میژووی

# کورد لە سەدەی ۲۰ - ۱۹ دا

لە کریس کوچیرا - وە

وەرگیراوی - محمد ریانی

# مێژووی

# کورد لە سەدەی ١٩ - ٢٠ دا

## لە کریس کۆچێرا - وە

## وەرگێڕاوی - محمد ریانی

وێنەی وەرگێڕ

**شناسنامەی مێژووی کورد**

×+×ـــــــــــــــــــــــ×+×

نێوی کتێب : کورد لە سەدەی ١٩ ـ ٢٠ دا

نووسەر : **کریس کوچێرا**

وەرگێڕ : محمد ریانی

چاپی : هەوەڵ

چاپخانەی : **کارون**

لیتوگراف : آذرنگ

تیراژ : ٣٠٠٠ نوسخە

ساڵی بڵاوبوونەوە بەهاری ١٣٦٩ ـ تاران

له ماموستا هه ژار

هه‌مو گه‌لێک له گه‌لانی ئه‌م سه‌رزه‌مینه هه‌راوه ...... چه ئه‌وانه‌ی ئازاد و خودا پێداون و چه ئه‌وانه‌ی چاوه چاون هه‌لێ وایان بۆ بڕه‌خسێ که ئازادی وه ده‌س بێنن و خۆیان وه‌کو بنیاده‌مان له ناو خه‌ڵکدا بنوێنن ، هه‌تا به‌زمانی زگ ماکی به نوسینه‌وه ڕا نه‌یه‌ن و ... له گه‌له ئازاده‌کانی دیکه‌ی نه‌گه‌یه‌نن که ئه‌مانیش وه‌ک بنیاده‌می تر زیندون و ده‌توانن بژین ، ده‌بێ به‌ڵگه‌یه‌کیان هه‌بێ، ئه‌و به‌ڵگه‌یه‌ش مێژوی تازه‌و که‌ونارایه که خرا بێته سه‌ر قاقه‌زو نیشانی یه‌کتری بده‌ن .هه‌ر گه‌لێکی مێژوی نوسراوی خۆی نه‌بێ وه‌ک که‌رکه مه‌ڕی بێ شوانه‌و له سارایه سه‌رگه‌ردانه . هه‌ر جانه‌وه‌ری دڕنده‌ی نزیکی بێ تا مه‌زرۆی گۆشته‌که‌یه‌تی ئیتر جێگه‌ی ئه‌ومیلله‌ته گه‌رمیانه یا کوێستانه فه‌رقێ ناکاو به‌ده‌ردی مه‌سه‌ل گوتنی بۆزیان ده‌سته‌وه‌ستانه وناتوانی بڵێ منیش هه‌م.

به داخه‌وه ئێمه‌ی کوردی قه‌ره‌به‌ختی ده‌سته‌وه‌ستان قه‌ت به‌هاری ئازادیمان به‌چاو نه‌دی و چوار فه‌سڵه بۆمه زستان بو.. بۆچی ؟ چونکه نه به زمانی خۆمان نوسین وخوێندنمان بوه نه مێژوشمان خستۆته سه‌ر قاقه‌زه‌وه ... ئێمه خوێنده‌وارمان زۆر بون به‌ڵام هه‌زاران فخابن زۆری بۆربون .

ئه‌گه‌ر ئێمه سه‌رمان به‌هه‌ر کتێبخانه‌یه‌کدا بکه‌ین به‌و کتێبانه‌ی که‌کورده‌کان به عاره‌بی و فارسی وترکی و ئینگلیسی و زۆر زمانی تر نوسیویانه پڕبوته‌وه ، هه‌ر له کوله‌کوی‌ته‌ڕیشدا

باسی کوردیان نەکردوە . چەندین سەدە هاتن وچون بەفەرمودەی حاجی قادر ، کورد هەر کورت بون وخەبەریان لەخۆیان نەبو . چاوەک دەڵێن " لە پاش ساڵێ سڵاماڵێ " والەم چەرخی بستەمدا تاک وتەرا لێرو لەوێ چەند لاوێکمان تێگەیشتن تا ئێمە خۆمان نەناسین چۆن خەڵک دەمان ناسێ ... هاتن بە زمانەکەی خۆیان ئەوەندی لوا بێ بویان ... کوششیان کرد مێژوی خۆیان بنوسنەوە و بە زمانێک بێ کە هاووڵاتیەکانی کوردیشان لێی تێ بگەن و رابردوی خۆیان بزانن ... کە ببرای زۆر بەنرخشمان ( کاک محەممەدی رەبیانی) یەکێک لەو لاوانەیە ، ئەم مێژوەی دەربارەی زۆرلەو رودوانەی کە لە کوردستاندا روی داوە ، خستویەتە سەر قاقەزو ، ئەم بەرهەمەی پێک هێناوە .

بەهومێدم نوسەرانی قەڵەم بەدەستی هاوزێدی چاولەو بکەن و بۆ قازانجی گەلەکەیان بەدڵ وگیان تێ بکۆشن وە لە هەژاری رزگارمان بێ .

رێبەندانی ١٣٦٨ ـ عبدالرحمن شوفکندی (هەژار)

نەخشەی تەواوی کوردستان

پێشکەش بەخێزانی هاودەم و،

هاودەردم ،وە بەکچەکانم کلی وڕۆژیار

کەلەیارمەتیئەومێژوویەدا هاوکارم بوون

محمدریانی

"بسمه تعالیٰ

شوکروسپاس بۆخودای مه زن که ئیّمەی خولقاندوه ئاده میزادی کردەئه شره ‌-فی مه خلوقات وه به شوێنی دانعمه تیکّی زوری دایه .

ئنجاقانون و عورفی الاهی بۆژیانی باش وحه سانه وه‌وه بوناسینی خوّیی له قوّناغی هه وه ڵه وه دانا وه به پیّی ئه وقانون و یاسایه ڕیّگای دروستو،راسته قینەی به خه‌ڵک نیشان دا .

سپاس بۆئەو خودایەی که له و ئاخریانه دا زۆری وملهوڕی پادشا زاڵمەکانی پاش ٢٥٠٠ سال حکومەتی داسه پاوی چەپەڵی‌پادشایه تی‌له سه رئه ستووکوڵی خه ڵکی دارنی و هه ڵ گرت ،وه به جیّگای وی حکومەتی عه دلی ئی لاهی‌دانا .

به راستی ئاڵوگۆرێکی ئه وتۆی له ئیّران دابه هدست هیّناکه له میژوودانه دیتراوه . به دریّژائی میژوودا زوڵم وستەم له نەته وەکان به تایبەت له کوردان زۆرکراوه .

ئینجابه دانانی قانون ئەساسی نوّیی کوّماری ئیسلامی ئیران مافی خەڵکه کانی ئیرانیی به هوی ماده ١٥ ناساندوزمان و نووسینی له ناوچەکان دائازاد کرد .

جائیمرو به وبۆنه وەیه که نو وسه ران تووانیوانه پیّنووس به ده سته وه بگرن وشت‌بنوسن وه به سه رهاتی قه ومەکه یان له ڕابردودا بگیّڕنه وه . لەڕاسته

قینه لە ڕابردوداەوە مێژو ونو وسەکان و نورسە رە کانی بیگانە بوون کە بە سە
رهاتی ئێمە یان بە کە یفی خۆیان نو وسیوە وە قە ڵمیان بە سە رکاغە زداهێناوە .
بە ڵام ئە وە . بۆهە وە ڵین کە ڕە تە کە دە و ڵە تی کۆماری ئیسلامی ئێران بە هۆی
حوکم و عورفی ئیسلامی خۆی،کە تە واوی نەتەوە کانی .
پێ وە ک یە ک وایە ، ڕێگادە داکە " مێژووی کورد " " لە ئێران دانبوسرێ .
هیوادارین ڕۆژێک بێ کە گشتی کوردە کان جهان " کە لە تە بارە وە ئێرانی و
مسلمانن ، لە ژێر ئالای بە رزی ئیسلامی ئیران دا ژیانێکی پاک و خاوێن بە ڕێوە
بە رن . لێرە دامن سپاس و تە شە کوری خۆم لە ئە ندامانی بە ڕێزی کۆماری
ئیسلامی ئێران دە ردە برم ، وە لە خودای گە ورە دە وام وپە رە پێدانیئە و
کۆمارە ئاواتە خــوا زم و هە روەها هیودارم کە ئالای بە رزی ئیسلام بە وزو وانەلە
تە واوی ووڵاتی جیهان دابلە رێتە وە وبشە کە یتە وە وە ئیتر . . . .
محمد ریانی

## ووتاری سەر فه سلەکان

### فه سلی ١

صفحـــه



### فه سلی ٢ ساله کانی به رهه ڵستی

صفحــه



## شۆڕشی شێخ مەحمود

صفحـــه



***شۆڕش و ، ڕاپه‌رینی شێخ سه‌عید (١٩٢٥)***

## *کۆماری کوردی ئاڕاڕات ( ١٩٢٧ـ ١٩٣١)*

## ئاخرین شۆڕشی شێخ مەحمود

صفحە



بەشی سەیەم

صفحـه

صفحە

صفحه

## پارتی دیموکراتی کوردستانی عراق له دامه زرانیوه تا شوّرشی ١٩٥٨ ٢٩٩



## له شوّرشی عراق (١٩٥٨) تا برینی هات و چوّ له گه ل قاسم

صفحه

صفحـه

صفحه

صفحــه

صفحــه

صفحه

## ژینامه کرپس کوچێرا

کریس کوچێرا نووسه ری مێژوی " خەبات‌و، هەڵستانی گەلی کورد " ، لەسالی ١٩٣٨ زاینی دا له دایک بووه، ژنه کەی وینه هەڵ گره، وُ له کاروباری کوچێرا داها وکارێتی .

ئه و نوسەره له ڕۆژنامه کان و ، گۆڤارەکانی وڵاتی فه رانسه، وه هه روەها ده ره وه، ڕێپۆر تاژی ڕامیاری ده نووسێ : هه تا ئیستا ئه وانەی به شه رخه وه نووسیوه: بـزوتنه وەی بیافراله سالی ١٩٦٩ ، کاتی خلیجی فارس له ١٩٧٨ — ١٩٧٥ دا " وڵاتی سوداں له ١٩٧١ دا، ڕاپه ڕینی کورده کان له ماوەی ١٩٧٥— ١٩٧١ دا وڵاتی شیلی که ١٩٧٦ ، فلستین له ساڵه کانی ١٩٧٨— ١٩٧٦ ، ئەوانه ڕسته نووسراوه یەکن که کوچێرا بڵاوی کردونەوه .

کرس کوچێرا ، بونووسینی ئه ومێژوویــه ، پترله ٥١ کتب وه ٧١ روژنامه وگوڤاری خویندوتەوه وه هه روه هاله ئارشیوه کانی دەرەوەی جیهان کەلکی وه رگرتووه .

وه رگێڕ — ڕیانی

## ناسینی وەرگێڕ

له سه ر ڕێی وشوێنی هـ ه میشه که باوه وقاوه، نووسه ریاوه رگێڕ بۆئه وەیکه بناسرێ پێویسته به کورتی له سه ره تاوه به سه رهات واته شه رحی حاڵی خوبی بنوسێ.

حه قیرله بانه مه ڕی ساڵی ١٣٠٣ له شاری مهابادله دایک بوم. له هه وە ڵه وه چومه مه کته ب، ده رسی دینی و، قوزئان م خوێند. پاشان ناردیاغه مەدره سه ی ده وڵەتی وه تا ساڵی ١٣٢٠ ی هه تاوی ده رسم خوێند. سه بارەت به ڕوودا وەی شەڕی گه ورەی دووهه میجیهانیٔ له کوردستان ماوەیکمـه دره سـەكان داخران منش ئه وکات نه م توواني پترله ٩ پله ده رسی نیۆنجی بخوێنم

ئاڵوزیو پشێوی له مهابادزیا ترده بووله هه ل ومه رجی دامه زراندنیکوماری کوردستان له مهاباد دابووکه بوده ره وەی ووڵات بۆ خویندن چووم ساڵێک لەوی مامه وه و، گه ڕامەوه ئێران.

مه یلم کێشرا بۆلای ئیش وکاری فه رهه نگ له سالی ١٣٢٦ له قوناغی هەوەڵه وه له مهاباددە رسم ده گوت. به شوێنی ئه وه داناردیاغه بۆکان مه درەسەی ناوه ندیبوکان م به یارمەتی ئاغاکانی وێ دانا.

پترله ساڵێک له وێ نه مامه وه، له وێراهه ڵیان داشتم بۆورمێ، له گوندێک بەنیۆی، مه لوونه" ده رسم ده دا. به شوێنی ئه وه داهێنا یاغەوه شاری ورمێ

وه به چه رمه سه ری ناردیاغه وه مهاباد .

له سالّی ١٣٢٩ تو وانیم دیپلّمی علمی وەرگرم ، وه به و به لّگه یه بچمه زانستگەی ئه فسه ری . به ده ره چه ی ستوانی له جنوبی ئێران له ڕستەی تۆپخانه خه ریکی خزمه ت بووم . ئه وکاره دووسالّی خایاند . له قوّناغی دووائی داهاتمه وه ئیدارەی فەرهه نگی مهاباد ، به لاّم تووشی ڕووداوەی سیاسی بووم و، له فه رهه نگوه ده ریان نام .

به شوێنی ئه وه داخه ریکی که سب وکاربووم ، وەهه روەهاله موتالاّش غافل نه بووم ، وه تو وانیم دیپلمی ئه ده بش وه رگرم .

له کنکورزانستگەی ته وریّزقه بول بووم . له ڕشتەی زمانی فه رانسه ناوینان نووسیم . له سالّی ١٣٣٧ لیسانس مەوه رگرت . له دووایه بو فه رهه نگ داوەت کرامه وه . کردیاغه سەروک ده بیرستان ، تا سالّی١٣٤٤ له سه رئه وکاره به رده وام بووم له وماوه یه دا لەگه ل هێندێ له ده بیران وآموزگاران ، تاوان بارکراین که دژی ڕژیم ده بزوینه وه ، منیان بوکاشان هەل داشت وه ئه وانی دیش‌هه ریەک بولایەک . پاش سی سال‌مانه وه و،کوێره وەری بوتاران ناردرام . له وکات‌وساته دابه یارمه تی ماموستای زاناوبه ڕێز مه حه مه دی ئیراهیمی چومه ئیزگەی برون مه رزی به رنامەی کوردی ، وه ها وکاریم ده کرد .

له وبه ینه ش دا تووانیم ده ورەی پلەی سه ره وەی انستیتو به رنامەریزی و مودیرییه ت ته واوکەم .

ئیستا که متقاعد بووم واته بازنشسته .

پاش شوڕشی پیروزی ئیسلامی ئیران ، به هوی دانی ئازادی قه لەم ونووسین منش خه ریکی وه رگێرانی په رتوکی " مێژووی‌کورد" که هه رئیستاکه له به رچاوتانه بووم . لیره دابه جییه که له جه نابی دوکتورا علم پروفسوری قه لب سوپاس وته شه کوربکەم که ئه وکتێبەی دامێ ، وه هانی دام که وه ری گێڕمەوه .

نوو سراوەکانی دیکەم له گوڤاری گرشەی کوردستانی داکه سه رده میک به سه رنووسه ری ماموستای زاناو کارزان ئیبراهیمی بلاو ده بووه ناساندراوه . جێی

شایانی با سەکەلیرەدا بەخاتری ئازادی قەلەم وەزمان کە لە مادەی ١٥ قانونی ئەساسی کۆماری ئیسلامی داگونجاوە سپاس بکرێ.

ئتردە وام و، قەوامی ئەو کومارە بەڕێزەمان لە خودای مەزن ئاواتە خووازین ــ محمد ریانی ڕێ بەندانی ١٣٦٦ هەتاوی لە تاران.

بسم الله الرحمن الرحيم

سه ره تا

نه ته وەیه که له نیۆ٥ و وڵاتی جۆر به جۆردا وونه ، به شیزۆری له ووڵاتی تورک، ئیڕان وه عراق ، وه به شی که می لەووڵاتی سوریه و شۆڕوەی دادەژین ئەوونه ته وەیه له میژوودالە هه رەنه ته وه کونه کان ناسراوه .

ووشەی کوردله و و ڵاتانه داوەک یه ک له سه رزاران نیه . له تورکیەداپێیان ده ڵێن دانشتووانی ئاناتۆلی باشوری . ژمارەی دانشتووانی کورد له ناوچەی ئه و وڵاتانه دابه وجوره نیوبردراوەله ووڵاتی تورکیه ٤ میلیون له ئیڕان ٥/٥ میلیون له عراق ٢/٥ میلیون وەیه ک میلیونی دیکه ش له ووڵاتی سوریه وُوو ڵاتی ترده ژین که له گشت دا ١٥ میلیون نەقەرزاندراوه .

هه ڵبه ت هێندی مێژوونووسان ئه وژمارەیان نه سه لماندوه، وەهێندی له حکومه ته کان ده ڵێن که ئه وژماره یه وانیه ، به ڵام هه رچێک بیٚله وباره یه دائاکاری ڕامیاری تێدا دیاره ، وه له ت وکوت بوونی ئه و، ووڵاته له وبابه ته وه بیئه سەرنیه

کات وچلۆنایه تی جوغرافیای کوردستانش زۆربەچاکی ڕوون نه بۆته وه. له عراق داسنوری به ینی کوردستان وه عه ره به کان ده ـ گه ڕێته وەلای کێوه کانی کوردستان وه ده شتی به ین ئه ننه هرێن ه ئینجا .

١٥ سال شه ڕوکێشه له ووڵاتی کوردستانی عراق دابه زگری له وەی کردوه که

رژیمی عراق بــە باشی نە تە وەی کــورد بناســی وە بــە حال و باڵیان ڕابگات ،
وە سنوریان دیاری بکات !

لە ئێران داتە نیالیوایە کی کوردســتــان هەیە کە نێوی ناوچەی کوردی لە سە
رەو ، وازبە چاکی ڕوون نە کراوە وبە وجورە ئە ولیوایە هە مووی ووڵاتی کوردستانی
ئێران ناگرێتە وە ، وەلە ڕاستە قینە دالە ووڵاتی تورکیە داهە ردە ڵێی کوردستان
هە ستی نیە .

ووڵاتی کوردستان لە نە خشە داباش دیارە واتە لە سە رتا سە ری دە ریای
مدیترانە تاخلیجی فارس دەگرێتەوە .

ئە ونە تە وە یە مە بە ست بە پاراستنی زمان و ، فە رهە نگ و آین و ، مە ذهەب
و ، فۆلکلۆر ، شانۆ ، میتولۆژی چیرۆک و ، مە تە ڵ ، زاراوە ئاداب وڕوسمی ڕە-
سە نی خۆیی تائێستاتووانیو یێتی هە ربە وچە شنــە فــۆرم و شکڵــــی خۆیی لە
ڕۆژ هە ڵاتی ناوە ڕاست دابێ ڵێتە وە ، ولە قە دیمەوە ڕای بگرێ . هێندێ ، هە-
لوێست بۆتە هۆی ئە وە ، کە کوردبێ مێژوومابێتە وە ، وەچ شتێک لە بارەی وی دائە-
نوسرابێ ئینجا نووسە رکانی عە ڕە ب ، فارس ، تورک هەوە ڵین ڕاوێژکە رە کان
بوون کە لە بابە ت مێژووی کورد لێیان کۆڵیوەتە وە و ، پە رتۆکیان نو و سیوە .
لە چاوە ڕووانی وَرُو وانگەیجو ــ غراقی ناسە کانە وە لە بارەی ئە وقە ومە واگوتراوە:
"ئە بــوو ئیسحاقــی فارسی " دە ڵێ کــوردقە ومێکە کە لە تە نشست فارسە کــان
داژیانیان ڕابووا ردووە ، ئە ونووسە رە لە سە دەی دە هەم داژیا وە هە روە هابە
ووتە کە ی درێژە داوە ، دە ڵێ کوردنە تە وە یە کی
تایبە تە کە ئاکاروکردە وەی جیاوازی خۆی هە یە ، واتە گە لێکە کە سروشتووخە
میرە کە ی لە هە وە ڵەوە کوردبە هە ستها تووە "

مێژوونووسێکی عە ڕە ب بەنێوی مەسعودی لە پە رتۆرکی "مروج‌الذهب "واتە"
چیمنە کانی تە لائی " دادەڵێ:قە ومی‌کورد لە بنە چە کە ی پیاوە یە خسیرە کانی
شاسولە یمانە ، وە لە تە باروعێلی شە یتانن کە لە کێوە کان دابڵاوبوونە وەوە سە
ربزیوو نافە رمان بوون "

مێژوونووسێکی دیکە دە نووسی کە ئەوقەومەلەبنەچە کە ی زووحاکن کە پادشایەکی خوێن خۆری ئێران بووە وە دووبرینی بە شکلی مارلە سەرشان بووە کە زۆری سەخلەت کردووە، وە بە هیچ داوودەرمانێک چارەی نە هاتووە" تاکورۆژێک شەیتان لە جلکی دوکتۆر دیتە لای وە پێی دە لێ ئە ودووبرینە تە نیاچارەی بە وەدێ کە هە مووڕۆژێ مە غزی سە ری دووگە نجی لە سە ردابنێی تائارام بیوساریژی بکات ئینجا.

ئەورێگایەی بۆدا مرکاندنی دەردی زووحاکبە پادشای ئێران فێرکردووە، کە بەوەش عیلاجی نەهاتووە.(١)

بە شوینی ئەوە دابورزگار بوون لەدا وی ئەوپادشایە، کوردە کان چوونە کێوەکانوە پەنایان بۆجێگای عاستەم بردوە، وەزۆرژیانیان لێ تاڵ بووە، وەبەوچەشنە لە چاوە ڕووانی ڕۆژیکدابوون کەهەل ومەرجیان بۆهەڵ کەوێ تابتوانن ئەوپادشا ملهوڕە لەبەین بەرنو، شەڕی وی لەسەرملی خۆیان دابڕنن گوتیەتی ئەونە تەوەیە ماوەیەک لەگەڵشارو، ئاوەدانی هاتو، چیان نەبووە وە لەوماوەشدا زمانێکی تایبەتیان داناوەو، قسەیان پێ کردووە".

ئینجا لاپەڕە مێژووکان نیشان دەدەن کە کورد لەمێژەهەستی هەیە وە لەزەویوو، کێوەکانێکی کەئەوڕۆ وڵاتی کوردستانی نیوە، ژیاون.

لەشاری ڕەواندزی عەراقدا، لەئەشکەوتی "شانیدار" بەندەنێکی ئادەمیزا دیان دیتۆتەوە لە ئیسانەهەوە ڵەکان، واتە "نێئان درتاڵ" ە، وە ئەوشارەش لەکاتی حازر دا کورد نشینە بەڵام باستانشناسان هێستا بڕوایان بەوەی نیە کەووشەی "کورد" لەسەرئەو ئێ سکلێتە دابنێن.

گزێ نێفۆن مێژوو نووسی یۆنانی کە لەسالی ٢٢٥ی پێشزایینی دا ژیاوە، وەیەکێکە لەمێژوو زانان وساحیب مەنسەبکانی گەورەی هێزی ئسپا رتەکان، لەپەڕتۆکی خۆی دا بە نێوی " گەڕانەوەی دە هەزارسو وار" دەنووسێ کەئەو قەومە، مـادن، وەخزم و، کوڕە مامی فارسە کانن؟ وەیان قەومێکن کە لەبەینی

١ ئینجاوەزیری زووحاک هەمووروژێ مێشکی بەرخێکی لەگە ل مێشکی گە نجێکیتێکەڵ کردوە، وەبە وجوورە، گە نجێکیلەکوشتنڕزگا ر کردوە.

وڵاتی ئاسیاو، ئوروپادا٠ وە بەنیوی سیریتەن ناسراو ن

بەڕاستی مێژووی کورد لەوە ختێک داناسراوە وە بەباشی ڕوون بۆتەوە کە ئاینی ئیسلام لەزەمانی عومەر خەلیفەی موسلمانان دالەوەلاتبڵاو بۆتەوە، وە ئەسەری لەسەر ئەوگەلەداناوە: نووسەرەعەڕەبەکان کە بەسەرهاتیان نووسیوە، دەڵێن کە ئەونەتەوە یەلە سێ سەداندا ڕا پەڕینە کەی خۆی درێژە پێداوە، واتەلەزەمانی داگیرکردنی تەکریت لەسالی ٦٣٧دا، تابەسەرهاتی هەوەلین سلسلەی مێژووئی کوردەکان: شەددیتەکان لەسالی ٩٥١ وە تا ١١٧٤ لەسەرەوەی قەفقاز حکومەتیان کردوە.

حەسەن وا حیدەکان کەلە ٩٦٠ وەتا ١٠١٥ ئەو کوردانەی کەئەوڕۆلە جەنوبی کوردستانی ئێران داهەن، حکومەتیان کردوە، وە مەڕوانیکانی کورد کەلە ٩٩٠ وە تا ١٠٩٦ لەناوچەی دیار بەکرحکومەتیان هەبووە سەلاحەددینی ئەیوبی کە دانیێنەری سلسلەی ئەیوبی بووە (١١٩٣ – ١١٣٨) لەبابەوە کوردە، وەهە تاوڵاتی مسر پادشایەتی کردوە، بەلام ڕەگەزی خۆی وەدەرنەخستووە، لەسەدەی ١٩دا مەغولەکان ڕژانە سەر ناوچەی کوردستان: لەسالی ١٢٤٧ وە لەشارە زوور، وەلەساڵی ١٢٥٢ دا، لە دیاربەکر، وەلەسالی ١٢٥٧ دا، لە کرمانشاو، هەولێر، وەلەساڵی ١٢٥٩ دا، لە حەکاریو، جەزیرە بوون، وە بەو چەشنە خاکی کوردستانیان تادووسەدە و، نیو لەژێر سێبەری ڕەشی خۆیاندا هێشتۆتەوە.

پێویستە لەسەدەی ١٧ زاینی شدا چاوێک لەوازی کوردستان بخشێنین وبزانین کە کاتی ئەووڵاتە چۆن بووە، لەگەڵ شەڕی چالداران لەسالی ١٥١٤ کوردەکان بۆ دووبارە ژیانەوەی خۆیان واتە رونیسانس: لە ماوەی چووار سەداندا کە ڕژیمی عوسمانی دژی پادشایە تی ئێران دووژ منایەتی هەبووە، توانی ویانە کە بەدامەزراندی ئۆتۆنۆمی لە ناوچە کە دابگەن، وە ئەو دو دەوڵەتە مافی نەتەوایەتی ئەویان بێان پێدا هێناوە، وە لەگەڵ هەردوو دەوڵەتی مەرکەزی ئەستەمبوول وەتاران نێوانی هەبووە، جالەودەورانە دا کە کوردستان هەستی هەبووە، پیێ گوتراوە دەورانی تەلائی فیئودالیتەی کورد.

شەرەفنا مەکەلەساڵی ١٥٩٥ دا بە زمانی فارسی نووسراوە، وەنووسەرەکەی کورد بووە، هەوەڵین کتیبی مێژووئی کوردە کە قامک لەسەر ئەوکاتە دادەنێ، وە

نێوی نووسەرەکە شەرەفئەددینی بتلیسیە.

لەسەدەی ۱۷ و ۱۸ دا سنووری کوردستان لەلایەن دوورەقیبەوە بەستراوە، سنووری بەینی تورکو، ئێران لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆڕۆژ ئاوا، وە لە ڕۆژئاواوە بو ڕۆژ هەڵاتدەس بەدەستگەڕاوە وئاڵوگۆڕ کراوە، ئەوەش مەبەستبە شەڕو، کێشەیەکبووە، کەلەوەمەڵبەندەدا قەوماوە.

پەیمانی سالی ۱۶۳۹ نیشان دەدا کەئیدی ئێران نەی توانیوە، بەو هێرشە درێژە پێبدات، لەئاکامدا تەواوی کوردەکان بوونە ژێرفەرمانی دەولەتی عوسمانی.

پەیمانی ۱۷۳۲ واتە پاش سەدەیەککە بەسترا، ئاسۆیەکی تازە لە سنووردا دێ نێتە پێشێ یا نی لەلای ڕۆژ ئاواوە کە قودرەتو، فەرمانی نادرشا کە هەتا دەروازەی بەغدایە بوو، ئەوسنوورەی ئاڵ و گۆڕکرد بەلام پەیمانێکی نوێی دیکە کە لەسالی ۱۷۳۶ دا بەسترا، دووبارەپەیمانی سالی ۱۶۳۹ ی هەروەا بە قەوەتی خۆی هێشتەوە.

لەبەرەبەری ئاسۆی سەدەی ۱۹ دا، کاتێککە جووڵانەوە ـ یەکـــی ناسیونالیستیو، نەتەوایەتی دەهاتشکڵبگرێ،کوردستان بەرەوڕا پەرێـــن دەرۆیشت، بەڵام هێشتا ناگاتە ئەو دەمەی کە شەرەفئەددین لەسالی ۱۵۹۶ زاینیدا گوتویەتی، وەقامکی لەسەرداناوە.

لەسەدەی ووستادا واتە لەسەدەی ناوەراستی ئوروپادا لەکۆشکەکانی فیئودال لەدەرەبەگەئان کەمو، .زۆر بەیارمەتی جوتیارەکانی کوردو، هەرمەنی حکومەتی قەبیلەئی، یان نیوە قەبیلەئیان پێک هێناوە.

لەمەڵبەندەکانی بەرزۆەککێوەکان کەڕێگای هاتو و چۆکەم بووە، قانونی دەرەبەگەکان لەسەرجوتیارە کوردەکان زۆر حوکمو، زۆربەی نەبووە، وە دستورو، حوکمیان لەدۆلو، دەربەندەکاندا پتر بەڕێوە بردراوە، ئینجا هێندێ لەدەرە بەگەکانو، ئەربابەکان بۆ خویان کەم یانزۆر چەشنە ئۆتۆنۆمێکیان پێکهێناوە، بەڵام هەرگز ووشەی "دۆلەت" وەیان "نەتەوە" بەسەرزمانان دانەهاتووە.

لەسالی ۱۹۷۵ دا، پاشئەوەی کەمافی نەتەوایەتی ناوخۆ ئەستاندرا، وە چەشنە مافێکی گشتی لە کوردستان بەڕێوە بردرا بە دووای تێکچووندا دیسان کوردستان لە ڕۆژی ڕەش وتاڵداماوەو، نیوی کوژاوە، ئینجا خۆهەڵکێشانو،

تی هەڵ چوون‌و، هان دان لەوبەینەدا بووبەمەبەستی ئیشتبایەکی مێژووئی، لەوهەل‌و، مەرجەدا!

دەگوترێ بڵێن‌کە تەواوی ئەو بزوتنەوانەی کەڕەنگ‌وشکڵی نەتەوایەتی هەبووە، وەئاڕاستەو، گەورەکراوە: هەمووی لەیەک مێژووی گشتی سەرچاوەی هەبووە، وە لەکورەیەکی نەتەوا یەتی‌و، ناسیونالیستی دا وەجۆش وخرۆش‌هاتووە، ئینجایان نەمان بووە و، گوللەی توپ، وە یان‌ژیان، بەڵام دەبێ پێ لەوەی بندرێ کە بەڕاستی کورد مێژووی نە بووە و، نەنووسراوە: " پێش مەرگەی ژێنراڵ بارزانی هەرگز ئەمیر بەدرخان‌ی نەدەناسی، وەنەی دەزانی شێخ‌عوبەی‌دیل‌لا کێیە، بەڕاستی ئەوان قارەمانێکی‌چارە رەشی کوردستان بوون.

تاقمی ڕووناک بیرەکانی کورد کە لەگەڵ بارزانی هاوکاریان دەکرد، هەرگزو هەرگز، ئەو مروڤانەی کە کلوبی کوردی قوس تەن تەنیە یان‌داناوە، نەدەناسی، جابەڕاستی ئەو مروڤانەی کە پێویست‌بوو لە بارەی ڕا پەڕینەکانی سالی ١٩٢١ ، ١٩٢٥، ١٩٢٧، ١٩٣٧ دا لیێ کۆڵیبایەو، وە متاڵای کردبایە، دەهات‌لەبارەی تەمەددنی ٥٠٠٠ ساڵەی کورد، دا قسەی دەکردو، لەسەری دەڕۆیشت، بێ‌گومان کوردەکان لەوبارەدا بەر هەڵست‌و، بیانوویان زۆرە: بەرەڵست‌و، پێش‌لێ گرتنی سەدساڵەی‌ڕژیمە کونەکان‌و، پادشا بۆگەنەکان کەنەیان دەهێشت تەنانەت مێژوو یەک‌لە بارەی نەتەوەی کورددا بنوسرێ.

لەسەرئەوەشڕا، کوردەکان ناتوانن ئەوبارە قورسە لەسەر ئەستۆو، کۆڵی‌خۆیان لابەن کەچیان نەکردووە، پاش ئاشتی وسولحی ١٩٧٠ کوردی عەراق بەڕاستی نـەی زانی، وەیان نەی ویست‌لەوکاتەو، دەمەگەورەیە کە بۆی‌هاتیو پێشێ کەڵک وەرگرێ وەلەسەر نوو بینی مێژوویەکی گەورەکاربکات، بەڕاستی دەبێ لێرە دابڵێن کە مێژوو لیاقەتی سەرزەنشو، لۆمەیە، ئینجا متاڵایەکی قووڵ لەسەر مێژووی ڕا پەڕینی کورد لەسەرەتای هەڵستانەکەی لەسەدەی ١٩ دا ئامانج و هەڵوێستە. بەڵام ئەوەش ناتوانێ بەبێ هەڵەوئیشتبابێ ــ بێ‌گومان ئەو کەسانەی کە لەداهاتوودا لەبارەی مێژووی کورد متاڵا دەکەن ولێێ دەکۆڵ نــەوە، و دەنووسن، دەبێتە هۆی دەرسێکی چاک کە ئاکارو کردەوەی ڕا بردوکان وەبیر خەلک دێنێتەوە، وەئیتر هەڵەدووپا تەنا بێتەوە.

سەرئەنجام هەرچۆنێک کە لەبارەی هەوا دارانی ژێنراڵ بارزانی قەزا-

وەتدەکەن ، بابی کەن ، بەڵام وا باشە کە بزوتنەوەکە هەربنوسرێ وەبەیان نامەکانیشبێتە سەرکاغەزو ، لەبیرنەچنەوە .

***

ژمارەی کوردان ئائەرو لە دونیایەدا بە ۲۵ میلیون نەفەرگە یشتوە ــ م

## بۆئاگاداری

نووسەر ئەوپەڕ تۆکەی کردۆتە چووار بەش
١ ــ مەسەلەی نەتەوایەتی قەومی کورد و ، هەوەڵین خەباتەکەیان
٢ ــساڵەکانێ کی کە کوردەکان ، لە ژێر زوڵم وستەمی نەتەوایەتی دابوون
٣ ــ خەیات بۆسەر کەوتن‌و ، سەربەستی
٤ ــ سەرئەنجامی ئەوگەلە ، وەسرنج‌دان بە خەبات‌و ، کەڵکلێ وەرگرتن .
"وەرگێڕ"

بەشی هەوەڵ (١)

(هەستی‌و ، بوونی نەتەوا یەتی کورد )

## بەشی (١)

### ١ ــ ئەمیر بەدرخان "پادشای" کوردان

ئەمیر بە درخان حاکمی کوردستانی بەشی وەلاتی کورد نشینی عوسمانی بوو ، حاکمێکی بەهێزوتوواناو ، ذانا بوو ، ئینجا بە دە خۆڕادیوی ئەوڕستەیەی لەبارەی خۆی داگوتووە :

ــ ئەوە منم کە حاکمی ئەو وەڵاتەم و ، حوکم دەدەم ، نەپادشای عوسمانی ئەگەر پادشای با بی عالی ، لەمن‌هێزو ، زۆر بەوتووا نائی پترە ، بەلام من‌زۆر لەوی نەجیب‌تروگەورەترم ! چونکە باش‌تروچاکتر بەسەر نەتەوەی خۆم ڕادەگەم ، وە ئاگام لێیانە ، هیچ کاتێک زوولم وستەمیان لێ‌ناکەم گەلی گورد گەلێکی کـۆن ، ئەسیلو ، پاک و خاوێنە .

هەرچەند گوتنی ئەووتا رەی بەدرخان دەبێ نەختێک لەخۆ هەڵ کێشانی وی بریتی‌بـێ ، ئەمما بۆمان وەدەردەکەوی ، کەئەوحاکمە شانازی بەوەوە کردوە کە خۆی بە کوردێکزا ینوە کە لەبەرا بنەرپادشای عوسمانی دا بەو هەموو توواناێی وقودرەتەوە ، نەک‌سەری دانەنوواندوە ، بەڵکو خۆشی بەزۆر داردانـــــاوە . وەڵامبەرێکی وەڵاتی فەرانسە کە لە لایەن پادشای فەرانسەوە سەری لەوەڵاتە کوردەکانی تورکیەداوە دەگێڕێتە وە ، دەڵێ : ئەو گەلەلەئاسیای کۆن داژیاوە : وە بەڕاستی سوڵتان حەقیێتی کەبڵێ ، من‌لەگەلێکی نەجیبو ، پاکم و چوون ئەمیر بەدرخانی !ش لەو ڕەگەزەیە ، وەلەو زەویو زارەش‌دا لەدا یک‌بووە .

هەروەها ئەووەڵامبەرەگوتویەتی : ئەمیر بەدرخان حاکمێکی زاناو ، تێ گەیشتوو بووە ، خزم وقەومێکی زۆری لەدەورو بەر بووە ، وە ئەو ووتارەی کە

گوتویەتی "من خوم لەپادشای عوسمانی بەما قوول تر دەزانم"، ڕاستی گوتووە.

ئینجا بابزانین ئەمیر بەدرخان کێبووە، ئەمیر بەدرخان بەگ لەبنەچەکەو، بنەماڵەی هەرەکۆنی کوردە، لەساڵی ١٨٢١ی زاینی دائەمیری وەڵاتی بۆتان بووە، ئەووەڵاتەکە جێی دانشتووانی کوردی تورکیە بوون، زۆر بە هێزەوە دابینو، ئـەهون کردوە، وەحکومەتی نەتەوایەتیو، سەربەخۆئی خەلکی کوردی لەوەلاتدا، دامەزراندوە.

ئەو ئەمیرە جلگی تایبەتی لەبەردەکرد، واتە لیباسێکی تایبەتی گووڵ دۆزی زیر کەزۆر ئاڕاستە بووە لەبەرکردوە، مێزەرێکی سووکی ئاوریشمی لەسەر داناوە، قەراغی پانتولی، ئاوریشمی سوورو، ڕەشبووە،کالەی‌شەمانەبەندی،یان سۆلێکی کەنووکی سەری هەڵگەڕاوە لەپێی کردووە.

ئینجا ئەوکات زۆربەی حاکمە کوردەکان جلکو، بەرگیان بەو چەشنە بووە، وە حوڕمەتێکی تایبەتیان لەنێو عێل و عەشیرەتی خۆیان بۆ گیراوە، وە هەروەها کوردەکانی دیکە ڕێزی ئەوحاکمانەیان گرتووە. ئەوڕێزگرتنە مەبەست بەوەبووە کە ئەمیروو حاکمەکانی کورد، گەلەکە یان زۆر خوش ویستووە، وەلەپاشا تورکەکان پتر بەسەرخەڵک ڕا دەگە یشتن.

ئەمیرەکان بۆ پاراستنی سنوورو، وڵاتی خۆیان، خەڵکیان چـەک داردەکرد، واتە تفەنگ و شمشیرو، خەنجەزیان دەدانێ کە بتوانن‌لە بەرانبەر دوژمن‌دا دلێرانەڕا وەستن، ئەمیر بەدرخان هەر بەنێوانی چەندڕۆژان، سەری بە سەرەلاتی کوردستان دادەکێشا، وە لەوازی خەڵکی دەپرسی، پووڵو، پارەی بەنەدارو، فەقیروهەژاران وەنابینایان دەدا وەمەلایانی خەڵات دەکرد، ئەمیر بەدرخان زۆر جار لەبەریبەیانیوە لەکۆشکی خۆی دا لەدەرگولێ لەجەزیرەدا، دادەنیشت، کیسەزێڕی دەبە شێوە، کە ئەو کیسە زێڕانە بە پوولی ئەوڕۆ ١٢٥ دلار واتە نزیک بە ٩٠٠٠ ریال دەبوو، مێژوو نووسان گوتویانە کە ئەمیربەدرخان مرۆڤێکی زۆر موسلمانو، پارێزگار بووە، وە زۆرش تواناو، زانا.[٢]

دەگێڕ نەو کە لەبەرانبەر ئەمیردا، سەرۆکەکان هیچ دەسەڵاتیان نەبووە، بەڕاستی هەموودانشتووانی وەڵاتی کوردستان لەو وەختو، زەمانەدا، پییان وابوو کە خودا، محەممەدێکی دووهەمی، بوریک و پیک‌کردنی کاروباری کوردان ناردووە،[٣] تالە ئاکام دا بەشە خووراوەکانیان بۆ بستێنێتەوە، وە ژیانێکـــی

بەشەرەفیان بۆوەدەست بخاتەوە، وەسەرئەنجام سەربەخۆییکی بەنرخ و بایخ بۆخەلکی کورددابمە زرینن. ٤

لەڕاستەقینەدا ئەمیر بەدرخان ئامانج و ئاکاری بۆکوردایەتی هەربەوچەشنە بووە، وە کۆسپو، بەرەلستیکی کە بۆخەلکە کە هاتۆ تەپیشێ، لەنیو بردوە، وەهەولێ داوە کەگەلی کورد لەچیوتی ونالە باری دا نەبێ.

ئینجا لەسالی ١٨٤٦ زاینی دا کۆڕیکی ئەمریکائی چاوپیکە وتنیکیان لەگەل ئەوحاکمەبووە، وەگیڕاویانەتەوە کە ئیمە کە ٨ سال لەوەی پیش ئەو ئەمیرەمان کە چاوپێ کەوتووە مروڤیکی "ناتووان، بووە، وەزۆر دەولەمەندو بەقودرەت نەبووە، لەئاکام دابە چاکی باسیان نەکردووە. ٥

هەرلەوبارەیەدا، مەحمود پاشا، شازادەی کوردی سولمایمانێ لەسالی ١٨٢٠ دا کەلەگەل پیاوێکی دیپلوماتی ئینگلیسی چاویان بە یەکتر کەوتووە، وەباسی میژووی گرنگی کوردی بۆگیڕا وەتەوە، گوتویەتی کە جەزیرە پێ تەختی تایبەتی بۆتان بووە،وە تێک و پێک دراوە، وەلەبارەی لە"نیوچوونی خانەدانی خۆیی" قسەی بۆکردووە.

هێندێ لەسەر چاووکانی مێژوو گوتویانە، کە بەدرخان جێی شازادە سەیفەئەددینی گرتۆتەوە، مەبەستبەوەکە یەزدان شیری کوری خۆیی لەزیندانی کردووە وەئەی هیشتووە حاکم بی ا ٦

لەسالی ١٨٢٨ – ١٨٢٩ ئەمیر بەدرخان کە خاوەن هێزو، تواناتر بووە، بەتا یبەت تووانیویتی لەبەرا نبەردەولەتی عوسمانی دا،ڕاوەستی وەهەولێ وتەقەلابدات کە جیرانە کوردە فئودالەکانی خویی وەکخان مەحمود، لەشاری وان، وەنورولێ لابەگ لەشاری حەکاری کۆکاتەوە و یەکێتی بەهەستبێنێ وە بەئاواتی پیکهینانی کوردستانی سەربەستبووە.

ئینجا پاشئەوەی کە سولتانی عوسمانی لەسالی ١٨٣٨ – ١٨٣٦، دا قەرمانی عەدالەتی و برایەتی لەوەلاتدا ڕادەگەینی بەدرخان لە سالی ١٨٣٩ دا پەیمانیکی لەگەل عوسمانی دەبەستێ.

بەلام پاشچەن حەوتووان هێزەکانی مسری بئرایم پاشا کە جێی نشینی هێزە عوسمانیکان دەبن، لەپەیمانەکە لادەدەن، بەم بۆنــــە بۆکوردەکان هیچ شتێک نامینێ، وەلەبیروڕای تۆلەئەستێنە وە دادەبن، لاوازیو، بــی،

قودرەتی تورکەکان بووبەهوی ئەوە کە کوردەکان لە (ژوئن ۱۸۳۹ – ۲۴ – ۲۱)
دا جوولانەوەیەکی گشتی بەهەستبێنن.
پاش پێنج سال واتە لەسالی ۱۸۴۶ – ۱۸۴۴ ئەمیربەدرخـــــان
بەقودرەتەوە،زۆرزوو ئاکاروکردەوەی خویی بەجی هینا: سکەی لێدا، لە نوێژی
جەما عەتی جومعەدا نێوی لە خوتنەدا خوێندراوە، تاسنووری ئیران حوکمی
وی ڕاگەیاندرا، لەڕۆژ هەڵاتەوە تانیوژاستی بەین ئەن نەهرێن واتە تاروژئاوا،
بەندەری دیار بەکر، وەتادەگاتەوەشار و ماڵبەندی موسل دەستەڵاتی هەبوو،
وە بەوجوره ماڵو، سەروەتیکی بێحیسابی پیک هێناو، حکومەتی کـرد.
ئەمیر بەدرخان لەسەرتا سەری کوردستان دا هێمنیوئارامی بەرقەرار
کرد بوو.
ئینجا لەسەرئەوەشرا مێژوو زۆرباشوازی حوکم ڕانی وی ڕوون نەکردوتەوە
وە ئاسەوار ئاگاداریکی چاک لەدەستدانیە، بەڵام ئەوەی کە ئاشکرایە تەواوی
وەڵاتی کوردستان لەژێر فەرمانی ئەمیر بەدرخان دا بووە.
ئەمیر بەدرخان دوو تاقمی ئەمریکائی کە بریتی لەدوکتوڕایـــت
وە بریتبوون، بۆسەرلێدان لە کوردستان بانگ هێشتووە، ئەودووتاقمە بانگ
هێشتنەکەیان سەلماندوە، وەهاتوونە "دێرگوولێ" وەماوەی ۲۳ ڕۆژ لەسالی
۱۸۴۶ داماوون، وە لەنا وچەی ورمێ ڕاتاجەزیرەی بەنی عومــــەر،وە لـــە
جووڵامێرگ ڕا تاسەرچاوەکانی خابوور گەڕا وون، وەسر نجیان داوە سەر وەڵاتی
ناچەکانی ، دەست پی رانە گەیشتویکوردستان.
کۆڕی قونسوولی فەرانسە وێکانیشکە لە سالی ۱۸۴۵ لەناوچەی "بۆتان"
دا گەڕاوون، بەو جوورەیان گێڕا وەتەوە: وەڵاتی کوردستان لەگەل وەڵاتی
تورکتەفاوەتیزۆرە، دانشتنو، ڕونشتنیان لە ڕوویزانستەوەیە، فەرهەنگیان
باشە، ئەو تاقمە لە ۵۰ جێگایان سەریداوە وە بەناوچەی تیگریێ دا دەچنە دیار
بەکر، وەدەگێرنەوە، کەدووژمنا یەتی کوردەکان و تورکەکان بە چاکی لەگەل
یەکتر دیاربوو، وە ئەمیر بەدرخان باش چاوە دێری وەڵاتی دەکرد.
ئەوکاتئەمیر بەدرخان ۲۵۰/۰۰۰ پیاستروانەقروشی تەرخان کردبوو،
بۆ هۆزەکانی بەندەر، ئەوکۆڕە لەبارەی ئەمیر بەدرخاندا دەلی: مرۆڤێکی بە
هێزو توانا بوو، بەلام عادل و دادگەر، بەقودرتە وە حوکم ڕانی دەکرد،

پیاوی سیخووری بو وەدەستهێنانی هەواڵ بو وەڵاتی تورکەکان دەنارد تا خەبەران بزانێ، ئەمیر بەدرخان پیاوێکی خاوەنجێ، بەتین وحەرا رەت، وە لەخۆرازی بوو، بەسەر تەواوی وەڵاتی کوردستاندا وە هەروەها بەسەر حاکمکانی دیکەی کورد زاڵ بوو، وەدستی بەسەریان دا دەرۆیشت. ٧

تاقمی دوکتور ڕایت وەبرێت ماوەی چووارحە وتووان لە لای ئەمیر بەدرخان مانەوە، وازی مەسیحی نەستورێکانی یان بەچاکی زانی، وە چلۆنایەتی ئەوان وە نێوان ناخۆشیێکەیان لەگەل کوردەکان لێ حالی بوو، وەکاتی را میاری ئەوان لەگەل کوردوتورکەکان باسکرا.

نەستورێکان لەبابەتدانی مالیاتەوە لەگەل کوردەکان نێوان ناخۆشیان بۆ هاتبۆ گۆڕی وە شۆڕشیان دەست پێ کردبوو، لەسالی ١٨٤٣ وەکەنەستۆرێکان لە ژێر ئالای کوردەکان دابوون وادیار بوو کە زولم و، ستەمی نەتەوایەتیان بەتایبەتی لەناوچەی حەکاری لەلایەن نورول لابەگەوە لێ کراوە، ئینجا لەسالی ١٨٤٦ دا ژیانیان بە کوردەکان تاڵ کرد، عوسمانیکان نەستوریکانبەیەکەوەدژی ئەمیربەدرخان نارەجەتی خۆیان دەربڕی، وەڵاتی کوردستان سەروە ناخۆشیوو، نالەباری چوو، ئاژاوەیەک بە دووای یەکی داوەدی دەهات، ئینجالە ئوتی ١٨٤٧ دژایەتی لندن و پاریس و ئەمری عسمان پاشا کۆشکی ئەمیر بەدرخان گەمارو درا، وەگرتیان وەلە و لاتبو "کاندی" دوورخراوە، وەلەویش ڕا نار دیانە "دیمەشق" وەلە ئاخری دا لەسالی ١٨٦٨ یان ١٨٧٠ کۆچی دووائی کرد. ٨

لەبارەی ئەمیر بەدرخان مێژوو نووسەکانی دیکەش، جور بە جور دوواوون، "بازی نیکیتین" مێژوو نووسی ڕووسی دەلێ: ئەمیربەدرخان نێوان ناکۆکێکی کە لەگەڵ مەسیحیکانی هەبوو، بەتولەی ئەوە کوشتو، کوشتاری لێکردن، بەلام چارەی نەما لەبەرانبەر داخووازەکانی ئەوان سەری دانوواندو، تەسلیم بوو، وەئەوەش بووبەمەبەستی شکانیوی، ئینجا عوسمانیکانیش بەسەرخاکی کوردستاندا زاڵبوون.

مێژوو نووسەکانی تر وەکوو "اگلیتۆن" گوتویانە کە ئەمیر بەدرخانلە حەقیقەتدا ویستویەتی کە هەستی نەتەوایەتی کورد بەتەواوی بناسێنی، بەلام بە داخەوە زۆر بەباشی و خێرائی بوی بەجێ نەهاتو، بەئاواتی خوی کە وەدەستخستنی مافی سەربەستی گشتی لەکوردستان بوو، نەگەیشت، پێلە

ڕووناکبیرو، پلەی سەرەوەی کوردی ئەڕۆ، لەسەر ئەوڕاوتە دبیرەن کە خەباتی ئەمیر بەدرخان لەکوردایەتیدا، خەباتێکی دەربەگایەتیو، فئوداڵی بووە، ئەگینە ئەو حکومەتە نەدەبایە بەو زووانە ڕووخابایە، ئەگەر فەلەو چوتیارەکان بەچاکی لەگەلی بـان، دەوامی پتر دەبوو!

ئینجا هەر چونێکبێ، ئەمیربەدرخان مرۆڤیکی ناوداری مێژووئی کوردە کە بۆکوردستان لەسەدەی ۱۹ دا خەباتی کردوە وە دەوڵەتی پێک هێناوە.

ئەوەی کەلەمێژوو نووسەکان وە هەروەها مێژووناسەکان وە دەر کەوتووە، ئـەویە کە ئەمیر بەدرخان لە مێژوودا بۆ کوردستان چەرخیکی زێڕینی کوردی بەهەستهێناوە.

دسەڵاتی ئەمیربەدرخان وابووە کە فەرمانی وی تەواوی ناوچـــەی کوردستانی داگر تووە، واتە لە وەڵاتی فارسەوە تاکوو "تیگر" ئەو دەسەڵاتە کاریگەر بووە، بەڕاستی ئەوکاتە لەمێژوودا بەچاکی لەبەر چاوە، وەوون‌نابێ، وەکوردەکان بەهۆی ئەوەیە کە پێی دەڵێن دەورەی، "چەرخەزێڕینە" وەشانازی پێوەدەکەن.

تووانائیو، بەکاری و مشووری ئەمیر بەدرخان، وەئاکاروکردە وەی بە چەشنێکلە مێژوو دا ڕوون بوتەوە وە دیارە کە پیاوناتووانی چاوی بقوچێنێ ولیێ ڕا برێ.

بەڕاستی پاش‌هەشتا سال دووائی ئەمیربەدرخان کامیک لە کە سانی وی، لەکوڕ ەکان تووانیوە وەکئەو بۆ جوتیار و فەلەکانو، نەجیب زادەکان‌بەکەلکبن وەیان بۆ کوردەکان بەچەشنی وی دلسوز بن، ئەگەر تووانی بانایە وەکئەمیر بەدرخان حکومت‌بکەن، ئیتر نێوی کوردستان وەمافی خەلکی کورد هەردەماوە و، نەدەکووژاوە!

ئەمیر بەدرخان هەوەڵین پیاوێکبووە کە تووانیوێتی گەلی کورد وەبەر چاوان بخاتەوە، گەشەی پێ بداتەوە، لەبەرچاوی ئوروپایەکان ئەمیر بەدرخان لە قودرەتو، تووانائی خۆی کەلک وەردەگرت، بەلام دوومەسەلە بوو بەهۆی ئەوە کە لەقودڕەت‌بکەوێ وە کوردستان تائەوڕۆ نەی توانی بێ ڕۆژلەهەلاتـــی ناوەڕاستدا هەستی هەبێ، یەکیان مەسەلەی نەستوریکان بوو کەنەی تووانی جێ بەجێیبکات، چوونکە هێندێ لەدەولەتانی ئوروپائی لایەن گری مەسیحیکان

بوون ، دووهەم مە سەلەی نەفت ، بۆی بەرهەڵستێکی گەورە بوو ا

ویلیام ئێ گلێ تۆن لەئاکاما ئاوا لەومەسەلەیەکە ڵک وەردەگرێ ، ئەومێژوو نووسەی ئینگلیسی کە بەسەرها تەکەی کۆماری مهابادی نووسیوە ، وەبە ووردی بە دووای مەسەلە کەدا ڕۆیشتووە لە ئاخری پەرتوکە کەی خۆیدا دەڵێ : شۆڕشی سالی ١٣٢٤ بەڕا بەرایەتی قازی مەحەممەد کە کوماری بچووکی کوردی پێک هێناوە ساڵێک بەردە و ام بوو ، ڕابردو ، تێکچوو ، ئینجا ئەوبزوتنەوەیە دروستسەدسال پاش حکومەتی ئەمیر بەدرخان بووە ، وە بەشوێنی ئەوەدا مەلامستەفاش لەسالی ١٩٧٥ دا تووشی ئەوشکانە بوو ، وەڕا پەڕینەکەی کوژاوە ، ئیتر . . .

## ٢ ــ شێخ عووبەی دیل لای شەمزینان (شەمونیان)

پاش ئەوەی کە ئەمیر بەدرخان لەسەر کار لابرادرا وەلە وڵات دوور خراوە ، حکومەتی تورکلە دووریگاوە دەیەویستبەسەر وڵاتی کوردستاندا زاڵ بێت ، هەوەڵین مەبەستی ئەوە بووکە لەخزم و قدومە کانی ئەمیر بەدرخان کەسێکبە جێ نشین هەڵ بژێرێ ، بەلام نەی تووانی ئەوکارە بکات ، دووهەم "بابی عالی" دەیەویست و لاتی پان و ، بەرینی کوردستان بەچەشنێکئیدارە بکاتوە سازمانێکدا مەزرینی کە بەتالائی ڕا میاری وئابوری و لاتە فئوداڵە کوردەکان پڕ کاتەوە .

ئینجا پاشئەمیر بەدرخان چەرخێکی پرلە ئاژاوەو ، پشێوی بەسەر وڵاتی کوردستاندا هات ، کەلە مەجموعدا دەبوو ، دەورەیەکی تازەوەدیبێت "گەورەکان" واتە "شێخەکان" کە لە کوردستان دا پیاوانی مەزهەبی ئائینی بوون وە نفوزێکی ئائینی باشیان لە نێو خەلکدا هەبوو ، وای نیشان دەدا بە نەبوونی شازادەکان و ، ئەمیرەکوردەکان ، خۆیان بنوێنن ، لەمەودای نیوسەدەدا ، لەبەر چاوی خەڵکی کورد ئەو پیاوە مەزەبیانە نەخشێکی گریگیان دەگێڕا ، بێگومان ووتارو ، کردەوەی ئەو پیاوە مەزهەبیانە دەی تووانی لەووەختە ناسکەدا لەسەرنەتەوەی کورد ئەسەرێکی قووڵ دابنێ .

ئینجا یەکێکە لەهەمووان قسەی زیاتر دەڕۆیشت ، شێخ عوبەی دیل لای شەم زینان یاشەم دینان بووە کە لەلایەن خەلکەوە لە حوڕمەتێکی تایبەتی کەڵکی وەردە گرت .

شێخ عوبەی دیل لای شەم زینان، لەبنەماڵەی شێخ عەبدول قادری گەیلانیە (١١٦٦ ـ ١٠٧٨) کە قادری سەر سلسلەی دانیە نەری سوفیا یەتی لەکوردستاندایەوەبەسلسلەی قادری نێودەبردرێ .

شێخ عوبەی دیل لا لەسالی ١٨٣٠ی زایینیدا لە دا یک بووە، پاش ئەوەی کە ڕابەرا یەتی ئەو سلسلەی بەدەستەوەگرتسەرئەنجام بەوریبازەگەیشتکە نەخشی مەزهەبی خۆی لەگەل نەخشی سیاسی تێکەڵ کاتەوە، وەبە کاروکردەوەی کوردستان ڕا بگات .

دەگونجێ بڵێن کە قەومی کورد بە چەشنێکئیمانی بەو سەرۆکە مەزهەبیە هەبوو کە پێی وابوو خودا ئەوپیاوەی بە تایبەت بۆڕزگارکردنی وۆلاتە کە ناردۆ، بەراستی هەربەوجۆرەشبوو، کوردەکان دەستورو، فەرمانی شێخ عوبەی دیل لایان بەگیانو، دلەوە بە جێ دەگەیاندو لەپێناوی ئەمری وی داسەروگیانیان فیدا دەکرد ؛ ئەو مرۆڤە مەزنە لەناوچەی شمالی ڕۆژهەلاتی (شەرقی)کوردستاندا دەسەڵاتێکی زۆری پەیدا کرد، لەوناوچەیەشدا تاو.لاتی دوورو، نێزیک بە مەڵبەندی بارزان کەسێک نەبووکە هەوتای بێ. . . . . ، شێخ لەقووڵائی دلەوە ئەوەی دەزانی کە تەنیا بەدبەختی وچارە ڕەشی کوردەکان ئەوەیە کە وڵاتیان یەک پارچە نیە وە دووبەشکراوە، وە تاو لاتە داگیر کراوەکانی تورک، ئێران نەکاتە یەک ناتوانێ بە ئاواتی خۆی کە گەیشتن بە مافی گشی نەتەوایەتیە بگات[٩]

کاتی شەڕی ڕووسیەی تزاری و عوسمانێکان لەسالی ١٨٧٨ ـ ١٨٧٧ دا لەبەر ئەوەی کە تورکەکان موسوڵمان بوون لایەن گری لێ کردن وەقازانجی کوردەکانیشلەوەی دادەدیت، بەلام بە داخەوە کەلکی لەوکارەوەرنەگرت وەلە ڕووسەکانشکا ، ماوەیەکخانەنشینبوو، بەڵام وازی لەبزوتنەوەی کوردنە هێنا ، وە زۆر زوو "ڕابەرایەتی نەتەوەیکوردی بەدەستەوە گرتەوە، وەخۆی نیشان داوە، وەخەباتی دەستپێ کردەوە. ١٠ ـ ١١

لەبەیانیەیەکدا واتە لەمانی فیستێکدا کە شێخ عوبەی دیل لابڵاوی کردەوە، نەتەوایەتی کوردی بۆ هەوەڵین جارباسکردوەبەولاتانی ڕۆژئاوا حاڵی

کرد کە کوردەکان چ لەئێران داوە چ لەو لاتی تورک دابن پێویستە ئاکاروکردەوەی خۆیان بە دەست خۆیان بێوە مافی سەر بەستی نەتەوایەتیان بۆ دیاری بکرێ.
بە دەوڵەتە ئوروپایەکانی ڕاگەیاندوبوو کە پێویستە بۆوکارە سرنج بدەنی وە وازی قەومی کورد بە چاکی بزانەن، کورد دەیەوی بو خویان کارەکانیان بە دەستەوە بگرن و بەڕێوەی بەرن. ١٢
بەبڵاوبوونەوەی ئەو بەیان نامەیە شێخ عوبەی دیلا، بەبابی کوردەکان نێو دەبردراوە هەروەها بە ڕابەری نەتەوەی کوردناسرا . . .
ئینجا دو شۆڕشکە لەماوەی سالەکانی ١٨٧٩ و ٨٨٨٠ لەناوچەی بادیبان وە لە مەڵبەندی ئێران دا قەوما، سەرئەنجامی بە شکستکێشا، واتاپاش ئەمیر بەدرخان شتەنانەتلە بەشێکلە کوردستان دا، کوردەکان نەیان توانی دەوڵەتێکبۆخویان پێکبێنن، هەرچەند شێخ عوبەیدیل لاسەرزەمینێکی زۆری لەناوچەی کوردستاندا داگیر کرد، وەهەتا مەلبەندی میاندواو، ئەولاترش چوو، بەڵام پەلاماری هێزی ئێران وە دووژمنایەتی هێندێ لە کوردەکان لەو ڕاپەڕینەدا، وە کاروکردەوەی ئە وان بە قازانجی دەولەت، نەی توانی کارێک بکات.
دەوڵەتە زۆر دارەکانی ئوڕوپا، بە تایبەت دەوڵەتی ئینگلیس کە قازانجیان لەوکارانەدا دەدیت، وازیان لە کوردەکان هێنابوو، وەلایەن گری ئێران بوون، وە هەروەها دەوڵەتی فەرانسەش دەیەویست بەهاوکاری دەوڵەتی بریتانیای گەورە، لەونا وچەیەدا کارەساتێک بەسەر تورکەکان بێنن، ئینجا دەوڵەتیئەمریکاشپێی لەناوچەکەدا کراوە، وە بۆ ئەوەی کە دەوڵەتی ئێرانش لەوبابەتەوە خاترجەم بکاتلە سالی ١٨٨٢ کاتی سیاسیو، دیپلوماتیکی خۆی لەومەلبەندەدا پتەوترکرد.
هەوەڵێن ئاسەوارێکی کە سودو، قازانجی ئێرانیکانی لێوە دیاز کەوت، ئەوەبوو کە لەومەڵبەندەدا، سەرکەوتنی ئەوانی لێ بەدی هات . . . . ١٣
پاش چل سال دوورکەوتنە، شیخ عوبەی دیلا لەسالی ١٨٨٣ لەشاری مەکە کوچی دووای کرد. کوڕەکەی شێخ عەبدول قادر، وەنەوەکەی سەید تاها، توانیان نەخشێکی گەورە لە ڕا پەڕینی کوردەکان دا بەڕێوە بەرن، وە لەئاکام دا ئەو بزوتنەوانەش مەبەست بەکاروکردەوەو، نفوذی گەورەی شێخ عوبەی دیل لابوو کە لەنێو کوردەکان دا ئەسەرێکی قوڵی دانا بوو.

## ٣ـ دانانی کانگای کوری زانیاری کورد (کلوپ)

هەرلەوکاتەو، دەورەدا، یانی لەهەوەڵین ڕۆژەکانی سـەدەی ٢٠، پاش‌ئەوەی کە پەنجا سال بزوتنەوەکان درێژەی هەبوو، وەهەروەها کە لەئاکاما بوورژوا گەورەکان، وە شازادەنەدارەکان دهاتن کە کاریان تەواوبێ، چینەکانی نیۆنجی، کورد، سەربلند دەکەن.

ئینجا ئەوجار پێویست‌بوو، کە لەڕێگایەکی دیکەوە خەبات‌بۆ بزوتنەوە دەست‌پێ بکرێ، سەروکە کوردەکان و، گەورەکان ئەوکەڕەت بۆ درێژەپێ دانی خەباتی کوردایەتی لەڕێگای ڕا میاریێوە دست بە کار بوون.

مەبەست بەمەلەسالی ١٩٠٨ دا بۆ دامەزرداندنی سازمانی سیاسی کورد قۆڵیان هەڵ کرد.

لەسالی ١٨٧٨ دا میدەحەت‌بەک بەدرخان لەشاری قاهرە هەوە ڵین ڕۆژنامەی کوردی بەنێوی کوردستان بڵاو کردەوە، لەوڕۆژنامەیەداچەشنی ژیان وئاکارو کردەوەی کوردەکانی تورکیەی دەنووسی وە زۆر بە گرنکی لەکاروباری سیاسی تورکەکان ڕخنەی دەگرت.

پاش میدحەت بەگ یەکێک‌لەبراکانی‌بەنێوی‌عەبدورەحمان‌بەدرخان‌لەشاری ژنو، وە لەشاری فول گی ستون دووائی‌ئەوروژنامەیەی گرت‌و لە چاپی داوە تا سالی ١٨٩٢ درێژەی پی‌دا.

لەکاتی شەری جیهانی هـ وەڵدا، ڕۆژنامەی کوردستان لەشاری قاهرە بەسەر نووسەرایەتی سووڕەییا بەدرخان کوڕی ئەمین عەلی‌بەدرخان‌لەژێر چاپ‌وە دەردەکەوت.

لەسالی ١٨٨٩ کۆڕێکی سیاسی تورک بە نێوی "کمیتەی یەکەتی‌و، تەررەقی خووازی "لەشاری قووس تەن تەنیە پێک‌هات کە دووئەندامی کورد وە دووئەندامی تورک بوو، ئەندامە کوردەکان یەکیان نێوی ئیسحاق سووکوتی وە ئەوی دیکەش عەبدول لاسیودەت‌بوو،[١٤] هاوڕێ لە گەڵ دەرچوونی ئەو روژنامە و، دانانی کۆڕە زانیارەکان، هێندێ لە کوردە ڕووناک بیرەکان، بەچەشن

وئاکاری تازه وه، بەنێوی "رێفورمیست" وه " مۆدێرنیست" زۆر بە گەرم وگوڕه وه‌ دەستیان بەکارکرد؛ لەنێو ئەو تاقمە ڕووناک بیرەدا؛ عەبدول قادری کوڕی شێخ کەدژی سولتان له ١٨٩٦ دا له پیلانیک‌دا هاوکاری‌کردبوو،وودووسەرۆکی کوردی دیکەش لەسالی ١٩٠٢ زایینی‌دا لەهەوەڵەوه لەو کوڕانه دانەخشیان بە جۆرێکی دیکەهەبوو وەنیویان عەبدوورەحمان بەدرخان وەحیکمەت بابان بوو، ئەوانیش‌لەهەوەڵین کنگرەی (کمیتەی یەکەتی‌و، تەرەقی خوازی) دا لەشاری پاریس‌هاوبەشیان بووه.

بەشوێنـــی ئەوا بـــردنی دەســال لەسازمانـــی کـــوردو تورکــه ناسیونالیستـــەکـــان، بزوتنــەوەی (گــەنجــەکانــی تـــورک) پێک‌هات. (١٩٠٨)

دەگوترێ کە کۆبوونەوەو، پێ گەیشتنی ئەو تاقمانە کە شۆڕشگێڕ بوون، وه لەژێر چاوەوێری دا لەسالی ١٨٧٦ وه‌ده بزوتنەوه، گەنجەکانی تورک بەو ئاکارە‌ درێژەیان پێ دەدا لەقوس تەن تەنیەهاورێ لەگەل ئەودەستانه هەوەڵین سازمانی ئەوا میاری کورد بەهەست‌هات.

سەرئەنجام: ئەمین عەلی بەدرخان، عەبدول قادری شەمزینان، شەریف‌پاشا، وه ئەحمەد زوولفیک‌پاشا لەسالی ١٩٥٨ دا کۆڕێکیان بە نێوی "کوردستان تەعالی وه تەررەقی جەمعییەتی" واتە "کوردستانی سەربەرزو، کوری ڕووناک‌بیران "دانا، وەهەروەها کۆڕێکی دیکەش‌بە نێوی: "کوردنه شری معاریف جەمعییەتی" یانی "کۆڕی چاپەمەنی، زانیاری کورد" کە بۆ زانیاری و، ئاگاداری خەڵکی کورد لەڕێگای علم‌وزانستەوه هەولی دەدا، پێک‌هات، ئەو کۆڕە لەشاری ئەستانبول لەگەرەکی خان وێرلی تاج مەدرەسەیەکی بە زمانی کوردی دانا.

لەخەزەل وەری ١٩٥٨ لە کانگای کۆڕی ئەمین عەلی بەدرخان ڕۆژنامە یەک بەنێوی: "کوردتە عاون وەتەررەقی گازێتـــی" واته: "روژنامەی یارمەتی و، پیش کەوتنی کورد " بەدەستی ئەوئەندا مانه، ئیسماعیل حکی بابان‌زاده، سعید کوردی، وه عەبدول قادری شەم زینان لەچاپ‌هاته دەری، ئەوڕۆژنامەیه

لەبارەی، زمان و، تەممەدن و، ئەدەب و تەعلیم وتەربیەتی کـــوردی وه دەولەمەندکردنی زمانی کوردی بە فۆلکلۆر و، ئەدەبیاتی ڕاستە قینەی کورد،

ووتاری دەنووسی وە پەرتوکی کوردیشی چاپدەکرد ، وەخزمەتێکی گەورەی بەخەلکی کوردی ناوچەکەکرد .

ئینجا ئەو روژنامەیە ، هێندێ شتــی لەبنەوە دژی ئەدەبیاتی تورکەکان دەنووسی وە زوٚر بە شێنەیو ، ووریایانە خەباتی قەلەمی دەستپێ کرد بوو ، وەزوٚر بە ووردیوٚە ئاگایان لەوە بوو کە لەلایەن عوسمانیێکان ڕخنەیان لێ نەگیرێ ، ووتارەکەی ئەوەبووکە دەی نووسی کە زمانی تورکی ئیتر قازانجیکی بوٚ خەلکی کوردی خوێندەوارنیە ، وەهەروەها ، توودەی خەلکش ناتووانێ کەلکی لێ وەرگرێ وە منا لان بەوزمانە هیچ فێرنابن .

ئینجا پێویستە فەرهەنگی ئابوری و ، کوٚمەلایەتی کوردیدا بندرێ ، وە لەگوندەکانی کوردستان بەزمانی زگماکی بخوێندرێ وەدەبێ پشتی ئەوکارە بگیرێ و ، بەردەوام بێت ، بەشوێنی ئەوە دا کوڕی زانیاری لەبەغداو ، موسل و ، دیاربەکر ، مەدرەسەیان بەزمانی کوردی کردەوە ، بە لام لەسەرئەوەشڕا گانگای گەورە ، وەنیوە رووکەو ئاورگی نەتەوە پەرستە کان شاری قوسیتەن تەنیە بوو .

لەئاکاما کانگای ناوەندی تووانی لەگەل ٣٠/٠٠٠ مروٚڤ ، هات و چوٚ بەرقەرا ربکات ، کەبەشی پتری ئەوئەندا مانە لەکوردەنەدارەکان و ، هەژارەکان بوون ، ئەوەش مەبەستێکی تیدا بووە بەلامدوودەستەلە کوردەکان نەیان تووانی لەگەل ئەو کوڕوکانگایە هاوکاری بکەن ، لەوانە دەستەیەک بوون کــە عوسمانیێکان ئەوانیان بوٚ شارەکانی قاهرە ، کریتدوورخستبوٚوە واتە تەبعید کرابوون ، تاقمێک کوردی دیکەش ڕەگە زیان گورابوو ، وە ببوونە تورک وە لەو لاتی تورک ڕا نەدەگەڕا نەوەو ولاتی کوردوە لەمەجموعدا هاتوچوٚشیان بڕا بوو .

### ٤ ـ شەجەرەی بەدرخان

ئەولادی ئەمیر بەدرخانزوٚربوون ،وەبەچاکینەزاندراوە کە ژمارەیان چەند بووە ، (ماژورنوئیل) گوتویەتی کە ٩٠ کوڕی هەبووە ، (کونسول تروتە) دەلێ کە ٤٠ کوڕو ، ١٤ کچی هەبووە و هەروەهاگوترا وەکە ٦٥ کوڕی هەبووە .

ئەمیر کامران بەدرخان نەوەی (پادشای کوردستان) شبە باشی نازانێ ، کەکوڕو ، کچەکان چەندن ، تەنیا ئەویش لەباب و باپیری خوٚی بیستووە کە گوتویانە

٩٩ مندالّی هەبووە . . . . . بەڵام ئەوەی کە جێگای خاترجەمی یە ، یانی کاتێک کە بەدرخان کۆچی دووائی کردوە ، ٢١ کوڕوە ٢١ کچی هەبووە . . . . . . وە منش ١٥ و ١٦ مام وپورم دەناسم . "١٥ جابەهەرچونێک‌بێ ، ئەوەی کە بە چاکی زاندراوە ، ١٢ مرۆڤ‌لەکوڕەکان وەنەوەکانیان نەخشێکی گەورەیان لەڕا پەڕینی نەتەوایەتی کوردان داهەبووە ، وە بریتی بوون لە :

ـ عوسمان وەحسنی (شورشی ١٨٧٩) یانێ‌ڕا بەرایەتی کردوە ، حسین سەر ئەنجام لەسالی ١٩١٠ دالەدار دراوە .

ـ میدحەت بەگ ، خاوەنی ڕۆژنامەی کوردستان (شۆڕشی ١٨٨٩)

ـ کامیل بەدرخان کە لەگەڵ ڕووسەکان نێوانی بووە ، وەلەسالی ١٩١٧ والی ئەرزەڕوم بووە ، وە لەپاشان لە تفلیس ژیاوە .

ـ خەلیل کەوالی واتە ئوستانداری شاری مالاتیا بووە .

ـ حسن بە درخان و ، حسین بەدرخان هەردوکیان لەهەڵ بژاردنی نێونە رایەتی سال ١٩١٠ دا هاوبەشیان کردوە ، وە بەنوێنەری کوردستان هەڵ بژێردراون ، بەڵام کە حسین زیندانی‌کرا ، براکەی حسن پاش‌ئەوەی کە ماوەی ٦ مانگان خۆی شاردەوە ، سەرئەنجام گیرا ، ولەبەندیخانەکرا وزۆریان شکەنجەدا وە لە ئاخردا کەڕبوو .

ـ عەبدوررەحمان پاش میدحەت بووبە سەرۆکی کوردستان .

ـ بەحری لەبزوتنەوەی شیخ عوبەی دیل لادا بەشەا ری هەبووە .

ـ ئەمین عەلی (١٩٢٦ ـ ١٨٥١) کە قازی بوو ، وە یەکێک لەئەندا مانی دامەزرێنیری کلوپی کوردستان لە سالی ١٩٠٨ دابوو .

## نەوەکانی

عەبدوررەزاق کوڕی نەجیب‌پاشا کە یەکێک‌لە کوڕەکانی ئەمیر بەدرخانە ، کە حاکمی شاری قوستەن تەنیەی لەبەربەرەکانیک‌دا کوشتووە ، ئینجا لەگەڵ تەواوی خانەوادەکەی دوورخرا وەتەوە ، وەپاشان پەنای بۆڕووسیە بردوەوەلەوێ بۆتە ئەفسەری دەرباری تزاری وەسەرئەنجام لەموسل لە سالی ١٩١٨ دا لە داردرا .

**ـ کوڕەکانی ئەمین عەلی :**

ـ سووڕەیا (١٩٣٨ ـ ١٨٨٣)
ـ جەلادەت (١٩٥١ ـ ١٨٩٣)
ـ کامران (١٩٧٨ ـ ١٨٩٥)

لەگەڵ بەدرخان، شەجەرەی سۆران، بابانەکان، وەشەجەرەی شێخ عوبەی دیل لاواتە عەبدوول قادر، وەسەید تاهای شەمزینان وە دوونەسلی ئەسلی کورد، شەریف‌پاشاو، مستەفا پاشا، وە چەندخانەوادەی سەر شناسی دیار بەکر، هەمووی ئەوانە کە لەسەرۆکەکانی بزوتنەوەی کوردستان بوون وە نەخشیکی گرنگیان لە راپەرینەکەدا بووە.

لەمانگی ئاوریل‌ی ١٩٠٩ دا پارتیزا نەکانی سوڵتان دژی شۆڕش هەڵستان وە لەگەڵ سەرۆکە کوردەکان‌ی میللی هاوبەشیان کرد، بە لام دژی شۆڕش لەلای تورکە گەنجەکان لایەن گری لی نەکرا وە لەئاکاما تەواوی کلوپ و کۆڕەزانیاریێکان‌و، مەدرەسەکان‌ی کوردیان بەستن.

ئەمین عەلی بەدرخان‌وە شەریف‌پاشا بە مەرگ مەحکوم کران، بەلام تووانیان‌کە هەڵین، سووڕەیا بەدرخان کە هاتبۆ شاری قاهرە، دەستی بە چاپ‌کردنی ڕۆژنامەی کوردستان کرد، ئەمما دووبارە لەوی دوورخراوە.

لەسالی ١٩١٠ دوو دانشجوی مەدرەسەی کشت و کاڵ‌ی هەڵ کەڵی کە نیۆیان خەلیل خەیالی موکتی عومەر، وە خەدری بەگ جەمیل پاشازادە، بوون، لەگەل فووئادتومولە لەشاری وان وە زەکی ئەفەندی لە شاری دیار بەکـــــر کۆبوونەوەیەکیان بەنیۆی (کۆڕی پلەی سەرکەوتوو) پێک‌هێنا، کە ئەوکۆبوونەوەیە بوو هۆی دروست‌بوونی (هیوی) وەلە پاشان لەشاری موسل بە نیوی "هیوا" ناسرا، ئەوکۆمەلەیە تا پێش شەڕی هەوەڵی جیهانی پەردەوام بـــــوو، وە ڕۆژنامەیەکی بەنیۆی ڕۆژی‌کورد وە دەردەخست، ڕۆژنامەی سووەم بە نیۆی ژین لەلایان مەمدوح سالم (دەبیری کل‌ی کورد) وە کامل فەوزی بەگ (لەدیاربەکر لە سالی ١٩٢٥ لە دار درا) وە حەمزە ئەفنە ندی، بلاودەبووە.

لەسالی ١٩١٢لە بەینی تورکە گەنجەکان وکوردە نەتەوە پەرستەکان ئاشتبوونە وەیەک پێکهات‌وە لە شاری بۆتان ئاژاوەیەک سازبوو، لەوشۆڕشەدا سولەیمان بەدرخان بەدەستی پولیس‌کوژرا.

لەسالی ١٩١٣ دا ئەنوەر پاشای دیکتاتور، فشاری بۆ خەڵک‌پترکرد، شەڕی هەوەڵی جیهانی دەستی پێ‌کرا، و ڵات‌لەلایەن دەوڵەتە گەورەکـــان داگیرکرا، وە هەروەها خاکی کوردستانش‌لەلایەن دەوڵەتی فەرانسە وئینگلیس‌گیرا.

لەمێژووی کورد دا ئینجا بۆ هەوەڵین کەڕەت، سەروکە کوردەکان، ڕاوتەدبیریان هێناسەرەوەی کە لەڕێگای دیپلوماسیەوە بۆ کوردەکان تێ بکۆشن و، هەوڵ بدەن: ئیمپراتوری عوسمانی دەهات لە شەڕدابشکێ، کوردەکان هەوڵیان دەدا کە لەکنفرانسی ئاشتی خووازی پاریس‌دا پاش‌تەواوی بوونی شەڕ بەشداری بکەن وە دەنگی خۆیان بۆ وەرگرتنی مافەکەیان دەربڕن، دەشیان تووانی لەشاری قووس تەن تەنیە دا لەگەل قودرەتەگەورەکان لەوبارە وە بەووت‌و، وێژ دابینیشن بەڵام هێستا نێوی کورد زۆر لە سەرزاران نەبوو.

ویلسون سەرکۆماری ئەمریکا وەدەولەتەخاوەن قودرەتەکانی دیکەکە لەشەڕ دا پیرۆز ببون دەیانەویست بەنەتەوە بچووکەکان مافی سەربەستی بدەن‌وە، هەروەها مەسەلەی کوردەکانیش‌لە گۆڕی دابوو، وە مەبەستی وانش‌لە بەر ئەوە بوو کە پێکهاتنی دەولەتانی تازە،سوود وقازانجی وانی زۆر لە بەردایە.

کوردەکان لەوبەینەدا بۆ کوردستان‌ی سەربەست‌هەوڵیان دەدا، بەڵام ئەو کەڕەتەش‌بوونە قووربانی دەستی نەتەوە گەورە ئیمریالیستەکان کە لەشەڕدا پیرۆز ببوون وەبەکەیفی خۆیان و لاتەداگیراوەکانیان‌دا بەشو، دابڕدەکرد، وەدوو دە ولـــە تـــی گەورە وەک ئینگلیس وفەرانسە بەشی زۆریان بۆخویان دانا، وە هێندێ لە دەولەتە ئوروپایەکان وەک ئیتالیـا وە یۆنانیش‌لەو جەمە بەشدار بوون، کوردەکان، بە سووک وهاسانی کڵاویان چۆسەرێ: دەرەبەگەکان واتە فئودالەکان‌ی کورد لەونێوە دا وەک مێوەرۆن لەبەردەستی دەولە تـە خاوەن زور دا را ن دابوون و گالتەیان پێ دەکرا.

## ٥ ـ شەریف پاشا

لەپی تەختی فرانسە لەپاریسدا، پیاوێکی سیاسی و، کۆنی دەوڵەتی عوسمانی کە لە بنەماڵەیەکی کورد بوو، پاشروەستانی شەڕی هەوەڵی جیهانی تووانیۆیتی لە کوبوونەوەی کنگرەی ئاشتی خووازانی جیهانی دا بەشداربێت.

شەریفپاشا لەشاری سوولەیمانیێ لەدا یک بووە، وەلەقووتاب خانەی خواجای بابی لەگەل شێخ مەحمود خوێندویەتی، پاشان کە لە خوێندن تەوابووە، لەکاتێکدا کە بە هیچ کوردێک کاری دەوڵەتیان نەدەدا، بەهەرچەشنێکبووە، لەکاری دەوڵەتیدا لەشاری قووس تەن تەنیە بەشدار بووە،وە لەدەم و، دەزگای دەوڵەتی دا خاوەن جێ و مەقام بووە.

پاش ماوەیەک لە سالی ١٨٩٠ لەلایەن سوڵتان عەبدوول حەمید پادشای عوسمانی کراوەتە بالوێزی عوسمانی لەشاری ستکهلم، جابە و جۆرە ئەوپیاوە لە ڕیزەی پیاوە دیپلوماتەکان بووە وە هەر بەومە بەستەی کە گوتمان خۆی لە کوردایەتی لەنەناسیوی داوە،[١٦] وە بە چەشنێکی نهێنی بۆ قازانجی گەلی کورد هەولیداوە و، تێ کۆشاوە. بەبێ کۆسپوکەند لە قوولائی دڵەوە کاری کردوە، کاتێک کە لەدا مە زراندنی کۆڕی یەکێتی و، تەرەقیخووازی کورد ئاگاداردە بێ لەگەلیان هاتو، چۆ پەیدا دەکات بەڵام لەسەرئەوەی کە شەریفپاشا بۆکارداری باڵوێزی فەرانسە دەنێردرێ، ئەوان دژی ئەوکارە دەبن، ئینجانێوان ناخۆشی لەگەلیان پەیدا دەکات، وە ئەوەها وکات لەگەڵ شۆڕشی ١٩٠٨ دەبێت.

کاتێک کە شەڕ هەل دایسێ وە دەوڵەتی عوسمانی پەیمانی هاوکاری خۆی لەشەری دا لەگەل ئالمان ڕا دەگەێنێ، شەریفپاشا دژی ئەوکارە دەنگی خۆی دەر دەبرێ وە ماوەیەکی زۆر لە مەودای شەڕێ دا لە کۆشکی "مون کیف" لەمونتکارلودا دەمێنێتەوە.

مرۆڤێکی فیۆدال و، پوولدار بووە، وە خۆشی ڕا بووا ردوە: یەکێکلە کوڕە ئەربابەکان لەبارەی وی دادە لێ و، دەنووسێ کە.... ژیان بۆوی سوک وهاسان بوو، خۆش گوزەران و، کە یفخوشبوە وادیارە زۆردەولەمەندو،[١٧]

پوولدارە." ئینگلیسیەکان کە خۆشیان نە ویستووە، لە بـــــارەی وی دا خراپدەگێڕنەوە: تورکەکان ئەوی بە پیاوێکی خۆش لیباس دەناسن، دەڵێن پیاوێکی لە خۆڕازیە .... وە لە سورشتەوە پیاوێکی نەزانەوگێژە! تورکەکانی میانەرەوی سویسدەڵێن کە بەختەوەرێکی گەورە لە چاوە ڕووانی ویدایە، ئینجا لەگەڵ کچێکی دەولە مەندی مسری شای و زەماوەند دەکات. ١٨

پاش ئەوەی کە لەسالی ١٩١٤ دا لە ئنگلیسیەکان نزیک دەبێتە وە، وە کەڵکی لی وەرناگرێ، ئینجا لەسەرڕا لەپێشئەوەی داکە شەڕ خلاسبێ، چەن جاران لێ یان نزیک دەبێتەوە، وە هەروەها لە سالی ١٩١٨ وە لە ٣ ی مانگی ژوئن‌دا لەشاری مارسێی چاوپێ کەوتنی دە بێ وە لەگەل سێرپەرسکاکسکمیسەر کەنیوی کمیسەری بەین ئەننەهرێنی لەسەردەبێ، پێکدەگەن. شەریفپاشا بە چەشنێکی ڕا میاری بە سێرپرس کاکس دەڵێ کە بریتانیای کەبیر لەگەڵ دانی مافی نەتەوایەتی کورد، گومان و تەدبیری یەکە، وەدانی بەسەر داهێناوە، وەکانگای مەرکەزی ئیدارەی کوردستانش (بێ گومان شاری موسل داندراوە) — کە ریگای بەشێکی ئەو ناوچەیە بوفەرانسە تەرخان دەدر ١

بەلام پاشوەستانەوەی شەڕ، لەمودروسڕا(٣١ دی ئوکتوبری ١٩١٨)، شەریفپاشا دێتە وڵاتی سویسوەلەلایەن سەباح ئەددین سەروکی کۆڕی ئازادی خووازەکانی عوسمانی بانگ هێشترا کە بۆچارەسەر کردنی مافی ١٩ گەلەکان لەکنگرەی ئوروپا دا بەشداری بکات وەلە مافی نەتەوا یەتـــــی بەرگری هەبێ. بە راستی کەشەریفپاشا ئەوهەموو هەوڵ و کۆششەی بۆ پێشبردنی کاری کوردەکان کردووە، ئایا کەسێ زانیوە، وەکەلکوقازانجی لی وەردەگرت؟ ٢٠ لەسەرئەوەشڕا شەریفپاشا پێیەکی لە پاریس و، پیەکی لە لەندەن بوو!

لەشاریلەندەن زۆر بەتینەوە، پیش و ازی لیٚ نەکرا، چوونکە مەسەلەی مافی ئۆتۆنۆمی لەبەرچاوی ڕا میاری ئەوان زۆر گرنگ نەبوو، وە دەیان گوت کە نوێنەری کوردەکانە لەوبا بەتەوە کە لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی هاوکاری دەکات وەئەوەش بەمەیلیئینگلیسیەکا نیە، وە لە سەر ئەوەشڕا بە شێک لەخاکی ئیمپرا توری عوسمانی لی دەبێتەوە، وەئینگلیس تەنیا لەگەل لامەرکەزی تەوافقیهەبوو.

ئینجا شەریفپاشا لەگەڕا نەوەکەی دا بۆ پاریس هەوڵی دا کە لەگەڵ

وەزارەتی دەرە وەی فەرانسە لەگەل پیاوەبەرزەکان ووت، و ویژ بکات تا بەلکو مەسەلەی کوردستان لەورێگایە وەجێ بە جێ بێت .

فەرانسە بەگومانی خۆی لەبیروژ ای شەریفپاشای گەیشتبوو، وە دەی گوتکە شەریفپاشا دەیەوێ ببێتە "ئەمیری کوردستان" وەمافی نەتەوایەتی ناخو بۆکورد لەژێر فەرمانی فەرانسەوەرگری. ٢١

بەڕاستی شەریفپاشا بۆ وەرگرتنی مافی نەتەوایەتی کورد لەهیچ ڕێگایەکەوە کۆتائی نەدەکرد، لەولابۆئەولای دەچوو، لەگەل دەولەتەکان ڕاو تەدبیری دەکرد وەمە سە لەیکوردستانی بەگوێ تەواوی بالۆیزەکان وە پیاوانی گەورەی رامیاری وەسەرکومارەکانیدەرەوەرا دە گەیاند .

لەی مانگی فوریەی سالی ۱۹۱۹ دا شەریفپاشا لەگەل کلمانسو سەروکی بەرزی کنفرانسی ئەشتی خووازانی دەولەتەپیرۆزەکان پاششەڕی هەوەلی جیهانی، چاوپێ کەوتنێکی بەڕێوە برد وە ووتوویژی لەبارەی مافینەتەوایەتی گەلی کورد واتە ئۆتۆنۆمیی کی کە ناوچەی دیار بەگر، خارپوت، بیتلیس وموسل وە هەروەها ناوچەی کۆی سەنجاق و، ئورفاشی لەبەردابی ڕا گەیاند .

شەریفپاشا بە ئاشکرائی ڕای گەیاند کە ئەو داوای (تەواوی کوردستان) وە مافەکەی کورد ناکات، بەلکو تەنیا مەبەستی ئەوجێگا یانەیەکە ڕای گەیاندوە، دە نامەسەلەی کورد و کوردستان لە ئەر زە ڕۆم ڕا تاکوردی ئێران شدەگرێتەوە ا

بەلام پاش چەن حەوتێک لە نامەیەکیدا کە بۆ ویلسون، کلمانسو، لوئید ٢٢ جورج وە ئورلاندوی نووسی لەوێدا (بەهەست هێنانی حکومەتێکی مووەقەتی کوردستان ی داوا کردو ، وە مەسە لەی کوردانی وەبیر ئەوان هێنابووە. ٢٣

## دووژمنایەتی دەولەتی فەرانسە

بەلام زۆر زوو دەولەتی فەرانسە دووژمنایەتی خۆی دژی ئاکاری کوردەکان دەربڕی، وە لەدژی دانانی ئەمارەتێکی کورد کە( دەستی ئینگلیس لەوی دابی دەنگی خۆی دەربڕی.

### کات‌و، چلۆنایەتی دەوڵەتی بریتانیای گەورە

بەشوێنی ئەوە دا لە ٢٠ی مانگی مەی ١٩١٩ شەریف‌پاشا بە میرلوئی مالس باڵوێزی بریتانیای گەورە لە پاریس‌دا ڕای گەیاند کە لە بالفورد خۆی بۆ نوێنەرایەتی‌ئەمیری‌کوردستان ئامادە دەکات، وە بە زوویێکی زوو ئەو دا خووازانە لە بریتانیا دەکات ا

بریتانیای گەورە، مافی گشتی نەتەوایەتی کوردستان بناسێ وە (لەوێ دا حکومەتێکی ناوەندی) کە تەواوی مافی سەرۆکەکانی کورد وەمافی سەدسالەی ئەوانی لەبەردابێ، لەچوا رچێوەی کاتی فئودالی داپناسرێ".

ئینجا پیاوەکانی سیاسی بریتانیای گەورەبۆکوردستان بنێردرێ وە وازی ئیداری ئابوری وڕا میاری ونزامی بەیارمەتی ئەوان، وە لە ژێر چاوە دێری ئەوان‌دا، ڕێکوپێک‌بکرێ‌و، گۆڕانێکی باشی تێدا بەکاربردرێ".

شەریف‌پاشا کە لەوهەل بژاردنەدا خۆی بەنێوی .... ئەمیری تەواوی وڵات وەسەرۆکەکانی کوردەقووس تەن تەنیە دانابوو، بەوچەشنە دەیەویست مەسەلەی کوردستان تەواو بکات....

شەریف‌پاشا گوتی کە ئەو مافەی کە بۆ تەواوی عەڕەبەکان لە بەرچاوە دەگرن، دەبێ بۆکوردەکان لەبەر چاو بگیرێ وە تەنانەت‌ئەو انەی کە لە قوس تەن تەنیەش‌دا هەن‌و، دەژین " بەوجورەی کە گوترا بێت. بەڕێوەببردرێ ٢٤

بەلام ئینگلیس نەهاتە ڕێیە...

ئینجا هەربەوچەشنەی کە پاش چەن حەوتووان پیاوێکی ڕا میاری ئیدارەی دەرەوەی ئینگلیس ڕای گەیاندوە گوتی کە "حکومەتی بریتانیای گەورە "لە مانەوەکەی دا لە پاریس، نەی توانی وە کە نەخشی سەرۆکی کوردان بە چاکی لەبارەی مەسەلەی کوردستان دادیاری بکات ا

ئینجا فەرانسەش ئەو بیانوویەی هێنا پێشێ کە شەریف پاشا (تەواوی داوخووازی ئینگلیسێکانی بەڕێوە بردووە بە داخەوە، چارە ڕەشی‌و بەدبەختی شەریف‌پاشا لەوەی دا بوو کە هەموو ئەویان تاوان باڕدەکرد[٢٥] ئینگلیس‌دەی

گوت کە ئەو پیاویکی لایەن گری فەرانسە ویکانە واتە (فرانکۆفیل)

هەرچەند لە مێژوو داشەریف‌پاشا بە مرۆڤیکی سازشکار و خۆ ڕێکخەر ناسراوە وە مێژوو نووسەکان زۆریان بەوە بڕواهەیە بەڵام: ئەگەرئەونەبایە هەرگز دەنگی نەتەوەی کورد لە کنفرانسی ئاشتی خووازانی جیهانی لە پاریس‌دا بە گوێی ڕابەرەکان سەرکومارەکانـــی نەتەوەی دوونیا ،ڕانەدەگەیشت‌بەڕاستی ئەوەش زورجێی باوەڕنیە، ئنگلیسێکان سەرئەنجام لەبارەی ئەو مەبەستە کە شەریف‌پاشا قسەوێژگی تەنیا بێوە نەخشێکی گەورە لە کنفرانس‌دا بەدەستە وەبگرێ، بەرگریان لێ نەدەکرد، لەکاتێک‌دا لە قسەوێژەکانی دیکەی کورد ولەهاتنی‌ئەوان بوفەرانسە بە رگریان کردوە!

ئینجا کە دووتاقمی ڕا میاری شێخ مەحمود (پاشای) کوردستان‌ی خووارو کە لەبێرۆت‌و، دیمەشق‌دا کاریان دەکرد وە لەژێر چاوەدێری کۆڕی بەغدایە دابوون، لەگەڵ کۆڕێکی کە لەشاری قاهرەدا خەریک‌بوون، کاری یەکتریان لەبەرچاونە دەگرت، بەهۆی ئەوە کاری کوردەکان تێکەڵ و پێکەڵ دەبوو، وەئەو و دووبەرەکیە و جیاوازی بەرهەلستیکی گەورە بوو بۆ پێشرەفتی کاری کوردەکان.

لەڕاستە قینەدا شەریف‌پاشا پیاوێکی مەزن‌بوو، وە لەبنە ڕەت‌ڕا لە کاری ڕا میاری دا بەشداری کرد بوو، وە لەگەڵ پیاوەدیپلوماتەکانی ئۆرووپاو ئەمریکا کەهات وچۆیی هەبوو لەکاری خویی دازۆر سەرڕاست‌بو هەڵوێستی ئەوە بووکە جکە لەمەسەلەی مافی کوردەکان، نێوانی کورد، ئەرمەنی شچاک‌بکات تـــا هەردوونەتەوە کە دووژمنایە تیان لە نێوان هەڵ گیرێ ولەتەنشت‌یەک‌دابژین. ئەرمەنیکانیش لە زور بزوتنەوان دا بە شدار ببون وە بۆمافی خویان خەباتیان زورکردبو.

ڕۆژنامەکانی ئۆرووپایە بەشی زیاتریان تەرخان‌دا بەلایەن گری لـــە ئەرمەنێکان وە لەسەرماف وەرگرتن‌ی ئەوان‌زۆری لەسەردەرۆیشتن وە کوردەکانیان لەوبەیبەدا تاوان باردەکرد، ئینجا بۆئەوەی کە دیاری بکرێت‌کە لەڕاستە قینەدا کوردەکان دەیانەوێ لەگەڵ هەرمەنێکان نێوان ناخۆشیان نەمێنێ وەتەنانەت‌لایەن گری وەرگتنی مافەکەیان بوو، شەریف‌پاشا سەرئەنجام کۆڕی هەرمەنێکان کە بەسەروکایەتی بۆغوس نۆبەر بووهێنا وە بەوچەشنە بەڵکەی نیشان‌دا کە ئێمە ناکۆکیمان نیە، بەڵام کەڵکی لەی وەرنەگرت، لەئاکام دا لە ٢٧ی ئاوریل‌ی

١٩٢٠ پاش ئەو هەمووهات‌و چۆوتەقل‌لایە، هەڵ پەسێردراوەئاوات وئامانجەکانی کە بە ڕاستی خەون و خیاڵێک‌بوو وە کە دەیەویست‌ببێتە ئەمیری کوردستان، بەجێ نەگەیشت‌و، پووچ بووە!

## کلۆبی کوردەکانی قوس تەن تەنیە

پاش‌تەواوبوونی شەڕ کلۆبی کوردەکان لەسەرڕا دەستیان بەکار کردەوە، دوو مرۆڤ‌کە لە کوردە نەتەوە پەرستەکانی نێونجی ، لە پێ تەختی عوسمانی خەریکی جووڵانەوە بوون، نوێنەرسەناتور عەبدول قادر کە کوڕی شێخ عوبەی دیل لابوو پاش ئەوەی کە لەسالی ١٨٨٠ زانیـــی دا ئێران بەسەر. بابی‌دا زاڵ‌بوو، یەکێک‌لەوانەبوو، ئەوی‌دی‌ئەمین‌عەلی‌بەدرخان‌بوو کەپاش‌ئەوەی‌کەبراکانی لەنێو چوون وەیان کۆچی دووایان کرد بووبە سەرۆکی بەنێوی شەجەرەی بەدرخان، ئەودووکەسە دەستیان بەدانانی کۆڕی کورد کرد.

ئەودوو مرۆڤە کومەڵی" کوردستان تەعالی جەمعییەتی" واتە( کومەڵی کوردی پلەی سەرووی کوردستان ) یان پیک هێنا.

عەبدوول قادر بە نێوی سەرۆک،ئەمین عەلی بەدرخان بەنێوی نایب سەرۆک، وە ئەندامانی گەورەی دیکە، وەک ڕەمزی بەگی خارپوتی، ئەکرەم بەگی جەمیل پاشازادەی دیار بەکری، نەجمەددین حسینی، مەمدوح سالم، دوکتور شوکری موحەممەد، ئەمین زەکی بەگ، حسین‌ئەمین بەگ، نێونیەری خارپوت، موحەممەد بەگ نوێنەری مالاتیا، سەرهەنگ خەلیل بەگی دەرسیمی، مەحمود نەدیـــم پاشای دوورما، وە ژێ نیرال مستەفا پاشا وە حمید پاشای سولەیمانی، لەوکورە دائە ندام بوون.

زۆریان لەو مرۆڤانە لەدەم و دەزگای ئیمپراتوری عوسمانی‌دا خاوەن‌کاری گرنگ‌بوون، وەیان ئەفسەری پایەبەرزی دەولەتی عوسمانی بوون. سەناتور عەبدول قادر یەکێ لەکاربەدەستانی هەرەنزیکی دەولەت‌بوو وەیەکێ لە ١٣ مرۆڤەکانی حکومەتی داماد فەرید بوو، کە تاڕووخانی حکومەتەکەی لەسالی ١٩١٩ مەی ١٥ ــ ١٤) لەلایەن یونانیکا نەوە وەلەداگیرکردنی سیمرن لەگەڵی هاوکاری کردووە.

سەرهەنگ خەلیل سەرۆک پولیسی شاری قوستەنتەنیەبوو. ئینجا لەماوەی نیوسەدەدا، بەڵکوپتر کوڕەکانی ئەمین عەلی بەدرخان، ئەمیر کامڕان بەدرخان: " پێ پەکیان لەنێو کوردەکاندا بووە، وەپێ یە کیان لە نێو تەشکیلاتی ئیسلامی و، عوسمانی .... وەکاندیدای وەزارەتبوون. ٢٦

سەرئەنجام ئەو کوڕانە زۆر زوو دەستیان بە دانانی کلوبی کورد بە تایبەت لەشارەکانی وەک مالاتیا، ماردەن وە خارپوت و دیار بەکرکرد.

## ٦ ـ بەسەرهاتە تازەکانی کوردە ناسیونالیستەکان

لەناوچەو، مەڵبەندەکانی کوردستان وە هەروەها لە پێ تەختی ئیمپراتوری عوسمانیدا، کوردەنەتەوەپەرستەکان سەبارەت بەئاکارو کردەوەیان، دابەش ببوون، وە دەگوترێ کە لەسی بەسەرهاتی تایبەتدا جووان وەدیار کەوتن:

ـ تاقمیک بەنێوی کانگای (کورد ـ تورک)بوونکە مەبەستوهەڵویستیان بەهەستهێنانی ئیسلامی کردنی گشتی، واتە بەهەستهێنانی پان ئیسلامیسم بوو، کە دژی دەوڵەتی ئینگلیس لەکوردستانی شمال و سەروو دا دەبزوتنەوە وەلایەن گریان لە شۆڕشگێڕەکانی ئەونانچەیە دەکرد وە پیشگیری فەوریان لە پێکهاتنی دەوڵەتیکی هەرمەنی دەکرد، وەهەروەها ئەگەر بێتوو دەولەتیکی کورد لەکوردستانی تورکیەدا بە هەستبێتنەیەڵن بچێتە ژێربالی دەوڵەتەکانی دەرەوە وەیان لەژێر چاوی دەوڵەتە بە قودرەتەکان دابن ا

ـ دوو هەمین کوڕی خەباتگێڕی ڕا میاری بەسەرۆکایەتی نوێبەری مەجلسی سەنابەنێوی عەبدول قادر بوو کە مەسەلەی سەربەستی نەتەوایەتی واتە ئۆتۆنۆمی بۆکوردستان هێنا بۆ پێشێ.

ـ تاقمی سێ هەم، بەسەرۆکایەتی ئەمین عەلیبەدرخان بوو کە داوای مافی سەربەستی گشتی بۆ کوردستان دەکرد، هەوە لینچاوپێ کەوتنو، کۆبوونە لەگەل کوڕە دەوڵەتێکان بوو، وەهەوڵیان دا لەودەرفە تە کەلکوەرگرن، وە کارێک بۆ کوردەکان بکەن.

ـ مستەفا عارفبەگ وەزیری ناوخۆ،وەدۆستی بەدرخان،زۆر زوو ئەو چاوپێ کەوتنەی پێکهێنا کە خەلیل بەگ ببێتە بەحاکمی مالایتا وە هەروەها عەلی

بەدرخانش ببێتە حاکمی شاری دیار بەکر. ٢٧

لەکاتی چاوپێ کەوتن‌و، ووت‌و، وێژەکاندا کوردەکان هەوڵیاندا کە دووائی قسەکانی سالی ١٩١٩ بگرن‌و، درێژەی پێبدەن و، لەو دەرفتەی کە عوسمانی تێدایە کەڵکوەرگرن، بەشی زۆرتری .کۆبونەوەو، هەلستان‌و، دانشتنانە، لەدەفتەری سەرۆک وەزیری عوسمانی پێک دەهێندرا.

ئەندامانی کۆڕی کورد کە لەوگفت‌وگۆیەدا بەشداریان دەکرد بریتی بوون لە: عەبدول قادر، ئەمین عەلی بەدرخان، مراد بەدرخان، مەولان‌زادە ڕفعەت‌و، دووئەندامی ئەفسەری کورد کە نێویان سەرهەنگ ئەمین بەگ‌وە سەرگورد عەونی بەگ‌بوون.

لەلایەن دەولەتی عوسمانیوە ئەوئەندا مانە لەووت‌و، وێژدا بەشداریان دەکرد: حەیدەری زادە، شێخ ئەل ئیسلام بووک پاشا، وەزیری جەنگ‌و، کاروپیشە، وە عەونی پاشا وەزیری مەعدەن.

. عوسمانیکان ڕایان وابوو کە دەبی لە پێشدا یاسایەک لەسەر بنەڕەتی دانانی مافی نەتەوایەتی لە کوردستان دالەژێر چاوەدێری و، فەرمانی تورکیە دابندرێ و بنوسری. وەئینجا مەجلسی تورکیەش ئە ویاسایەبسەلمینی

لەسەرهەلویستی ژێرەوەهەردوو کۆڕەکەپێک‌هاتبوون:

١ ــ حکومەتی ناوخۆی کوردستان، بۆئیدارە کردنەکەی کوردستان، ژاندارم و کاربەدەستەکانی ئیدارەکان لەنێو خۆی دا هەل بژێرێ وەلە سەرئیش و کاریان دابنێ.

٢ ــ بەشی زۆری قازانجی ناوخۆی ناوچەکەبۆ ئاوادان کردنی و ڵات تەرخان بدرێ.

٣ ــ کوردەکان لەڕاوتەدبیری دەرەوەی گشتی و لات دەتوانن ها وبەشی بکەن و چاوە دێر بن، ئەوەشکە ئاشکرایە کە حکومەتی کورد بەشێکە ولەو لاتی ئیمپراتوری عوسمانی وەوەک دەست وباسک وایە بۆ دەولەتی عوسمانی ا

کۆڕە ڕا میارەکانی کورد بەووتارانە بە لێنی یان دابوو، وە پێشوازیان لی کرد بوو، بەلام هێرلەشک‌وگومان دابوون، چونکە پێیان وابوو، پاش‌تەوابوونی شەڕی جیهانی، ئیتر عوسمانی بەچەشنێک شل و کوت‌و، کەلەلاو و کز ببوو، کە نەی‌تووانی داخوازەکانی کوردەکان بەجێ‌بێنێ. هجگەلەوە دەشیان دیت‌کە

تورکەکانیش‌ئەوە وردە وردەدێن لەژێر قسەکانیان دەدەن و پاشەکشەی‌دەکەن مەسەلەکەی لەبیرخویان بەر نەوە. ٢٨

## دمە تەقە لەبەینی کۆڕی کلوبی کورد ، وە حکومەتی تورکیەی عوسمانی

کۆبوونەوەکانی کۆڕی تورک و ،کورد کەبۆڕاپەڕاندنی مەسەلەی کـــورد لەنهێنی‌دا لەگەڵ یەکووت‌و ، وێژیان دەکرد ، وەنەتیجەی لێ نە گیرا ، ئینجا وردە وردە ووت‌و ، وێژەکەئاشکرابوو ، یەک یەکێ لەکاتی ووت‌و ، وێژەکان‌دا تاوان باردەکرد .

بەدووای ئەوە دا تورکەکان لەڕۆژنامەی وەکیت ، داشەڕێکی قەڵەمیان دەس‌پێ کردوە لەهەوەڵەوە کوردەکانیان تاوان بار کرد کە داوای مافـــی گشتی نەتەوایەتی واتە ئیستقلال دەکەن ، وەنایانەوێ ئەرمەنێکان لەومەبەستەدا پیرۆزو ، بەشدا ربن.ئەوەی کە ئاشکرا یەکوردە کان هیچ کاتێک‌ئەودا وا زلەیان نەکردبوو ، وە دەوڵەتی عوسمانیش‌قەت‌دانی بە سەر ئەوەی دانانەدەهێنا ، پەس کەوابوو ، سوور دەزانین کە ئەو داوایە لەوکاتەدا دووژمنایەتی لەگەڵ حکومەتی عوسمانیە ! جاهەرئەوانە دووژمنانی خەڵکی کوردن ! ٢٩

بە شوێنی ئەو ووتارە لەروژنامەی وەکیت‌ی تورکەکان دا ، کوردەکانیش‌لە ڕۆژنامەی ژین‌دا بە وچەشنەوە لامیان داوە :

ئیمە ئەوتاوانە ڕەد دەکێنەوە ، وەبەچاکی تێ دەگەین کەلەوسەردەمەدا کۆڕی ڕا میاری کورد هەرگز نایەوێ حکومەتی تورک ناڕەحەت‌بکات ،دەزانین کە حکومەت‌پاش شەڕی جیهانی تووشی چ نالەباری وچەرمەسەری بووە ، ئێمە نامانەوی چێوتی ودەردی سەری لەسەر حکومەت زیاتربکەین ، بەڵکوتەنیا داوای‌مافی بەشر خووراوی خۆمان دەکەین کەسەدان سالە لەدووای دەگەڕێن کەوەدەستی بخەینەوە ، ئیتر کوێرەوەری وچەرمەسەری بۆکورد بەسە ، کاتێک‌کە کوردەکان داوای مافی خۆیان دەکەن وە دەڵێن کە زوڵمان لیکراوە وە کوردەکان لەدەوڵەت‌دا بەشدارنین ، تەماشاکەن بزانن جگەلەومەبەستانە چی دیکەمان داواکردوە ! ٣٠

حکومەت‌بە کوردەکان دەڵێ شوڕش‌گیــڕن بەهەمووچەشنێک تاوان باریان دەکەن ، ئینجا لە جیاتی وەی کە بۆهیمن‌و ، ئەهوەن کردنەوەی و لات‌تێ بکۆشن

وە لەوڕێگایەوە هەوڵ بدەن، بەڵام بە پێچەوانەی ئەومەبەستە بەرهەڵستدیننە پیشی وەناکۆکی سازدەکەن.

هاوکات لەگەل نووسین وشەری قەلەمی کە تورکەکان لەڕۆژنامە دا هێنا بوویانە پیشی، حکومەت کۆڕێکی بە قسەی خۆی ئازاد لەناو چەکانی کوردستان دا پێک هێناوە دژی مافی سەربەستی گشتی دەنگی خۆیان دەربڕی وەگوتیان کەئەوە دەستی دەرەوەی تێدایە وەکوردەکان بە تین وهان دانی دەوڵەتی دەرموەئەودا وا یە دەکەن. لە ٢٠ ی ژانوییەی ١٩٢٠ دالەتیلیگرامێکدا کە بۆحکومەت لێدرا، مەتنی تۆماریک بوو، لەلایەن سەروکەکانی بتلیس ناردرا، سەرئەنجام وەزیری ناوخۆی تورکیە داوخووازەکانێکی کە لەلایەن پارتی دیموکراتی تورکیەوە داواکرابوو، ڕەدی کردەوە، لەئاکاما پاش ٢٥ سال ئەوهەڵوێستە و مەبەستەو داوایە، لەلایەن دانینەری پارتی دیموکراتی کوردستان لەشاری مهاباد تازەکراوە.

کۆڕی سیاسی کوردستان وەپارتی دیموکراتی کوردستان پێشئەوەی کە قوس تەن تەنیە نێوی هەل گیرێ جارێکی دیکەش لەلایان نەجمئەددین حسینی دەبیری پارت، ئەودا وایەی وەبیر حکومەتی عوسمانی هێناوە، بەلام قوستەن تەنیە ئەوکەرەتلەلایەن مستەفا کە مال داگیرکرا، وەکاری کوردەکان زیاتر گیروگرفتی تێ کەوت.

حکومەتی عوسمانی تائەوجێگایەگەیشتکە هێندێ لەسەروکەکانی کوردی لەبەند کرد، لەوانە یەکیان سەردەبیری ڕۆژنامەی ژین بەنێوی هەمزە بەگبوو کە لەئاخری سالی ١٩١٩ دا بەمەرگمەحکوم بوو، وە تاوانی ئەوەبوو کە لەکۆبوونەوەیەکدا لەماردەنبەشداریکردبووگوتبووی کە"کوردەکاندەبێ خۆیان ڕزگارکەن "سەرۆکەکانیکورد"[٣١] لەوکاتە عاستەمەدا زۆرچاکدەیانزانیکەنابێداوای مافی گشتی نەتەوا یەتی بکەن وە لەوکارەش خۆیان دەپار است! وەلەوەی خاتر جەم ببون کەسەر ئەنجام کنفرانسی ئاشتی خووازان مافی کوردەکان دەسەلمینی و دەیان داتێ وە نایە لێ لەژێر ئالای تورکەکاندا بمێ نێتەوە.

## دژی ئاکاری سیاسی وە بەپێچەوانەی مەیلی تورکەکان ، ڕاپەڕینەکە: یان ئۆتۆنۆمی دەویست ،یان مافی گشتی سەربەستی

بەڵام زۆر زوو سەرۆکە کوردەکان لەدوودڵی هاتنە دەرێ ، شەریف پاشا لەشاری پاریسلە ٢٠ی مانگی نوامبری ١٩١٩ لەگەڵ هاوکارەکانی ، وە نوێنەرەکانی هەرمەنی وەبەتایبەت لەگەل سەرۆک بۆغوس نۆبار بەپێک هاتنێک گەیشتن .

شەریفپاشا بە بۆغوس نۆباری گوتکە: گەلەکانی کوردو ، هەر مەنی کەهەردوکیان لە ڕەگەزی ئاریان ، پێویستیانە لەتەنشت یەک پێکەوە بژین وە قازانجی شیان لەوەی دایە ، هەردوکخەلکی ئەرمەنی و کورد بۆ وەدەستخستنی ئازادی خەباتیان زۆرکردووە ، وە ئاواتی کۆنیان سەر بەستی وسەربەخۆئی گەلەکەیانە ، جا دەبێ لەوبابەتەوە ، هاوڕێو ، هاوفکر بن ، شەریفپاشا بە بۆغوسنوباری گوت : کە ناوچەو ، سنووری کوردەکان و مەسیحیێکان پێکەوە دیاری دەکەن ، وە بە شوێنی ئەوەدا تەسمیمی خویان بە کون فرانسی ئاشتی خووازائی جیهانی ڕادەگەینن . ٣٢

ووتوویژی ئەو دوو نوێنەرە لەنێو دەولەتەکانی ئوروپاو ئەمریکادا دەنگی داوە ، وە ئەوانیش لەو مەسەلە یەپێشوازیان لێ کرد .

ئەوپێک هاتنە ،وەکبۆمبلە پێ تەختی عوسمانی واتە قوستەن تە نیە دەنگی داوە وە گوتیان ئیتر لەوەی دووا کوردەکان سەربەلای سولتانی عوسمانی واتە خەلیفەی عووسمانیان نین وە بە چاکی دیارە پیک هاتنی بەینی ئەو دوورەقیبە ، دووژمنایەتی لەگەل تورکەکانەوە ئەو کارەی بە خەیانەتدەزانین .

بەشوینی ئەو پێکهاتنەی بۆغوس نۆبارو ، شەریفپاشا ، کوردە کان بوونە دووبەش، هێندێ دەیان گوتکە دەبێ ئایا مافی سەربەستی گشتی واتە ئیستقلال داوا بکرێ یان مافی نەتەوایەتی ناوخۆ؟ یانی ئوتونومی؟ ٣٣

ئالۆزیوفکر کردنەوە لەبینی کوردەکان دا زۆر بوو نەیان دەزانی چبکەن ،

وە" مدعای ئینگلیسکانیش لەگۆڕێدا بوو "لەوهەلو، مەرجە دا نەجمەددین حسینی، نووسەری گشتی پارتی دیموکراتی کوردی تورکیە، نامەیەکی بۆ پیاوە بەرزەکانی حکومەتی ئینگلیس نارد و گوتبووی کە مەسەلەی "مافی سەربەستی گشتی لەناوچەی کوردستاندا بۆکوردان، کارو کردەویەکی تەبیعـــــی و نەتەوایەتیە. . . .

وە پێکهاتنی ئەو مەسەلەیە، بەتەوای ناخوشیکانی ناوچەی ڕۆژ هەڵاتی ئاسیای ناوە راستدووائی پێ دینێ وە هەروەها لەو نامەیەدا زیاتر مەبەستی وی ئەوە بوو کەبەگویی دەوڵەتی ئینگلیس ڕا بگەینی کە داخووازی کوردەکان کە لەکون فرانسی ئاشتی خووازانی جیهانی هاتۆتـە پێشێ ناتووانێ کوردەکان رازی بکات!

کوڕی ئەمین عەلی بەدرخان وە هەروەها چەن کوڕێکی دیکەش لەروژنامەی (بوسفور) دا بە داو خووازەکانی مافی گشتی کوردی گوت کە: " ئێمە سولتانی عوسمانی هەربە خەلیفەدەناسینوەداوای جودائی ناکەین، جا بە هەرچەشنێک بێ، ئێمە دەمێ نینەوەو، لەگەل ئەوان دەبین.

تاقمیکی دیکەی ئۆپۆرتۆنیستواتە خوڕێک خەرپیان وابوو کە ئەگەر خەلکی کورد بە مافەکەی بگات، مەترسی ئەوەیە کە لە ئوروپا دوور کە ویتەوە، یان لەنەکاو تورکەنەتەوەپەرستەکان بگە ڕینەوە سەرئێمە، جاواچاکە بە چەشنـــی ئوتونومی لەژێر ئالای تورکدا بمێ نیینەوە، وەلایەن گری ئەو مەسەلەیەکەم بوون. . . . وەگوتیان کە واباشە ئەومەسەلەیە بچەتەوە بەرچاوەدێری ویلسون.

بۆچی ئیمەنابی مەسەلەی کوردستانینە جەسەوە سەرئەستوی وان؟ دەنا ئەگەر حکومەتی مەرکەزی وەبەتایبەت هێزی نەتەوایەتی نارازی بن؟ ئەو وەختی ئێمە چمان لەدەستدی؟ . . .

مرۆڤیکی کە لێرە دا زۆر تین و، حەرا رەتی لەخۆی نیشان دەدا. . . وە خوڕیک خەرەکان (ئوپورتونیستەکان) ش زۆریان خوش نەدەویست سەناتور عەبدوول قادر بوو!

لەروژنامەی "ئەل ئیقدام" لە ٢٧ فوریبەی ١٩٢٥ دا عەبدوول قادر ووتوویژیکی کردبوو، ووتاریکی نووسی بوو هەولێ دابوو، کە پیکهاتنەکەی شەریفپاشاو، بۆغوس نۆباری چکولەکاتەوە وەگوت بووی کە: "ئیمە لەگەل

تورکەکان لەیەک جیّگاین و، وەبراین، یەکتر مان خۆشدەوی، هەردوکمان موسولمانین، بغزوکینەمان لەنێودانیە! ئیمە دەمانەوێ تەنیا ئازادیّکی خۆمان هەبێ، پیکهاتنی بەینی شەریفپاشا وە بوغوسی نوبارتەنیا لەئاکاما دووژمنایەتی لەگەل تورکەکانە، وە ئەومەبەستەو هەلوێستەی کە ئیمە دەمانەوێ ڕۆژێک بەدەستی بێنین ئەوەنیە!"

وەکوری شێخ عوبەی دیل لای ئاوای لەسەرڕۆیشت: ٣٤

"لەکاتی حازردا پێنج پاشەش ولایەت کورد نشی نن.... کە حکومەت دان بەمافی نەتەوایەتی لەوولایەتانەدا دەنێ وەئێمە لەسەر مانەکە لەو و لاتانەدا (هەوڵ بو ئاوەدانی وگەورەکردنی بدەین) وەپیاوی حقوقی و بەشەرەفوڕاستەقینە هەل بژێرین‌وە هەربەوچەشنەی کە من بەئێوە دلێم، لێرە داڕادە گەێنم کەئیمەدوژ منایەتیمان لەگەل تورکەکان نیە وەئیمە تەنانەتدەمانەوێ لەمافی سەربەستی ناوخۆ (ئوتونومی) کە داوادە کەین، حکومەت یارمەتیمان بدات، وە لەگەلمان بۆدامەزراندنی ئەومافە وە بەڕێوە بردنی،هاوبەشی بکات." ٣٥

پاشچەند ڕوژێکی دی، عەبدوول قادر لەگەل روژنامەی "تەسویری ئیفکیار" ووتو، ویژیکی نویی کرد و ڕای گەیاند: "بەراستی ئەوەکاریکی زۆر هەلەیە کە کورد هەلوێستی بێ لەتورک جودا بێتەوە، ئە من بەبەشی خۆم بەوکارە بەلێنی نادەم، ئایا مرۆڤبەڕاستی نابێ لەو کارانەدا خورد پێتەوەو، ڕاوتەدبیربکات؟

یەکێتی وپەیمان دەتووانێ لەبەینی موسولمانان دامەبەستێکی گەورە بۆپلەی سەرکەوتوو پێک بێنێ وەکوردەکان لە حەقیقەتدا، حوڕمەتێکی تایبەتبۆ خەلیفەی ئیسلام دادەنێن، لەئاکام دامن‌لایەن گری مافی نەتەوایەتی ناوخۆ لە چووار چیۆەی تورکیەدام وەمن لێرەدا بەتەنێ نیم، وە" کمیتەی ئازادی کورد"

ئەوەی پێویستەوەباشدەزانین کە کوردەکان بەمەیلی خۆیان ئەوکمیتەیان داناوە، کاربەدەستەکانی عوسمانی بە درێژائی سالەکاندا لەوبارەداکوتاییان کردوە وزوولمیان لەکوردەکان کردوە، کە مافی نەتەوایەتیان نەداوە"، وەهەروەها عەبدول قادر لەکارەکەی شەریفپاشا رخنەی گرتوگوتی کە کارو کردەوکانی وی (نەتەنیا بە قازانجی کوردەکان نیە، بەلکو بەقازانجی تورکەکانە"، سەرئەنجام ئەوکاروکردەوەیە لەمەجلسی عوسمانیدا دەنگی داوە وئالۆزی بەهەست هێناوە

نۆێنەرەکانی کوردی (سەربەدەولەت) دژی ئاکاری عەبدول قادر، دەنگی خۆیان دەربڕی وە داوای عەزل ولابردنی ویان لە دانشگەی کرد، وەگوتیان کە عەبدول قادر بەسەرزەمین و، نەتەوەو، حکومەت خیانەت دەکات." ٣٦

وەلەسەرەتای مانگی مارسی ١٩٢٠ نوێنەرەکانی ناوچەی کوردستان لەشارەکانی وان ئەرزەڕۆم، ترابوزان، حەکاری، وە با یەزید، داوای لاچوونی عەبدول قادریان لە نونەرا یەتی سەنا کرد!

لەئاکام دا هێندەیان هێرش بۆهێناو، وەڕەزیان کرد کەمەجبور بوولە ١٥ مارس‌دا لەسەرکاری خۆ ی لاچێ.

**٧ ـ نێوان ناخوشی و، دووبەرەکانی لەبزوتنەوەی کورد**

ئەوهەوال‌و، خەبەرانەوەئەوئاکارانەبوونەهۆی‌ئەوەکەکلوبی‌کۆڕی‌کورد قەڵشتی تێکەوێ بە تایبەت‌لە خانەوادەی بابان، دژی سەرۆکی مەجلسی نوێنەران دەنگی خۆیان دەربڕی لەسەرەتای مانگی ئاوریل‌ی ١٩٢٠ عەبدول قادر بەنێوی (ڕابەری کورد)ی قوس تەن تەنیە، یانی بەنێوی‌تاقمێک‌لە دانشتووانی کوردی پێتەخت، ڕای‌گەیاند کە تەنیا من دەتووانم، وە لەخۆم ڕادەبینم کە لەبارەی کاروباری کوردەکان دا بدوێم!

لەلایەکی دیکەشەوە، لاوان و ڕوشن بیرەکانی کورد، کەلەدەوروبەری ئەمین عەلی بەدرخان کۆبببوونەوە، داوایان کردکەعەبدوول‌قادر لەسەروکایەتی کانگای کلوب‌ی کورد لابردرێ! وە لەسەرکاروباری ڕا بەری لاچێ.

سەرئەنجام دووبەرەکایەتی دەهات‌پتر بێ وەدووکۆڕی ناسیونالیست‌ی کورد لە قوس تەن تەنیە دا بە ناوانی (کۆمەڵی کوردی سۆسیال) کەئەمین عەلی بەدرخان لەگەل ممدوح سەلیم‌کە،سی‌کرێتێری ئەوکۆمەڵە بووە ئەوی دی بەنێوی (کۆمەڵی کورد و کوردستان کەلەلایەن عەبدوول قادرە وەبەڕێوەدەبردرا هەستیان هەبوو.

ڕەقیبەکانی سەناتۆر عەبدوول قادر وە بەتایبەت‌ئەندامانی خانەوادەی بەدرخان لەگەل ئەوهەمیشەزۆر بەڕاستی و دووروستی نەدەبزوتنە تەواوی پیاوە دیپلوماتەکانی دەرەوە کە لە گەل عەبدوول قادر تێکەڵاویان هەبوو، ئەویــــان

بەمرۆڤیکی مەزهەبی ناسیوە، وەحورمەتوڕیزیان بودانا وە، جابەوهۆیەوە بووەکە بۆلایویکیشراون، ئەومرۆڤەموسولمانە بەچاوی خەلیفەتەماشای پادشای عوسمانی کردوە، وەلەبەرئەوهەلویستەش بووە کە بۆکوردەکان ئوتونومی داوا کردوە تا هەرلەژیرئالای تورکەکان دابمێ ننەوە بەگومان دەبێ بگوترێ کــەبــەزۆر مەبەستو دەلیلان کوڕی شیخ عوبەی دیلا بەهۆی چاوە دیری ڕا میاری وەحەقی بووە کە بۆمەسەلەی کوردستان بەو چەشنەخۆی مەحدود بکاتو، هەربەوەندەرازی بێت.

لەنیوۆت وویژیکی کە لەبەینی پیاویکی سیاسی پایەبەرزی بریتانیا وە عەبدول قادر لەقوس تەن تەنیەدا کەوەدی هات، عەبدوولقادر ئەوپەندەی کوردی گیڕا بووە: " ئەگەر دووژمنی تو میروو لەیەکیش بێ، نابی پیی لی بخشینی وبیکوژی "وە گوت بووی:[٣٧] لەسەرئەوەش را ئیستا کە سوور دەبینن کە و لاتی تورکیە لەلایەن دەولەتەکانەوە داگیرکراوە، وەلەشەرداشکاون، بەلام نابێ ئیمە ئەوان بە گالتە بگرین وکایەیان پیبکەین. جائەگەر کوردەکان بیتــولەسەرمەسەلەی مافی نەتەوایەتی گشتی بڕۆن، وەهیزی نیزامی نەتووانی وازی وولاتبەچاکی بەریوەبەری، ئیتر تورکەکان مەسەلەی ئاشتی لە گشت دا پیشنیار دەکەن

وادیاربوو دووشتلە بەرچاوی عەبدوول قادر گرنگبوو: مەبەستەکانیکی کە بەشوینی وەرگرتنی ئوتونومی دادیتە پیشی

ــ مافی سەربەستی گشتی ــ وە مەسەلەی یەکیتی کوردەکانبوو.

ئینجا بە پیچەوانەی داخوازی ئەمین عەلی بەدرخان، عەبدوول قادر مافی نەتەوایەتی ناوخویی لەژیر ئالای تورکەکان داپی باشتر بوو، لەکوردستانیکی سەربەستکەبەرەو، بلاوبوون وتەقینەوە برووا !

عەبدوول قادر لەشاری قوس تەن تەنیەدا بەمستر دوروبیک کمیسە ری پایە بەرزی ئینگلیسی ڕاگەیاند کە: "ئەگەر حکومەتی سولتانی عوسمانی بیبەوی کە لەکاتی حازر دامافی سەربەستی گشتی بەکوردستان بداتوە ئەکــارە بەریوەبەری، هیچ کەلک وقازانجی تیدانیە واتە ئەو مەبەستە ناتووانی بەنیوی مافی سەربەستی گشتی بیت.[٣٨]

## ٨ ـ لە "پشتیوانێک" دەگەڕان

پاشسەدەیەک خەباتی چەکدارانە بۆئازادی وسەربەستی نەتەوایەتی گشتی، لەئاکام دا کوردەکان بۆیان وەدیار کەوتکە لەڕێگای نیزامـــــی و، شەڕەوە چییان بۆ ناچێتەسەرێ، جادەستیان بە خەباتلەڕێگای ڕامیاریو، دیپلوماتیکەوە دا وەپێیان وابوو کە ئەگەر پشتیوانێک نەبێ هیچ کارێک ناکرێ سەرۆکەکانی ناسیونالیستی کورد لەخانەدانی بەدرخان بەتایبەتی بۆچارە سەرکردنی مەسەلەیکورد هەولیان دا کەلەگەل ڕا بەرقودرەتمەندەکانی ئوروپائی نزیک بنەوە، وەفکرو ڕای ئەوان بۆلای خویان بکێشن.

ـ وەلەهەوەلەوە بۆلای دەولەتی بریتانیای گەورە چوون، وەیارمەتیان لەوێویست چوونکە ئەودەولەتە خوی بەڕا بەروسەرکردەی ئاسیای کۆن وقەدیم دەزانی وە باشانشدەولەتی فەرانسەبووکە لەڕێزەیقودرەتی دووهەمحساب دەکرا.

هەموو کوردێک دەیزانی و دەی سەلماند کە ئەگەر ئنگلیس بە مەسەلەی کورد ڕازی نەبێتوە بەکۆمەگ ویارمەتی ئەوان نەبێ، ناتووانن سەرکەون، وە کوردستان لەداهاتوودا بەهەستنایە دەیان گوت کە ئێمە بەهەموو جۆرێک حازرین خزمەت بەدەولەتی ئینگلیس بکەین، بەشەرتێک کە وەلاتمان لەژێر چاوەدێری ئەوان دابێ!"

لەوسەرۆکانە کە بەگومانی وی کورد دەیتووانیڕزگاربێ، نەجمەددین حسینی دەبیری کلی پارتی دیموکراتی کورد بوو، کەلەگەل کمیسەری پایە بەرزی ئنگلیس بەووتو، وێژ خەریکبوو! ٣٩

زۆریان لەسەرۆک،وڕابەرەکوردەکان ئەو هەلوێستەیان هەبوو، وەپێیان وابوو کە گرێی کارەکە بەدەستی ئینگلیس یا فەرانسە دەکرێتەوە... وەهەروەها سەناتۆری نوێنەر عەبدوول قادر کە لەسالی ١٩٢٥ زاینی داکۆچی دووائی کرد، لەسەرئەوڕا وتەدبیرەبوو!

ئەمین عەلی بەدرخان لەشاری قوس تەن تەنیەدا، یادداشتو،نـــــا ملکەیەکیدا بەکمیسەری پایەبەرزی فەرانسە وەلەپاش ئەوەی کە نێوەکانی شەجەرەی

خۆی بە دوورو، درێژ نووسی بوو، وەکەسوکاری خانەوادەکەی نێوبرد بوو کە هێندیکیان لەوانە لەرێگای خەباتوڕاپەڕینەکەی کوردستاندا بۆ وەدەستهێنانی مافی سەربەستی گشتی خویان بەختکردوە، بەدووایئەوە دا نوسی بووی کە:
ئێمە لەکوردستاندا لەحورمەتێکی گەورە کەڵکمان وەرگرتووە، وە نفوزمان هەبووە، وە بە تایبەت لەوناوچە نەدا کە ئەوەدێ وەبەر بەشی دەوڵەتی فەرانسەبکەوێ، نفـــوزو، قودڕەتـــی ئیوە کاتێکدەتووانێ کارگەر بێوە بە ئامانجی خویـــی بکاتوە لە ناوچەکەدا بە ئاشتی و، هێمنی دەستپەیدا بکاتکە ئەوان بیبنێتە بەرحەمایەتودەستبەسەردا گرتنی خویی وە لەژێر چاوە دێری ئەوان بێ. ٤٠

لەمانگی ئاوریلی ١٩٢٢ نفوزی بریتانیا کەم بۆوە، وەدەوله تی فەرانسە لە کاتێکدا کە لەگەل نەتەوە پەرستەکانی کەمالی خۆیی ڕێکدەخست، عەبدوول قادر بە سەروک وەزیری فەرانسە، پووان کارێی گوت کە ئەگەر ئێوە بە نهینی لەگەل حکومەتی کە مالی کان بدوێن، وە لەبارەی مافی نەتەوایەتی ناوخوی کوردستان قسەبکەن "ئەمنش بەرا بەری کوردستان دا بندرێم، حازرم کە نوشتارێک بدەم کە نفوزی خۆم بەتەواوی بۆ ودەستهێنانی سووریە بۆ دەوڵەتی فەرانســـە، وەکاربخـــەم" ( لەونامیلکە کە دا نووسی بـــووی کە شتمەکی تجارەتی فەرانسە بە ئازادی لە کوردستان دا بچێتە سەرێ وە ڕەواجی هەبێ[٤١]!

کیامل بەدرخان کە لایەن گری زووسەکان بوو، وەلەشاری تفلیس دا دەژیا، لە مانگی ژانویەی ١٩١٨ دا، بەئینگلیسێکانی پێشنیارکرد کـــە "هەڵایساندنی ئاوریکی گەورە لە سەرتاسەری کوردستان دا واتە لە سنووری ئێران ڕا تادیار بەکر "ئەگەر لەڕووی نەخشەیکی دروستپێکبی وە یەکێتی لەنێودابێ: ئینجا من بو ئیدارەکردنی و لاتی کوردستان حازرم وە قـــوڵ هەڵدەماڵم وە کارەکە بەدەستەوەدەگرم!" ٤٢

لەنێو ئارشیوی ڕا میاری و دیپلوماتیکدا بە درێژائی ساڵە کانەوە، واوەدەردەکەوێ کە تەواوی ڕا بەرەکانی کورد، تەدبیریان ئەوە بووە کە بۆ گەیشتن بە مەسەلەی کورد وە ڕا پەڕاندنی ئەومبەستە، دەبێ یان یارمەتی لە ئینگلیس وەرگیرێ، یان لە فەرانسە: "ئەگەر ئێمە بمانەوی مەسەلەی کوردستان وە گەیشتن بە مافی ناوخو(ئوتونومی)، وەیان گەیشتن بەمافی سەربەستی گشتی (ئیستقلال) کورد حەل کەین، پیویستە دەستوور لەئەوان وەرگیرێ وە ئەوەش نابێتە هۆی

ئەوە کە لەیاساو ، کردەوە لادین !

ئینجا ئەگەر تەواوی ئەو رابەرەکوردانە پێکەوە فکروڕایان یەک بایە، وە لە بیری پادشایەتی و، ڕابەری و، خۆهەڵ کێشان و، لە خۆڕازی بوندا، نەبانایەوە سوبسیدیان نەویستایەوە مەبەستیان ڕزگاری نەتەوەکەبایە، وە هەروەها لەکاروباری کوردستان دا غافل نەبانایە، پیویستبوو لە دەرفەت وهەڵ کەوتکەڵکیان وەرگرتبایە، وەبەکەمەو، زۆر لەگەل دەولەتە زۆردارەکان بە وجێگایەگەیشتبانایە کە سوودی لێ وەردەگیرا، بەگورجی ڕازی بانایە. بەلام نەیان توانی ئەوکارە بکەن، نووسەرێکی پایە بەرزی کاروباری ئیداری دەرەوەی ئینگلیس گوتویەتی : [٤٣]"خەون وخیاڵێکی کە پارتی لاوانی کورد دەی بینن و، دەیکەن وە قامک لەسەر خەرج و پوول و پارەو پیاوەکانی دەولەتەکانی دەرەوەدادەنێن، بەڕاستی خەون و خیاڵێکی بەتاڵەوە قەتبۆیان ناگونجی "وەسەرکە وتنی تێدا نابیندرێ، ئەوەی کە ئاشکرا بوو، ڕابەرەکوردەکان "نەدارو فەقیر" بوون وە تەنیا لەنێو ئەوان دا سەناتور عەبدوول قادر بوو کە داراودەولەمەند بوو.

قوس تەن تەنیە هێستا ناوەندی هان دانێ بوو وەهە موو وڵاتی عوسمانیشی دەگرتەوە. وەزیری ناوخۆی تورک لایەنگری انگلیس بوو، وە فەرانسە ـ وێکان بەوەیان تاوان بارکرد کە ١٥٠٠٠٠ لیری بەرتیل لە انگلیس وە رگرتووە. ئەوانی دیش دە ولەتی فەرانسەیان لە وبابەتە وە تاوان باردە کرد. انگلیس لایەن گری کوردستانی خووارو بوو، فەرانسە و ێکان، ڕووسە کان و ئێرانیکان هەریە ک مدعایە کیان هە بو .

کنفرانس ئاشتی خووازان کەلە ١٨ ژانویەی ١٩١٩ دا کراوە، بریتانیای گەورە، وە فەرانسە هۆش وگۆشیان لە سە رمە سەلەی ووڵاتی عوسمانی بو ، ئیدی گوێیان بوسە رۆ کە کوردەکان شل نە رەکرد.

کوردەکان بەهیوای ویلسون سەرکوماری ئەمریکا بوون، بەڵام تەنیا نوێنەرانی ئەمریکائی بۆولاتی سوریە و، قوس تە ن تەنیە، بەین ئەن نەهرێن و ئاناتۆلی، چوون پاشسال و نیویک دەولەتە زۆر دارە پیرۆزەکان لەشەڕی جیهانی هەوەڵ دا کە دەیانەویستمافی خەڵکەکان لەپەیمانی سێوردا ( ١١ی مانگی ئوتی ١٩٢٠)

بدەن ، تەنیا لەسەر کاغەز نووسرابوو وە ئەوپەیمانە لە بەینی "نەژین ــ ژیان" (مردن ــ نەمردن )دا مابۆوە وە نەیان تووانی، یان کەیفیان لێ نەبووکە مەسەلەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست حەل بکەن وڕای پەرێنن وە مافی کوردەکانش بەوجورە لەبەرچاو نەهات‌وبە ڕێوە نەبردرا .

لەکون فرانسی ئاشتی خووازانی جیهانی لەبەشی کنگرەی سێوز دا

کە باسی کوردها تبۆگۆڕێ ، لەبارە ی‌ئە ودوومادە انەی خووا رە وە لە سە ری ڕۆیشت بوون . لە مادەی ٦٢ ی یاسای مافە کانی گە لە کان دالە کمسیونی‌ئتالیاــ فە رانسە نئگلیس کە لە شاری قوس تە ن تە ینەگیرابوو ، ئاوانووسرابوو :

پێویستە لە ماوەی ٦ مانگان دامافی سە ربە ستی نە تە وایە تی‌ناوچەی کوردستان بێتە جێ . . .

وە سە رئە نجام ئە وسە رزە مینانە بۆمافی نە تە وە کە دیاری کرابووکە بریتی بوون لە : ناوچەی فوڕات ، ڕاواتە لە جنوبە وە تاسنووری مە سحێکان ، وەلە شمال ڕا تاسنووری تورکە کان ، کە دە گاتە وە ووڵاتی سووریەوە ناوچەی بە ین ئە ننە رێن ، " . ،

لە مادەی ٦٤ دادیاری کرابوو ، کە ژمارەی دانشتووانی خە ڵکی کوردلە هەioomە ڵبە ندە نش تە جێگانی کوردی ئۆتۆنۆمی دا ، لە ماوە ی ساڵێک داسە رژمێری بکرێ وە بنووسرێ ،چونکە ئە وکارە ساتە بۆپاشە ڕۆژێ بۆمە سە لە ی پێک‌هاتنی مافی سە ر بە ستی نە تە وایە تی گشتی کوردستان کارێکی پێویستە " .

## بەشی دووەم

# ساڵەکانی بەرهەڵستی

مەسەلەی مافی نەتە وایەتی ناوخۆ واتە ئوتونومی ، وە دانی مافی سەربە ستی گشتی بە کوردەکان وە هەروەها مەتڵەبی چکۆلەی دیکەش، کەیەک بەیەک لەپەیمانی سیۆردا ، چ لەلایەن دەولە تەگەورەکانەوە، وە چ لەلایەن کوردەکانی رامیاری، ذانا وە کە بە شداریان لە دانشتنەکان دا کردبوو ،وەباسێلی کرابوو ، بۆوەهیچ وە بەچەشنی بروسکێک هات و ، ڕۆیشت .

ئینجا لەو کنگرەیەدا دوو مەسەلەی دیکە لەگەل ماف دان بەگەلەکان تێکەڵ ببو ، وە بریتی بوون لەوانە ، هەوەڵ زیندو بوونەوەی دە وڵەتێکی تازەی تورک پاش شکانی دەولەتی ئمپراتوری عوسمانی وە تەواوبوونی شەڕ ، لەژێرچاوە دێری وە حکومەت کردنی کەماڵ مستەفا .

ئەوی دی بەهەست هاتنی دەوڵەتی عەراق بە سەرۆ کایەتی شافەیسەل !

وەبۆ کوردەکان مەسەلەی موسلیان هێناپێشی وەتە نانەت پەیمانی لۆزان ش نەی تووانی ئەوبەرهەڵستەی لەنێوبەرێ، لەئاکاماسێبەرێکی تاریک لەساڵەکانی دا هاتوو ناوچەی کوردستانی داگرت . وەکوردەکان لەژێر چەپۆکەی سێ قودرەتی تورک ، وەفارس وەئینگلیس داماوە .

بۆیەدەڵێن ئینگلیس چوونکە عەراق کە نیوەی کوردبوو ، لەژێر ئاڵای ئینگلیس دەهات بەهەست بێ . ئینجا لەڕێبازێکی تازە ،واتە لەلایەن قودرەتێکی دەرەوە کە ڕەقیبی ئینگلیس و تورک بوو ، کوردەکان دلداری دە درانەوە ، ئەویش دەولەتی یۆنان بوو . کلۆبی کوردەکان لەشاری قوستەنتەنیەدادەستی یارمەتی

بولای ویدرێژ کردوە هەوڵی دا لـــە دژایەتیێکی کەلەبەینی تورک ــ ئینگلیس بەهەست هاتووە، کە لکوەرگریَ، لەو نیێوانەش دا لوئیدجوَرج کە لەهات وچوَ دابوو، وە لەئاکاردا دژیمستەفا کە مال بەرگری دەکرد، بەلام بیَ کە لکبوو کارەساتیک لەگوَریَ دابوو، کە پیێویستبوو، زوو ڕاپەریێندریَ. بەلام لەوکاتە عاستەمەش کەلکوەرنەگیرا، وەقەول وقەراریێکی کە داندرابوو کە یارمەتی بە کوردەکان لەریێی بە غداوەبگات، نەگەیشتیَ، وە سەرئەنجام ڕاپەرینە کە لەسالی ۱۹۲۱ لە لایەن حکومەتی تورکیە تیێک شکاو، کوژاوە.

لەڕاستەقینە دا کورد لە هەموو لایەوە کە زوَری بوَهات بوو، واتـــە لە هەموو لایە کیێوە دەستیان لیَدەوەشاند، تورکەکانوئیێرانیێکان هەریەک لە لایەکیێوە، ئینگلیسکانیش هەربەوجورە زوَربەی لە کوردەکان دەدا.

لەئیێرانیدا ڕاپەڕینی سمایل لاغا سمکوَ بوَ ڕەزاخان کە تازە بە شایەتی ئیڕان گەیشتبوو مەترسیێکی گەورە و، بەرهەلستیێکیزل لەبەرچاو دەهات، هەر بەو هەلویێستەوە بوو، کە ڕەزاخان دەیەویست پەیوەندیکی تازە لەگەل ئینگلیس بە هەست بیێنیَ.

لەمانگی ئوتی ۱۹۱۹ دا، پەیمانیێکی لەگەل ئینگلیس بەست، بەڕاستی بە بەستنی ئەوپەیمانانە، جا، چلەئیێران، وە چ لە تورکیەدا کە بەڕیێوە دەبردراو، دەبەسترا، هەرگزوهەرگز ئەوقەرارمەداداەی کە لە پیێشوودا بوَ کورد لە بەرچاو بوو، وەرِستەو، ڕەسەنیێکیان کە بوچاوەدیێری کردبوو، بەجیَ نەهاتو، خیانەتی پیێکرا.

لەحەقیقەت دا ئنگلیس لەبەر قارانجی خوَی لەناوچە کە دا خوَی گیل دەکردو، چاو یدە قووچاند، وە دەنگی لەبەر دە رنە دەهات، تورکەکانیش خەیانەتیان کرد، وە پەیمانەکانیدیکەش مەحکوم کران، وە لەبیر چوونەوە. هاوکات لەگەل ئەو کارەساتانە، لەزەویوو، زاری و لاتی تازە پیێکهاتـــووی عەراقیش دا، شیێخ مەحمود، لەناوچەی کوردستان داخەریکی بزوتنـــەو، خەباتبوو، وەمەبەستی ئەوە بوو، کە لە دووژمنایەتیو، دو بەرەکی دوو ڕەقیبی تورک ــ ئنگلیس کە لکوەرگری، وەلەگەل تورکەکان دژیئینگلیس هاوڕیَ بیێت، وەهەروەها لە "ناوچەی کوردستان"ی عەراق داسەربەخوَ ی وەدەست بخاتو، بە پادشایەتی بگات.

بەلام ئەوەی لەبەرچاو بوو، ئینگلیسیکان قەت نەیان دەویست کە لە عەراقدا دووپادشا ، یانی شیخمەحمود وە فەیسەل بەهەستبین !

ئینجا دوور لە هەموو عەقلو، مەنتقیک، بە چەشنی پیشوو، دەولەتەزۆر-دارەکان، راپەرینی کوردەکانیان، کە بەراستی دەهات کە لکی لی وەرگیریوەلە ریبازی ئاواتو،ئامانجدا بیت، سەرکوتیانکرد، وە نەتەوەیکوردیان لە تەمو، خەم داهیشتەوە.

## فه سلی ١

### ١ ــ شۆڕشی کوردستانی تورکیه (١٩٢١)

لەکاتێک دا کە کوردەکان هەوڵیان دەدا وەتیٔ دەکۆشان کە دەولەته گەورەکان بە تایبەتی بریتانیای کەبیر بەمەسەلەی کوردەکان تێڕابینی هەبێ، مستەفا کەمال هاتە سەرکار، وە لیدەرە کوردەکانی شاریقوستەنتەنیەش زوریان پێ ناخۆشبوو.

ئەوەی کە بەچاکی ڕوون ببۆوە مستەفا کە مال لەسالی ١٩٢٠ دا لەگەل بەرهەڵستێکی گەورەی نیزامی ڕوو بە ڕوو ببوو، ئەویش قەڵپۆزو، هێزی کوردەکان بوو کە لەگۆڕێ دابوو. هێندێ لەسەر چاوەکانی هەواڵ دەری کوردەکان گوتویانە کە مستەفا کە مال دەیەویست کەبەچەشنێک لە کنگرەی سێور دا مافی کوردەکان دیاری بکرێ، ئەویش ئەو مافەی دەسەلمینێ ١

بەلام کە هەرشەو، گورەشەو، دەستی کوردەکانی لەسالی ١٩٢١ دا لەسەر کورتبوو، مەسەلەکەی وەپشت گوێی خۆی خستو، لەبیر خــــۆی بردە وە، وە دەت گوت قەت لەوبابەتەوەباسێک نەکراوە....

ئینجا کەلەبەهاری ١٩٢١دادەستبەکار بوو،وەچەند بزوتنەوەی کوردەکانی سەرکوت کرد، وەخەڵکی بەپووڵو، پارە و،پیاوی‌خوییهاندەدا، کــــە دژییۆنانیکان کە دەیانەوێ بەکوردەکان کۆمەک بکەن، بەشەڕینوە نێوانی کوردەکانش ناخوشبکەن، بەلام بەپێچەوانەیئەوکارە، ڕاپەڕینەکەسەرتاسەری کوردستانی تورکیەی داگرت بۆ هەوەڵین کات وە کەڵک وەرگرتن، لەناوچەی ماردیندا کوردەکان لەگەل یەکێک لەسەروکەکانی گەورەی‌نیزامی‌تورکیە بە نێوی،

پەریزادبـــەکـر کە ئەفسەرێکی پایە بەرزیقەدیمی دەرباری سولتانی عەبدوولحەمید، وە فەرماندەی هێزی چووارم‌بوو، وە دژی مستەفاکەمال بەشەڕ دەهات، چاوپیکەوتێک پێکهاتو، زوو دەست بەیەک بوون، بەلام لەمانگی ژوئنی ١٩٢١، لایەن گرەکانی مستەفا کەمال دەست بەکاربوون وەبۆ ئەوەی کەئـەو ئەفسەرە لەکوردەکان جوێ بکە نەوە، کوڕێکیان بۆ ووتو، وێژ بۆلای پەریزاد بەکر نارد، وە پێیان گوت کە! باش دەزانێ کە کوردەکان مافی نەتەوایەتــــی ئەیالەتیان واتە ئوتونومیان دەوێ.

وە دەیانەوێ کە سنووری کوردستان دیـاری بکەن، وە دەیانــــەوێ کاربە دەستەکانو، ژاندارمەکانو شارەوانێکان لە ناوچەی کوردستان وەدەرنێن، وەنەیەلن لەمەلبەندی کوردستان داسەر بازبگیری. ٢

ئینجا ئەوە کارێکی پڕلەمەترسیو، نالەباریە، وەئەومەبەستەی کوردان لەقەوەتو، قودرەتی ئێمەدانیە. کوردەناسیونالیستەکە مالیکان بەبێ ئەوەی کە لەگەل کوردەکانو، پەریزاد پێکبین، گەڕانەوەشاری ئانکاراوەدەریان بڕی کە ووتو، وێژ بێ کەلکە.

لەمانگی سپتامبری ١٩٢١ داکۆ ڕیکی تازەی دیکەی تورک کە بریتیلە نوێنە رەکانی ناسیونالیستی شاری بتلیسو، وان، وەنوێنەرانی حکومەت بوون، بۆ گفتو، گۆ هاتنەلای کوردەکان، بەلام ئەو کۆڕەش نەیتووانی کارێـک بـــە-رێتەپیشی. وە هیمنایەتــیو، هومیدێک لە کوردستان بەڕێوەبەرێ. لەمانگی ئوکتوبری ١٩٢١ تورکەکان ویستیان بەچەشنێک (تەشکیلاتی ئیداری) لەناوچەی دەرسـیم دابنین وەبەوجورە هێمنـیو، ئەهوەنی بۆ ولاتی کوردستان بگە ڕێتەوەوەهەوەها وەدەستیان‌بەسەربازگیریکرد، وەمەبەستیگەورەیان ئەوە بوو کە بزوتنە وەی کوردەکان بەرهەرچونێک بێ دامرکێنن، دە ناهیچ ئامانجی دیکەیان نە بوو کە بـــەلـکـی کوردەکان‌بێ. ئینجا بلێسەو گڕی ڕاپەڕینە کە مەبەست بەوکاتە ناسکەوباریکە پترهەلائیسا، وە ناوچەکانی دیکەشیداگرت.

## ١ ـ ئینگلیسو، بزوتنە وەی کوردەکان

بۆ فەرانسە وێکان هیچ شکو، گومانێک نە مابوو، کە لەو بزوتنە وەیە دا

دەستی ئیگلیزێکان لە کاردایە. ئینگلیس لە تورکیەدا پتردەستی بە سەرپشتی کوردەکان دادێنا، وە زیاتر وەباوی‌دەخستن، ئەویش مەبەست بەوە بوو، کە مستەفا کەماڵ بە دەستی کوردەکان کز، لاوازبێ، تاپتر پەرو، بال ناویٚوە مدعای ناوچەی موسڵ‌لە بیروباوەڕی بەرێتەوە. ژێنیرال‌پیلێ سەرۆکی پایەبەرزی فەرانسەویان‌لەڕۆژهەلاٚت‌دا، دەی‌گوت کە ئینگلیسیکان هەلوٚیستیان ئەوەیە کە بەهەر چونێک‌بێ کوردەکان لەومەلبەندەدا بەچەشنی بەر هەلستیێک وە لەمپەرێکی‌گەورەلەبەینی فەیسەل و ناسیونالیستەکان بۆ نەتەوەکانی دی‌بێ، وە مەلیک فەسەل‌ش بە قازانجی ئەوان ببزوێتەوە. ٣

لەپائیزی سالی ١٩٢٠ دا بۆ هەوەلێن کە ڕەت گومانی خۆتێوەردانێکی گرنگ، وە بەرەنگاربوونێک چاوەدێری دەکرا، بەلام نەخشەیەکیش لەبەرچاوبوو، واتەئینگلیس دەیەویست کە لە جەزیرە داهێزێکی کورد پێک‌بێت وەئازادێک بە کوردەکان بدرێت بە چەشنێک کە "بۆ لای فەرانسەوێکان نە کێشیرێن."

بەلام ئەو ڕێبازونەخشەیە مەبەست بەمەسەلەی ڕامیاری لەلایەن سێ کرێتری ئینگلیس لەهندوستان دا وە پشت گوێ‌خرا وە لەبیرچووە (١٨ ژانویە – ١٩٢٠) لەمانگی ژوئینی ١٩٢١ لە لایەن سیرپیرسی‌کاکس پیاوە بە رزە کەی ئینگلیس لەکون‌فرانسی لەندەن دا (فیوریە – مارس ١٩٢١) مەسەلەی کوردەکان سەبارەت بە دووژمنایەتی‌لەگەل مستەفاکەمال‌هاتە پێشێوە سەرئەنجام ئینگلیس بەوەی ڕازی‌بوو کە مرۆڤیک لەخزم‌وقەومەکانی بەدرخان کە سەربەئینگلیس هەن، بەیارمەتی‌و، لایەن‌گری نوویل بۆ کاروباری کوردەکان دابندرێ.

بەشوێنی ئەوەدا لەمانگی ئوکتوبری ١٩٢١ بەهاتنی خەلیل بەدرخان، وە چووار ئەندامی کانگای کۆڕی کلوبی‌کوردانی شاری‌قوستەن‌تەنیە، بۆ بەغدایە مەسەلەی کورد هاتە سەر زار، وەئینگلیس خەریکی بەڕێوەبردنی مەبەستەکەبوو کە بەقازانجی خۆی بەریوەی بەرێ. ٤

بەگومانی خەلیل بەدرخان، بەهاتنی کمیسەری‌عالی ئینگلیس لەقوستەن‌تەنیەڕا بوو، ووت‌و، ویژە "بە ختە وەری" بۆ ڕێک وپێک کردنی مەسەلەی کورد زۆر بوو.

## ٢ ــ نەخشەی خەلیل بەدرخان

خەلیل بەدرخان لەووت‌و، وێژە کەی خۆی دا کە لەگەڵ‌سێرپیێرسی‌کاکس کمیسەری‌پایەبەرزی ئینگلیس لەعەراق‌دا ڕای گەیاند کە بزوتنەوەی دووساڵەی ئیمە لە ڕێگای کانگای کلوبی قووس تەن‌تەنیەوە، هاوکات لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینە بووە کە لەناوچەکانی دیاربەکر، وان، بتلیس هەیان‌بووە، ئەو ماڵبەندانە ماوەی ساڵێکە کە ماڵیاتیان بە دەولەتی تورک سەبارەت بەخەباتەکەیان نەداوە. وەمنش لەبنەماڵەی کوردم، وەئێل‌و، هۆزی‌مە لەمێژە بۆیـەکـەتـی خەبات دە کات" ! ئینجا خەلیل بەدرخان ئەوەی بە ئاشکرائی بە کمیسەری عالی ئینگلیس گوت کە ئێمە پێویستمان بە یارمەتی‌و کومەگی ئێوە هەیە.

بەداخەوە ئەو یارمەتیە بە چەشنێک بووەکە هەتا ئێستا نەگوتــــراو، نەدیترابوو! خەلیل بەدرخان بەقسەکانی درێژەپێ‌داو، گوتی "ئێمەگیان‌و، ڕووحمان لەگەل ئیگلیسە، وە لایەن‌گری ئەوانین"

وە لەبنەڕەت‌ڕا واتە لەئەمیرخانەوە هەروابووین. " ئێمە دەمانەوێ لەژێر فەرمان‌و، یاسای‌ئێوە دابژین، ئەگەر بریتانیای گەورە یارمەتی‌مان‌بدات وە کوردەکانیش دەولەتێکی هەوا داری ئێـوە لەبەینی دووژمنانی عەراق، رووس، تورک پێک بی‌نن، ئینجا لەگەل هەرمەنێکان واتە لەگەل‌تەواوی مەسیحیکان‌ش پێک دێن،"

ئەویار مەتیەی‌کە خەلیل بەدرخان لەئینگلیسیکانی چاوەدێری هەبوو ئەوە بــــۆو داوای کرد کە لەپێش هەمووشتێک ذا کە کۆرێکی ئەفسەری‌خواروی بریتانیاوەک ماژور نۆئیل بە جلکی کوردی بنێردرێ، جائەو وەختی دەتوانین‌بلێن کە حکومەتی بریتانیا بەڕاستی"بەلێنی‌بەبزوتنەوەی کوردەکان دەدات"

بەشوێنی ئەو داوایانەی دا خەلیل‌بەدرخان هەروەهالە کمیسەری پایە بەرزی ئینگلیسی ویست کە ئێوە! دووتۆپی سەحرائی، چەن تیربار، ٥٠٠٠هەزار تفەنگ، وە جلکی سازوبەرگی شەڕێ‌شمان بۆبنێرن

لەبارەی مەسەلەی ئابوری وولات دا خەلیل بەدرخان گوتی، کەپاش‌ئە وەی دەولەتی بریتانیای گەورەکاری کوردەکانی پێک هێنا، ئێمە پێویستمان بە پول‌و، پارە هەیە کە لەرێگای باوەرکردن‌عتباری‌بانکی‌بە ئێمە بدرێ، جاهەروەخت

ئینجا خەلیل بەدرخان زور بەتێرادیوێوە رای گەیاند کە. "ئەگەر ئیوە ژەدی کەنەوە، من بەدووای‌ئەومەبەستەدا هەرهەم، وئەگەر تووانیم شەرێکی کلاسیکی واتە گەورە دەس‌پێ‌دەکەم، دەنالەرێگای شەری‌گرێلە لائی‌و، پارتیزانیێوە بە خەبات‌و، راپەرینەکە درێژە پێ دەدێن!"

## ٣ ــ یارمەتی یۆنانیکان

وەک‌کە سێرپێرس‌کاکس گێراوێتەوە، کوری خەلیل بەدرخان ١٠/٠٠٠ لیرەی لەبانکێ کی قووس‌تەن تانیەی وەرگرت، وە کە رەتێکی دیکەش تێلی‌گرافی بۆ حکومەتی یۆنان لێدا کە پولێکی‌ترش بۆ کوردەکان بنێردرێ. خەلیل بەدرخان بەوچەشنەکەین‌و، بەینی خۆی لەگەل یونانیکان سازکرد...

هاوکات لەگەلْ ئەو کارەساتە یونان هەنگاوێکی بە بایخی هەلْێنا، واتە رێگای لەئینگلیس وەرگرێ کە، کەشتێکی پرْ لە چەک‌و ئە سلە حە لەوەلاتی عەراقە وە بو کوردەکان بنێرێ.

## ٤ ــ راو، تەدبیرو، تەسمیمی چرْچیل.

لەمانگی ژوئن دا تاقمێکی چریکی تورک بە لایەن‌گری مستەفا کە مال هاتە شاری رەواندز وە لەئیدارەی کاری‌ئینگلیس چاوپێکەوتنێکیان بەجێ هێناوە لەنهێنی دا دژی عەراق‌لەگەل سێرپرسی‌کاکس،ووت، وێژی کرد، ئەویش‌زیاتر لەبارەی مەسەلەی کوردەکان‌بوو. بەلام کمیسەری عالی ئینگلیس، گوتی کە حکومەتەکەی دژی‌ئەو کارەی کە تورکەکان کردویانە،وە ئەفسەریان بۆ رەواندز ناردووە دەنگی خوی دەربریوە

ئینجا تورکەکان گوتیان کە ئینگلیس بە یونانیکانیشی رێگا داوە کە چەک‌و، ئەسلەحەو، سازوبەرگی جەنگی بۆ کوردان بنێرن!؟ بەلام کمیسەری ئینگلیس

لەسەر ئەومەسەلەیە نەرۆیشت‌و ، گوبی خوی بو دانەخست و ، بێ‌دەنگەی لیّ‌کردو ، وای‌نیشان‌دا کە من ئاگام لەو کارەنیە . ٥

ئەوەی کە شایانی باسە ، ئینگلیس دەیەویست کە کارو کردەوەی کوردەکان لەناوچەکەدا پیّک بیّت ، بەلام لەوکاتەدا چرچیل‌هەوالیکی بوسیّرپرسی کاکس نارد وەلی‌ویست کە وازی (لەهان دانی کوردەکان لەوکاتەدا) بیّنیّ . " ٤

### ٥ ــ پیش گرتن لە جوولانەوەی کورد

لەکەرەتی دوووەم دا کە دەولەتی‌فەرانسە پیّک هاتنەکەی خوّی بەجیّ گەیاندوە لەئوکتوبری ١٩٢١ ڕا قەراردادی ئیمزاکرد ، وە هەروەها کە ڕژیمی مستەفا کەمال وردەوردە پەرەی گرت ! ئینجا لەسالی ١٩٢١ ڕا جەواد پاشا هیّرش‌بردە سەر کوردەکان ، وەپاش شەرێکی دوورو ، دریّژ و قورس لە (نوامبری ١٩٢١ ــ فیّورییەی١٩٢٢) شوّرشی کوردانی تیّک‌شاند .

ئینجارەفەت‌بەگ لەبەغدایە بوو ، وەلەکاتیک دا کە دیتی ئینگلیس هیچ یارمەتیّک ناکا گەڕاوەقوس‌تەن‌تەنیە (ئاخری (١٩٢) .

خەلیل بەگەش کە دیتی کارەسات بەو جورەیە ، وە ژیانیشی لەمەترسی‌و ، خەتەر دایە هاتەوە بەغدایە کەهەم خوّی ڕزگاربکات وە هەم بەلکو بتوانیّ (کاریّکی دەولەتی‌واتەپوّستیّک) بەدەست‌بیّ‌نیّت بەلام تامانگی مەی‌سالی ١٩٢٢ ماوە ، دووبارە گەڕاوەقوس‌تە ن‌تەنیە وەخوّی‌بەدەستەوەداو تەسلیم‌بوو .

## فه سلی ۲

### سمکو

سمایل‌ئاغا، که سمکۆیان پێ گوتووه، کوڕی مه‌حمه‌دئاغای سه‌رۆکی عیلی شکاکانه، که‌ئه‌و تایفه‌یه‌له سالی ۱۹۱۸، دا ۲۰۰۰ خانه‌واری نزیکی یه‌کتربوون [1]

پاش مردنی موحه‌مه‌دئاغا، عه‌شریه‌تی شکاک له‌ژێر فه‌رمان‌و، چاوه‌دێری برا گه‌وره‌که‌ی جه‌عفه‌ر ئاغا قه‌راری‌گرت که خاوه‌ن قودره‌ت‌وبه نفوزبوو ـ له‌سالی ۱۸۸۹ داله‌لایه‌ن تزاری ڕوسیـــه نیکـــلای دووم له‌گه‌ل عه‌بدورره‌زاق به‌درخان وه سه‌ییدتاهای شه‌مزینان بۆڕوسیه داوه‌ت‌کراوه ـ

به‌لام حاکمی شاری ته‌وریز که (نیزام وسه‌لته‌نه) بوو، پێشی لـــه‌و داوه‌ته‌گرت: به شوێنی داوه‌ت‌کردنی ئه‌و بۆ ته‌وریزواته‌پاش شۆڕشی ۱۹۰۶ که‌له‌بابه‌ت ئاژاوه‌ی ناوچه‌که پێک هات‌بوو، که بتوانن هیمنایه‌تی‌و، ئه‌هوه‌نی‌بۆ ناوچه‌که‌بگه‌ڕێننه‌وه، پیلانێکنان بۆ سازکرد وه‌له‌سالی ۱۹۰۷ داله‌پشتی چادرێک دا له‌گه‌ل‌هاوڕێییه‌کانی شه‌هیدیان کرد.

له‌وێ ڕۆژێ ڕا سمایل‌ئاغا، هه‌رله فکری وه‌ی دابوو که تۆڵه‌ی خۆی

---

[1] عه‌شیره‌تی‌شکاک به دوو ده‌سته به‌ش کراوه: عه‌بدواکان که له ده‌وروبه‌ری چه‌هریق له‌رۆژئاوا له‌انتهای سه‌روی به‌حری ورمێ ده‌ژین، که‌سه‌روه سمکۆ بوون، وه مه‌مدوا کان که نزیک به خووارو، واته‌جنوبن وه‌سه‌ربه یه‌کیک له‌مامه‌کانی سمکون، که‌عه‌مه‌رخانه، که‌یه‌کی له‌خاوه‌ن نیوو، به‌نفـــود بووه، له‌پیاویگی‌وه‌ک سمکو به قودره‌ت بووه.

بەتورەیی‌وزۆرەملی لە فارسەکان بستێنێتەوە، جا، کەڕەتێک بۆ لای تورکەکان دەچوو وە جارێک بۆلای ڕووسەکان، وە هەروەها بۆ لای ئینگلیسیکان خۆی دە کێشا... وە هەربەوجوورەبوو کە لەووتو، ویژو، هاتو، چویەکی دۆستانەدا لەشاری‌وان لەگەل وابەستەی نیزامی بریتانیا لەوان بە نیۆی کاپیتان دیکسون کەلکی وەردەگرت.

لەپاش‌تەواو بوونی شەڕی جیهانی هەوەل سەرۆکی ستادی پایەبەرزی ئینگلیس هەولێدا، کە یەکەتێک لەبەینی گەلی‌هەرمەنی، ئاسوری وە کوردەکانی سەر بەسماعیل ئاغا لە سنووری ڕووس دا دژی تورکەکان پێک بێنێ. بەلام سمکۆ یەکەتیکەی نەسەلماند،وەلە ٢٥ فیوریەی ١٩١٨دا سەرۆکی ڕووحانی هەرمەنیکانی بەنیوی مارشیمون‌ی لەنێو برد.

سیمکو پاش شەڕێکی قوورس تووانی بەسەر زۆربەی وڵاتی کوردستان دازاڵ بێ،واتەلە لەدەوروبەری قەراغ بەحری ورمێ‌وە‌تا سنووری‌تورکیەئەوناوچانەی داگیر کرد، ئەوکارەساتە هاوکات‌لەگەل تەسلیم‌بوونی‌تورکەکان لە ئوکتوبری ١٩١٨ دابوو کە تەواوبوونی شەڕیان سەلماند.

ڕاپەرینی سمکو لەگەل لەناوچوونی سلسلەی پادشایەتی قاجار لەئێران دا بەرامبەرەو، هاوکاتە، ئەوەی کە ڕوون بۆ تە وە ئەو وەختی لەسەرتاسەری زەویوزاری‌ئێران دا تە واوی پیاوە چەک دارەکانی ژاندارمی و بلات لە ١٢٠٠٠ نەفەر، وە قەزاقەکان لە ٧٠٠٠ سەرباز کە خەرجیان لەلایەن دەولەتی ئینگلیس‌وە رووسیە دە درا پیترنەبوون!

تائەوکاتەی‌کە ڕەزاخان لەسالی ١٩٢١دا کودتای کرد، سەربازە قەزاقەکان لەژێر فەرمانی ئەفسەرەکانی دەرەوە، واتە ڕووسە سپیەکان تەعلیم دەدران، وەخەرجی‌ئەوانیش لەلایەن دەولەتی بریتانیاوە دەدرا.... کەبەراستی تەواوی دەرآمدی مالیاتو، خەراجاتی‌ئیران لەژێربارمەتی‌و، چاو(دێری ئینگلیسیکان بوو. وەئەوکارە ساتە، تا تەواو بوونی‌شەڕ هەرد.ریژەی هەبوو، وە بەگرنگـــی ئینگلیس بە دووایە وە بوو.

حکومەتی ئیران بەتەواوی زەبرو، زەنگی خۆیەوە، دەیەدیست بەهەر چونێک‌بێ سمکۆی لەنێو بەری ئینجا بۆ کوشتنی سمکو بەستەیەکی بە فێڵو، تەلەکە بۆ نارد، بەلام ئەوبەستەیە کە بۆمب بوو، وەتۆقی چەن کەسی لە سەرۆکە

شکاکەکان وەیەکیک لەبراکانی لەنێوبردو، سمایل ئاغالەو پیلانە ڕزگار بوو.

لەهاوینی سالی ١٩١٩ سیمکو شاری وورمێی گە مارۆ دا. حکومەتی ئیران، سەرهەنگ فیلیپوفی ڕووسی کەسەرۆکی قەزاقەکانی ئیرانێ بوو، وەلەقشونی ئیران دا خزمەتی دەکرد، لەڕێگای شەرەف خانەی ورمێ ڕا ناردە سەرسمایل ئاغا. ئەوئەفسەرەلەمەلبەندی شاپور دا هیزشیبردە سەر سمایل ئاغا، وە پیاوەچەک دارەکانی سیمکوی تا چەهریق پاشەکشە پێدا، بەلام لەنەکاو لە سمکوی داوا کرد کە ووت و، وێژبکرێ. لەکاتی ووت و، وێژ دا فیلپوف پێی ڕا گەیاند کە من نامەوێ بۆسەرناوچەی وورمێ دەس درێژ کەم، وەدەگەڕێمەوە. ١

ئینجا فیلیپوف ئەوکارەی کرد، وەسمایل ئاغا ووردە - ووردە تەواوی مەلبەندی ورمێ داگرت لەسالی ١٩٢٠ ڕا تا نیوەراستی سالی ١٩٢١ ناوچەکە لە هێمنی و ئارامی دابوو، بەلام قشوونێکی تازە لەتە ورێز و مڕێ کە وت کە ئەو هێزە لە ناوچەکانی تارانەوەهات بوون.

بەو جوڕە ناوچەی کوردستان ئاژاوەی لێ سازبووە، بەلام لەپێش ئەوەی دا کە ئەو هێزە بگاتە ناوچەکە، سمایل ئاغا شاری سابلاغ واتە مهابادی گەمارۆ دا و، خەریکی گرتنی بوو.

## ١ - گرتنی سابلاغ (مهاباد) (لەخەزلوەری ١٩٢١)

٢ لە٦ مانگی اوکتوبری ١٩٢١ مرۆڤ تەها، ژن براو، ئاوالزاوا و، هاوڕێی سمکو لەگەل چەندسەدسووار هێرشیان بۆ سەر شاری سابلاغ (مهاباد) برد. لەوکاتدا ٥٥٠ ژاندارمی ئیرانێ لەوشارەیان بەرگری دەکرد

بەلام لەشک دامابوونە وە، وە نەیان دەزانی چبکەن، وە ئایا پیوستە شەڕبکرێ یان نە!؟

بۆدوارۆژێ سمایل ئاغا بە خۆیوبە ٢٠٠٠ سوواریکورد بۆ سابلاغێ وەڕێ کەوت، لەسەرڕێگای خۆی هەرقەلاوپۆستێکی ئیرانێ کەدیتبایە لەبەینی دەبرد، دەیگرت، تاگەیشتە شاری سابلاغ، لە نێوشاریدا وە دووی ژاندارمەکان کەوت، قەلەتوبڕی لێ کردن،[٣] هێزی دەولەتی خۆی نەگرت و، شکاوبلاوبوو،

لەوشەرە دا ٤٠٠ژاندارم کوژراولەناوچوو ساحێبمەنسەبەکانیان جگەلــــە دوویا سی کەس کوژرانو، لەنێو چوون، سێ ئەفسەرەش کە گیرا بوون لەبە ندیخانەکران. شکانی هێزی دەولەتی لەمهاباد زۆر بەیەکی گەورە بۆ دەولەت بوو، ئەوناکامیەو، شکانە، مەبەست بەوەبوو کە هێزی دەولەتی نەزمو، دیسپلینینەبوو، ئاڵۆزی لەنێویان دا دەدیترا، بەلام مەبەستێکی دیکەش بۆتە هۆی شکانو، لێکبڵاو بوونی هیزی ئیران. یانی بە گرتنی دووپیاوی گەورەی سابلاغ، خەلکی شاری بەربەرەکانیان لەگەل کار بە دەستەکان کرد، وەبووبە هۆی شکانیوان بە لام گرتنی شاری مهاباد لەلایەن هێزی سمایل ئاغاوە، تالان و کوشتنی خەلکی نیوشاریشی بە دوواوەبوو، وەخەلکێکی زۆر کوژرا: قازی لەتیفی بەناوبانگ لەجەنگەیشەرێداشەهیدکرا، وە دەولەمەندەکانو، دەرەبەگەکانو، خەلکی شاری تالان کران بە شوینی ئەوە دا پاش چەند حەوتووان، سمایلئاغا ئەوکارە ساتەی لەووتو، وێژێکدا، بۆکۆری کلوبی کوردەکان کە لەشاری قوس تەن تەنیەرا هات بوون، وەبەسەرکردایەتی مستەفا پاشا بوو، بلاوی کردبۆوەو،وە شەرحی دابوو، گوتبووی: کە ئێمە لەسەروکە گەورەکانی سابلاغ داوەتمان کرد کە بێنوە لەپێش گرتنی شار داچارە سەرێکی مەسەلەکە بکرێ، بەلام ئەوان نەیانەویست وەلام بدەنەوە، وە خەلکی شاری سابلاغ ریزیان دانەنایین،ئیمەش شەرمان هێنا قەراغ دیواری شاری سابلاغ، وەشکاکیش بیانەوی یانەیانەوێ دەسیتان بە تالان و برین کرد!

سمایلئاغا بە ووتارەکەی ئاوا درێژە پێدا، فارسەکان تاقەراغ دیوارو، برج و باروی شارپاشەکشەیانکرد بوو، وە دەهات کە بە گرتنی شاری سابلاغ، شەر تە واوبی، بەلام خەلکی شاریش لەوبەنیە دا تاوانباربوون.[٢] ئینجابوونە فیدای ئەوشەرە، وەشکاکە کانش چاویان هیچ شتیکی نــەدەویــت، هیچیان نەدەپاراست. سمایلئاغا هەروەها دەریبڕی کە بەراستی نەدە تووانرا کەلەتالان کردنی شار، پیاوەکانی خۆی بپاریزێ." هەرچەند لەدووایە داخەلکی شاری بەتایبەتگەورەکانو، ڕدێن سپــیکان لەلایەن سمکۆوە دلداری درانەوە، بە لام خەلکی ئەو ڕۆی مهاباد لەوبارەیەدا زۆر بە دەستە وەستانەوە دەدوینو، قەزاورەت دەکەن.

ئینجا بە هەرچونێک بووبێ ،خەلکی مهاباد سمکۆیبەیەکیک لەپیاوەگەورەکانی

خۆمالـــی کورد، واتە ناسیونالیسم دەناسن. پاشگرتنی سابلاغ هێزی دەولەتی ئیران، لە ئازربایجاندا هاتە ژێرفەرمانی ساحێب مەنسەبیکیسوویدی بەنێوی سەرهەنگ "لوئیدبێرگ".

هێزیکیدیکەش لەژێر ئەمروفەرمانی سەرۆکێکی ئیرانی بە نیـــوی "ئەمیرئەرشەد" بوو، کە قشوونەکەی بریتی بوو لە چریک و، پارتیزانی خەلکی ناوچەی ئاذربایجان کە پتر لە ۲۰۰۰ کەسبوون، ئەوهیزە هێرشیکی بردە سەر پیاوە چەکدارە کوردەکان، سمکو لە قەراغ شاری هیرشەکەی تیک شکاند، وەپترلە ۲۰۰ کە سی لیٚ کوشتن، وە هەروەها ئەمیر ئەر شەدش لەو شەرەدا کووژرا، ماوەی هێزە کە بە ئالۆزی و شکاوی، بۆ دووایە پاشەکشەی کرد. بەشوینی شکانی هێزە ئازەریکان، سیمکو ئەوجـارهیرشێکی گەورەی بردە سەرهێزی بەرێک و پێکی سەرهەنگ لوئیدبێرگ سویدی، ژاندارمەکانی ئەوهیزە بەچەکو، ئەسلەحەی ئینگلیس چەکدار کرابوون، بەلام ئەسباب و یەدەگی شەرێ کە بۆ پشتیوانی هیزەکە داندارو، یان چەکوئەسلەحەی فەرانسەوی بوو، یان سازوبەرگی رووسی! ۵

دووهێزی دیکەی دەولەتێ کە یەکیان لەنیوەی مانگی نوامبری سالی ۱۹۲۱ وە تا دسامبری ۱۹۲۱ بەرگری لەشاریخۆیە دەکرد، لەوێدا ماوە.

، هیـــزە کەیدی هێرشی بردە سەر ناوچەی قەرەتەپە، ئینجا هەر دوکهێزلەبەرانبەر هێزی سمایلئاغادا شکان، وە کشانەوە دووایە.

پاشئەو پیرۆزە گەورەی کە وەدست سیمکو کەوت، حورمەتو، رێزیوی لەنێو عێلو، عەشیرەتە کوردەکان وە خەلکی کورد بەتێگرائی چوٚ سـەرێوە گەورەکان سەریان بو دانواند.

سەرئەنجام و لاتو، مەلبەندێکی کە سمایلئاغا توانی بە هێزو، قودرەتی خۆی داگیر بکات بریتیبوولە ناوچەی با شووری بە حری وورمێ تا شاری خۆیە، وەلە شمالەوە بۆ لای جنوب تا شاری بانە. وە هەربەو جوورە، تەها برای خیزانی سمایـلئاغـا و لاتی بیرا کاپرای، تازێباری لەبەردەستی دابوو، وە ئیدارەی دەکرد.

## ٢ ــ سمكو ــ

مافی گشتیو، سەربەستی نەتەوایەتی واتە لە مەجموع دا وڵاتی‌یەکجێ کورد ئاوات و ئامانجی وی، بووە ئینجالەبەر چاوی سەرکردەکانی‌ئیران وە هەروەها تورک وەک "حەسەن ئەرفەع" وە "ئوزدەمیر" سمایل ئاغابەو چەشنە قەزاوەتی لەبارەی دا کراوە، سمکو هەرچونێک‌بێ، پیاویکی لەخۆ ڕازیو، هیچ‌نەزان بووەو، تاڵان گێڕ! وەبەراستی مرۆڤیکی نەتەوەپەرست‌واتە ناسیونالیست بوو، وەنێو ئاخن‌دار. وە زۆریان لە ئاغاوەتەکان‌و، دەربەگەکان کە هاوکاریان لەگەل کردوە، مەبەست بەوە بووە کە ئەویش "فیودال" بووە، وە تامی نەتەوایەتی‌واتە ناسیونالیستیان چێشتووە، وەبەراستی هەموویان کوردی نەتەوەپەرست‌بوون. سیمکو کۆتی ڕیزریزەوە پانتولێکی شکاکی، وە چەکمەیەکی ڕووسی لـــەپـــێ دەکرد بەووتەی‌ئینگلیسیکان خۆش لیباس‌بووە هەمیشە زەردە خەندەیەکی شەرمێو نانەی بە لێویوە بووە، پیاوێکی کەم‌دوێ، ماقوول‌و، لەسەرخۆ بوو. کانگای ناوەنـــدی سمایل‌ئاغا چەهریق بوو کە نزیکی سنووری وڵاتی تورکیە یەوە لەقەراغ وئاخری شمالی بەحری وورمێ‌یەبووە.

لەنێوچومێک دا لەسەر تەقتەقە بەردێکی بلند بابی سمکـو قەلایەکی دروست‌کردوە کە دەلێێ هێل‌لانەی هەلۆیە.

ماڵێکی گەورەی‌دیکەشی‌هەبوو کەئاشپەز خانەو، تەویلەی‌لەنێوی‌خۆی‌دابووە. گێڕاویانەتەوەکەکاتیک کاربەدەستانی‌دەولەتی بزوتنەوەکەی سمایل ئاغایان‌تێک شکاندوە مالەکەیان داگیرکرد، لەوێ‌دا پیانووکیان دیتەوە. مێژوو نووسان‌لەبابەت بوونی ئەو پیانویە لە خانوی سبمکودا کە دیترا وە سەریان سوورماوە، لەبەرئەوەی کە و لاتی‌پان‌وبەرینی کوردستانێکی کە هێستا ڕام‌نەبووە، ئەوە بەراستی‌جێی سەر سوورمانە. "سبمکو دەنگی تفەنگێ‌یوە قاسپەقاسپی، کەوێێ و هەراهەرای مەیدانی شەڕیێ وەحیلەی‌ئە سپانی زۆر لەدەنگی پیانۆی پی‌خۆش‌تربووە ــ وەرگیر[1]" سمایل ئاغابو هەوا ل، خەبەروباس وەرگرتن لەدووری و لاتڕا، لەمابەینی شاری مهاباد ــ چەهریق ویلمان وە هەروەها جیگا دوورەکانی‌کوردستان

تەلەفونی هەبووە، وەخەبەریوەرگرتووە، ئاگاداری لەکاروباری ناوچە کە هەبووە. گێڕا ویانەتەوە کە سمایلئاغا مرۆڤێکی بێڕەحم بووە، وە دووژمنانیخـــۆی بەزنیدووئی لــەســەرقــەڵای، کێوەکان ڕا هەڵ داشتووە

لەوبارەیەدا بەسەرهاتێک لەوێ دەگێڕ نەوە وە لەزمان یەکیـــــک لەوئەفسەرانەی کە گرتوویەتی بیستراوە کە سمکو لەخۆڕا خەلکی نەکوشتووە، بەلکو ویستوویەتی تۆلە وەرگرێتەوە، وەئاوای گێڕاوە تەوە! پاش شەڕی یەزدیکانێ (نێوەراستی مانگی نووامبری ١٩٢١) کەچەن ساحیب مەنسەبێکزیندانی بوو ن لەیەکیک لەوانەی ویستووەکە چەشنی کارولەعەمەل هێنانی ڕەشاشی فێرکا. ئەوئەفسەرەیان دەرجەدارە کە لەوکاتە دا کە گوللەی لەبەر ڕەشاشە کە دا داناوە بەرە و سمایلئاغای ڕا گرتووە، وە ویستوویەتی پێیەوەنێ!

لەوکاتە عاستەمەدا سمایلئاغا هە ڵاتو تەسەریوە دەستی گرتووە وە پێی گووتووە کە "سپاس"! بەراستی فێربووم کە چۆن دەبێ وەکارخـــــریۆ، باوێژری... " وە پاشانلێیدەپرسێ، مەبەستی کوشتنی من لەنێو ئەوهەموو سەرکردە کوردانەدا چبووە، وە تۆ سوور دە زانی کەدەکـوژرێیــەوە، بەلام ئەفسەرەکە وەلامیکی ئەو توی نەداوەتەوە، ئینجا لەکاتیک دا کە ئـــەوی لەگەل ئەفسەرەکانیدیکە ئازاد دەکا، بە هەریەک لەوانە لیرەیەکی زیریشیان دەداتێ وەتا ڕێبازو، خەتی ئیران پیاویان لەگەل دەنیری. ٨

ئینجا سیمکو، ئەوەش ناشارێتەوە کە بەلێ وایەکە ئەمن بەچەشنی تۆلە وەرگرتن لە گە ل ئیرانیکان بزووتومەوە چونکە! باب و، با پیرم ،وە هەروەها خزمو، قەومەکانو، دوو براکانم بەدەستی ئەوان کوژراون. سەرئەنجام هەر ئەوانش سیمکویان لە نێو بردوە!

سیمکو زۆرجاران لە ووتارەکانیدا گوتویەتی کە بەڕاستی هەلوێستو، مەبەستی ئێمە، زیاتر مەسەلەینەتەوایەتی بووە، نەک تۆلە ئەستاندنەوە: "هەمووکەسدەزانێ تائێستا ،چبە سەر کوردەکان داهاتووە، کەسانوگەورەکانی پێشووی ئیمەوەک سمایلخان، عەلیخان، بەچەشنێکی زۆر زاڵمانە لە لایەن ئیرانیکانەوە لەبەینچوون. لەڕاستەقینە دا منکە ئێستا بۆ نەتەوەیکورد، هەول دە دەم مەسەلەی تۆ لە وەرگرتنش لە زۆر دارەکان، لەگۆڕێ دایە" ٩

ئەوەی کە وا بۆسمکو ڕوون بۆ تەوە، ئەوەیە کە حکومەتی پادشایەتی

ئیران قەت نەی ویستووە لەگەل داوای مافەکەیئەوان کە بە دەست هێنانیمافی سەربەستی گشتی ، یان مافی ناو خۆی واتە ئوتونومی بووە، ڕووی خویی بنوێینی وەدان بەسەر ئەومەسەلەیە دا بێنی.

جا با بڕووانینە ئەو نامیلکەیە کە سمایل ئاغا لەسالی ١٩٢٢ دا، بۆ زەفەر رودددەولە (فەرماندەی پایە بەرزی ئێران فەرماندەگشتی لە ئاذربایجان دا نوسیوە، سرنج بدەنێ: "ئیوە باش دەزانن کە هێندێک نەتەوەلەدونیایەدا هەن کە بەقە را چووار بەش لەبەشیک لە کوردەکان نابن، وە بە ئاواتی خۆیان کە مافی ئوتونومی یە گە یشتوون، چاوبنۆڕینە سەر ئالماشێکان کە بەو جورە دابین کراون" "ناوچەین"

"لەراستە قینە دا ئەگەر نەتەوەی گەورەی کورد، لەئیران دا بە مافی نەتەوایەتی نەگات، مردنو، نەمانی، لەژیان چاکترە (لەوکاتەی کە ئێستاکە ئێمەتێی داین، لەئاکام دا حکومەتی ئیران پێی خوشبێیان پێناخوش بێ، ئیمە مافی ئوتونومی مان دەوێ، جائەوە ئاواتی هەرمرۆڤیکی کوردە، وەژیانێکی نوی بوخەلکی ئیمەیە. [10]

بەلام سیمکو هەرگز ئەو کاتەی بونەهاتە پێشێ کە کوردستانێکی سەربەخۆ، یان ئوتونوم، دابمە زرێنێ، وەکاروباری و لات بەدەست بگرێ...

کۆڕی کانگای کلوبی کوردی شاریقوستەنتەنیە کە بە سەرۆیەکایەتی مستەفاپاشای کورد هاتنەلای سمایلئاغای لێیانپرسی: "تو کە دە تەوێ لەوزەویزارەی کە ئێستا کە بە دەستە وەیە، سازمانێکی حکومەتی دامەزێرینی، وە سەربەخۆبی، پەس ئالات بۆهەڵ نەکردووە؟

سمکو وەلامی داوە: لەکاتی حازردا سازمانێکی زۆر ڕێک و پێک بەڕێوە نەچووە. من مرۆڤیکی کوردم، وەرە ئەوو لاتەی ڕزگارکەین، هێندە کارێکی گرنگو، زلشە کە کێ حاکمو، ڕابەربێ. من لەو سەرزەمینە داپیاوێکنیم کە مەقام پەرستو، لەخۆ ڕازیبم. ئەوەی کە مەبەست لەئالایە،... من پێموانیە هێندە مەسەلەیەکی گرنگ بێ. بەلام پێویستە ئەوەش بزانین کە شکاک ئالای جور بەجوریان هەیە، وە هەرعەشیرەتەی ئالای خۆی هەیە، ئەوە تا کە بەچاوی خۆت ئەوەیباش دەبینی." [11]

لەئاخری سال ١٩٢١ دا سەرۆکەکانی شاری قوس تەن تەنیە کە ڕاپەڕینێکی

تەواویان لەکوردستان پێک هێنابوو، وەک کە لەپێش داباسی‌کرا، دەیانەویست کە سیمکوش بە وراپەڕینە پەیوەندبدەن وە مەبەستی ئەوپرسیارەی مستەفاپاشا کە لەسمایل‌ئاغای کرد، کە تولەجیات ئەوەی کە ئێستا کە لەگەل ئیران شەر دەکەی وە هێرشیان دەبەیە سەری، بۆچ نایەی لەپێش دا بە ئیمە یانی کوردەکانی، وان، ئەرزەڕوم، بتلیسو، هەکاری یارمەتی بکەی؟وە ئێستاکە، کە مال مستەفا قودرەتی بەدەستەوەگرتووە کاتی‌وەیە کە نەیەلین بەسەرئیمە دازال‌بێ؟

سبمکو وەلامی‌داوە کە من نامەوێ پردی بەینی‌خۆم‌و، تورکیە لەنێو بەرم، چونکە ئەوان‌چەکو، سازوبەرگم دەدەنێ.

بەلام شای‌وباس بوو کە سمکو بەو قسەیەی‌کەکردی، لەگەڵ پێک‌هاتنی (کوردستان‌ی گەورە) بەلێنی‌نە دابوو،وەیان لەخۆی ڕانەدیوەکە ڕابەری‌و سەروکایەتی بەدەستەوەبگرێ... بەلام مستەفاپاشا ئەوەی‌نەشاردەوەو، بە تووڕەئی لەبارەی سمکو دا گوت بووی کە: "سمکو بەنەزانی‌خویەوە بو کوڕەکەی نووسیبوو کە بەلێ من‌لایەن‌گری کە مالێکانم، چوونکە بە هەمووجوریک یارمەتیم دەکەن.

## ٣ ــ سمکوو، ئینگلیسێکان

سمایل‌ئاغا لەسالی ١٩١٩ یەوە، لەگەل ئینگلیس دەیەویست نێوانی خۆش‌کا، وەبەیارمەتی ئەوان چارەسەری مەسەلەی کوردبکات. ئینجا ئەوکارە بە ڕابەری سەید تەها دەهات بە ڕیوە ببردری، لەمانگی مەی سال‌ی ١٩١٩، تەهای لەرێگای هەولێرەوە ناردە بە غدایە کەلەگەل ئینگلیسیکان لەبارەی مەسەلەی کوردی‌ئیران ووت‌و، وێژبکات، تەها لەگەل ویلسون پیاوە ڕامیارەکەی ئینگلیس لە بابەت چلۆنایەتی مەسەلەی کورد زور دووا، بەلام سەرئەنجام "ناهومێد" ماوە، وە کە لکی لەووت‌و، وێژە کە وەرنەگرت. لەوکاتەدا کە پیاوی رامیاری ئینگلیس لەگەل نوێنەری کوردەکان گفت‌وگۆی‌دەکرد، لەبنەوەش ڕا لەگەل‌ئیرانیکانیش خەریکی گەپ‌و، گالتەی سیاسی بوو، وەلە ئاکاما ئیدارەی سیاسی دەرەوەی ئینگلیس دەری‌بڕی کە: "ئەگەر حکومەتی ئیران لەسەر چارە سەر کردن و کارەساتەکەی مەسەلەی کوردستان، بەڕاستی و چاکی‌نەیەتە پێشێ وە

ساوەساوی تێدا بکات ، دەبێ لەوەی بترسێ کە کوردەکان ، داوای جودائی بکەن "
وەئەوکارەش بۆ تاران لەوکاتە باریکە و ناسکە دا مەترسی زۆرە ، وەشایەد کە لە
ئاسۆی سیاسی ئینگلیسو ، فارسەکان دا بێ تە ئیسرنەبێ . ١٢

ئینجا لەسالی ١٩٢١ پاش ئەوەی کە سێرپرسی کاکس چۆتاران ، وە
لەگەل ئیرانیکان بە گفت و گویەکی گرنگ دانشت ، وەپۆستی تازەی لەشاری
بەغدایە وەرگرت ، کاروبار بەتەواوی گۆرابوو واتە لەوبەینەدا سەرۆک وەزیری
ئیران ووسووقوددەولە[13] پەیمانیکی لەگەل ئینگلیس بەستبوو ، وە وا ئاشکرا بوو
کە پاش هاتنی زیائەوددین تەباتەبائی وە کودتای مانگی فیوریبیەی سالی ١٩٢١
مەسەلەی ولات رەنگو ، ڕوویەکی دیکەی بەخۆی گرتووە ، وە دوو دەولەتی ئیران
وئینگلیس زۆر لەیەکتر نزیک بوونەوە .

سمایل ئاغا لەمانگی ژوییەی سالی ١٩٢١ واتە پێنج مانگ دووای کودتا ،
تا ئەو ڕادەیە گە یشت کە چاوپێ کەوتنێکی لەگەل یەکیک لە ساحیب
مەنسەبەکانی ئینگلیس شاری شنۆ بکات تا بەلکو پێک هاتنێک لە بەینی هەرودوکیان
دا وەدی بیت .[14] وە بە دووای وی دا لەگەل سێرپرسی کاکس لە مانگی ئوتی ١٩٢١
دا یەکتریان دیت ، وە لەو چاوپێکەوتنە بە پیویستی زانی کە دوو مەسەلان
لەوبەینەدا بە چاکی ڕوون کاتەوە ، وەلەئاکامابزانێ و ازی کوردستان چی لی دێتەوە ،
وە ئایامەسەلەی کوردستان کەلەسالی ١٩١٤ وە کە لەبەر چاوی دەو لەتانی
تورکو ، سوویەت ، وەئینگلیس دابووە ، بەکوێ دەگات .

دووەم دەبێ ئەو مەبە ستەش بزانێ کە ئایا لەنێو چوونی تاج و تەختی
پادشایەتی قاجار ، وە هاتنە سەرکاری ڕەزاخان دەبێتە هۆی ئەوە کە قازانجی
خەلکی کوردی تێدابێت ، وەئایالەووبابەتەوە مەترسێک لەگۆڕێدانیە؟ وەئایا
ئەگەر دەولەتیک کوردەکان لەژێر بالی خۆی دا ڕانەگری بە تەنیا لیی چۆن
لەچنگی ئیرانو ، تورک ڕزگاری دێت؟ سیمکو هەلوێستی ئەوەبوو کە بەهەرچونێک
بێ ئنگلیس ڕازی بکا کە لایەنگری بێو ، حمایەتی لێ بکات .

"سمایل ئاغائەو مەتلەبەی دووبارە بە وان گوت بوو کە "کەرەسەو ،
سازوبەرگی شەڕێ بۆ کوردەکان زۆر پێداویستە . ئەگەر تە دارەکی شەڕێ نەبێ
ئیمەتووشی نارەحەتی وچوێتی دەبین ! ١٥

ماوەی سێ مانگان ووتو ، وێژ لەبەینی کوردەکان وە پیاوەکانی ئینگلیس

درێژەی هەبوو، لەوبەنیەشدا بابەکرئاغای‌کورد کە لایەن‌گری‌ئینگلیس‌بوووە لەوکارە دانیۆنجی‌بوو. هاوبەشی لەگفت‌وگویەکە دادە کرد. بەلام پاش ئەوهەموو هات‌و، چۆیەو، ووت‌و، وێژە لەمانگی اوکتوبری سالی ١٩٢١ دا بە دەستووری دەولەتی ئینگلیس، لەبەر ئەوەی کە ئیران لەو مەبەستە و گفت‌وگویە نیگەران‌و، دڕدۆنگە ئیتر هیچ نوینەرێک بو قسەلێ‌کردن‌لەمەسەلەکەکۆنەبووە، تەنیا ئینگلیس بۆ ئەوەی کە بزانێ بزوتنەوەکەی کوردان لە چلۆنایەتی‌بەرگری ئەوان، کە ئیران بیتوو هێرش بەرێ بە کوی دەگات‌وە لەومەبەستەئاگاداربێت. ١٦

لەسەر ئەوەش‌ڕا مستەفاپاشا، سەرۆکی کۆڕی کوردی تورکیە، پلاری ئاخری خۆی هاویشت، وەهەولی‌دا کە ووت‌و، وێژیکی دیکە لەنێوان کوردەکان‌و، ئینگلیس بەرێوەببردرێ.

ئینجا هەردوک کۆڕی کوردی تورکیە وئیران بە ڕا بەرایەتی مستەفا پاشاوە سەیدتاها لەگەل ئینگلسیکان ووت‌و،وێژیکیان بەعەمەل هێناوە بەوانیان ڕا-گەیاند کە ئەگەر بیتوو ئینگلیس یارمەتی چەک‌و، ئەسلەحەو، سازوبەرگی‌شەڕێمان بداتێ وە بەئاشکرایی پشتیوانی کوردبێ، ئیمە دە تووانین ناوچـەی‌وان، ئەرزەروم، سیواس، حەکیاری، بتلیس بگرین‌وەلەسەربازەتورکەکانی پاک‌کەینەوە، وە دەرسێکی‌وا بە کاربەدەستەکانی‌تورک بدەین کە قەت لەبیریان نەچێتە وە تارە واندز یچین وە ئەگەر ئینگلیس بییەلێ تا شاری ئانکارا دەڕۆین. وەئینجا لە ئیران دا دەتووانین تا مەلبەندی سنە بڕۆینەپێشێ! ١٧

دەولەتی فەرانسەش کە هەروەها بە شوێنی مەسەلەی کورددابوو، باشی لێ حالی ببوو کە ئینگلیسیکان پاش بە ستنی پەیمان لەگەل‌ئیرانێ، ئیتر هیچ کاریکیان بە کوردەکان نەماوەوەچشیان بۆ ناکەن،وە مەسەلەی‌کورد لەبەرچاوی ئەوان لاچووە، وەپشت‌گوێی خراوە. بەلام‌لەسەرئەوەش ڕا سمکوش هەرچاوە ڕووانی یارمەتی لەوان هەبوو، سەرئەنجام کوردەکان لەودەم‌و، جەمەش‌دا هیچ کاریکیان بونە کرا. ١٨

### ٤ ـ سیمکو و تورکەکان

وە سەرئەنجام سیمکو بەوەی خۆ رازی کرد کە لەتورکەکان یارمەتی وەرگرێ!

ئەویش لەوەی دا مەبەستی دوشت بوو. مەسەلەی نەتەوایەتی کە لەنێو تورکەکان دا ڕەواجی‌هەبوو، بۆوی زۆر چاک ئاشکرابوو، وە دەشی‌زانی کە تورکەکـــان لەئیرانیکان بۆ کوردان دووژمن‌ترن"بەلام سیمکۆ هەرگز هات‌و، چۆی لەگەل تورکەکان نەبڕی وەچەک وئەسلەحەیەکی کە پیویستی بوو لەوانی وەردەگرت.[١٩]

تورکەکان لەبارەی سمایل‌ئاغا دا جووان قەزاوەتیان نەدەکرد، سەرهەنگ عەلی شەفیق (ئوزدەمیر) لەسەرەڕای کاری سمکو دا پیێ‌دەگوت کە پیاویکی (عەوام) و سادەیە، بیرو، ڕای قوولْ‌نیە "سفەتی حاکم بوونی‌چاک لەوی داهەیە".[٢٠] ئەو قسانەی ئوزدەمیرپاش چەن‌مانگان کاتێک گوترا کە سمکو تەواوی ناوچەی کوردستانی لەژێر دەستی دابوو، بەلام لەو کاتەدا حکومەتی ئیران هەولْی دا کە لەتورکەکان نزیک بێتەوە، وە ئەوان دژی کوردەکان هان بدات. ئینجائیران لە ٢٥ئوکتوبری ١٩٢٢ داخەریکی‌ووت‌و، وێژ لەگەل تورکەکان‌بوو. وە ئەوەش مەبەست بەیارمەتێک‌بوو کە لە لایەن‌تورکەکانەوەبەسیمکو دەکرا، وە هەروەها دەشیانەویست کە پێش لەیەکەتی و نفوزی ئینگلیس ـ فەیسەل لەناوچەکەدا واتەلەنێوعەشیرەتەکوردەکان‌لەمەلبەندەکەدابگرن‌وە مافی‌خۆیان لەونێوە دا دژی کوردەکان بپارێزن.[٢١]

### ٥ ـ سمکووەرووسەکان :

ئینجاسیمکۆ لەو ناوچەیەدا لە پشتیوانێک دە گەڕا، جاهەل‌و، مەرجی بۆهەلْ کەوت وە لەبەهاری سالی ١٩٢٢ داکوریکی بۆ باکویەنارد.[٢٢]

ئەوکاتە لەمێژوودا، کاتیکی زۆر ناسکو، عاستەم بوو، سمایل‌ئاغابەڕاستی وەختیکی باریکی هەل بژاردبوو! حکومەتی تازەی ئیران هات‌و، چۆی خۆی لەگەل حکومەتی شوڕەوی عادی‌وتەبیعی‌کردبوو. وەلەپەیمانی ٢٦ فیوریەی سالی ١٩٢٢ ئەو کارەی سەلماندبوو. وە هەروەها شوڕەوی یارمەتی سازوبەرگ‌و، نیزامی خوی لەسەرانی شۆڕشگێڕی کومونیستـــی گیلان بڕی بو (١٩٢١ ـ ١٩٢٠)

شکانی "جمهوری لایەن‌گری شۆڕەوی"لەئیران هەوەل و ئاخری دەورەی سمکۆیە.[٢٣] ئینجا حکومەتی‌شای تازەی ئیران پەرە دەگرێ وە دبێ کە پایـــەداربێ و، ڕاوەستێ: تەواوی عەشیرەتەکان‌و، خاوەن قودڕەتەکانی ناوچەکانی ئیران سەریان

بۆشا شۆڕ کردو، ڕام بـــوون وەئه سلەحەکانیان لێوەرگرتنه وەوه قودرەتی رابردوویان‌لی ئه ستاندنەوە.

لەمانگی دێ سامبری ۱۹۲۱ وە، ڕەزاخان سازمانەکانی هێزی ئیرانی وەک قەزاقەکان‌و، ژاندارمەکان وە هێزی ئەیالەتی کە تەواوی‌ئەوهیزانە ڕێکوپێک‌نەبوون وە هەریەک لەوانە سەربەخۆکاری‌دەکرد، هێنایە ژێر فەرمانی خـــوی وە دووبەرکایەتی لەنێو هەڵ گرتن وە یەکەتی‌و، یەکڕەنگی لەنێوئەوان دا پێک هێناوە بە سازوبەرگ‌و، ئەسلەحەی یەک جوور ئامادەی کردن.

سەرئه نجام ڕەزاخان دەبووکاری سیمکوش تەواوکا ،وە بەهەرچونێک بێ لەنێوی بەرێ. وەرەزاخان بەو نەتیجە گەیشت‌بوو کە پیرۆز بوونی وی یەک بە دووای‌یەکێ دابە سەر ڕەقیبەکانی ناوچەکە ئەوەبوو کە دەی‌زانی‌زۆر قودرەتێکی وایان‌نیە کەبتوانن لەبەرانبەر وی داخۆڕاگرن‌وەلەئاکام دا یەک‌بەدووای‌یەکێ‌داشکاون

## ٦ـ شەری مياندواو لەئاوريل ی۱۹۲۲دا

سه رله شکر شه يبانی فەرماندەی هێزی تازەی نیزامی ئیران لەمانگی ژانوییەی سالی ۱۹۲۲ دا هاته شاری تەورێز، مه به ستی ئەوە بوو کە ناوچەی کوردستان له ڕووانگەی نیزامیێوە هەڵ سەنگێنێ و کاره سا ته کەی سەنگ و سوک کات: لەمانگی ئاوریل‌ی ۱۹۲۲ ئه و هه لۆیستەی به جێ گەیاند، واته ٥٠٠ پیاوی سەربزێوو، سه کیشی خەڵکی گێلاێنی لەژێر فەرمانی خاله قوربانی. دانا، کە بۆشاری سابلاغ "مهاباد" هیرش‌وهوروژم بەرێ. ئەوهیزه کە گه یشته سابڵاغ سامل ئاغاله پێشدا دەستی لی وەشاندن، همه ڵمەتی بو سەر بردن. هێزە کە تێک شکاو، خاله قوربانی

*ردین‌سپیکانی‌مهاباد دەگیرنەوە کەخالوقوربان بەدەستی‌کاک سوارەی‌مەنگور لەدیی ایندرتاش داکوژرا. ئەوهەلبەستەش سەرەتا ی‌زارەویەکن کەگوتراون*

ئافەرین سوارەئە سلەمەنگوری *لینگی‌داخالوی ،خالوی‌زگدری...*

←

ش لە و شەڕە دا کوژرا !

ئینجا سێ‌مانگ هێزشی دیکەی دەولەت وە دووا کە وت وە سمکو لە کەمین دا ڕاوەستا بو. ، هێزی خالە قوربانی کە لەیەک بڵاو ببوو ڕەسیتان لە شەر کیشاوە ، پەڕش و بڵا بوون . ئترئاداری لە سەر پاداری نەما ، وە لە بە ڕەنگاری دا

لەگەل کوردەکان وازیان دینا .

ڕە زاخان وەزیری تازەی شەڕ ، بە وا بە ستەی نیزامی ئینگلیسی ڕا گە یاند کە دە ولە تی ئیران تووشی مەسەلەیەکی زۆر زل بووە ، ئینجا بۆ ڕا پە ڕاندنی ئەو گیرو گرفتە پێویستی بە پوول و پارەیە ! وە هەروەهاگوتی : ئەگەر ئەو یارمەتیە زووبکرێ ، من لە ماوەی چەن حەوتووان دا دەتووانم هیزی سیمکو بشکێنیم و ، تەرت و توونای بکەم .

مەسەلەیەک ،کە بوڕەزاخان‌هات بۆپیشێ ، وە زۆری لەبەر نارەحەت‌بوو ، وەلەبەرئەومەبەستە نەی دەتووانی لەگەل سیمکو ڕووبە ڕووبێ ، وە دژیوی دەست بەکاربێت مەسەلەی ! هیزی سنە بوو ٤٠٠ پیاوی کەم چەکو ، بێ‌سازو ، بەرگ : فیشە کەکانێکی کە سالەکانی پێشوو بۆ تفەنگی رووسی لە قشونی ئیس فەهان دا ئامادەیان کردبوو[٢٥] وەناربوویان ، لەگەل فیشەک و تفەنگیکی کە لە هیـــزی کوردستان دا بوو ، فەرقی‌دەکرد ! سیمکو لەو دەمەوساتەدا ، وازی زۆرباش بۆ هاتبۆپێشێ ، وە کاتێکی چاکی بوهەل‌کەوت‌بو ! هەر چەند لە بابەت سازوبەرگی هێز زۆر تەیارنەبوو ، وە بوغزوکینەی هێندێ لەکەسەکان‌و ، هەوال‌دەرەکان بە حکومەت ، پێشی لەکارەکانی‌وی‌دەگرت ، بەلام دەی تووانی نفوزی خوی تاو لاتی خوواروی کوردستان یانی‌جنوب پەرە پێ بدات وە بەرگریشی‌لێ‌بکات ، وە ، لەو هەل‌کەوتە کەلک ،وەرگرێ بەلام‌لە مانگی‌ژوئن‌ی سالی‌١٩٢٢ سمکو لەوەلاتی شەمزینان لەگەل کۆڕیکی تورک بە سەروکایەتی حەیدەربەگ والی‌قەدیمی موسل چاو پێ کە وتنێکی کرد : بەلام‌ئە و کۆڕە لەبەرئەوەی کە ئینگلیس چاوی بە

خالە قوربانی ردین پاش وپیش ... هەستە لە خوی ........

خالە قوربانی ردین کلکە کەر ... هەستە لە خوی منگورت هاتە سەر

عەراقیێوە بوو ، وەنیگەران‌بوو ، لەبارەی مەسەلەی‌کوردنەدووان‌و ، باسیان نەکرد .
لەمانگی ژوئیەی سالی ١٩٢٢ تەواوی یارمەتی تاران حازرو ، ئامادە ببوو ،
ساحیب مەنسەبی‌تازەی هێزی ئیران ، سەرلەشکرجهانبانی بوو ، کە لەشکری گاردی
تاران وە هەروەهاهێزی تەوریزشی‌لەژێرفەرمان دابوو ، ئەوهیزە لەتارانی ڕا هات
بوو ، وەلەمەجموع دالەگەڵ "هێزی تەوریز" هێزێکی گەورەی ئازربایجانی
پێک هێنابوو ، وەجگە لەو هێزە ، هێزێکی داووخووازی هەرمەنی لەژێر فەرمانی
ساحیب مەنسەبێکیەنێوی بە گزورابوف کە ئەفسە رێکی روسیەی تزاری بوو
حازربوو
لە گشت‌دا ئەوهێزانە بریتـی لە ٨٠٠٠ کەس‌بوون کە لە شمالی دە و
رووبەری‌بەحری ورمێ‌دا جێگیرببون .
کە سەرئەنجام لە ٢٣ ژوییەی سالی ١٩٢٢ دا بۆلای شاری سەلماس وەڕێ
کەوتن [1]

## ٧ ــ شەڕی شەکەریازی (٢٥ی ژوییەی ١٩٢٢)

شەڕی ئەومەلبەندە زۆر قورس‌بوو ، وەلە کردەوەدا لە ٢٥ی ژوییــــە
لەشەکەریازی دەستی پێ‌کرا . کوردەکان چووارجار بۆ سەرهێزی پیادەی ئیران
هێرشیان برد وە هە تا جەرگی‌پیادەنیزام نفوزیان‌کرد ، شەڕبە خەنجەڕو ،
شمشیردەکرا ، وەدلێرانە لە قەلبی هیزی ئیران دا رخنەیان کردبوو ، بەڵام
لەئاکام‌دا پیرۆزنەبوون‌و ، پاشەکشەیان کرد .
سمکو ئەوجار بە سووارەکانێ هێرشی دەست پی‌کرد ، بەڵام لەبەر ئاور
بارانی گوللەی چەکەکان پاشەکشەی کرد .
گوللەی توێپی کوردەکان ــ کە دەنگی دەهات‌و ، داوێژ را ، زۆر چاک وە
نیشانە نەدەکەوت نیشانەگیرەکان تورکەکان‌بوون ــ بەلام زۆریان لە گوللەکان

١) لەمیژووی ورمێ دا (تاریخ اورمیه) کە نووسەرەگەی (تمدن) بوو ، ژمارەی
سەربازەکان و ، چریکەکانی ئیرانی پترلە ١٥٠٠٠ کەسی نووسیوە ، کە
ئەوهێزە هەمووی هیرشی‌هێنا سەر سمکو . وەرگیر ــ م ــ ر

نەدەتۆقین ، وە سەرئەنجام کوردەکان پاش نیوەڕۆیە گەڕانەوە دووایە وەپاشەکشە یان کرد .

سمکو کە لەو شەڕەدا ١٠٠٠٠کەسی لەگەڵ بوو ، بەلام لەوبەینە دا پترلە هەزار نەفەری لەگەل نەما ـ وەئەویش تەنیا عەشیرە تەکەی خۆیبوو کە هەتا ئاخر لەگەڵی بوو !

بەوجوروە سیمکو لە بەرانبەر هیزی ئیران داشکا.[٢٦] بەشوێنی شکانەکەی داهیزی ئیران ئاهەنگی وورمیێ کرد وە لە مانگی ئوت دا پاش ئەوەی کە کوردەکان چووارسالی ڕەبەق ورمێیان لەبەر دەستیدابوو ، گریتانەوە !

پاشان هیزی ئیران بۆلای چەهریق کە کانگای ناوە رووکەی هێزی سمکو بوو ڕۆیشت وە لەکاتیکدا کە هەتاسنووری تورکیەدە چۆ پێشێ ، لەفەرماندەی هیزی تورکانی ویست کە پارتیزانەکانی کورد چەکبکاوە ئەسلەحەکانیان لێ بستینێ .

## ٨ ـ شەڕی ساری تاج (ئوتی١٩٢٢)

سمکو هیرشی هێنا سەرئە و هێزەی کە هەتاسنوور هات بوون ، وە لە قە لە- ڕە شەدا ، ئەوانی مەجبور کرد کە بگەڕێنەوە ، وە پاشەکشەی پێدان... بەلام سیمکو لە هەزار پیاو زیاتری هێزلەگەڵنە بوو ، وە هێزی گەورەی نیزامی ئیران بو یارمەتیان هاتن ـ وە تاقمیکی تۆپخانەی لەگەل بوو وە کوردەکان پەنایان بوکیۆی ساری تاج برد ، وە لەویش ڕا لە لایەن هیزی تورکانە وە ، هێرشیان بۆ هاتوە پاش شەڕێکی قوڕس شکان . وە سەرئەنجام سمکو "پەنای بۆ تورکیە برد" وە هاوڕێیە کانی لەلایەن تورکەکانەوە چەککران .[٢٧]

## ٩ ـ دوورکەوتنەوەی سیمکو لەوەڵات :

سبمکو لە ئوکتوبری ١٩٢٢ پاش لەنێو چوونی شور شەکە خۆی گەیاندە شاری هەولێری عەراق ، وەتەواوی چەکوئەسلەحەکانی کە بریتی بوون لە :

توپ، ڕەشاش، وە سازوبەرگیجەنگی لەدەستدا، خێزانی کوژرا، کوڕی لە تەمەنی دەسالەیدا "گلێنەی هەردوک چاوی" لە بەندیخانە کرا، وە بە چاوی خۆی دەیدیت کە ئینگلیسێکان بە ئاشکرائی لەدەوڵەتیئێران لایەنگری دەکات، وە بەیارمەتیو. قەوەتی وی بوو( کە ڕاپەرینەکەیتێک شکاوە، وەهەربەوجورەش لەتورکەکان زۆر داغدار بوو کە لە کاتی کشانەوەکەیدا، جگە لەوەی کە یارمەتی نە داوە، بەڵکو بە سەریشی دا داوە، وە پەناشینەداوە.[28] ئەو مەبەستەی کە لە مێژوو دا بۆمان ڕوون بۆتە وە، ئەوەیە کە سمایل ئاغا دەیەویست کە بۆ خۆی ببێتــە ڕا بە ڕێکی کورد کە لە نێوان دووحکومەتی ئیران و تورکیە دە ولە تێکی کورد بەهەست بێنێت، وە ئەویش بە یارمەتی ئینگلیس. لەکاتی ئاخری ڕاپەڕینە- کەی دائینگلیس پیاوێکی ڕا میاری خوێ بەنیوی سیرژان ئیدمونڈ ناردە لای سیمکو وەووتو، وێژیکی دوورو، دریژی لە ۱۲ نوامبری ۱۹۲۲ دا لە گەل کرد، وە بە چاکی پێی ڕا گە یاند کە لەوعانەیدا کە ئیران و تورک تەواوی سنووریان گرتۆتەوە، وە تورکەکان دەیانەوێ بۆسەرشاری ڕەواندز هێرش بەرن، ئیتر هەموشتێک تەواو بووە وە ئێمە ناتووانین، لە ئێوە لایەن گری بکەین

## ۱۰ ــ پێشوازی شێخ مەحمود

سمکو کە بەباشی لە فرۆفێلی ئینگلیسێکان گە یشت بوو، لەسەید تەهای جوی بوۆە وە بۆ لای شاری سولەیمانێ وەڕێ کەوت، وەلەمانگی ژانوییەی سالی ۱۹۲۳ دا کەگەیشتە سولەیمانێ بە چەشنی سەرۆک دەولەتیک لەلایەن شێخ مەحمودە وە پێش وازی لێکرا! حەوت تۆپیان بە حورمەتو، ئیحترامـــــیوی هاویشت، دوکانو، بازاریان بۆدا خست، ئینجا سیمکو لە بەرانبەر هێزی نیزامی کوردی سولەیمانیدا کە بە خاتری وی ڕازا بۆوە، بە شانازیوە "سان"ی دیــت!

بەڵام لەپاشان سیمکو زۆر بەباشی لەلایەن شێخ مەحمودەوە کە داوای یارمەتیلێ کردبوو، ڕێزی لێ نەگیرا وە وە لامی نە دراوە. ئینجا لەو نیوەشدا دەهات کە نیوانی حکومەتی بە غدا و سولەیمانیش ناخۆشبێ، وەشێخ مەحمود کە لە سولەیمانێ حکومەتی دەکرد، نەیدەویست خوێ لە کێژاوێک باوێ کە تەنانەت قارەمانی کورد لەکارەکەیداسەرکە وێ وە قازانجێکی بوویش نەبێ. [29]

سیمکو ماوەی مانگێک لەشاری سولەیمانیٚ ماوە، لەوبەتیەدا نیٚوانی شیٚخ مەحمود لەگەڵ ئینگلیسیٚکان ناخۆشتر ببوو، ئەویش وازی لە سولەیمانی هیٚناو، لەویٚ نەماوە. ٣٠

## ١١ ـ ساڵەکانی سەرگەردانی

سیمکو گــەڕاوە وڵاتی تورکیە، خوی شاردەوە، وە ماوەی ساڵیٚک لەویٚ ماوە، لەساڵی ١٩٢٤ هاتەوە وولاتی ئیران، لەگەل سەرلەشکرتەهماسبی کە سەرۆکی هیٚزی شمالی ئیرانیٚ بوو، چاوپیٚکەوتنیٚکی کرد، لەسالی ١٩٢٥ دا چۆوە چەهریق، ڕەزا شا لاواندیٚوە، دلداری داوە ئەویش سوێندی خووارد کــە ئیتر تا (ئەبەد) کاری بەکەس نەدابیٚ

ئینجا پاش ساڵیٚک سەری بلند کردەوە، وەبەیارمەتی چەن‌سەد مرۆڤی هەرکی، هیٚرشیان بۆ سەر شاری سەلماس بردو، گەماڕۆی شارەکەیان‌دا. بەڵام ئەو کە رەتەش شکا، وە تا سنووری ئیران ـ تورکیە کشاوە، لە سنووری تورگیەدا گەماڕویان داو، بیٚچەکیان کردو، گرتیان، پاش چەن مانگیک واتە لەئاخری ساڵیٚ ١٩٢٦ دا گە ڕاوە عەراق ئنجا لە سالی ١٩٢٧ دا گە راوە تورکیە، وسەر لە نوی لە سالی ١٩٢٨ گە راوە عراق وە چەن‌پیاویٚکی‌خۆی زیاتر لەگەل نەبوو. دەولەتی‌ئیران داوای وەرگرتنەوەی سمایل‌ئاغای لەدەولەتی عەراق کرد، بەلام عەراق بەئیرانیێ وەلام داوە کە ئەوە مەسەلەیەی پە نادانی سیاسیە. ٣١

ئینجا سیمکو پاش ماوەیەک کە لەعەراقیٚ ماوە، لەئاکام دا گەڕاوە ئیرانی وە بووبە حاکمی شاری شنۆیە، سەرئەنجام پاش چەن ڕۆژیٚک، سبمکو لەسالی ١٩٣٠ بەدەستووری‌ڕەزاشا بەمەرگ مەحکوم کرا، وەبەدەستی سەربازەکانی‌ئیرانی کووژرا[١]

١) *لەمیزووی کوردستان‌وکورد، (د ـ ق) داگوتراوە کە بو ووت‌و، ویــژ بانگ‌کرا شاری شنو، وەلەویدا بە ناپیاوی کوشتیان، کەئەو نووسراوە وگوتراوە دروست‌ترە. . . وەرگیر. م ـ ر*

سوویەت
ماکو
ئەرەس
خوی
قوتور
ئەزدیکان
شەکەریازی
چەریق
تورکیە
شاپور
تەبریز
بەحری ورمێ
مەراغە
ئیران
میاندواو
ئوشنو
مهاباد
بوکان
سەردەشت
سەقز
زابی چکولە
بانە
دیواندرە
عراق
سەنەندەج
حەلەبجە
هەمەدان
خانقین
کرمانشاه
کوردستانی ئیران
سنوری ناونەتەوەئی
0 50 100 Kms

# فه سلی ۳

## ـ شۆڕشی شێخ مەحمود .

من هەرگز لە هەوە لێوە هەوڵ نادەم کە پادشایەکی دانێم کە گەورەو، عاقل‌وبەمشوربێ .!. "ئەو ڕستەو، ووتەیە؛ ژێر ترۆدبیل‌دەسیتارو، یارمەتی‌دەری سیرپیرسی ۱دسوە ئار نولدویلسون پیاوی‌پایە بەرزی ئینگلیسیکان لـــە بەیان‌نامەیەک‌دا نووسرا بوو، لەبەغدا ،بڵاو ببۆوە لەوبەیان‌نامە بە ناوبانگە دا بە چاکی ڕوون ببۆوەکە ئینگلسیکان پێیان لەوەی نابوو کە ناتووانن پادشایەکی ئەوتو لە و لاتــی عەراقیدا داهاتوودا دابنێین کە لەقودرت‌کەڵک‌وەرگرێ، بەڵکو پاوێکی وەک فەیسەڵ‌بۆپادشایەتی باشەو، کار وباری ئەوان ڕاست دەکاتەوە.

لایان گرانی سیاسی (ئیمپراتوری) ئینگلیس دەیانەویست کـــــە بەین‌ئەننەهرێن هەروەها لەژێر چاوە دێری ئینگلیس بمێنێتەوە، چوون بیرو ڕای ئەوان وابوو کە ئەگەر ئەو ناوچەیە بێتوو لەژێر چاوی ئستعمارگەری ئینگلیـــس دابچێتە دەرێ، بێ‌گومان بە دوویویدا ، مەلبەندی ئیران تووشی نالەباری‌و، سەربزێویوو، بزوتنەوە دەبێ وە دە ڕووخی . ئینجا و لاتی پان‌و، بەرینی هندوستان‌ش لەدەست دەچێ‌و، دەڕووخێ، مەبەست‌ئەوەبوو کە حکومەتیکی لایەن‌گری ئینگلیس دەبێ‌بێتە سەرئیش‌وکار، وە بەووتە ویلسون جاهەرچونێک بی قەیدێ ناکات . ۲

پاش شۆڕشی وەحشتناکی هاوینی سالی ۱۹۲۰ کە چەن سەدکەسێک لە

سەفی هێزی نیزامی ئینگلیس،وە سەربازە هندیەکان کوژران، ئیتربۆقودرەتمە ندەکانو، کاربەدەستەکانی مەلبەندی بەینئەننەهرێن چارەیەک نەما کە دەبوو هەل بژاردنێک بەهەست بێت، وە ئەوەتاقی کردنەوەیەک بۆ سێرپێرستی کاکسبوو کە دە بوو پاش دانانی نەزم و تەرتیبێک حکومـــەتێکـــی (نەتەوایەتی) لەوڵاتدابەهەستبێت.

### ١ ــ ئەمیرفەیسەل

فەیسەل لەسالی ١٩٢٤ی مانگی ژوئیەدا لەشاری دیمەشق کە لەلایەن دەولەتیفەرانسە وە دەرکرا بوو، وە بەخۆییو ٢٤ ژن و ٧٥ (پیاوی تایبەتی گاردی حجاز، وە ٢٥ ئەپسی سوواری وە ٤ تون باروشتمە کەوە سەرگەردانبوو، وە دەسوورا وە لەپاشان لەئوردونی مابۆوە ٣

فەرانسەویەکان فەیسەلیان بە پیاوێکی نالایقو، خۆیری و زعیف دەناسی، بەلام دەیان گوت لەسەرئەوەشەرا کە پیاوێکی بە زیپکە، پیاوێکی خەتەرناکو، هارە،[٤] دەی زانی کـە ئینگلیسیش لە بیرو، رای‌وەیدا کەلەبەینئەننەهرین دا بیکەنە پادشاوەتاجی لەسەرنێن... وە گورزون[١] پیاوی ئینگلیس بیرورای وابوو کە بە هەلە ئەوکارەنەکرێ وە گورزون کەئەوپێشنیارەیدابوو لەبەینو، بەیندا زورکەم لایەنگریئەوبوو، وە دەیگوت کە بە چاکیدیارە کە فەیسەل لە دیمەشق (پیاوێکی زەعیف و ناتووان) بوو وە "ئشکەرنیک زیاترنەبوو" . ٥

بەلام ئەوەشیان بۆروون ببۆوە کە دانانی (جمهوریک) لە ناوچەکەشدا "دژی ئاکارو، رەوشتی ئیسلامیە"[٤] وەئینجا پیاوی دیکە شلە مەلبەندەکەدا کەمبوون، لەئاکاما گورزون، وەحکومەتی بریتانیای گەورە، رایان هێنا سەر ئەوەیوە پاش دووهەمین کون فرانسی قاهرەلە( ٢٤ ـــ ١٢ مارسی ١٩٢٤) کە فەیسەل بێتە یەکێ لە پادشای بەینئەننەهرێن وە ناوچەی کوردستانش بەرەی پی بدرێ!

---

(١) گورزون: *میژوونووس پیاوی رامیاری وبەناوی ئینگلیسبەلەسالی١٨٩٤دا میژووی "ئیران"ینووسیوە. وەعلیجواهرکلام بەفارسیوەریگیرا وەتەوەم ـــ ریانی*

نەتیجەی بەرە پێدانی ،قەلەمرەوی‌کورد لە خاکی عەراق دا لە دووشتان بریتی‌بوو: پاش ماوەیەک کە لە کون فرانسی قاهرە را بردبوو، ویلسون‌گوتی کە تەسمیم‌بگیرێ لەسەرپرسین لە خەلکی کورد ــ کە لە ٦ی مەی ١٩٢١ دابەڕێوە ببردرێ،بپرسێ‌چەشنی سازمانی ئیداری پێیان خوشە چۆن بێ، ئایا دەیانەوێ‌لە ژێر چاوەدێری حکومەتی عەراق دابمێننەوە ــ وەبنوسن کە ئایاچەشنی‌هاتو،چۆ لەنێویان لەمەسەلەی ئەساسی داچون بەڕێوببردرێ ــ ئایا ئیوە کوردەکان دەتانەوێ بەچەشنێک لەژێرچاوەدیری حکومەت‌دابن ــ ئایاخۆ لەوکارە ناکێشنەوە وەپێ دزەی ناکەن.

هەلّ بژاردن بەڕاستی لە شەرایتێکی سەیردا کە باوەر نەدەکرا هاتە پێشێ: لەشاری سولەیمانی‌دا هەر دەنگەی واتە هەر ڕەئیەی کە دەدرا بەنرخی ١٠٠٠ ریال لەمالەکان دەکڕدرا!

لە٢٠٠ کە سان، ١٩٠ کەس دەنگیان‌دا، وە٣٢٥٪کەس گوتبویان کە سولەیمانێ دەبێ لەژێر چاوە دێری عەراق دا بمێنێتەوە.

بەڕاستی ژمارەو، دانشتووانی فەقیر، دەنگی فەقیرشی دەبێ"

ئینجاخەلک‌بو چووارڕەیانێک داوەت‌کراوەگوتیان‌کەبەدەس‌هەلنیان دەنگی خۆیان دەربڕن. کە ئایا دەیانەوی لەژێرچاوەدێری ناوچەی عەراق دا بمێننەوە؟ بەلام حسی نەتەوایەتی بە چەشنێک بە هێز بوو کە دەنگێک بلند نەبوو کە ئەو بەڵێنییێ‌بدات، تەنیالە گەڕەکی چولەکان، لە ٩٢ کەس موافق ٤ کەس‌ش دژی ئەوکارە دەنگی خۆی دەربڕی.

لەگەڕە کە کانی دیکەی سولەیمانێ‌دا قائم مەقام هێندێ پیاوی بودێیەکان نارد. لە ٦٠٠٠ دەنگ،٥٠٠٠ دەنگ ڕەئیان‌دا کە لەژێر حمایەتی عەراق دا نامێنێنەوە، وە ٣٢ کەس‌دەنگیان نەدا (ممتنع) بوو، وە دیار بوو کە ئەوان لایەن گرەکانی بریتانیابوون. لەنێوان گفت و گوێەک لەگەل ئەفسەرێکی ڕامیاری ئینگلیس‌گوترابوو کە چووار پیاوی گەورەو، نێوناسی کورد سەبارەت بە پێش‌لێ گرتن لەکاروباری گمرک دا دەنگی مەنفی‌یان دابوو. بەلام لە گشت داخەلکی سولەیمانێ لەوەی مەترسی هەبوو کە لە ژێر چاوەدیری عەرەب‌دا ماندنەوە، کاری کوردەکان خراپ دەکات."

کمیسەری ئینگلیس کە ئەو کارە ساتەی لەسولەیمانێ چاوپێ کەوت ،ئیترلە

شارەکانی دیکەوەک دەهۆک، زاخۆ، ئاکرا، هەولێروە ئامادیا، خۆیکیشاوە — وەڕایگەیاند کە ئەگەر مەجلسن پێکهات، ئەو وەخت کوردەکان بەمەیلیخۆیان بڕیاربدەن. واتە "گەورەکانی دانشتگەی شورا" تەسمیم دەگرێ. لەهەولێر دا هەربەوجوورە لەسەر ئەوڕاوتە دبیرەبوون کە شورای گەورەکانی تورکمەنی شاری قەدیم بۆ مەلبەندێکی کورد دەنگ بدەنو، تی کوشن وە تە دبیر هاتە سە رە وە ی کە جگە لە سولە یمانی بوجاری دوەم دە نگ وە رگرن بودانانی فە یسە ل لە ناوچە ی کورد داتە سیم بگیری.

**٢ — ڕێفراندووم — دەنگ وەرگرتن و پرسیارکردن**

ئەوجار سێرپێرسیکاکس کمیسەریعالی سیاسی و لات کە تازە لەشاری لەندەنێ ڕا بە بنهەنگلێکی، پڕ لە پەروەندەکەڕا بوەو ناوچەکەدەیەویست کارەکە ڕا پەڕێنێ.

بەفرۆفیلێکی کە بو خۆی دەیزانی دەست بەکاربو، وە لەمەلبەندەکانیدا لەهەرجێگایەیبەجۆرێک کایەی دەکرد.

دەستی بە دەنگوەرگرتنو، ڕێی وەرگرتن کرد، لەهێندێ لە ناوچەکان ڕا کە دەهاتن ڕێیان دەدا، پیاوێک وەژوور کەوتە دە فتەری هەڵ بژاردنو، گوتیمن دەنگی خۆم بە "بەلێ" دەردەبڕم، بەلام من دەنگدە دەم بە کە سیکی تەمەنیوی لە ٢٠سال پتربێ وە بۆنوێنەربێ

ئینجا ئەندامانی کمیسیونی هەل بژاردنی ئەو دەفتەرە، هێنایان ئەویان سەبارەت بەوقسەیە لەڕێزەی نوێنەران نووسی!

وە هەروەها یەکێک لەسەرۆکەعەشیرەتەکان ٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ کە سی کە کۆکردبوەوە، هەمووپێکەوە چاویان لەسەرۆکەکە کردو دەنگی بەلییاندا.

بەلام هەرئەوفرۆفیلانە یەکو، دوونەبوون: لەشاری کەرکوک لەژێرچاوە دێری سێرپێرسی کاکس کۆڕێکی ئیداری لایەنگری ئینگلیس دانرابوو کە ئەوکۆڕە بە قازانجی فەیسەلدەنگیوەر دەگرت!

ئینجا لە هێندێ لە کۆبوونەوەکانینهێینی دا تە سمیمیان جۆرێکی دیکەدەگرت. لە ٢٣ ژوییە دا لە کوبوونە وەیەکدا کە موفتێک لەوێ حازر دەبێت، فتوا دە دا کە دژی فەیسەل (فتوای مەزهەبی) بدری!

لەوکاتو، سەردەمەدا سێرپێرسی کاکس ووتارێکی سەیرو، پێکەنینداری

گوتبوو: "ئەگەر گەلی عەراق وە هەروەها کوردەکان، بەڕاستی نایانـــەوێ حکومەتێکی عەرەب بسەلمێنن‌وە ئەمیر فەیسەڵیشیان بەو حکوومەتەوە ناوێ، وادیارە هەڵوێستیان ئەوەیە کە دەیانەوێ لەژێر ئاڵای ئینگلیس دابن" !

ئینجا لەسەرچاوەیەکی ڕەسمیۆە زاندرابوو کە کوردستان دەیەویست بۆ خوئی لەژیانیکی ڕا ستەقینە بە شداربێت، جا بەهیچ چەشنێک نەدەویست فەیسەل بەسەری داپادشایەتی بکات، وەیان بیێتە ژێر چەپۆکەی ئستعماری ئینگلیس.

لە ١٨ ای ئوتی ١٩٢١ دا کە ڕێفراندووم بە ڕێوە چوو، وە نەقیـــب ڕای گەیاندکە ٩٠% لەسەددا (نەوەد) کەس دەنگی بەفەیسەل داوە، ئیدی کار لەکارترازابوو، وە شیعەکانی لای خوواروەی وڵاتش کە وەک کوردەکان دژی فەیسەل کاریان دەکرد، چیبیان بۆنەکرا. ٩

لەئاکاما لە ٢٣ مانگی ئوتی ١٩٢١ دا ئەمیرفەیسەل کوری شەریفی مەککەی بووبە پادشای عەراقێ وە بەو ووتەیەی کە... کە پادشانیسێ خوودالەئەرزێ! دەنگ و ڕای شارەکوردەکانی وڵاتی عەراق بۆوە بەهیچ، وە ئینگلیس پێی لەتەواوی ئەو مەبەستانە خشاندەوە نوێنەرەکانی سولەیمانێ وکەرکوک وەهەل بژاردنەکەیان بەتەواوی وەپشتگوێ خرا. ١٠

## ٣ ــ شاەفەیسەڵو، کوردەکان

بەڕاستی پیاوێک، یان باشتربڵێین (ئشکەرنی) کورزون لەعەراق دا تاجی پادشایەتیێ لەسەر داندرا کە تەواوی ئاکارو، ڕەوشتی ئینگلیسیانی هەبووە تامەزروی قودرەتو، دەستەڵات بوو.

چرچیل لەوبارەی دا ئاوای نووسی بو "من بە ڕاستی لەو هە موو تێلێ گرامە دوورو، درێژەی کە لەسەر فەیسەڵوە دە ولە تە کەی دەکرا، ماندوببووم، وەماوەی شەش مانگە کە لەسەر ئەو نووسرا وانە وە خەرجی هوتێلی لندەنێ حیساب دە کری وەڕۆژ بەدووای ڕۆژێ هەواڵو، پەیامی ٨٠٠ ووشەی دێ، وەلەسەرئە و مەسەلەیە دە ڕووا کە دەبێ ئەو پەیکرە هاتو، چوو، نیوانی لەگەل قودرە تە کانی دەرەوە چۆن بێت." ١١

ئەومەبە ستە پێک هات وە ئینگلیسیکان بەڕاستی لەبارەیفەیسەلدا باشیان فکر کردەوە وە ئەویان بە پادشایەتی گەیاند، فەیسەلش ئەو ئارەزوێی هەبوو: کە بتوانێ سنوورەکانی گەورەکاتەوە وە قودرەتو، دەسەڵاتی خۆی پەرەپێبدات.

هەر لەبنەرەتڕا مەسەلەی کورد، مەسەلەیەکی گەورەوگرنگبوو: فەیسەل سەرئەنجام بەو جێگایەی دەگەیشتو، دەیگوت کە ئەگەر زۆر بەتینو حەراڕەتەوە لە بیری بە هەست هێنانی دەولەتێکی عەرەبی سەربەستبم لە ئاکاما ئینگلیسیکان "کوردەکان هان دەدەن وە دژی عەرەبەکان ڕاستیان دەکەنەوەوە ئەوەش بەئیشتیای مەنیە" ١٢

مەسەلەی کورد بۆ پادشای تازەی عەراقێ ڕووانگە یەکی دیکەی هەبوو کە بەڕاستی زۆر گرنگ بوو:

فەیسەل لەلایەن عەرەبێکی کەمی سوننی مەذهەبەوە لایەنگریلێدەکرا کە لە بە غدایە نشتەجی بوون، وە تەنیا لایەن گرەکانی، ئەفسەرانی بەینئەن— نەهرینبوون کە لە حیجازو، سووریە ڕا لەگەلی بوون. بەلام تەواوی بەین ئەننەهرێنی خوواروو کە شیعە مەذهەب بوون هەموویان لەگەل کوڕی شەریفی مەککەی دووژمنایەتیان دەکرد کە سوونیبوو... ١٣

وەلە مانگی سپتامبری ١٩٢١ لەکاتێکدا کە گومانیدەبرد کە دەتوانێ لەگەڵیان خۆ ڕێک خات، وە تا بتوانێ لەگەل شیعەکان ڕێ بڕووا وەپاشان بەسەریاندا زاڵ بێ هەل بژیر درا و، بووبە پادشا یە ک کە چی لە بەر چاونە بوو.

فەیسەل لە سیرپیریکاکس کمیسەری عالی ئینگلیسی پریسارکرد کە ئەگەر کوردەکانی ئیران بیانەوێ لەگەڵ کوردەکانی تورکیە (وە هێندێلە ناوچەی کوردی عەراق) وەیانتە واوی ناوچەی کوردەکان جودابېنەوەو، ببنەیەک" ئینگلیس لەو بابەتەوە چ دەکات؟" ١٤

ئەگەر بیانەوێ کە تەواوی سەزرەمینی کوردان لە خاکی عەراق ڕا ببێتەیەک پاڵ وەکوردی شمال بدەن؟ ئەو وەختی چۆن دەبێت؟"

وە لامی سیرپیرسی کاکس زۆرسەر ئاواڵە نەبوٚوە گوتی: پاش ئەوەی لەکون فرانسی قاهرە لە مارسی ١٩٢١ دا دەولەتی بریتانیای گەورە ڕای هێناسەرەوەی کە دەولەتیکی سەربەخۆیی کوردپێک بێت مەبەستی کوردی عەراقێ

نەبوو" وەئینجا لە قاهرە کە گەڕاوەتە وە بەو ئاکامە گەیشتووە کە کوردەکان لەنێوخۆیاندا زۆرپێکە وەنین کە بتوانن لەعەراق جوێ ببنە وە." ١٥

لەو وە لامەی سیرپیرس کاکس کە دایەوە، فەیسەل زۆر ڕازی نەبوو، وەئینجا کە ئینگلیس مەسەلەی (گرنگی) بوونەوەی کوردی لەبەرچاوبووە، ڕەزامەندی خوی نیشان نەدا.

فەیسەل پاش چەند ڕۆژان لە کمیسە ری عالی ئینگلیسی پرسار کرد کە من بە پێویست دەزانم وەک پیاوێکی (عراقی) بدوێم، وە بزانم ئایائینگلیس بە چاوی عەراقێکم تەمەشادەکات، یان بەپادشایەکی عەرەب کەکوردستانی لی دوور دەبێتەوە، چاوولێ دەکات؟

وەلامی سیرپرس کاکس وەک سەرەسی مورغێک وابوو، وەگوتی: لەپێشگەیشتی فەیسەل بەتاجو، تەختی پادشایەتی ئەو فکرانەمان لــەهەمولا بەکەوە کردۆتەوە، وە "ئاواڵە" هێشتۆتەوە دیسان فەیسەل لەسیرپیرس کاکسی پرسی کە ئەگـــەر دەولەتیکی دیکەی دە رە وە یارمەتی کوردان بدات، ئایا دەولەتی بریتانیا لەسەرئێمە وە جوواب دێت وە تاچ ڕادەیەکو، چماوەیەک دەکات؟ وەئایا حکومەتی بریتانیای گەورە لە ناکۆکیو، بی‌نەزمی کوردستان، ئەوکات بەرگری دەکات، وەئەوە تاچ ماوەیەکو، کاتێک دەبێ؟

فەیسەل باش دەیزانی کە تاچ ڕادەیەک بریتانیای گەورە لەو دەورووکاتە دا کەئەگەر بە رەنگارێکی نیزامی بێتە پێشێ لە ناردنی پیاوێک بۆ بە رگری لە کوردستان، چاوو ناقووچێنێ فەیسەل دەیزانی کەلەو دەمەدا کە ئینگلیس لەشەرێکی جیهانی دێ ڕزگاربێت، ئایا دەیەوێ لەمەسەلەی کوردستان دا لەگەل کوردەکان ڕووبە رووبێت. وە هەر بە وجورەی کە عەراق پێویستێی، ئایا حکومەتی بریتانیای گەورەش هەرئەو هەلوێستەی لە بارەی خاکی کوردستان دا هەیە وە لەجوییاز بوونی کوردستان پێش‌گیری دەکات.

بەلام فەیسەل هەرلەسەر ئیشوکارماو، وەئیتر لەسەر کار لانە چوو.

### ٤ ــ ئاژاوەی تورک لە کوردستاندا

لە سەرەتای پادشایەتی فەیسەل، تورکەکان خەریکی ئاژاوە بوون لەناوچەی

کوردستانیخۆیاندا مەبەسیتان لەوکارە ئەوەبوو کە پاش شەڕی هەوەلیجیهانی کە عەراق جۆی دەکراوە، نالەباریبێننە پێشی، چونکە هێستا پاشکانەکەیلەشەڕ سنووری وەلاتی بۆ دیارینەکرابوو.

ئینگلیسێکان نەیان دەویست کە فەیسەل سەربەخۆ لەگەل تورکەکان ووتو، ویژ بکات.

لەمانگی ژوئنی ١٩٢١ یەکێ لەلایەن گرەکانی مستەفا کەمال کە ساحیب مەنسەبێکبوو بە نێوی فازل ئەفەندی نار درا کوردستان کە لەگەل چەن سەربازێک بو لای شاری رە واندزبچنئەو ئەفسەرەدەبوو بە نێوان مەلەبەندەکانێکی کە سمکو داگیـری کردبوو، رابرێ. لەمانگی ئوتدا عەشیرەتەکانی جیرانیان دەستیان بە شۆڕشکرد، ئینگلیسکـان لەوە ئاگاداربوون، وە ڕۆژئاواو، شمالی ڕەواندزیان بومباران کرد. لەئاخری سالی ١٩٢١ دا ئینگلیسێکان لە و شۆڕشە مەترسیـان ڕێنشت وە زورنیگەران بوون. ئینجا وا دیار بوو کە دەستی دەولەتی فەرانسە لەو کارەدایە، بۆ ئەوەی "تورکەکان یارمەتی بدا بەخاتری نە فتی موسل" وە دەستی کۆمپانی نەفتی" ستاندارد ئویل "ش لەکاردایە کە دەیـــــەوی مەلەبەندیموسل داگیرکـات.[١٦] کە مالیکان پاش چول کردنی سیلیسی (۴ ژانوئیەی ١٩٢٢) لە لایەن دەستەی فەرانسەوێکان بەچاکی خاترجەم بوون کەدەتووانن سەبارەت بەپاراستنی مەلبەندی موسل لەبەرانبەر ئینگلیسیکان ڕاوەستن. لە نێوەراستی مانگی مارس ١٩٢٢ دا کە مالیستەکان قایـم مەقامێکیان بۆ رە واندز نارد، وە لە ئاخری مانگی مەی گەیشتە ڕە واندز. تورکەکان کاریان لەپێش بوو. لەو دەمو، جەمەش دا دوودەستە لەکوردەکانی زێباری لەنزیک چەمچەمال وە هەروەها لە نیوەی مانگی ژوئندا کوردە هەمەوەندەکان پاش کوشتنی کاپیتان بوند، وە ماکانت، بەسەروکایەتی کریمیفەتتاح بەکهەلستانە سەرپێ.

لەنیوەی دووهەمیمانگی ژوئنی سالی ١٩٢٢ دا کۆلۆنێل عەلیشەفیق کە بە گالتە بە (ئوزدە میر" نێودەبردرا بۆ رەواندزێ نار درا کە شەڕی چریکی تورکەکان ڕابەریبکات، لەو ناوچەیەدا کاروباری تورکەکان لەپێشبوو، بەلام لەناوچەیسولەیمانێ وازیان زۆرخراپو، پەشێوبوو.

ئینجا پیاوە بە رزەکانی ئینگلیسی نشتەجی بە غدایە، جا چ بەراست وەچبەدرۆ دەیانگوت بوچ دەبێ تەنیا عەرەبەکان لەعەراقدا سەربەخۆئیوەرگرن، ئەوەی کە لە سەرچاوەی خەبەرەکان وەدەر کە وتووە، [۱۷] پاش ئەوەی کە کمیسەری عالی ئینگلیس سازمانو، تە شکیلاتی فەیسەلێ دانا، بو خوشی لە ئیدارە کردنە کە ی لە و نێوە دامابوّوە.......سەرئەنجام سێر پیرسیکاکس ڕاو، تە دبیر هێنا سەرەوەیکە دەبێ چەن پیاوێکی بەرزی کورد لەحکومەتو، ئیدارە کردنی عەراق دا بە شداربن، بەلام لەوەش دامابوونەوە کە کی هەڵبژێرن. پێیان وابوو حەمیدبەگ کە لە عێل وعە شیرەتی بابانی سولەیمانییە دەتووانێ لەوکارە دا بە شداربێوەیارمەتی بکات، بەلام دیتیان کە ئەوپیاوە کوردێ نازانێ وەتەنیا مرۆڤیکە کە عێل و عەشیرەتو، خانەوادەکەیخۆی دەناسێ وە سەریشی لەسیاسەت دەرناچێ. هێندێ پێیان وابوو کە دەبێشیخ مەحمود بێتە وەسەرئیشوکار، وە ئینگلیسیکان ئەویان لە ژوئنی ۱۹۱۹ دا لا برد بوو. ئیدموندییوابوو کە پیویستە سەیدتاها نوێنەری دائمی بێو، بێتەسەرکار

بەلام کارەساتە کە وا دە هاتەپێش کە جی بەجێ نەدەبوو، وەپتر لەو کارانە دا سێرپێرسیکاکس چێوتی دێناپێشێ، ئیتر لەوئاخریانەدا کاروباریویش تەواو بوو، دەبوو دەستی کورت کە نەوە!

## ٥ـ چوڵ کردنی سولەیمانێ ((هەوەڵی سیپتامبری ۱۹۲۲)

لەئاخری ئوتی ۱۹۲۲ لیوایهێزی سولەیمانی دژی چریکە تورکەکان کە لەڕەواندزێ ئاژاوەیان سازکرد بوو وە دە هاتن کە نزیک شاری ڕانیە بن، دەس بەکاربوون، لە هەوەڵین بەرنگاریدا بەرهەڵستیان بو هاتەپێشێوە دوو ئەفسەری هنـدیش لەگەل تاقمێک بەیارمەتی هێزە کە وە چوو: لە ۳۱ مانگی ئوت لە مەلەبەندی دەربەندو، زابیچکۆڵە ئەو ستوونە لە "رانیکول" تیک شکـــاو پاشەکشەی کرد، دووتوپو، تەواوی ئەسلحەحەکانیان لە سەحرایە بەجێ هیشت، دووئە فسەری ئینگلیسی بریندار بوون، ۳۰ تا ۴۰ سەربازی سیکی هندی کوژران یان برنیدار بوون. [۱۸]

ئینجا ئەو کارەساتەیکە تورکەکان لەگەل کوردەکان بەسەرهێـــزی

ئینگلیسیکانیان هێنا، ترسیانڕێ کەوت وە سولەیمانئیان چۆڵ کـــــرد:
لەبەریبەینانی مانگی سیپتامبری ١٩٢٢ فرۆکەکانی ئینگلیـــس
لەهەمووڵاوە مەلبەندی سەربازخانەکان و ئیدارەکانیان بۆمباران کرد، پیاوە
ئیگلیسیکانی دانشتە جێی سولەیمانیٚ بۆ ڕزگاربوونی خۆیان لەترسی بومباران
هاتنە لای شیخ قادر برای شیخ مەحمود وەهاچری صندوقێکی کە ٣٠٠٠٠ روپیە
ولیرەی استرلینگیتێدا بوو دایە، وەلەئەسباب وچەکو، ئەسلەحەی شەڕێ ٥٠٠
تفەنگیئینگلیسی و( ٥٠٠ تفەنگی تورکیان تەسلیم کرد کە نەزموئەمـــری
شاریبەدەستبگرێ.

## ٦ ـ گەڕانەوەی شێخمەحمود

سەرئەنجام سیرپرسی کاکس تەسمیم دەگرێ کە شیخ مەحمودی بێنێتەوە
سولەیمانیٚ. چوون بە باشی لیێ حالی ببوو کە خەلکی سولەیمانیٚ بەگشتـی
(دەنگ) بۆوی دەردەبڕن، وە گەڕانەوەیویان دەوی. وەدەشلێن تەنیا مرۆڤیکە
کە دە توانیٚ نەزم و ئەمرلە سولەیمانیٚ دا، بە ڕیوە بەرێوە، ئینگلسیکانش هەر
بەراستی پێیان وابوو. ! ١٩

لەکاتێکدا کە سیرپیرسکاکس بیروباوەڕی بەوە نەبوو کە دووبارە بەهێزی
نیزامی، سولەیمانێ بگرێتەوە هەروەها گومانی هاتە سەر ئەومەبەستەی کە کوردە
نەتەوە پەرستەکان لەدەو رووبەری شیخ مەحمود کۆدە بنەوە، وە بۆ شکانـــی
تورکەکان لەومەلبەندەدا قوڵ هەڵ دەکەنو، دەس بەکار دەبن. واتە بە "تیرێکی
دوونیشانەی هەنگاوت ـ وەرگیر". وەک کە یەکی لە پیاوە بە نێوەکان گوت بووی:
"کە ئێمە بە وکارە چ لە دەست نادین وەلەگەل شیخ مەحمود هەوڵ دە دەێن."

سەرئەنجام کاتی ئینگلسیکان زۆر خراب بوو: ژینرال فریزیـــر
لەوەی مەترسی هەبوو کە کورد ـ تورکەکان لە لای دۆلی زابی گەورەوە، هێرش
بوسەر مەلەبەندی ئاکراوە هەولیر بەرن!

لەئاکاما شیخ مەحمود، بەچەشنی "حوکمدار" یا "والی"ی کوردستانی
سەربەخو سەلماندرا و، پیشوازی لیٚکرا. وە روژنامەکانی ناوچەکە نووسیان کە
ماژور نوئیل ئەفسەری ژابتـی بریتانیا، ئیدی نەخشێکی نەماوە، تەنیادەبی

"کونسوول" واتە مشاور بێ وە هەروەهالەوەیدواوە لە بەینی شیخ مەحمود وە کمیسەری عالی ئینگلیس بەنێوی ڕێک خەردەناسرێ .

## ٧ ـ شێخ مەحمود "شای کوردستان"

شیخ مەحمود کە لەسالی ١٩٢٢ دا، ٤٤ سالی لە تە مەنی ڕا بردووە، یەکیک بوو لە ڕە قیبە کانی ئینگلیس لەکوردستان دا، پیاوێکی لەشساغو، پتەوو، سالم بوو. مرۆڤیک بوو ،شەڕکەر ، ئەنگێوەیچاک ،قسەزانو، خۆشبەیان هۆ نراوە کانی حەماسی وە فولکلۆیری کوردی زۆر لەبەر بوو، جارجار بەدەنگی خۆشیخۆی لەقووڵائی دلەوە وەلە ناخی گەرووبەوە لەبارەی قارەمانانی کورد هۆنراوەکانی دە خوێندەوە. تە نانەت قسەکانی لە دلی خەلکی زور جێگیر بووە.

بەچاولێ کردنێک وای لە ئینسانی دەکرد، دەتگوتدلی دەفرێنێ، کە پیاو بە دل و گیانە وەتەسلیمی دەبوو، مرۆڤ وای لێ دەهات کە لەڕێبازی ئەوداگیان بازدەبوو. واتە شیخ مەحمود پیاوێک بووە کە تەواوی ئاکارو، ڕەوشتی مردایەتی سەرۆکێکی کورد لەویدا دەدیترا.

٢٠ لەشیخەکانی بەرزنجیبووە، مرۆڤیکی بە مشوورو، ماقوول، گێڕاویانەتەوە کە تیغ بە ندو، گوللەبەندی هەبووە. پێش مەرگەکانیوی سوێندیان خواردووە کەگوللە توپیش کاری لێ نە کر دووە، وە تەنانەت بریندا ریشی نە کردووە.

شیخ مەحمود هەر بە شوێنی ئاکارو کردە وەی باب وبا پیری خۆی کاک ئەحمەد، توانیویتی بە سەرهاتو، ڕووداوەکانی داهاتووی خەلکی بزانێو، بیلێ.

زمانی تورکی، فارسی، عەرەبی، کوردی باش نووسیوەو، خوێندویەتەوە، زانایان ئەویان بە نووسەریکی (قابل توجه ـ تیڕابین) ناسیوەو، چاویان لێ کردووە. قەدوبالایەکی نیونجی، بووەچاوڕەش، دموچاوپان، وەکەللەزلبووە، ڕەگەزی، کوردایەتی بە باشی لە نیوچاوانو، ڕەنگو، ڕوو قەلافەتی باریوە.

دلێکی خاوێن و پاکیهەبووە، قین هەڵ گرنە بووە، بەلام قینیزۆر لە ئینگلیسیکان بووە.

نووسەرە ئینگلیسیکان لەبارەی ئەودا بە باشی نە دوواون، نووسەرێک بەنێوی سوئان کە ئەفسەرێکی بریتانیائی بووە، سەفەری بۆکوردستان زور کردوە وە لێی ماوەتەوە، پێش ئەوبەسەرهاتە بابی شیخ مەحمودی دیتوە لە کتیبی (کوردستان ئەوە دی بگۆڕێ) وا دە لێ "شیخ مەحمود پیاوێکی باش نیە وە جنایەتی لەبابی خوی وەرگرتووە!"

کار بە دەستێکی بریتانی لە سالی ١٩١٩ دا نووسراوەیەکی بە نێوی (کارەکانی کوردستانی خوواروو"ی نووسیوە لەوێ دادەلێ "وەک گەنجیکی سادەو، ژیرو، وریا دەچێ وە دووردەڕووانێ، بەلام گەنجێکی بە فڕوفێلە وە جاەتەلەبو، لەخۆڕازی... وە تاقمێک ئەویان دەورەدا وە، وەزۆریان زل وگەورە کردوە، وە دەلێن کە بو وەی دروست کراوە کە تەواوی گیروگرفتی کوردو، کوردستان لەناوبەرێ

پرسار دەکرێ جا چۆن لە و دەمو، جەمەدا شیخ مەحمود بۆتە (حوکمدار)ی سولەیمانێ. وە لامی ئەو پرسیارە ئەوەیە کە لەکتێبی!" کارەکانی کوردستانی جنوب) لەسالی ١٩١٨ تا سالی ١٩٢٢ دا نووسراوە، واتە بەبێ ئەوەی کە ئەرکی قورسی لەسەرشانی بێ - بەدەستی خوی "پێویستی بووە کە ساخلوی نیزامی ئینگلیس لە سولەیمانی سازکاو، بیان هێنی .... وەسەرئەنجام وە دەریان نی!"

پاش چەن ڕوژ، کە شیخ مەحمود بە شانازێوە کە گە ڕاوە شاری سولەیمانی، لە ١٠ی مانگی ئوکتوبری ١٩٢٢ دا فەرمانێکی تایبەتی دەربڕی، وە "شاری سولەیمانێ"ی پێ تەختی کوردستان" نێوبرد ئینجا بەوچەشنە ٨ وەزیری کابینەی خوی ناساند کە لە وانە بریتی بوون.

١ ـ شیخ قادر سەرۆک وەزیر، ٢ ـ شیخ مەحمود وەزیری بەرگری، ٣ ـ شیخ مەحمود غالب وەزیری ناوخو، ٤ ـ عومەر ئاغا وەزیری ئیشوکار، ٥ ـ خاجی مستەفا پاشا، وەزیری تەعلیم و، تەربیەت، ٦ ـ وەزارەتی دارائی ومالی دا بە پیاوێکی مەسیحی کەریم ئالاکاکە کاروباری دیکە بەجێ دینا ٨ ـ وەزارەتی دادگوستەری دا بە عەلی قەلاداری، سەیە ئەحمەد بووبە مودیر، سەرۆک پولیس.

وەمانگێک پاش واتە لە ١٨ نوامبری ١٩٢٢ شیخ مەحمود رای گە یاند کە من "پادشای کوردستان، م! ئالای کوردستان هەر بە چەشنی ئالای سالی ١٩١٩

بوو، کە رەنگی شین بووە، وە دایرەیەکی سووری تێداکێشرابوو کە لەنێو دایرەکەدا، هلالی مانگێکی سپی تیدا دیاری کرابوو.

شیخ مەحمود هەروەها تەمری پوستی چاپ کردووە، کە لەوێدا دوومستی پیاوی کورد بە شکلی زەربدەر کێشرابـــوو ئەورستەیەشی تێدا نووســرابــو: "حکومەتی کوردستانی جنوب".

## ٨ – رۆژنامەکانی کورد، کاتی پادشایەتی شیخ مەحمود

لە سەرەتای مانگی ئوتی ١٩٢٢ مستەفاپاشاروژنامەیەکی بە نێوی "بانگی کوردستان" وەدەرخست کە ١٣ ژمارەی بلاو بۆوە. پاش ماوەیەک کاربەدەستەکانی شیخ مەحمود، روژنامەیەکیان بە نێوی "رۆژی کوردستان" کە هەوەلین ژمارەی لە ١٥ی نوامبری ١٩٢٢ لەچاپ درا بلاو بۆوە.

روژنامەی کوردستان، رۆژنامەیەکی رەسمی، رامیاری، و( وێژەوەری بوو کە لە حەوتوودا کەرەتیک وە دە ردەکەوت، وە تا سی هەمی مانگی مارسی ١٩٢٣ بەهاوکاری نووسەرە گە ورەکانی کورد لەژێر چاوەدێری وان دابوو. لەمانگی دیسامبری ١٩٢٢ داشیخ مەحمود دوو ئوردوگای کەرکوکی خستە سەر خاکـــی کوردستان وە بو ئەوەی کە نیشان بدرێ لەگەل "قەلەم رەوی" کوردە.

هەرلەوکاتەشدا روژنامەی "رۆژی کوردستان" لەئاخری مانگی دا ئاگاداری دا کە سەرۆکی عەشیرەی ناوچەی کەرکوک، هاتۆتەسولەیمانی لەئاکامـــــــا (واوەدەردەکەوت) کە هەریەک لەوانەدەیانەویست کە بۆخویان لەو ناوچەیە دا خاوەن قودرە ت و، سە روک، رابە رن"

وەک کە گوتمان روژنامەی روژی کوردستان کە لە چاپ دە درا کۆرێک لە نووسە ران کە لە رووناک بیرە کان، هۆنە رە کان وە ئە دیبە کان ی سولەیمانی بە تایبەت وەک عارف سائب، وەرە فیق حیلمی پێک هات بوو، بلاودە بۆوە.

ئینجالە ژمارەی هە وە لی رە سمی دە ولە تی دا، دمە تە قە یە کی رامیاری لە گە ل روژنامە کانی بە غدایە کە لە بارەی "کوردستانی" جنوب دادە دووان بە دی هاتئە و روژنامە یە "ئۆرگانی پارتی ــ عراقیکان" بو و وە نێوی (لیوای

سوله یمانی ) بو . دەی نووسی که پیاوه کانی کابینەی شیخ محمود ته نیابه " ڕابەر وسه رۆ کی ئیداری ناوچەکه" پیویستەناو ببردرێن سه رئه نجام روژنامەی شیخ مەحمودوه لامی ده داوه که به راستی جێی سه رسووڕمانه که" جیران و دوستی ئێمه "عراق" ده یه وێ مافی هه زار سالەی کوردله ژیرپێ بخات ) . . وه یان سنووره کان لەئا ژا وەدابنێ" مه گەرکوردوعەره ب پێکه وه له ماف دابه رانبەر نین ،وه پیویسته نن که مافی کورده کان ،وه مافی نه ته وایەتی وان ، وه هەروەها سنوریان له لایەن " سازمانیئنه ته وه کان ناسراوه"[۲۱]

به وجوره ووتاری ئه و روژنامەیه وای نیشاندەداکەلێقه ومانێکلەبەینیشیخ مه حمود و ئینگلیسگان ئه وه دێ به دی بیت .

له راسته قینه دا له ماوەی نیوسه دان دا ته جروبه یه کی تال بوشیخ مه حمود رووی دابوو ، وه ده بوو لێی حالی بی که چون له و حالە دا ، دو و باره ، داوەت کراوەته وه که چاره سه ری مه سه له که بێ . . . لەحەقیقەت داشیخ مه حمود ، له هەوه لی کاره وه مه ئموریيه تی هه بوو له له میژوو داپێی ئه سپاردرابوو ، که ده یه ویست کوردستانی گه وره ، پێک بێنێ . ئه ومه سه له یه ی به گوئیسه روکی ئه مریکا ویلسون راگەیاندبوو گووت بووی که داو خووازیتی که له کوردستانی خوارودادە وله تیکی سه ربه خوپێک بێنێ .

بەلام ئنگلیس مه به ستی ئەوه بوو که شیخ مه حمود ، وه وله تیکیناووچەئی دابنێ وه له زال بوونی تورکه کان به سه رشاریسوولەیمانیبه و جوره پیش گیری بکات ئینجائەگه وه ک زانایه ک ئاکاری خوی له به رچاوی ئنگلیس نیشان دابایه ،زور زوولەبیرنەده چۆوه ، وه پیوست بوو ، ئه گه رله ده رکەبی کی وه دەریان نایه ده بووله ده رکه یه کی ئاوالەی دیکه بدات وەلەگیژاوانبەقازانجیکورده کان خورزگار کات .

### ٩ ـ مەسەلەی کەرکوک

مه سه له ی که رکوک له هه ره مه سه له گرنکه کان بود که له ووت و، وێژه دابووله نیوەیمانگی سیپتامبری ١٩٢٢ که ووت و وێژ له گه ل سێر پرسی کاکس لەه غدایه دەستی پیکرابوو، گوت بووی که پێش ئەوەی که شیخ مه حمودبگەڕێتەوه سوله یمانی، نابێ په هیچ چه شنێک باسی ئیدارەکردنیناوچەیکه رکوک و هەولێر بی نێته گوری

وازی که رکوک له وکاتەدا گرنگ بوو، هێستـا تورکەکان له وشاره دادەسیاندە رۆیشت ئاڵ وگۆڕی نامه بۆبه غدا بەزمانی تورکی بوو، شاره داری کورد سه ربه خۆکاری دەکرد وه ئاڵای عراق هێستا لە سه ر قه ڵا وکوشکی ده وله تی هه له نه کرابوو، موته سه ریفی تورک واته (والی) شاری که رکوکـی ئیداره ده کرد،وه له گه ل ئنگلسیان هاوکاری دەکرد. " بە ڵام ورده ـ وردەئه وشاره چۆژێردەستی ئنگلیس وه ده ستور له به غدایه وەردەگیرا. ٢٢

فەیسه ل زۆربەی دینا، سه رئه نجام له٢٣ ئوکتوبری ١٩٢٢ بەفەرمانی وی هه ڵ بژاردنی نێونه رایەتی مه جلس دەستی پێکرابەلام شیخ مەحمود ناڕەزامه ندی خۆی له وبابه ته وه ده ربری وگوتی: گه رئێوه ده لین که زه مانی زۆرله وه پێش شاری کە رکوک دانشتوٚ، کانی تورکمه نی بوون، ئه مه ـــــ دەبینین که ناوچه که کوردنشینه، وه پیویسته له ژیرقەلەم ره وی ئێمه دابیت.

وه سه رئه نجام لەدیسامبری ١٩٢٢ داهه روەک که له سه ره وه گوتمانشیخ مه حمود دووکه مپی که رکوکیی خسته ژێر ناوچه که. وه له ئاخری ئەو مانگشدا، روژی کوردستان گه یشتنی رابەرەعه شیرەته کانی سولەیمانیێ بو کەرکوک راگەیاند. له ئا کام داهه ریه ک به شوینی شۆرەتی "تامه زرووی تاکتیکی" دابوو.

## ١٠ ــ شیخ مەحمودو، تورکەکان

ئەمماشیخ مەحمود نەی دەویست لەگەل (قودرەتـەکانـی) بەغدایە کایە بکاتو، خۆتیوەردا: ماژور نوئیل بە ریوە بەریکاروباری ئینگلیس، نەخشەی ئەوە بوو کە شیخ مەحمودو، سمکو وە سەید تا ها دژیتورکەکان بکاتەیەکو هانیان بدات.

وادیاربوو کە سمکو نەی دەویست لەمەسەلەی عەراق دا دەستی تێدا بێ، بەڵام تە ها لە گە ل ئینگلیسیکان هاوکاری خۆیی دەربری، وەلە نیوەراستی نوامبری١٩٢٢ وە بە خۆ یوو بە ١٥٠ پیش مەرگەی کوردە وە لەگەل سەربازەکانی عەراق ریک کەوت ،وە هە لوێستی ئەوە بوو، کە ئە فسەری تورکەکان کە ئوزدەمیر بوو لە رەواندزیی وە دەرنێ!

ئاکارو کردەوەی "رووڵاش" هیزی رەواندز!، زۆر پیرۆزی لەبەر دانە بوو: سەیدتەها چاوەدێری ئەوەی نەدەکرد کە کارەساتەکە بەو جوورەی لێ بێ وە لەشەرە کە سەرێ نەکەوێ:

بارانـی توونددش هەروەها بووبە مەبەستی شل بوون لەکاردا، ئینجا ئەگەر تورکەکان لەئاکاما شاری رانیە یان چۆل کرد، مەبەست بەوە بوو کە لە بومباران‌کردنی شاردەترسان

نەتیجە و کردە وەی شەری (رووڵاش) تەنیا قازانجی بۆ شیخ مەحمود تێدا بوو، کە حورمەتو، گەورەیی‌وی زیاتر کرد. واتە شیخ مەحمود بەو جوورە دووژمنایەتی خۆی لەگەل ئینگلیس دەربری وە بە پیچەوانەی ئەو، تەها لایەن‌گری ئینگلیس بوو، وە دژی تورکەکانی عوسمانی ئەوکارەی‌کرد!

ئینجا شیخ مەحمود بە زووئی لەگەل کۆلۆنیل عەلی‌شەفیق وە ئەلیاس ئوزدەمیر لەرەواندز هاتو، چوی خۆی سازکرد وە دەری بری کە (دەیەوێ بۆ هیزی تورک فداکاری بکات) وە رای گەیاند کە ئامادەیە کە مافی نەتەوایەتی ناوخـوی کورد واتە ئوتونومی بسەلمێنی وەدست لە داواکردنی مافی گشتی سەر بەستی بکیشیتە وە، وە لە گە ل حکومەتی تورکیەش هاوکاری‌بکات.[٢٣]

بەو وو تارە ئاشکرا بوو کە شیخ مەحمود دەیەویست نێوان ناکۆکی لەبەینی تورک و ئینگلیس پتربکات ! تورکەکان خۆیان نەشەمزاند ، وە هەروەک (ئاژانسی ئینگلیس) ڕای‌گەیاند ، کولونیل عەلی شەفیق ئامادەگی خۆی لەگەل ئینگلیسیکان دەربڕێ وە پاش چەندیک بەو سەرئەنجامە گەیشت :

"ئیمەئەوشیخەمان ناوی... زۆر بە فرۆفیڵە!" بەلام بەبێ ئەوەی کە لەگەڵی رووبەروو بێ، دەیەویست کە لەهیزی وی بو ولایەتی موسل کە لک وەرگرێ، موسلێکی کە پاشە ڕوژی هەرگز لەوکاتە دامەعلوم نەبوو.

## ١١ ــ بەیان‌نامەی ئینگلیس لەنوئیل ١٩٢٢

لەروژی نوئیل‌ی ١٩٢٢ پیاوە بە رزەکەی ئینگلیس لە بە غدایە ئا گا-داری دا ، کە دە ولە تی بریتانیا ، وە حکومەتی عەراق، دان بە مافی سەربە خۆئی ناوخۆ ی کوردەکان لە سنوورو ، چووار چێوەی و لاتی عەراق دا دەنێ. حکومەتی عەراق دەیەوێ کە لە نێوو لاتی عەراق دا حکومەتی کورد پێک بێت.

لەوبە یان‌نامەدا ڕا گە یاندرابوو کە کوردەکان بۆ نوسینی یا سای مافە کە پیوستە بێنە شاری بە غدا وە لەبارەی مەسەلەی ئابوریو، ڕامیاری لە ما بەینی عەراق و ئینگلیس، وە کوردەکان باس بکرێ. "

لەکاتێک دا کە بە (ئیدموند) وەبەیەکێ لەئەفسەرەپایەبەرزەکانی سیاسی ئینگلیس، گوترابوو کە بەیان نامەکە بۆ سەروکی کوردەکان بنیـــردرێوە بخوێندرێتەوە، لەکاتی خوێندنەوەی‌دا نەی تووانی کە ئی‌حساساتی خۆی دەرنە بڕێ، وە گوتی: دەولەتی عەراق نایەوێ لەگەل کوردەکان ڕووبەروو بێ وە لە نەتەوەی کورد دوربێتەوە

ئەوەی کە لەو بەیان‌نامەیەدا بە چاکی دیار بوو، عەراق مەبەستی نووادنی قودرەتی‌خۆی بوو، دە نانەی‌دەویست کەبە هیچ چەشنێک هەلوێستەکانی‌و، حورمەتی ئـــەو بەیان‌نامەیە ڕابگرێ وە نێوان‌و، هات‌و، چوئی‌بچاکـــــــی بەرێوەبەرێ!

### ١٢ ــ لەژێر پێ‌نانی مافەکەی‌شیخ‌مەحمود

پاش شکانی هەوەڵین کنفرانسی لۆزان (٤ی فێوریبە ١٩٢٣) لەسەرتا سە ری کوردستان ئاژاوە سازبوو، ئینگلیسیکان بە دانی چەن ئاگاداری ڕایان گەیاند کە شیخ مەحمود وە لیدێرو، گەورەی شیعەکانی نەجەفو، کە ربە لا،لە گە ڵ یەکتر هاتو، چۆیان هەیە، وە دژی عەراق دەیانەوێ کاربکەن وە دەستیان داوەتە دەستی یەکتروە مەبەستیان ئەوەیە کە هێرشێکی گەورە لەمانگی مارس[٢٤] دا بەرنە سەر ئوزدەمیر بۆ شاری کە رکوک. بریتانیای گەورە دەیەویست کە بە تاڵووکە هێرش بەرێتە سەرشیخ مەحمود، وەکاری‌وی تەواوبکات، وە هەروەها لەوئاگاداریانە و بەیان‌نامانەدا بە خەلکی ناوچەکەیان ڕادەگەیاند کە دەبێ بی‌سەلمێنن کە ئیتر شیخ‌مەحمود بە پێچەوانەی سالی ١٩١٩ کاردەکات وەتەنیامەبەستی "ئاژاوەو، سەربزێویە"، نەک ڕاپەرین‌و، شۆڕشی کورد.

سیرپیرس کاکس لە ١٩ی ژانوییە دا گەڕاوە لەندەن تا لە دانشتنێکی پیاوە بەرزەکانی حکومەت لەبارەی عەراق دا ڕاوتە دبیرو هاوبەشی بکات...

دەگونجێ بلێن کە کاروکردەوی ئەو لەناوچەکەدا تەواو بووە، وەبەجێ‌وی. سێرهانری دابس دێتە سەرکار. بەلام هەرچێک‌بێ،ڕاوتە سمیم لەبارەی شیخ‌ـ مەحمود، دا گیرا بوو.

لە نێوەراستی مانگی فیوریبە دا سێرهانری دابس لەگەل بۆرتۆن بووردیون ئەفسەری دەریائی وە نووسەری پایەبەرزی کمیسەری‌عالی وەئیدموند گە یشتنە بە غدایەوە کۆبوونەوەیەکیان پێک هێنا، تانەخشەی خۆیان لەبەرانبەر "پادشای کوردستان" بەرێوە بەرن.

لە ٢١ی مانگی فیوریبەی ١٩٢٣ دا پاش پێنج مانگ "پادشایەتی" ئەو ئولتیماتۆمەیان دابەشێخ مەحمود: ئینجا بە پێویست زاندراوە کە بۆ خۆت لەگەل کاربە دەستەئیداریکانت یابەووتەیەکی، دیکە "ئە ندامانی دە ولەتی خۆت) بێیە بەغدایە، یان پێوستە لەسەر کانەمێنی! لەئاکاما هەر ئەو بڕیارنامەیە

(اولتیماتوم ) بەچەشنی بەیانییە بە فڕۆکە بەسەرشاری سولەیمانی دابڵاو کراوە، وە تێشی دا نووسرا بوو کە ئەگەر بێتوو لەبەرانبەر ئێمەدا خەلکی شاری ڕاوەستن، بومباران دەکرێن. ٢٥

## ١٣ – بۆمبارانی شاری سولەیمانیێ:

هەر بەو جورەی کە چاوە ڕووانی دەکرا، شیخ مەحمود چوونی‌خۆیی بۆ بەغدایە ڕەد کردەوە و لە ٢٢ی مانگی فیۆرییەی ١٩٢٣ دا، ٢٠ فڕۆکە، تراکت‌و، بەیانیەیان هە ل گرت کە لە سەر شاری سولەیمانیێ بلاو کە نەوە.... بەلام ١٨ فڕوکە لە بەر ئەوەی کە سەرکێوە کانی ناوچەی سولەیمانیێ وە هەروەها شاری سولەیمانێ تەپو، مژدای گرت‌بوو، نەیان توانی کارێک بکەن، گەڕانەوە، وەتەنیا دووفڕۆکە توانی خۆیی بگەیەنێتە سەرشار! لە ٢٤ فیورییبیە لەنیوە شەوی دا شیخ مەحمود تێ‌لێ گرافێکی بو ئیدموند کەهاتبۆ کەرکوکێ لێدا وە بە درێژائی ئەوێ شەوێ، تاقمە وە زیرەکانی کورد هەولیان‌دا کە چارە سەری‌کارەکە بکەن‌و، نەخشــی نێوبْجیان هەبێ! بەلام بێ نەتیجە ماوە! وە سەرئەنجام لە ٣ی مانگی مارس‌دا، فروکە یە ک شاری سولەیمانیێ بۆمباران کرد.

ئەوبومبارانەهاوکاث لە گە ل چوونی شیخ قادر برای شیخ مەحمود، وەزیری گەورە، وەمستەفا پاشاو، دووپیاوی خۆفیە بۆ شاری کە رکوک بۆ ووت‌و، ویژبوو.

لە ٤ی مارسی ١٩٢٣ شیخ مەحمود بەری‌بەیانی، بارگەوبنەو، خەزێنە و پوولی تێک‌نا، وەشاری سولەیمانیێی بەرەو کیوەکانی سەردەشت[١] بەجێی هێشت، وەلەغارێک‌دا جێ گیر بوو.

لە ٨ی مارس دا لە نێو ئەشکەوتەکەدا ڕۆژنامەیەکی تازەی بە نێوی "بانگی حەق" وەدەرخست، کە لەوێ دافەرمانی جیهادی دابوو[٢٦]، وە لە گە ل چەن سەد سوواری‌خۆ ی کە بە سەرۆکایەتی "سالح زەکی) بوو دەستی بە شەری پارتیزانی کرد.

---

١ـ سوبردانی، دروستتر، تا سەر دەشت ـم ـر

## ١٤ ــ شەڕ دژی ئوزدەمیر

لە ١٨ای مانگی مارس دا فەرماندەی هێزی هەوائی ئینگلیس سێرجان سالموند[٢٧]، تەسمیمی‌گر ت کە شاری رە واندزێ بومباران کاوە بەوجورەکاری تورکەکان کو تائی‌پێ‌بێ‌نێ . ، ئەویش مەبەست بەوەبوو کە شیخ مەحمودو سەرۆکی تورکەکان، هەردوکیان دەیانەویست دژی‌ئینگلیس دەست‌بەکاربن. ستوونێک لە سەربازەکانی (کوئی‌کول) کەتەنیائینگلیسی بوون، هێرشیان بردە سەر شاری موسل، هولێر و، کوی سەنجاق،وە مەبەست لەوهێرشە بڕینی‌هات‌و، چۆ لەبەینی تورکەکان‌و، شیخ مەحمود بوو. ستوونی دووەم (فرۆن تیرکول) کە بریتی لە پولیسو، چریک بوون، یەک راست چوونە سەر دێرا، سپی‌لیک‌وە شاری رەواندزی.

کولونیل شەفیق سەرداری تورک کەئەوهێرشە گەورەی بیست‌و، لەپاشان چاوی‌پێ کەوت، شەڕی نەکرد، وە لە ٢٢ی ئاوریل‌ی ١٩٢٣ دا ڕەواندزی بەجێ هێشت.

ئەو هوروژم‌و، هێرشانە هاوکات لە گە ل وەختێک بوو کە دوو هەمین کون‌فرانسی لۆزان کراوە، دەستی بە ئیشوکار کرد . [٢٨]

## ١٥ ــ سەید تەها قایم‌مەقامی شاری ڕەواندز

پاش چەن ڕۆژێک سەیدتەها بە نێوی "قائم مەقام"ی ڕەواندز لە لایەن ئینگلیسەوە داندرا: بە یارمەتی هێزی‌ئا سوریکا ن‌لەو ناوچەیەدا، لەســەر ئیشوکاردانشت.

دەگونجێ بڵێن کە سەیدتەها نەوەی شیخ عوبەی دیل لا بوو، وە هەروەها لە پیاوە ژاو، تەدبیر کە رەکان‌و، مشاوری سیمکو بوو، بەلام نەی‌توانی نەخشێکی ئەوتو بو کوردەکان بەرێوە بەرێ.

ئەو مرۆڤە کە لە مەودای ٢٠ سالان‌دابۆ کورد کاری‌کرد سەرئەنجام لە

سالی ١٩٣٩ی‌زاینی‌دا پاش ئەوەی کە هاتەئێرانێ دەرمان داوو کرا لە تاران کوچی دووائی کرد .

## ١٦ ــ گرتنی شاری سولەیمانی (١٦ مەی ١٩٢٣)

بێگومـان کار بە دەستەکانی بە غدا بەتەواو کردنی کاری تورکەکان وە ڕزگار بوون لە شەڕی ئەوان ، دەیانەویست ڕا پەرینەکەی شیخ مەحمودیش زووتێک دەن . گوتمان کە شیخ مەحمود بۆ ئەشکەوتی یازانە ، یان ڕاژ ـانە نزیک شاری سەردەشت کە لەقەراغ سنووریێ بوو پەنای برد ، هیزی ئینگلیسو ، عــــەراق دەیانەویست کاری‌شیخ‌مەحمود تەواوبکەن . عەراق دەیەویست کە پیاوێک بە نیۆی حاکمی کورد بێتە سەرکار کە لەژێر حوکمو ، ڕای ئەوان دابێ ، بەلام کەس‌لە سەرۆکە کوردەکان ئامادەی ئەوکارەنەبوو ، وە هەروەها لەبابەت بەیان‌نامەی نوئیل‌ی ١٩٢٣ش دا خۆیان گێل کردو ، نیۆیان نەهێنا . [٢٩]

سێرهانری دابس دەی گوت کە دانی ( ئوتونومی ) لەلایەن ئێمـــە بەکوردەکان کاتێک بەڕێوە دەبردرێ کە بەرهەڵستی گەورەی ئەوکارە کە شیخ مەحمودە لەنێوان لاچێ وە ماوەیەکی زۆرەکە ئینگلیس دەیەوێ کاری سەربەخوئی ناوخوئی ناوچەی کوردی محەلی پێک‌بیت ، وە تەنانەت شیخ مەحمودیش ئازادبێ بەلام کمیسەری عالی پیێ وابوو کە شیخ مەحمود پیویستەیان بکوژرێ یان‌بگیرێ ، وەواباش‌ترە کە ئەوکردەوەیە بەجێ بێت .

لەڕاستەقینە دا دەگوترێ کە فشارو ، هێرشی گرنگی : ٨ی مەی ١٩٢٣ هاوکات لەگەل بلاو کردنەوەی بەیان نامەو ، تڕاکت بە سەرشاری سولەیمانی ، دەسیان بەگرتنی خەلکی‌ش کرد . وە لە ١٢ی‌مەی‌دا دوو هەنگی نیزامی هیندی کە لە لایەن هێندێ لە ئەفسەرەکانی ئینگلیس ، وە ئیدموند ڕا بەری دەکران ، بۆ لای کە رکوک چوون . وە بەوجورە ڕوو داوەی سالی ١٩١٩ دووپاتە کراوە !

بەلام ئەو کە ڕەتە سولەیمانی بێ شەر و کێشەگیرا : شیخ مەحمود ڕا وتەدبیری ئەوەبووکە تاسلوجەی بگری وە بیکاتە پیگەی خو ی ، بەلام ئینگلیسیکان پیش‌دەسیان‌کردو ، لەوکارە بەرگریان‌کرد ، ئەویش چارەی‌نەما وە ڕووی لەکیۆەکان کرد ، سەرئەنجام سولەیمانێ لە ١٦ی‌مەی ١٩٢٣ دا دووبارەگیراوە . ئینجا

ئێدموند لەشاری سولەیمانیێ لە" دەفتەری‌کاری" شیخ مەحمود دانشت، واتە لەو مە درەسەیەی کە ماژورنوئیل لەسالی ١٩١٩ دا کردبوویە دەفتـــەری‌خوی، جێ‌گیربوو.

تەنیا عەلامەت‌و، نیشانەیەک کە لەدەفتەری‌شیخ‌مەحمود دەدیترا: وێنەی شیخ مەحمودی بوو کە نەوارێکی سووری لە دەورەی پێچرابوو، وە هەروەهـــا ئالایەکی کوردی کەلەگەل تاجێک لەسەر پەرچەمی پادشایەتی در ابوو خوئی دەنوواند. پاش‌کاروبارەکەی شیخ‌مەحمود، کاربەدەستەکانی ئینگلیس وە بە تایبەت ئێدموند هەلوێستیان ئەوە بوو کە لە کوردستان دا چەشنە"ئوتونومی"ک دابنێن وە پیاوێک لەگەورەکانی کورد هەل بژێرن کە بەمەیل‌و ئاکاری بە غدایە ببزۆتەوە،! ئینجا شیخ‌قادر "سەروک وەزیر"ی کوردستان، برای شیخ مەحمود بۆو کارە لەبەر چاوگیرا کەهەمیشە بۆ لای ئینگلیسیان خۆیی دەکێشا. وە بەرگری‌و هێمنایەتی شاری وە عودە وئە ستۆی خۆی‌گرت. ئەحمەد توفیق بەگ پیاوی گەورەی کورد بوو بە کاربەدەستی بەڕیوەبەری‌شار . لە٢٥ی‌مەی ١٩٢٣ تاقمێک سەرباز بو لای‌ستادی‌ناوەندی شیخ مەحمود پاش ڕویشتن لە سولەیمانی کە لە ئەشکەوتی رازانە دابوو ناردرا!، گرتن‌ی ئەوشکەوتە کە لە جێگایەکی زور تەنگە بەرو، عاستەم دابوو، وە دو لیکی تەنگ‌و باربکیشی لە پێش‌بوو، وە لە پەناو، پەسیوێکی وا دا بوونەدەدیترا، بەلام گە ماڕۆیان داوگریتان

لەو ئەشکەوتەدا: تەختێکی نووستنی‌ی ئاسن، چەند کورسی‌دار، ماشینێکی تایپی نووسینێ، وەتێلیێ‌فۆنێک بو ڕێیەکانی موبلیمانی کوشکەکانی شاهی!" کە نزیک بە هیزەکان‌و، ئاقمەکانی ئینگلیس بوو، دەدیترا، وەشیخ مەحمود لەگەل‌چەن کەسیـک لە سووارەکانی خوی بو لای‌ئیرانی، کەلەبەرچاوان نەمابوون ڕویشت بوون وە ئە شکە و تە کە یان چۆل کرد بوو.

## ١٧ ـــ ناکام مانەوەی ڕەژیمی "هاوکاری"

بەلام زۆر زوو کاربەدەستەکان‌و، قودرەتمەندەکانی‌ئینگلیس بۆ حکومەت کردن لە کوردستان‌دا وە هاوکاری لەگەل هێندێ لەلایەن‌گرەکانی خۆی لە

ناوچەکەدا، ناکام مانەوەو، ناهومێدانەبەر هەڵستی یان بۆهاتەپێشێ: بو کمیسەری پایە بەرزی ئینگلیس نەدەکرا کە سەروکێکی ئەوتۆی کورد کە "بتوانێ قودرەتی هەبێوەلەبەرانبەر نفوذی شیخ مەحمود دا ڕاوەستی" هەل بژێرێ، ئەویش بەبێ ئەوەی هێزو، قودرەتی ئینگلیسی چاوەدێری لێ نەکاتو، نەی پارێزیو، باڵی بەسەر دانە لێشی. ٣٠

ئەوەی کە بە چاکی دیار بوو، بەتایبەت سەروکە گەورەکانی کورد حازر بە هاوکاری لەگەل ئینگلیسیکان بوون، بەلام هەرگز فەیسەڵیان نەدەسەلماند!

لەئاخری مانگی مەی ١٩٢٣ دا سەروک وەزیری عەراق عەبدوول موحسن ئەسسە عدوون، لەگەڵ حاکمی شاری بە غدایە بەنێوی شە ی بەگ نەشئەت کەخەلکی (کوردی هەولێر) بوو، هاوڕێ لەگەل کار بەدەستێکی پایەبەرزی ئینگلیس کۆرن والیس چوونە شاری سولەیمانێ.

کورن والیس ڕای گەیاند کە حکومەتی بریتانیایە تەسمیمو، ڕای هێناوەتە سەر ئەومەبەستەی کە سازمانی حازر لەعەراقدا بکاتە ٦ فوج واتە ٦ لەشکر، وە "کوئی کول" لە نیوەی مانگی ژوییە دا لە سولەیمانی دەچێتەدەرێ.

سێرهانری دابس، ئیدموند، وە کورن والیس زۆر بەنهێنی لەسەر کاروباری ناوچەکەڕاو، تەدبیریان دەکرد، وەلەلایەکی دیکەشەوە کە سەروک وەزیری عەراق هاتبۆ سولەیمانی دەیەویست کە ڕێبازی بەینی سولەیمانێ وە قەڵەم ڕەوی عەراقێ لەداهاتوودا دیاریبکات.

سەرئەنجام بەهاتنی ئەو دوو تاقمە بۆسولەیمانێ لە ٢ی ژوئنی ١٩٢٣ کمیسەریپایە بەرز، سێرهانرێدابس، وە سەروکە گەورەکانی کورد نەیان توانی لە ڕووانگەیبەغدایەوە کارێکی بکەن، وە لە ١٤ ژوئندا، ڕاوێژەری، کوردی سولەیمانی لە سەرئیش و کار لابردرا!

بەتاڵ کردنی سولەیمانی لەلایەن ئینگلیس، لەپیش دا چاوە دێری دەکرا وەلە ١٧ی ژوین ١٩٢٣ دا بەڕێوەبردرا. سێ ڕۆژی ئاخری پاش ڕا گەیاندنی ئیدموند "سێبەریکیتاڵ و ناخوش) ولاتی داگرت! شیخقادر ئینجا ئەرکی سەرشانی شاری وە نەزم وتەرتیبی ناوچەکەی بەدەستەوەگرت، وە بریتانیا بویارمەتی ئەو ٣٥٠ کەسیلەگەل ئەفسەرێکی ئینگلیس دایە...

کویکول ـــ ستونی نیزامی کوی

بەلام وادیاربوو کە سێرهانری دابس بەوکارە بەڵێنی نەدابوو، وەگوت بووی کە: خۆتیوەردانی بریتانیا لەکاروباری سولەیمانی داهەروا لەسەرجیگای خویەتیو، بەتال نابێتەوە!

وەلە ١٧ی ژوئنی ١٩٢٣ دا (کوئی کول) شاری سولەیمانیی چول کردوە ٢٠٠٠ کەسی پەنابەر" بە دووای ئەوان دا لەگەل ئینگلیسیکان وە دەرکەوتن. ٣١

## ١٨ ـ گەڕانەوەی شیخ مەحمود بو سولەیمانی (١١ ژوییەی ١٩٢٣)

لەکاتیک دا کە گەڕانەوەیشیخ مەحمود بۆ سولەیمانیچاوە دێری دەکرا، ئیدموند وەپیاوە گەورەکانی بریتانیا دیسان وە خۆکەوتن، بۆ ئەوەی کە نەخشەو ئاکاریخۆیان بۆ کەرەتی ئاخر لەژێرچاوەدیریوئیداری خۆیانەوە بەدەستەوەبگرن، واتە ناوچەی (مراوی)، ڕانیە، قەلادزی لەشمال، وە چەمچەمال لە ڕۆژئاواوە، وەقەرەداغوهەڵەبجە لەجنوبەوە، لە بەشی مەلەبەندی سولەیمانی بکە نەوە.

کاتیک کە شیخ مەحمود لە ١١ی ژوییەی ١٩٢٣ لەگەل هێزی نەتەوایەتی کوردستان، کە لە ژێر حمایەتی مەجید مستەفادا بوو،" مەلکی کوردستان" بە شیکی بەرتەنگی زۆر کەمی بو حکومەت بەدەستە وە مابوو. ئینجا شیخ مەحمود ڕایگەیاند کە ناوچەی سولەیمانی تا سنووریئیران درێژەی هەیە وە لکو پۆکی لی نابێتەوە، وە حکومەتیتازەی کوردستان هەروەها لەژێرچاوەدێری حکومەتی عەراقوە هاوکاریلەگەلئەو کارەی خویي بەرێوە دەبا. بەراستی ئەومەلەبەندە وەک "کەمەربەندیکی حفازی یەکە چاوەدێریلی دەکرێ. ئینجا سێرها نرێ دابس کمیسەری عالی ئینگلیس لەبڕیار نامەیەک دا کە لەڕۆژی ٢٠ی ژوییەی ١٩٢٣ دا ڕایگەیاند، بەمەیلیخویي سنووری کوردەکانی دیاری کرد. ٣٢

هاوکات لەگەل ئەو هەواڵە، حکومەتی عەراقش بەیاننامەیەکی بڵاو کردە وە کە کورتەی بەوجورەبوو، دەولەتی عەراق بەهیچچەشنێک نایەوێ لەبارەی چاوەدێرکردنی ناوچەی کوردستان کەلەژێر حمایەتیشیخ مەحمود دایە قسەی لێبکات، پێویستە ئەفسەرەعەرەبەکان جگە لە ئەفسەرە فەننیکان هەموویان بگەڕێنەوە ولاتی عەرەب، وە هەروەها ڕەواجی زمانی عەرەبی لەناوچەی ئیدارەکانی کوردستاندا بەسەرنەتەوە کەدا، دانا سەپێنی وە نایەوێ زمانێکی

رەسمیبێت. کوردەکان بەچاکی دەتوانن‌مافو، سروشتو، ئاکارێکی کە لەنێو ئەواندا هەیە جا، چ لەبارەی مەذهەب‌وئائین، وە چلەبارەی شتیدیکەوەبێ بەرێوەی بەرنو، بیپارێزن. ٣٣

ئەمما ئەو مەسەلەیەزورلە بڕیارنامەی نوئیل‌ی ١٩٢٢ دوور کە وتبۆوە! جامەبەست بەوچبوو ە،نەزاندزاوە

بەراستی لە ئاگادارێکی حقوقی لۆزانێ کە لە (٢٢ی ژوییەی ١٩٢٣) درا بوو! بەبێ ئەوە ی کە مەسەلەی موسڵێ نەتیجەی‌لێ وەرگیرابێ، لەسەر مەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناوخۆ واتە ئوتونومی کورد کوتائی هاتبوو، وە مافەکە دیاری کرابوو.

لەعەراقێدا، "بەچاکی بۆهەموو کوردێک جگەلە کوردە بێ‌خەبەرەکان ڕوون بۆوە، کە لەداهاتوودا بەشیان هەرمانەوە لەژێر چاوەدێری عەراق‌دایە وەئەوەشیان کوردەکان بەهیچ جورێک نەدەسەلماند، چوونکە ئەوەبەراستی بە هەست‌هاتنی عەراقە کە بوتە مایەی چارە ڕەشی ئەوان، تەنانەت‌دیاربوو کە ئیدی شیخ مەحمود پادشایەتی ناکا! ٣٤

بەلام لەسەر ئەوەشڕا کە کمیسەری پایە بەرزی ئینگلیس لەوەی هەڕەشەی دەکرد کە شیخ مەحمود بەکارو کردەوەی ڕامیاری ولات تاقەلەمرەوی‌جیرانەکانی درێژەپێ‌دەدا.

ئینجا کار بەدەستەکانی بریتانیا بۆ ئەوەی کە گوتە وئاکاری ڕا بوردووی خۆیان وەبیرکوردەکان‌بێننەوە "بیرەوەری مەنتقی" ئەوجار لەسەر تەدبیری پێشوو، کانگای دەفتری گشتی‌خۆیان لەسولەیمانی بە بومبی (٢٢٥ لیوری) (گەورەتر) لە ١٦ی ئوتی ١٩٢٣ بومباران دەکەن، وە ئەوەبۆهەوەڵین کەڕەتە کە بومبی "گەورە" لەکاردەبەن!

پاش چەن مانگ لەروژی نوئیل‌ی ١٩٢٣ فروکەیەکی زور هاتنە هەولێر کە لەوێ ڕابچنەسەرشاری سولەیمانیو، لەسەرڕا بومبارانی کەن. بەلام نیوەی‌لە فروکەکان لەتەپو، مژدا وون‌بوون وە گەڕانەوە، وە دوویان لە ناوچەی شیخ مەحمود کەوتن. کاربەدەستەکان هەر "ئەمرودەستووریان" بە شیخ مەحموددەدا کە خوی لەوکارە بپارێزی، بەلام ئەوەی کەدە بووبکرێ کرابوو!

## ١٩ ــ مەجلسی یاسای بنەڕەتی وەمانی پەیوەندی لەگەڵ بریتانیای گەورە

بەلام ئینگلیس و ، حکومەتی عەراق لەو خەمو ، چەمەدابوون کە: هەڵ بژاردنی نوێنەران بۆ یاسای بنەڕەتی بە چ چەشنێک بەڕێوەبەرن ، وەپاش دانانی فەیسەل لەسەرتەختی پادشایەتی ئەو مەبەستەی پێویست بوو . بە دوور خستنەوەی لیدەرە شیعەکان لە ولات ئەوکارەی نەختێک سووک کردبوو کار بەدەستەکانی عەراق هێندێ کاروباری هەل بژاردنی نوێنەرایەتیان ڕێک وپێک کرد ــ وە بەچەشنێکی سەر سووڕمان ئەوکارەیان کرد: واتە لەنێوانی هەل بژاردنی دا " لەکە ڕەتی هەوەڵ" تەواوی پیاوەکانێ ی کە حەقی هەل بژاردنی یانهەبوو "هەوەلین هەل بژاردرەکان" دەنگیان بە "نوێنەرە گەورەکان"ی دەستەی دووەم دا جا ئەو جار ئەوانیش نوێنەری دیکە هەل دەبژیرن . کاربەدەستانی ئینگلیس لەسەرئەوهەمووکارەساتەیڕا ، نەیانتووانی پێشولەوەی بگرن کە "کوردەکان نەتوانن نوێنەری باش بو مەجلس بنێرن .

لەسەرئەو هەموو فڕوفێڵە ش ڕاخەلکی کە رکوکو ، سولەیمانی توانیان لە نیوعەشیرەتەکانوشار دەسینان تێ دابێوە نوێنەری چاک بنێرنە مەجلسی یاسای بنەڕەتی . [٣٥]

لە ١٢ ای مارسی ١٩٢٤ هەل بژاردن "تەواوبوو" ! سەرئەنجام کوردستان ١٧ نوێنەری نارده دانشتگەی یاسائی عەراق . لەنێو ئەو نوێنەرانەدا ، "نوێنەرە باشەکان" بریتی بوون لەوانە !

(شیخ قادر برای شیخ مەحمود !) ئەحمەد تەوفیق بەگ لە سولەیمانی ، ساڵەبەگ نەفچیزادە لەکەرکوک ، جەمیل بەگ لەخانەوادەی بابان لەشاری کیفری ، وەشیخ حەبیب تالە بانی لەنێو سەرۆ کە عەشیرەتەکان هێندەیپێ نە چوو کە لە هەوەلین دانشتنەکەی مەجلسی دا ، چەن کە سێ لە نوینەرەکان دژی مافی ڕێک کەوتنویەکەتی، بریتانیالەگەل عەراقێ دەسیەکاربوون .

ئاژاوە لەمەجلسی بەغدایە بە ڕێوەبردرا ، وە ئەوە کاتێک بوو کە دوو

نوێنەری‌موافق دژی‌کوشت و کوشتاری ناڕەوا لەولات دا وە هەروەها لەبەرچاونەگرتنی مافی نەتەوەکان لە عەراق‌دا، دووان‌و، قسەیان‌کرد.

ئەوئاژاوەیە زور زوو لە کوردستان دا ئەسەری دانا: (لەکە رکوک دا سەربازەئاسوورییەکان پەنجاکە سیان بە رەشاش کوشت، بەلام ئەوکارە نرخ‌وبایخی شیخ‌مەحمودی لەولات‌دا بردەسەری‌وە پێش مەرگەکانی شیخ مەحمودتوانیان آسووری‌کان وە دەرنێن.

ئەوئاژاوە لەگەل مەسەلەی قوسی‌تەن‌تەنیە بو قسەلی کردن لەکون فرانسی لوزان دا لە ١٩ی‌مەی – ژوئن‌ی ١٩٢٤ بوو کە دەیانەویست سنووری (پانی‌تەلائی) عەراق‌وتورکیە دیاری‌بکری هاوکات‌بوو. ٣۶

## ٢٠ – بومبارانی سولەیمانی لەمانگی مەی ١٩٢٤

حکومەتی بەغدایە دەیەویست کە شیخ مەحمودی بەهەرچۆنێک بی لە نێوان لابەری، بو لە نێو بردنی ئەوکەرەتە لەریگای دا سەپاندنی‌مالیاتیکی قورس‌و، زالمانە دەس بەکار بوو، وە لەلایەکی‌ترە وەخەلکو، دووژمنانی‌شیخ مەحمودی دژی ئەو هان‌دەدا. هاوکات لەگەل ئەوە فڕۆکە کانیش لە٢٠ی مانگی مەی ١٩٢٤ دا، دەسیان بەبلاو کردنەوەی کاغەزو، تراکت بەسەر شاری سولەیمانی دا کرد.

لەوبەیان نامەوتراکتانە دا نووسرا بوو کە دە بووشیخ مەحمود لە ١۵ مەدا بێتە بە غدایە،وە وادیارە کە وە لامی‌نە داوەتەوە، جامەبەست بەوە شار لە ٢٨ و ٢٧ی مانگی دا زور بە گورجی‌و هەلە لە لایەن فڕۆکەکانی ئینگلیس بومباران‌کرا

لەڕاپۆرتێک دا کە هیزی هەوائی سەلەتەنەتی‌ئینگلیس لەبەغدایە دابلاوی کردەوە، رای گە یاندبوو کە لەو بومبارانەدا، لە٣٠٠٠ خانوی شاری سولەیمانی ۵٠یا١٠٠مالی کونی‌قەدیمی‌شیخ‌مەحمودلەنێوچووەوەزەرەروزیانێکی‌گەورەی‌لی‌کەوتو. ٣٧

تورکەکان مەبەست‌بەو بومبارانە لە ٣ی‌مانگی سی‌پتامبردا لەسازمانی نەتەوە یەک‌گرتوکان‌دا بڕیار نامەیەکیان بلاو کردەوەوەدەنگی‌خۆیان دەربڕی: لە سی بەشی شاری سولەیمانی دووبەشی ویران بووە، وە خەلکێکی زور لەنێو چوون! سەرئەنجام ئەو بومبارانە بەهیچ چەشنێک لەئاکارو، ڕەوشتی شیخ

مەحمودی کەم نەکردەوە، وەلەمەیدانی خەباتدەر نەچوو، بەڵکو دووهێندە لەبەرگری‌دا شێرگیرتر بــوو. ئینگلیس ئەوجار ئولتی‌ماتومێکی‌دا بە نوێنەرانی دانشتگەی‌یاسای‌بەغدایەوە بڕیاری دابوو کە: ئەگەر مەبەستو، پەیمانەکەی کە ئێمە چاوەدێری دەکەن، قامکی‌لەسەر دانەندری، وە تانیوە شەوی ١٠ی ژوئن نەسەلمێندریٚ وەک ئەوەیکە دژی‌ئیمە دەتانەوی ببزونەوە، وەئیمەش بەجوریکی دیکەعەمەل‌دەکەین.

ئینجا نوێنەرانی‌مەجلس یاسائی کە زۆریان بۆهات‌بوو لە ١٠٠ نوینەر کە ٦٧ کەس بو دەنگ‌دان هاوبەشیان کردبوو، پیش نیوەشەوی ١٠ی ژوئن‌ی ١٩٢٤، کارە کە یان بەڕێوەبــرد ،وەلەئاکاما ٣٧ کەس‌ی مووافق، وە ٢٤ مرۆڤی دژ وە ٨ کەس‌کەدەنگی نەدا، ئەو قەراردادەپێک‌هات. تەنیادوو نوینەری کوردی موسل لەگەل دەنگی موافق بەڵێنی‌و، ڕێ‌دەسیتان‌دا.

سەرئەنجام بەو هەموو هەڕەشەوفڕوفێڵەی ئینگلیس، فەیســەل مەلکی عەراق تووانی ناوچەی کوردستان بخاتە ژێر دەستی ولاتــی عەراق‌و، داگیری‌کات

## ٢١ ـ دووبارە داگیر کردنی ناوچەی سولەیمانی لەلایەن دەولەتی عەراق (١٩ ژوییەی ١٩٢٤)

لەمانگی ژوییەی ١٩٢٤ دا حکومەتی بەغدا ڕاوتەدبیری هێنا سەرەوەی‌کە شاری سولەیمانی بگرێتەوە. بەلام مەبەست وهەلوێستی ئەوکارە هێستا مەعلوم نەکرابوو: بێ‌گومان پاش ناهومێدی کوڕی تورکیەی شاری‌قوس تەن‌تەنیە کــە ماوەیەک دانشتنەکەی درێژەی پێدرا، وەلەبارەی موسل‌دا دەیانەویست کە تە تەسمیم بگرن‌وەهەروەها ئەوکوڕە دەیەویست لەگەل شیخ‌مەحمود پیک‌بێــتو، کارە کە بەریوەبەری، چاوەڕووانی‌دەکرا.

ئەوەی کە ڕوون‌بووە، فەیسەل لەوکارە دانفوزی زۆر بوو، بەلام هەرچێک بێ، ڕاو، تە دبیرلە لەندەن ڕا دەگیرا وە ئیدارەی دەرەوەی ئینگلیس‌ش لەکەین وبەینی تورک و شیخ مەحمود بەچاکی‌ئاگاداربوو.

وە ئیدارەی سیاسی دەرەوەی ئینگلیس زور بەگرنگی بە دووای ئەوکارەوەبوو وەتەنانەت ئاگاداری‌دا کە لە "نەکاو" ئەو هەلوێستە گیراوە وەکمیسەری

پایە بەرزیئینگلیس بەبێ سەلماندنو، پرسیاری حکومەتی خوئی ئەوکارەدەکات[٣٨]،
بەلام هەرچونیک بی "پێیلەوکارەشدەنـــی" سەرئەنجام دەگوتری کە ئەو راو
تەدبیرە زیاترئی بەغدایەبوو، کە کاربەدەستە ئینگلیسیکانش دەسیتان تێدابوو،
وەکاتیک کەحکومەتی ناوەندیئینگلیسلەوکارەیبەغدایەئاگادار بوو ئیتر درەنگ
ببوو»، وەهێزیک لەلایەن کاربەدەستەکانیبەغداوە ناردرا، کەگەیشتبوونە دە
روازەی سولەیمانی، وە لە ١٩ی ژوییەی ١٩٢٤ شاریان گرتەوە! [٣٩]

## ٢٢ ـ ڕەخنە

شیخمەحمود بەهیچ جوریکوابەسووکو، هاسانیوەبەبێشەڕ سولەیمانێی
تەسلیمی دووژمن نەکرد. سەرئەنجام پاشئەوەی کەشاری چول کرد، لەگەل
١٥٠ کەسی پیاوی چەکدارلەسەر کیوێکیچووک لە سەر سە روی روژە هەلاتی،
سولەیمانێ "پیتەختی" کوردستان، بنکەیدامەزراندوە تا ٢٧ی ژوییەی خەریکی
زۆر بەوەشاندن لەهێزی داگیرکراوی شاریبوو.

پاشانپەنای بۆبەرزەنجێ برد، بەشوێنی ئەوە دا چۆ شاریپێنجون،
پیشمەرگەکان تائاخری سالێ هوروژمو، هەلمەتیان بو سەر هیزی ڕێک و پێک
خراوی بەغدا یەدەبرد، وە تانزیک سولەیمانی دەچوون. لەئاخری مانگینووامبری
١٩٢٤ ئیدموند دەستوریبومبارانی کوردەکانی لە ناوچەی سیتاک وە شاربەزار
دا، بو هەوەلینجار بومبی ناپالمی بەکاربرد! شاری سولەیمانی پاشئەوەی
کەگیراوە لەژێر چاوەدێری ئەفسەرێکی ڕامیاری ئینگلیسی بەنێوی شاپمەن کە بە
"حاکم" داندرابووئیدارەدەکرا، وەکمیسەری عالی ئینگلیس دەسەلاتی تایبەتی
لەناوچەکەدا بەڕێوەبرد. لە ٢٠ی دیسامبری ١٩٢٤ مەلک فەیسەل بوهەوەلین
کەڕەت بۆ دتینێ شاری کـــەرکـــوک چوو، وە ئالای دەولەتی عەراق بو
هەوەلین جار لەسەرقە لای کەرکوکی هەلّ کرا. وەلە پاشان چۆ کیفری، بەلام
لە ڕۆیشتن بو شاری سولەیمانی وازیهێنا. ئەفسەرەکان پێیانگوت کە شار پر لە
بەفرە، وەهاتو، چۆ خراپە، لەئاکامافەیسەل نەیوێرا بەو زووانە چاوی بە پێ
تەختی کوردستانی خووارو بکەوێ. فەیسەل ئاگای لەوەش بوو کە شیخ مەحمود
پەڕیوەتەوە خاکی ئیران.

سالیک پاش ئەو ڕاپەرینە لەئاکاما لە ١٦ی دی‌سامبری ١٩٢٥ دا سازمانی نەتەوەیەک گرتۆکان ڕاو، تەدبیریان هێنا سەرئەومەبەستەی کە ناوچەی موسل بێتە سەرولاتـــی عەراقی عەرەب، وە وەک شاری "بروکسیل"بی‌کەنە سنوورو، ڕێبازی ولات.

سەرئەنجام ئەوەی‌کە بۆ کوردان‌ماوە، ئەوەبوو کە سازمان‌ی‌نەتەوە یەک گرتوکان لەئینگلیس داوا بکات کە لە ئیدارە کردن ودامەزراندنی سازمانێکی ئیداری کوردی، یارمەتی بە کوردەکان بکات تالە داهاتوودا حکومەتیکی ناوچەی بۆ کوردان بەریوە ببردریٚ"

## فه سلی ۴

### شورشو، ڕاپەرینی شیخ سەعید (۱۹۲۵)

لەنێو چوونو، تێک رووخانی حکومەتی خەلافەتی عوسمانی ،وە هاتنە سەرکاری مستەفا کەمال، وە ڕاگەیاندنی حکومەتی کۆماری لە ۳ی مارسی ۱۹۲۴، کاتیکی زۆر نالەباری بو کوردەکان هێنا بو پیشێ، هەروەک کە گوترا، کوردەکان بو پێش بردنی ئیشوکاری خۆیان کاتێک لەیونان، وە وە ختێک لەئینگلیس وە هێندێ وەخت دژی ئەوان لەگەل حکومەتی تورکەکان ڕێک دەکەوت کە لەبارەی موسلدا یارمەتیان بدەنو، تابکەوێتە ژیر دەستی حکومەتی تازەی مستەفاکەمال.

لەمەبەستێکو، هەلویستی دیکەدا کە دەگوترێ کە بۆچ کوردەکـــان هاوکاریان لەگەل ئیمپراتوری عوسمانی دەکرد ئەوەبوو کە مەسەلەی فاناتیسمی مەذهەبی وە سرردانوواندن بۆ سولتان خەلیفەی عوسمانی لەگۆڕێدا بووە. بەشیک لەکوردە دەربارێکانی سولتانی عوسمانی پاشئەوەی کە رژیمی خەلافەت ڕووخا، هەروابە چەشنی جاران وەفادار مابوونەوە، جابەو بۆ نەیەوە مەسەلەی مەذهەب لەنێو نەتە وە پەرستەکانی کورد هەروا مەسەلەیەکی گرنگ مابۆوە، وە هەرگز بیرو، باوەڕیان نەدەکرد کە بەو زووانە حکومەت لەبەین بچێ. ئینجا کاتێک کە حکومەت ڕووخا، تە واوی کوردەکانی تورکیە ئامادەی ئەوە بوون کە هەتا دلۆپەی ئاخری خوێنیان بۆ وەدس هێنانی مافی سەر بە خوئی گشتی لە کوردستانی تورکیە دا خەبات بکەن، و( بو بەختەوەریوو، وەدست هێنانی مافی نەتەوایەتی گشتی تێ بکۆش، وەتەنانەت هەر جورە فکرو، ئیدێئۆلۆژێکی کە هەیانە بوخاتری وەدس هێنانی مافەکە دای بنێن وەلەخەباتی تازەدا بە شداربن

بەلام ئەوکارە ساوەساوی تێداکرا، ئیتر حکومەتی تازەی مستەفاکەمال پەرەی گرتبوو، وە لە ئاناتولی‌و، ئیرانیش کەسن‌نەما بووە کە لەو خەباتەو شەڕە بی ئەمانە دا هاوبەش نەبێ، بەلام لەسەر ئەوەشڕا کە لک و قازانجی‌بو کوردەکان تیدا نەمابوو.

لەسالی ١٩٢١ تا ١٩٣٧ کوردستان‌ی تورکیە بێ‌ووچان‌و، پسانـــەوە لەئاکاری ڕا پەرین‌و، بزووتنەوەدا هەربەشداربوو. هێندێ لەوشۆڕشانـــەو، ڕاپەڕینانە لەمێژوودا زۆرحیسابی‌لەسەر نەکراوە، بەڵکە تەنانەت بەکایەوگاڵتە نێوبردراوە! بەلام دەگونجی لە ڕاپەرینی‌شیخ سەعیدلە سالی ١٩٢٥ وە لە بزووتنەوەی ئاڕاڕات لەسالی ١٩٣٠ وە هەروەها لە هەلستانێ دەرسیم لەسالی ١٩٣٧ بەچاکی نێو ببردرێ.

ئاکاری بەتینی ئەو قارەمانانە زۆرجاران بەهان وتین‌دانی ئاکاری دیپلوماتە ڕامیارەکانەوە ڕووانگە یەکی خەمبارانەی بۆ لیدەرە کوردەکانـــــی قوستەنتەنیەی بەدی‌هێناوە ،وە بە سەرهات‌و، سەودا گەری تێدا بووە.

### ١ ــ ڕاپەرینی شیخ سەعید

لە ١٥ی فیورییەی ١٩٢٥ دا "هەوال دەری ئاناتولی، بە کورتی ڕای گەیاند کە! بە سەرهاتێک لە گووندی پیران لەنزیک ژەنج، لەبەینـــــی ژاندارمەکان ،وە ٥٠کەس لەپیاوەکانی‌شیخ سەعید[1] رووی داوە، وە دوو کەس

---

[1] ژیانی شیخ سەعید : شیخ سەعید کوڕی شیخ ــ عەلی وسالی ١٢٨٥ ای کۆچی لەدایک بووە ، دانشتووی دیسی (کلدار) بووەلەپاشان چووە بو (پالو) کەیەکیکە لەدی‌یانەی سەربە ناحیەی (منشی کورد)ە لە تورکیا کەئەم ناحیەیەش سەربە ولایەتی (گەنج)ە. باپیری‌شیخ‌سعید کە (شیخ علی) بووە تەریقەتی نەقشبەندی (مەولانا خالید) وەرگرتووە ، لەشەرع ودیندا زانایەکی دەست بالا بووە ، وەهەرلەزەمانی‌باوکیادەستی بەبلاو کردنەوەی دین وارشادات کردووە. وە لە هەلبەستدا دەستیکی بالای هەبووە ، هەلبەستی بەکوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی ووتووە. ←

دوای ئەوەی کە باوکی لەسالی ١٣١٦ای کوچی‌دا ، کوچی دوایی کرد ، شیخ سعید بووە جێ‌نشینی .
شیخ‌سەعید (١٢) زانای گەورەی بووە کە لەژیرەدەستی خویدا زانیاری دینیان تەواو کردوە ، وەنزیکەی (٦٠) هەزار دەرویش و خلیفەی هەبووە ، وئەمانەگشتی لەژیر فەرمان و چاودیری خویدا بوون ولەقسەی‌نەچوونە تە دەرەوە .
شورشی شیخ سەعید : پاش شەری جیهانی یەکەم میللەتی کوردی‌ش وەکو میللەتەکانی‌تر بیری‌لەسەر بەستی‌و ئازادی دەکردەوە ، وەپوئەمەش چەند کومەلیک و پارتی سیاسی دامەزرا بە تایبەتی لەکوردستانی تورکیە وەکو : کومەلی (هیوا ــ هیفی) کە روژنامە (روژی کورد) یان دەرئەکردوە کومەلی «رێک خراوی کومەلایەتی‌کوردستان» وەپارتی (میللەتی کورد) کومەلی (خویبون) وەکومەلی (بلاوکەرەوەی زانیاری) وەگەل کومەل وپارتی . . .
یەکیک لەوشۆڕشانە کە لە تورکیەدا برپابوو شورشی شیخ سعید بوو. شیخ لەناوچەی (گەنج) داخوی کوکردەوە ، وە بە هەموو لایەکدا هەوالی بلاو کردەوە کە نابێ بەرامبەر بەم ناڕەوایە کەبەمیللەتی‌کورد ئەکریـــت دەستەوسان بوەستن وگوی نەدەنی بەلکو ئەبی مافی نەتەوایەتیمان بسێنین ولەمەبی‌دەنگ نەبین و داوای لەهەموو سەرکردەکانی کورد کرد کە ئامادەبین‌بۆشورش و نامەشی‌نووسی بوئە و سەربازوئەفسەرەکوردانەی‌کە بڕاوی پێ ئەکردن‌وکە لەسوپای‌تورکیا دابوون‌کەئەوانیش بەشداری ئەو شورشەببن .
وەبوئەم مەبەستە لەشکرێکی گەورەی میللی‌پیکەوە نا بەسەروکایەتی خوالی خوش بوو) خالدبەگی جبرانی) کەلە دوایدا بەدەستی تورکەکان کوژرا .
شیخ‌سەعید لەگەل سەرکردەکانی کورد و خالد بەگدا شوینی شورشەکەیان نیشان کرد کە شاری (گەنج) .بوو کە لەڕوژی ٢١ ــ مارس ــ ٩٢٥ ١دا شورشی بەرپا بکەن بەلام بـــەرلـــە دووحەفتەپێش شورشەکەیانی‌لە ٧ ــ مارسی ــ ١٩٢٥ دا هیندی لەمریدەکانی شیخ لەناوخویانداتیک چوون و نهێنی ئەم شورشەبەئاشکرائی کەوتە چنگی تورکەکان وەحکومەتی تورکیە بەیارمەتی ئیستعماری فەرانسە هەموو هێزیکی خوی‌خستەکارولەشکریکی

بقیه زیرنویس صفحه قبل

لەژاندارمەکان کوژراون !

لە ٢٣ی فیورییەدا ڕۆژنامەکان نووسیان کەئەو ڕووداوەیە زۆر سووک وچووک نیە، بەلام وا بەستەی‌نیزامی ئینگلیس لەشاری قووس تەن تەنیە دا‌'وای گومان برد کە حکومەتی تورکیە ئەوکارەی گەورە، دەکاتەوە، وەڕنگی سیاسی ناوخۆ پێ‌دەدا، ئەوەش مەبەست بە دژایەتی‌لەگەل دووژمنانە ـ یان بو سەرکوت کردن‌و، مات کردنی ئەوان. ١

لە ٢٤ فیورییەدا وەزیری ناوخو ڕای‌گەیاند کە لەوناوچە یە دا هەلویست‌و، نەخشەیەکی گشتی بزوتنەوە یەک تائاخری‌مانگی مارس بەریوە دەبردرێ، ژمارەی‌پیش مەرگەکانی شیخ سەعید پترلە ٧٠٠٠ کەسن، کە لەنیوئەوان دا هەروەها هەلاتووی پەنابەری‌نیزامیٚ‌کی زۆری‌تێدایە.

هێندێ لەروژنامەکان دەیان نووسی کە بریتانیای گە ورە بە شوڕش گێڕەکان یارمەتی دەکات! روژنامەیەک بە نێوی وەتەن، ڕای‌گەیاند کە ئەوکارەساتـــیە لەبنەڕەت‌را لەسازمانێکی خراپ سەرچاوە دەگرێ کەخەریکی بەربەرەکانی‌یە.

لە ٢٦ی‌فیورییە دا روژنامە کە نووسی کە تەواوی ناوچە کە لەژیردەستی شوڕش گێڕەکان دایە. حەرە کەت‌و، ئاکاریان سەرچاوە لە دین و مەزهەبە: ڕابەرەکەی پیاویکی تاج‌دارە کە لە پادشایەتی ئیمپراتوری‌یە کە نیوی شازادە سەلیم ،وەیە کیکە لەکوڕانی سولتان حەمید!

ئینجا لە سەرئەو هەمووهەوالٚ وخەبەرانە کە لەبارەی ڕاپەرینی شیخ سەعید دا دەدرا، هیچ‌پیاوێکی ڕامیاری ئوروپائی، یان روژنامە نووسێـــک نەی‌توانیوە وەیان‌نەچووە کە دیتنێک لەو ڕووداوەیە بکات وە تەنانەت لەماوەی سێ‌سال بزوتنەوە کە ـ روژنامەکان بەمەیلی خویان دەیان نووسی، وەئەوەی

---

*زیرنویس صفحه قبل*

*ـــــ گەورەی زیاترلە (٢٥)هەزار کەس‌کوکردەوە ولەڕێگەی (سیواس وارضروم وقەراغی بەحری‌ڕەش) وە هەندیکی تری‌لەریگەی ئاسنی بەینی بەغدا. حلب وە نارد، وەئەم هیزی تورکە لەگەل لەشکری شیخ‌لە(دیاربکر) داکەوتەشەڕوەلەئەنجاما لەشکری شیخ‌شکا، شیخ ودکتر فواد و (٥٦) کەسی ناوداریان‌گرت لەوانە (٤٦) کەس‌کوژران، وە لەویدا لە ئوتی ١٩٢٥ لە داردران." م-ا*

کوردستانی تورکیە
سنوری ناونە تەوەئی
چوم
مقیاس کیلومتر ١٥٠
0 50 100 150kms
ئەرزنجان
ئەرزەروم
ئیگدر
کیوی ئارارات
بایزید
ماکو
ئەرەس
خنیس
گیژی
دەرسیم
مەلازگرد
بولانیک
بنگول
پالو
موش
خارپوت
سیوان
بەحری وان
وان
ئیران
مالایتا
پیران
بیتلس
ئارگانا
دیاربەکر
سی ایریت
نیگر
فرات
سیویریک
چرناک
حەکاری
شەمرینان
ماردین
اجەزیرە
اورفا
عراق
سوریە

کەمەعلومو، ئاشکرایە، ئەوبزوتنەوەیەبەچاکی ڕوون نە بۆ تەوە وە ک گاڵتە نێویان بردوە بەلام هەرچونێک هەیە گوتراوە کەئەو ڕاپەرینە هەستی بووە..

۲ ـ شیخسەعید :

بەڕاستی دوورلە عەقلو، زانستی هەرمرۆڤێکی کوردە کە لەبارەی کەسێکدا کە زەمانێک لە بەرانبەر حکومەتی تازەی مستەفا کەمال ڕاوەستابێوە خەباتی نەتەوایەتی کردبێوە کاری لەحکومەت شێواندبێ، پێیبگوترێکارەکەی ویگالتەو، کایەبووە!

تەمەنو، سال و ئەندامو، باڵاو، سەرو، ڕوو، دیمەنو، ئاکـــارو، کردەوەیویهێستا بەچاکی نەناسرا بوو! روژنامەکانی شاری دیاربەکر کە لایەن گری دەولەتی تورکیە بوون، بەجۆرێکی باشو، ڕاستەقیە ئەوپیاوەیان بەخەلک نەدەناساند. تورکەکان شیخسەعیدیان بەپیاویکی نەزانو، کێویلکە دەناسی (تورکەکان بە تەواوی کوردی دانشتووی تورکیەیان گوتوە، تورکە کیویلکە ــ وەرگیر.) ۲

شیخ سەعید مرۆڤێک بوو لەبنەمالەی شیخی نەخشبەندی، کوڕی شیخ عەلی، کە لە مەلبەندیپالوودا ژیاون، پیاویکی خوداناسو، مەذهەبیبوو، خەلکی کورد حوڕمەتوڕیزێکی تایبەتی بوئەو گرتووە، پیاویکبوو، کە بو ئامانجی کوردایەتی تێ کۆشیوە، مەبە ستێکیدی کە شایانیباسە ئەوەیە وە بەوپرسیارە وەلام نە دراوەتەوە کە ئەوانەی کە تەنانەت دژی کەمالیکاننە بزوتوونەوە بۆچ دەبوو لە ژیانی تال دابنو، لەگەلیان خراب ببزونەوە.

لە را پە رینە کەی شیخ سە عیدش دا هەر بەو جورە لە گەل کوردەکان بەتایبەت لەگەل سەر و کەکان عەمەلیان کردوە. دە گوتری کە کە مالیکان بو سەر کوت کردنی دیش لەو بزوتنە وەیە کە لکیان وە رگرتوە. هەروەها مروقە کانی نەتەوە پەرت کـــە لەگەل راپەرینی سالی ١٩١٩ ( کوری ماژورنوئیل) بوون بە سەروکی سادە ناسراون، ئینجا یان گیراون، وە یان لە ولات دور خراونەوە.

زورحبی باوەر کردن نیە کە ئەنداماني روناک بیری کورد، وەک دوکتور فــــواد دیاربەکریو، توفیق بەگی وەکیل، قایم مەقامی شیخ سەعیدبوبن. ئـــــەوەی کـــە

بریتیە ، عەبدول قادری کوری شیخ عوبەی دیل لا کە بوو بەقوربانی پیلانیکــــــی پولیسی ، لە گشت دا دور لە کردە وە بووە .

تەنیا راوتە دبیر کەری خاترجەمی شیخ سەعید خالد بەگ سەروکی عەشیرەتـــی جیرانلی ( سەرهەنگی قەدیمی رژیمی حەمید پادشا ) وە سەرهەنگ نیوریس بوون .

### ٣ ــ لە تە دارەکی شورش دا

بەسەرهات‌و ، شۆڕشی خەمباری شیخ سەعید لەمانگی نوامبری ١٩٢٤ ڕا دەستی پێکرا : واتە لە شاری دیاربەکرە وە چەن سەد سوواریکی وی بە قە سدی وەی کە سەرێک لەجیرانەعەشیرەتەکانی‌دەدا وەڕێ کەوتن . بەباشی دیار بوو کە پیاویکی وا مەزهەبی ، بەڕێزو ، خاوەن قودڕەت‌و ، دەولەمەند کە ئەو حەڕە کەتەی دەسی پێ کردوە ، قەت دەولەت گومانی وەی ناکا کە لیێ دردونگ بی‌و ، دژی‌ئەوکاربکات ٣ ئاکارو کرذە وەو ، نفوزی‌شیخ کە لەناوچە کە دا ئەسەری هەبوو ، بەو حەرە کە تەپتربوو ، وە بەبێ ئەوەی کە لیێ مەشکوک بن‌دەستی بە را گەیاندن‌و ، پڕوپاگاندی خویی کرد .

ئینجا تویژەکان‌و ، جوتیارو کرێکارەکانی کوردی لەدییەکان دا ڕوون کروەوە ، وە مەبەستی دووژمنایەتی دەولەتی ئانکارای لە گەل خەلکی کوردی بۆشەرحدان ، وە وردە وردە باسی مەسەلەی نەتەوایەتی ناوخوی کوردستان بۆکردن ، وە خەبات وبەربەرەکانی ڕا بردووی کوردەکانی بو بەهەست‌هینانی مافی سەربەخوئی وەبیرئەوان‌هێناوە .

مەبەست‌و ، دەلیلی‌وەپێش کە وتنی شیخ سەعید لەو ئاکارو کردەوەیە بە چاکی ڕوون بوو : لەبەینی ئیمزا کردنی پەیمانی لوزان ، وە بە تاڵ بوونـــی خەلافەتی عوسمانی ، حکومەتی تازەی ئانکارا تەسمیمی گرت‌بوو ، کە دژی کورد هێندێ‌کار بکات ــ ئینجا دەستی بە بە ستنی قوتاب خانەکان‌و ، مەدرەسەکان‌کرد ، وەقسەکردن ووت‌و ، وێژی بەزمانی کوردی قەدەغە کرد ، سەروکە کوردەکانی لەولات دوور خستەوە .

جگە لەوانە دەولەتی تازەی ئانکارا لەبارەی کوردستان دا مەبەستو، گومانی دیکەشی هەبوو کە دەیەویست یەک بە دووای یەکیٚ دا بە ڕیٚوەی بەریٚ، واتە وازی ئابوری ولاتــی کوردستانی‌تیٚک‌دا وەخەلکی بە چارەڕەشی‌و، کویٚرە وەری‌کیٚشا، وەهیٚنای ناوچەی کوٚنی شاری سنجاقی‌لە ژیٚرئەیالەتی"والیس" دا دانا کە بەڕاستی ئەو ئاکاروعەمەلەدژانەی کە دەی‌کرد وە لە بارەی‌کورد دا بە ڕیوەی دەبرد، زوٚر خراپتر لە دەورەی ئمپراتوری عوسمانی‌بوو.

سەرئەنجام حکومەتی تورک لە کردەوەی ڕامیاریٚوە بەکاری جوتیــارە دییەکانی کورد تەواوی‌و، کوتائی پیٚدا وە مەسەلەی (تورک کردنی) ولاتــی بە دانی‌زەوی سەربازەکانی تورکی قەدیم واتە ئەو زەویو، سەرزەمینانەی کە ئی هەرمەنیٚکان بوو، وە لەولات دوورخرا بوونە وە، وە یان قەلتٚو، بڕو، ئیعدام کرابوون وە هەروەها زەویــو، زاری کوردەکانیٚکەهەلاٚ توون، وە یان لە ماوەی شەری هەوەلی جیهانی دا لەولات، دەرکراون‌و، دوورخراونەوە، حەل کرد

## ٤ــ "دەستی" ئینگلیسیکان

شورشی کوردستان‌ی تورکیە کاتیک دەستی پیٚکرا کە ئەندامانی نەتەوە یەک گرتوکان دەیانەویست لەسەرمەسەلەی ناوچەی موسل وە سنووری عەراق‌و، تورکیە کە دەگەڕیٚتەوە بو موسل، راو، تەدبیری لەسەربدەن!

بومستەفا کە مال بەباشی ئاشکرا ببوو، کە ئەو شورشە دەستی ئینگلیسی تیٚدایە! وەدەی گوت! ولاتــی تورکیە لەمەترسی‌و، خەتەر کەوتووە، کوردەکان لەلایەن ئینگلیسەوە هان دراون‌و، لە پشتووانی ئەوان کە لک وەردەگرن... هاوکات لەگەل ئەوکارە ساتە روژنامەکانی تورک بە ئاشکرائی دەولەتــــی ئینگلیسیان بەوە تاوان‌بار کرد کە یارمەتی‌گەری کوردەکانە. ٤

دەگونجیٚ بلیٚن کە بەچاکی ڕوون دە بیتەوە کە ئەگەر ئینگلیس لەو ساتەو، دەمەدا کوردەکانی یارمەتی دەدا، دەست لەلایەن‌گری لەتورکەکانیش هەل‌ناگری، دەساپیتر لەو دووکارە مەبەستی ئەوەیە کە بتوانیٚ ئەرکیٚکی گران لەسەر شانی ئەوان دابنیٚ، وە ناوچەی نەفتی موسل کە کوردەکان لە دەروازەی وی‌دان رزگار بکات، وە تەنیا حکومەتی تازەی تورکیە لەمەلبەندی‌خو ی‌دا کە بوٚیی دیاری

کراوە قەناعەت بکاو، رازیبیت ٥ ئینجا لە رووانگەی پیاوانی رامیاری وە ئەوکارەش بە دووایدا بوون. لەشاری قووس تەنتەنیە، ئالبێرت سارولت بالوێزی فەرانسە رای گەیاند کە، لەمەحکەمەی جیهانی داهێستا ئەو مەسەلەیە لە دەستوری ڕۆژدا دانەندراوە، بەچاکی خوتیوەردانی ئینگلیس دیاری نەکراوە.

لەئاکاما ئینگلیس ئاگاداری دا کە ئەگەر دەبیندرێ لەناوچەی موسل دا ئەو کارەساتە بەریوە بردراوە، زیاتر دەستی تورکەکانی تێدایە، ئەویش مەبەست بەوەیە کە لەناوچەی موسلدا کوردەکان سەرگەرم کەن تانەتووانن بە راپەرینەکەی دیاربەکرو، وان یارمەتی بدەن، وە لەنەتیجەدا ئەو ڕاپەڕینەی تێکبشکێنن. ٦

**٥ ـ نەخشی شورەوی**

٧ ئینگلیس ڕای هێنا بۆ سەر ئەوەیکە خالد بەگجیرانلی لەگەل قونسولی رووسەکان لەوورمیدا پیش شورشەکە چاو پیکەوتنیتکی هەبووە، بەلام ولامی مەنفیوەرگرتووە. . . . وە ئەو چاوپیێ کەوتنە دیاری نەکراوە کە ئایا رەسمی بووە، یان عادی و مەعمولی.

ئینجا هەرچێک بی، دەولەتی ساوای سوویەت لە روژنامەی "ئیزوێسیا" دا ڕای گەیاند دژی شورشی شیخ سەعید کە پەرەی پێدراوەو، گەورەبووە، شورشێکی دەرەبەگایەتیو، فئودالیتەیە، وەشیخ سەعید بەراستی بۆتە قوربانی قودرەتەکانی غەرب، چوونکە زۆر بەباشی روون بۆتەوە کە ئینگلیس لەو شورشە پشتیوانـــی دەکات، وە ئەوە لە ڕاستەقینەدا دژی ڕاپەرینی کوردە، وەلێرە دا ئینگلیس کوردەکانی هان ویتن داوە. ٨

**٦ ـ کاتی پیاوە گەورەکانی کورد لە شارەکاندا**

دەسا لەبەینی خەلکیشارەکانو، دێیەکان دا نێوان ناخوشیانلیوەدیارکەوتو، لەیەکتریان هاندان. لەدیاربە کردا هێندێ لە گە ورەکانی کورد لەدەو رووبەری کەمالیکان کۆ بوونەوە! یەکیک لەوانە پیرنجیزادە سدیق سەروکی پارتی خەلک، وە سێپیاویدی کە نوێنە رەکانی شاریئانکارا بوون کۆ بوونە وە یەکسان

پێک هێنا کە بریتی‌بوون لەوانە: پیرینجی زادە فەیزی‌بەگ، وەزیری پێشووی ناوخۆی‌تورکیە، مفتی‌زادە شەرەف، وەزولفی‌زادە.

بەلام عێلی جەمیل پاشازادە کە لەنهێنی دا لەگەڵ پیلانی ناوخۆ دەستی تێدا بوو،وە نەی‌دەویست بە تەواوی لەگەل شۆڕشە کە هاوکاری‌بکات. قاسم‌برا گەورەکەی هەروەها تاوان‌بارکرابوو کە لە سالی ١٩١٩دا لەگەل دووژمن هاوبەشی هەبووە، وە بوشاری قوس‌تەن تەنیەیان ناردبوو.

ئینجا یەکیک لەسەروکی عێلەکەبەنێوی ئەحمەدبەگ هاوڕێ لەگەل شەڕ کەرەکانی، دژی شوڕشی شیخ سەعید لەگەل هێزی مستەفا کەمال کەوت، وەلە دییەکان داهەڵمەتی بو کوردەکان دەبرد.

## ٧- سەرەتای شۆڕشو، هەڵستان

هێندەی پێ نەچوو کە ١٠٠٠٠ پیاوی چەک‌دار کە هەموویان "گیان‌و، ماڵیان" لە پێناوی شیخ سەعیددا، دانابوو، وە ئامادەی شەڕێ ببوون لەدەورەی کو بوونەوە. بەلام ئەوهیزە چەکیان تەنیا شمشیرو، نیزە بوو! هەوەلین روو داوە کە لە نیوەراستی مانگی فیوریە دا وەدی‌هات.

بەشوێنی بە رەنگارێک لە پیران لە ١٣ی فیوریەی ١٩٢٥ لەگەل پێش مەرگەکانی شیخ سەعید، ئینجا سەروکی هێزی فەرماندەری ناوچەی دیاربەکر ٥ هەنگی نیزامی کە زور کوک وتەیار بوون، لە بەرانبەر کوردەکانی‌دا رازاندەوەو، ڕای‌گرت‌و، پاشان بە شەڕی دان.

لە ٢٢ی مانگی فیورییە دا هەوەلین دەستەی بریندارەکانیان کە هیناوە دیاربەکر، ئەوان زور بە مەترسی‌و، هەراسەوە چونایەتی شەڕکەیان لەگەل کوردە شوڕشگێڕەکان‌دەگێڕاوە،وە گوتیان کە ٥ هەنگی نیزامی‌ئیمە قەلت‌و، بڕ کران‌و، لەنێو چوون!

لە ٢٤ی فیورییە دا لە بەرانبەر ئەو ڕوو داوەقورسەدا، هیزی ناوەندی لە شارەکانی دیاربەکر، وە مەئمورەتول‌عەزیر، (خارپـوت) وە ئورفا چەن مرۆڤیـکی‌وەک جەمیل پاشازادە ئەکرەم، وە دوکتور فووادی گرت‌و، لەبەندی خانەی کرد.

## ۸ ـ گرتنی خارپوت

له ۲۶ فیوریەدا هات و چۆی لەبەینی دووشاری دیاربەکرو، خارپوت بڕا وه شورشگیرەکانی شیخ سەعید هاتنه نێوشاری خارپوت... خەلک شاریان زور زوو چول کرد بوو، وەنەیان دەزانی که چون هیزی دەولەتی که خاوەن ئەسلەحەو، سازوبەرگێکی زور بووه، شاری بەجی هێشتووه، وەیان‌شکاون. بەلام هەر لەوکات‌وساته دا تەواوی ناوچەی شمالی دیاربەکر لەگەل ئارگانا، پالوو، پیران، مەئورەتوول‌عەزیر کەو ته وه ژیر چنگی شۆڕشگێڕەکان.
به ووتەی روژنامەی دەولەتی جمهوریەت، ژاندارمەکان‌و، هیزی ناوخوئی ئەو ولاتانـــه وه هەروەها تاقمی،محەللی‌هاتنه بال هیزی شورشگیرەکان، وەیان هەلاتن: حکومەتی ناوەندی‌ئانکارا بەراستی سەری لەو کاره سوورما بوو، وه ترسێکی گەورەی لی پەیدابوو. ۹

## ۹ ـ گه ماروی شاری دیاربەکر (۴ تا ۷ی مارسی ۱۹۲۵)

له ۲ی مانگی مارس هیزی شیخ سەعید چەن سەعاتیکی ڕێگابۆ دیار بەکر نەمابوو، خەلکی شاری له لایەن هیزی دەوله تیۆه له ۲۷ی فیوریەدا بێ‌چەک کرابوون. له ۴ی مارس که شار له لایەن شورشگیرەکانی شیخ سەعید گەمـــارو درابوو، فەرماندەری هیزی دەولەتی ۲۰ توپی له دەو رووبەری ذیوارو، قەڵای شاری دامەزراندبوو، وه تەواوی مەدرسەو، سەربازخانەو، نەخۆش خانەکان، چۆل کرابوون. دیواری شار له زور جیگایان له سەر دەروازەی ریگاکان‌ی، "پی‌ته ختی" کوردستان به سمیتی داڕژترابوو. هیرش لەنیوه شەوی ۷ی مارس‌دا دەستی پێکرا، وەلەلای‌دەروازەی خارپووتەوه بوو.
کوردەکان له سەنگه رەکانیان هەل قەندران‌و، زه ره روزیانێکی گەورەیان لیٚ کەوت... ئینجا دووسەعات بەکاتی بەیانی دەسته یەکی دووسەد نەفەری کورد له دەروازەی ماردەنەوه هێرشێکی تازەیان برده سەر تورکەکان، وەهاتنه

نیوشاری، وەتاقمێک لەسەر بازەکانی تورکیە کە لە پۆستی قەراغ قە ڵای شاری دابوون، قەڵت‌و، بڕ کران، بە دووای ئەوە دامەبەستیان ئەوە بوو کە پشت لەسەربازە تورکەکان بگرن، بەلام لەنەکاو تاقمیکی سووارەی تورکان گەیشتنێوە کوردەکانی بلاو کردو، لەکوچەکانی شاری کردن، وە لەکاتی سەری بەیانی وردە ــ وردە کوردەکان کە ماندوو، شەکرت بوون دەسیان لەشەر کیشاوە، وەپاشەکشەیان کردو، هاتنە قەراغ چومی‌دیاربەکر. چەن سەد سەربازێکی‌تورک لای سەروویان گرت بوو، وە لە پەناگایەکی زورقایم دا جێگیر بــــون وە سەنگەریان لێ دابوو.

ئینجا ٦ تا ٨٠٠٠ شۆڕشگێڕی کورد، دیسان دەسیتان بەهێرشو، هەڵمەت برد! بۆ شیخ سەعیدئەو شەڕە زور بەنروبایخ بوو، شکان‌و، نەمانی یەک بوو، هەنگی تازەی شەرکەری‌تورک بە یارمەتی تورکەکان هات. لە ٨ی مارس‌دا لە کوچەکانی‌شار دا زۆربەی پیاوی چەکدارەکانی کورد کە لە شەڕی نیوەشەوێ‌دا کوژرابوون، کە لاکیان دەدیترا. بەشوێنی ئەوە دا تەواوی خەلک لەنێوە ڕاستی شاری دیاربەکر کۆ کرابوونەوە، وەهەروەهالە مالان دا لە کوردەکان دەگەڕان. چەن سەد کە سیک لەکوردی (زازا) تاوان بارکرابوون کە لەگەل شورشگیرەکان هاوکاریان کردوە! بەلام بەپیچەوانەی ئەو مەبەستە لەشاری ئانکارا وەقوس تەن تەنیە وا بلاو بۆوە کە ئیتر ئەوانە هیچ یارمەتیێکیان بە شورش گیرەکان نەکردوە، بەلام تورکەکان هەر لە پەلپ‌و بیانوو دەگەران تاکوردەکانی نیو شار لە پەشێوی‌و شپرزەئی دابنێن.

لەئاکام‌دا لە شەوی داهاتوو دا لە شاری دیاربەکر، هەردەنگی تفەنگ دەهات‌و، بە کوردەکانیانەوە دە نا تا لە شاری هەلێن‌و، بچتە دەرێ.

## ١٠ ــ گەورە بوونی شۆڕش‌و، سەربزێوی

لەروژی ١٠ی مارس شێخ سەعید کە لەنزیک‌دیاربە کرهیزی خوی ڕاگرت بوو، لەنەکاو گەڕاوە بۆشمال‌و، ڕۆژئاوا، زۆر بەباشی و ئازائێ وە شارەکانی سولیوان، هازرو، ئارگاوە چیرمیکی گرت، وە بولای سیویریک‌ی چوو. لەنێوە ڕاستی‌مانگی مارس‌دا کوردەکان تەواوی ناوچەی‌کوردستانیان‌داگیرکرد، وە بۆلای

روژئاوای بەحریوان هاتنە خوواری،وە سەرئەنجام تەواوی ناوچەکە لەبەردەستی لایەن گرەکان و هیزەکانیشیخ سەعید دابوو. دووای پاشەکشەپێکردنی قشونی تورکەکان کە "دژی هێرشیان" دەست پێکردبوو، تورکەکان ئەوجارشـــاری بێنگول، کیژیانگرت، وەبۆلای شەرقهاتن، وەتابولانێک، مالازژیرت چوونە پێشێ، سیڕیست وەسیلوانیانگرتوە هیرشیان بو مارون برد! لەلای روژئاواوە پیش مەرگەکانی شیخ سەعید تامالاتیا هاتن؛[10] لەبەرامبەر تورکەکان دا دژی هێرشیان دەست پێکرد. تورکەکان لەو کاتەدا سەریان لی سووڕمابوو، لەئاکامدا حکومەتی تورکیە بوچارە سەرکردنی مەسەلەیکورد لەگەل دەولەتە ئورووپایەکان بەتایبەت لەگەل دەولەتی فەرانسە خەریکی گفت وگۆی بوو.

## ١١ ـ سازمانی نیزامی بەرگریو، پیێشگیری

بەلام پاش چەندیک، مەترسیو، وەحشەت حکومەتی تورکیەی داگرت،وە خوفی ڕی نشت. بوچارە سەرکردنی ئەوشوڕشە، زور بەبێ ڕوحمی بزووتەوە، خەلکی دەکوشت و ئینجا کەمالئەددینپاشای کەیەکیک لەدووساحیبمەنسەبەکانی بەرزی تورکیە،[12] کە لەشاری بیرلەن بالویز بوو، بە دەستووری ئیدارەی دەرەوەی لەندەنی ئینگلیس، دژی راپەرینی کوردەکان بانگیان کردەوە تا ئامادەی کاربێت. لەهەوەلێمانگی مارس حکومەتی تورکیە بە شوێنی ئەوەی کەلەسەر ڕا سازماندرا، لەحکومەتی فەرانسەی داوا کرد کە: ڕێبدا کە روژێ چووار قەتاری شەمەننەفەر لەرێ بە غدایەوە بو ناردنی ٢٠٠٠٠ (تا) ٢٥٠٠٠ سەربازیتورک بە سازوبەرگەوە بو سەرکوت کردنی کوردەکان بنێردرێ.

هاوکات لەگەل ئەوە، حکومەتی تورکیا "مەحکەمەی قەزائی سەربەخوی"ی لە ٥مارسدا پێک هینا، وەبە تاوان بارکردنی خەلک خەریک بوو، هەرچەند ئەوکـوڕە،قەزائیە پیویست بوو لەگەل مەحکەمەی قەزائی ئانکارا ڕاوتە دبیربکات، بەلام سەربەخۆخەلکی لەداردەداوخیرادەیکوشت .بەشوینیئەوڕا کە عسمەت پاشالە ٩یمانگی مارسەوە، مستەفا کەمالی بە سەرۆک وەزیردانا، بەتەواوی هیزو، قەوەتی خۆیەوە دژی شورش دەست بەکاربوو![13] ئەوکارە ساتە بەدەستی کە سانێک ئەسپاردرا، وە دژی خەلکی کورد بەڕێوە دەبردرا کە زور

زالمو ، خوین خورو ، خوێن ڕژ بوون . لەدییەکاندا خەلکیان قەتلو ،عام دەکرد ، بەژنو ، مندالیان روحم نەدەکرد.[١٤] ئینجا وردە ـ وردە هیزەکانی شاری ماردن-نیان کو کردەوە ، وە دەیانەویست بەریگای سووریەدا بەڕێی ئاسندا بیانبەنە بەغدایە حکومەتی تورکیا لەولایە شەوە لەگەل کەمبوونی پوولوپارە ڕوو بە ڕوو ببوو ، کەئەومەسەلەیەش کە مترلەمەسەلەی شورشی کوردەکاننەبوو.[١٥] لە ١٠ی مانگی مارسدا حکومەت داوای ١٠میلیون لیرەی باوەڕپیکردن (اعتبار) لەمەجلس کرد کە دژیشۆڕش خەرجیکات

## ١٢ ـ ئاکارو کردەوەی نیزامیدژی کوردەکان

لەئاخری مانگی مارس ١٩٢٥ دەولەتی تورکیا دژی جووڵانەوەکە دەستی پێکرد . لەهەوەلدا پێشی کوردەکانیانگرت کە بو لای روژئاوای بەحری وان ڕایاندەن ، مەبەستیان ئەوەبوو کە ڕێگایهاتو ، چوّییپەینی ئیرانو ، عەراقیان لێببەستن ، کوردەکانیان لەشارەکان وەدەرنان ، هیزی کوردەکان پەنایان بۆ کیوە کانی گەنجی برد ، بەلام لەولایە شەوە ، ١٥ ڕوژ لەپێشدا هیزی تورکیا لە دیار بەکر کۆ ببۆوە ، تالە ٨ی ئاوریلدا بە هەرچونیک بێت کاری کوردەکان لایەکی وەلایەکی بکەوێ . شیخ سەعید لە جەبەکتور دا ، لەنزیک گەنجیوە ، لەگەل سیئاغایمرۆڤبوو.[١٦] وەپێیان وابوو کە شیخ سەعیدلەگەل هاوڕێیەکانی نیـوان ناخۆشیانلێ پەیدا بووە ، ئینجا توانیان لەگیریبخەن.[١٧] ئینجا هەواڵ دەرەکانڕایان گەیاند کەتەواوی گرتو کانیکی کە شیخ سەعید لە٥فوجی تورکیای گرتووە ، هەمووحالیان باشە . ( ١٥ئاوریل ١٩٢٥)

ئەوەی کە شایانی باس بوو ، شیخ سەعید شەڕیکی عاقلانەی دەکرد ، مەبەستی ئەوەبوو کە خەلک لەوشەڕەدا کەمتربکوژری وە دەیەویست کە بـــە ئورووپایەکان بسەلمینی کە ئێمە گەلێکی خوێن مژوخوینخۆرنینو ، بەلکـــو دەمانەویلەهیمنی دابژین.[١٨] بەلام تورکەکان زۆر بەبێ روحمی هەلمەتیان بو سەر کوردەکانبردبوو ، وەدەیانەویست بەهەرچونێکبێتکارەکەیڕاپەڕێننو ، تەواویبکەن .

## ١٣ ــ سەرکوت کردنی شۆڕش

بۆ تێک شکاندنی ڕاپەڕینی شیخ‌سەعید ٣٠٠٠٠ سەربازی تورکی قین ئەستوری بێڕوحمیان نارده ناوچەی کوردستان. لەشاری دیاریەکر لە کوردە "زازا" کان کە یارمەتی شیخ‌سەعیدیان دابوو بەبێ ئەوەی کە بزانن گوناح و تاوانیان چیە لەمەیدانی شاری‌دا پاش نیوسەعات محاکەمە لەپەنای دیواران تیرەباران کران یان لەدار دران خەلکی دانشتوی شاری دیاریەکر مردنیان لەبەرچاوبوو بەوجورە کوشتارێکی زۆریان لە کوردان‌کرد. ١٩

لە ١٥ی ئاوریل‌دا چووار مرۆڤی بەناوبانگی کوردی شاری‌بتلیس کە لەنێو ئەوان‌دا دووکەس بەنێوی یوسف‌زیا نوێنەری پێشوی مەجلــــس وە سەرهەنگ پیلید دەدیتران کە بەقەنارەوە بوون لە ١٨ئاوریل دا شیخ‌عەبدل‌قادر لەگەل شەش‌پیاوی گەورەی کورد کە هاتبۆە شاری قوس تەن‌تەنیە گیران تەواوبوونی کاری شیخ عەبدول‌قادری کوڕی شیخ‌عوبەی‌دیل‌لا زور خەم‌بارو بەتەم بوو: پاش‌ئەوەی کە لەسالی١٩١٩دا ماژۆر نۆئێل تەکلیفی لێ کرد کەبگەڕێتەوە، ئەویش نەی‌سەلماند بەنەمانی تەواو بوو تورکەکان ئەویان بەخەباتگەرێکی گەورە تاوان‌بار کردبوو ٦ سال پاشواتە لەئاخری١٩٢٤زاینی‌دا یەکی لەهاوڕێیەکانــــی شیخ‌عەبدول‌قادر لە بەرەنگاریک‌دا لەگەل تاقمیکی "مەزهەبی" کە خەریکی ووت‌و، ویژ لەگەل "مودیری کاروباری ڕۆژهەلاتی ئیدارەی دەرەوە بوو لە لایەن پاسەوانیکی تورکەوە گیرا! شیخ‌عەبدول‌قادر بەوە تاوان‌بار کرا بوو کە لەگەل "شەریف حوسەینی مەکەی" بوپیک‌هاتن بەیارمەتی ئینگلیسیکان خەریکی ووت‌و، ویژبووە بەراستی لەوبارەیەدا کە بە چاوقوچاندن‌و لاپلەسەنی وەدووی ئیگلیسان کەوت‌بوو بو بە قوربانی ئەوکارە وبەمەرگ مەحکوم کراو لەداردرا

## ١٤ ــ محاکەمەی شێخ‌سەعید وەئاکاری‌دووژمنایەتی

لەشاری ئانکاراو، دیاربەکر، کۆڕی دادگای نیزامی‌تورک کە سەربەخۆ بوو کاروباری‌خوی‌درێژەپیدا لەدادگای دیاربەکر پاش‌نەختێک دەنگو، چەلەمەو

ئیددعا ،وە گێچەل پێ‌کردن وەقسەی‌هیچ‌وپوچ ، دوکتور فوواد بەمەرگ تاوان‌بارکرا بەدووای‌وی‌دا محاکەمەی ئەکرەم جەمیل پاشازادە دەستی پێکرا ![٢٠] بەشوێنی ئەودا نوبەی‌شیخ‌سەعیدهات چەن‌دێڕێکی نووسراوەکەدادستان‌نووسی بووی لەئیددعانامەکەی‌دا خوێندیوە وەبریتی‌بوو لەوڕستانە : شیخ‌سەعید هیچ‌کاتیک‌تەنیا بەبیانووی ئەوەی‌کەمەبەستی‌خەباتی

مەزەبی‌بێ ، هەل‌نەستاوە ، بەلکوشۆڕشی ئەوپیاوە بەچەشنی شۆڕشەکانی بوسنی‌و[١] هێرزگوین‌بووە. وەهەروەها هەلستانەکەی وەک‌هەلستانی سووریەو ، فەلستین دەبێ نێوببردرێ ، وەتەنانەت تائەوڕادەیەی دەگوترێ کەئەوشورشانەش لەشیخ سەعید "سەرچاوە دەگرێ"

جگەلەوقسانەی کەپییانەوە نووساندبوو ، بەوەشیان تاوان‌بارکرد کە یارمەتی ڕامیاری‌و فکری‌شی لە بێگانەگان وەرگرتووە ! وە دادگاە پێی‌گوت کە تۆدەتەویست وەلاتێکی سەر بەخوی‌پێکەوەبینی ، وەکوردستانیکی سەربەست‌و ،ئازادبەهەست‌بێنی بەلێ تۆ دەبێ تەواوی ئەوکارانە بەئەستۆی‌خوت‌بگری‌و تاوانی‌بدەیەوە ! [٢١]

محاکەمەی‌شیخ‌سەعید لە٢٨ژوئن‌ی١٩٢٥دا دووائی‌هات ، وەلەگەل ٤٠ مرۆڤ لەپیاوە بەرزەکانی کورد ، بەلەقەنارەدان مەحکوم‌کران ، وەتاریک‌و ، ڕوونی‌بەیانی لەداردران بەکوشتنی شیخ‌سەعیدو یارانی‌ئەو ، دەولەتی تازەی تورکیە ،[٢٢] ئینجا دژی لایەن‌گرەکانی خەلیفەی‌عوسمانی ، وە دژی‌ڕووناک‌بیرەکان‌و ، کۆمۆنیستەکان ، دەس‌بەکاربوو ، بەتایبەتی کوردەکانی دانشتووی شارەکانی قوس‌تەن‌تەنیەو ، دیاربەکر ، تاقم‌تاقم دەگیران وە تاوان‌باردەکران هەروەها ئەوکەسانەی کەلەوشارانەدا دەیانەویست تەنیامافی سەربەخویی‌واتە (سازمانی ئیداری‌و ، لامەرکەزی ، بەکوردان بدرێت ، ئەوانیش گوناح‌باردەکران بەووتەی کاربەدەستێکی ئینگلیس کە گوتویەتی : مستەفاکەمال‌ش ئاکاروکرداری‌دیکتاتوری ئیتالیا واتە موسولینی ڕەچاوکرد ، وەتەواوی ئازادی خووازان‌و ، مافەداواکەرەکانی سەرکوت‌کرد وەتەنانەت تائەو ڕادەش کەدەنگی‌ڕخنە گەرەکان‌شی‌خەفەکردو ، لەناویی‌بردن [٢٣]

---

(١) دوولاتی‌بالکانی‌قەدیم بوون ، کە لەژێر فەرمانی تورکی‌عوسمانی دابوون ، پاشی ڕووخان‌و ، لەت‌وکوت بوونی خاکی عوسمانی ئەو دوو وەلاتە دژی دەولەتی تورک شورشیان‌کرد وەرگیر.

## ١٥ ـ پاشکۆیی ڕاپەرینی شیخسەعید :

لەبەیانیەیەکو، بڕیارنامەیەکی ڕەسمی دەولەتیدا کەبلاوکراوە،نووسرا بوو کە شۆڕش لەئاوریلی ١٩٢٥ بەتەواوی دووائی هاتووە، بەلاملەنهینیدا ئەوراپەڕینە درێژەی هەرهەبوو، وەشەڕی پارتیزانیدژی دەولەتی تورکیەماوەی مابوو لەئاخری مانگی مەی ١٩٢٥ یەکێک لەپیاوە ڕامیارەکانی فەرانسە ئاگاداریدا کە هەلو،مەرج لەکوردستاندا نەگۆڕدراوە!کوردەکان بۆ کێوەکان چـــوون تادەس بەشەڕی گریللائیبکەن! ئینجاحکومەتی تورکیە پێویستێتی کەلەسەرڕا داخووازی خۆیلە دەولەتیفەرانسەبکا کەلەبەینیوەلاتی سووریەو، بەغدادا، کەشەمەننەفەر سەربازو، شتمەک ڕادەگوێزێ، چاوەدیریو، پارێزگاریلێبکرێ. لەئاکاما لایەنگرەکانی وەفادار بەشیخسەعید وەک دەروێشەکان کەمو، زۆر لەناوچەکەدا، بزوتنەوەکەیان هەرهەبوو، بەتایبەتلەناوچەی هاجۆ لەمارسی ١٩٢٦دا کەنزیکەی (نەسیبەین بوو ئەوسەربزێوێ دەدیترا.

## ١٦ ـ گەیشتنی پەنابەرەکان بووەلاتی عەراق

کوردەکانی دانشتووی عەراق هێستا بەباشی لە ڕاپەڕینەکەی شیخ سەعید ئاگا داریاننەبوو کە، کوردە شۆڕشگێڕەکانی تورکیەگەیشتنە وەلاتیعەراق.

لەمانگیسیپتامبری١٩٢٥تاقمیکلەپەنابەرەکانی مەسیحی وکورد گەیشتنە شاریزاخۆ و دەهۆک،ئینگلیسیکان ١٠٠٠٠ کەسیان لەمەسحیێکان کەلەدییەکانی گویانیێو،[٢٤] چێرناک هەلاتبوون نشتەجێکرد : بەلام کوردەکان لەهەوادا مابوونەوە تاکوکرانە سێبەش، وەلە زاخو، دەهوکوە بەرسەیێولەنزیک سنووردا جێگایاندانی

لەنیوان کوردەکاندا هیندی ئاغاو، بەگ لەگەلیان بوون کە ئەوانە بەقسەی تورکەکانیان نەکردبوون کە هەرمەنیێکان بکوژن، هێندێ لەسەربازەکانی هەنگی ٦٢یتورک وبەهێندێ لەجویتارو، فەلەکانو، عەشیرەتەکان کەهەلاتبوون وەلەنیوکوردەکان دابوون، جیگادران.[٢٥]

## ١٧ ـ لەسەرکوتانڕا ، تامەسەلەی اِتْنۆسید (لەناوبردنوپاککردنەوە)

هاتنی خەڵکێکی زۆری پەنابەری کوردو، هەرمەنی بۆ و ڵاتی عەراق مەسەلەیەکی گرینگی بۆ دەولەتی عەراقو، ئیدارەکانی ناوچەکە، هێنابو پێشێ لەسەرمیزی شامێکی رەسمی لەشاری ئانکارا لەئاخری مانگی نووامبری ١٩٢٦دا کمیسەری عالی ئینگلیس لەعەراقدا سێرهانرێ دابس، ئەو پرسیارەی لەوەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیە تەوفیقرەشیدبەگ کردو، پێیگوت: جگەلەوەی کە تورکەکان نایانەوێ کە پەنابەرەکان دووبارە ڕێداتەوە، ئایا دەشیوێ کە کوردەکانی ناوچەی ئاناتولیش لەوڵات دوورخاتەوە، واتە دەیەوێکە ئەوکارەساتەی کە بە سەر یۆنانیێکانوە هەرمەنیێکانی هێنا، بەسەر کوردەکانیش بینێ![26] وەزیری دەرەوەی تورکیەپاشچەند حەوتوێک کەدووبارە ووتو، وێژی لەگەل باڵوێزی ئینگلیس کرد وەلامی داوە کە تئۆریفلسفی ـ میژووئی، وە هەروەها کاتی ڕامیاری حکومەتی تورکیە زۆربەباشی ئاشکرایە، نازانم سیاسەت مەدارانی ئینگلیس خراپحاڵیبوون وەیاگوێبیسنین!سەربەخوئیگشتی بو خەلکیک کە میلیونێک پیترنین، وەیان، پیک ناینەوێ( کاتی ئالبانی ) سەر ناگرێ کوردەکان هەردەبێبەوچەشنە مەحکومو، چەوساوەبمێننەوە.

لەکاتی ئێستادا کوردەکان لەچاو تورکەکان فەرهەنگو، ئابوریو، ڕامیاریان زۆر لەپاشە، وەئەندامی ڕامیاریاننیە ئینجا "وەک هندوکانیئامریکا، وەیان پێستسوورەکان کەلەگەلئەوانی دیکە بەرابنەرنین.دەگونجێ بڵێن کەتورکەکانی دانشتووی ناوچەی کوردستان زۆر زاناترو بەفەرهەنگترن. سەرەڕای ئەوە تەواوی دانشتووانی کوردیتورکیە لە ٥٠٠٠٠٠ کەس زیاترنین کە گەلێلە کوردەکانی ئیرانو عەراقیش کەهاتوونە نێویان تیکەڵ بوون، وەبەکورتی دەگوترێ کەئەو کوردانە لە ئادابو، روسمو، تەممەدن دوورن. ٢٧

سەرئەنجام پاشچەنمانگێک کە ڕابووارد حکومەتی تورکیە یاسایەکی وەدەرخست (یاسای ژمارە ١٠٩٧ لە ١٩ی ژوئنی ١٩٢٧) کە بەدەولەت ڕێگاو، ڕێدەست دەدا، سەبارەت بە مەبەستی نیزامیو، کۆمەڵایەتی، لەناوچەکانی

باشورێوە نیزیک بە ١٤٠٠ کەس کورد لەگەل کەسو کاریان بۆ ناوچەی باکوری، دوورخرێنەوە، وە هەروەها بەوە مەحکوم دەکرێن کە کاریقورسو، پڕ زەحمەت" بکەن دووسال پاش شورشی شیخ سەعید دەولەتی تورکیە لەناوچەی کوردستاندا هێستا کویرەوەریو، دەردیسەری زۆرمابوو، لەناوچەیباشوری بۆباکوریڕا تابەحری وان، ٣٠٠٠٠ پولیسو، نیزامی تورکیە نەی تووانی و لاتی کوردستان بەچاکیهێمنو، ئەهوەن کاتەوە،[28] جالەوەی دەگەڕا کە بەیارمەتی ئیران کارو بزوتنەوەی کوردەکان لەسنوورەکاندا تەواو بکات وە کوتائی پێبێنێ، چونکە بەراستی بەتەنێ بوخوێی نەیدەتووانی کاریکوردەکان تەواوبکات. [29]

## فه سلی ٥

### کۆماری کوردی ئاراڕات (١٩٢٧ – ١٩٣١)

#### ١ – پێک هاتنی "خۆیی بوون" مەسەلەی مافی نەتەوایەتی گشتی

بەهەست هاتنی کمیتەی کورد بەنیوی (خویی‌بوون)[1] زور بەچاکی ئاشکراو ڕوون‌نیە یەکێک لەدامەزرێنەری ئەوسازمانە دەڵێ کەلەبەهاری ١٩٢٧ دالە داوێنی کێوی ئارارات چووار ئەندامی بنەڕەتی نەتەوایەتی کورد کە بریتی لەچووار تاقمی "کوردستان تەعالی"، کوردستان تەشیکیلات"، "کوردمیللی‌یەت"، وەکمیتەی ئیستقلال بوون ڕاوتەدبیریان هێنا سەرئەوەی کەهەرچوواریان ببنەیەک وەبنکەیەکی ناوەندی بەنێوی "خۆیی‌بوون"[2] "پێک بێنن. خویی‌بوون بەنیوی "کمیتەی بەڕێوەبەری ئەجرائی" هەتا هاوینی ١٩٢٨ کانگای ائالێپ بوو بەلام دەولەتی فەرانسە لەویی ڕادان. پیاوە بەنرخەکانی کوردی قوس‌تەن‌تەنیەش لەکۆ بوونەوەکان‌دا بەشداریان دەکرد وە بەتایبەتی (نەوەی) بەدرخـــان: چەلالەت بەدرخان، کەیەکێک لەکوڕەکانی عەلی‌بەدرخان بوو، وە ئەندامانی وەک براکانی کامران‌و، سوڕەیا بەدرخان، وەمەمدوح‌سالم بەگ، وەشاهین‌بـــەک لەکۆنگرەداهاوبەشیان‌دەکرد. ئینجا خویی‌بوون لەوئە ندامانەی‌کە لەسەرەوە نێوبران پێک هاتبوو، لەئاکام‌دا وا وەدەردەکەوێ کەئەو کۆبوونەوەیە لە بێ‌حەمڕۆن لەلیبی بەڕێوە چووە، بەلام بەشوێنی ئەوە داچوون ئاکاروکردەوەی نیزامی لەکاتی کۆبونەوەکەدا لەکوردستانی‌تورکیە دەهات دەستی پێ‌بکرێ، کۆنگرە کە ڕاوتەدبیری هێنا سەر ئەوەی کەلەئارارات پێک‌بێت لەڕاستەقینەدا

ئاکارو، ڕەوشتی ئەوکمیتەیە بریتی‌بوو کە: شکان ،وکارە نادروستەکانی ڕابردو، وەبیربێ‌نێیتەوە، وە ڕخنەی لێ‌بگرێ تابەلکو لەخەباتی داهاتوودا کارە نارەواکان لەکوردستان‌دا دووپاتە نەبێتەوە، کارو کردەوەی دروست لەسەرڕێو شوێنێکی تایبەتی دەست پێ‌بکرێ ڕاوتەدبیر ئەوەیە کە ڕووناک بیرەکان، جوتیارەکان‌و، هۆزەکان پێکەوەڕێک‌وپێک‌بخات، وەبزوتنەوەی دا هاتوو لەسەرنیزامێکی باشو تازە بەڕێوە بەرێ، وەبە شێوەی شەڕی تازە ئاشنایان‌کات.

خویی‌بوون بەرنامەی ئەوەبوو کە تاکتیکی شەڕی پارتیزانی، بەچەشنی ئەمریکای لاتین، لەکێوەکانی داگیرکراوی وەلاتی تورکیەکە نێوەرووکەی ناوەندی ڕاپەرینەکەبێت، بەهەست بێ‌نێت، وەلەژێرفەرمانی سەرۆک‌و، ڕابەرێک‌دا، هیزیکی بەقودرەت وتووانا بەهەست بێ‌نێت، وەلەئاکام‌دا خەباتێکی‌باش بەڕێوەبەرێ.

سەرئەنجام‌خوی‌بوون دەیەویست، کە"سەربازە تورکەکان تاسنوور پاشەکشە پێ‌بدات" وەئاکارو کردارێک لەبەرچاوبگرێ کە دووژمن بۆخویی نەتاشی،بەتایبەتی دەی‌گوت کە کوردی‌تورکیە لەگەل کوردەکانی ئێران وەک خوشک،وبران، وەئیمەکە خەبات دەکەین هیچ‌کاتێک نامانەوێ لەسنووری‌ئیران ئاژاوە سازکەین، تەنانەت پێویسمانە کەلەلایەن ئێرانەوە یارمەتیمان بدرێتێ، وەدژی‌مە نەبزونەوە هەروەها خویی‌بوون‌لە دەولە تانی‌عەراق‌و، سوریە داخووازی دەکات کەمافی کوردەکانی ناوخویی لەچووارچێوەی وەلاتانی خۆیان‌دا لەسەر شوێن‌و، یاسای‌خۆیان بدرێ، وە بەچەشنێک‌بێ کە دەولەتانی ئینگلیس‌وفەرانسەش بەوە ڕازی‌بن، وەدووژمنایەتی دەرنەبڕن. وەسەرئەنجام سازمانی تازەپیک‌هاتووی کورد دەی‌گوت کەئەگەر لە ڕابردوو دا لەبەینی کوردەکان‌و، هەرمەنێکان نێوان ناخۆشێک هاتۆتە پێشێ، هەردوک لا تاوان‌بارن،[٣] وەدەبێ‌بەوکارە کۆتایی پێ‌بدەن.ئەوەی کەشای‌و، باسە لەبەینی سازمانی خۆیی‌بوون وەپارتی نەتەوەی هەرمەنی بەنیوی "داشناک"

هات‌و چۆی زۆر گەرم‌وگوڕ نەبووە. هاواڵیکی بریتانیا گوت‌بووی کە خویی‌بوون‌بە پاپازیان ئەندامی کوری ناوەندی داشناک ڕێی نەداوە کە لەکۆ بوونە وەیەک[٤] دا،هاوبەشی بکات، دەنا هەرمەنێکان خاترجەم دەبوون کەلەڕێگای تەورێزەوە سازوبەرگی شەڕێ بۆ شورش گێڕەکانــی ئارارات بنێیردرێ ڕاپورتی کمیتەی[٥] خویی‌بوون‌ی ئالێپ لەگەل ئەو تاقمەکوردانە کە لەکاتی خەبات دابوون بەچاکی

بەڕێوە نەچووبوو، لەبەرئەوەی کەکمیتە لەوەلاتی ئوڕووپا دا دەستی بە پەڕو پاگان کردبوو، وەپێیوا، بوو کە ئەومەبەستە دەبێتە هۆی ئەوە کە لەڕووحوگیانی شەڕکەرەکاندا قودڕەتێکی جووانپێک بێنێ وەئەوە تەنیا پەیوەندێکە لەگەل دونیای دەرەوە.

ئینجا لەسالی١٩٢٥وە، شۆڕش لەکردەوە دا لەکوردستان هەرمابوو، وەبەتایبەت لەناوچەی بایەزیدو، ئاراراتبەلام دامەزرێنەرەکانی کمیتـــە ئەوەیاندان پێدادینا کەئەو بزوتنەوەیە لەپێش دروستکردنی کمیتە کەدا هەرهەستی هەبوو، وەهاتنی ئیحسان نووری لەوکاتە دا وادیار بوو کە لە نێو ئەواندا بەنێوی سەرۆک زۆر لەبەرچاونەبوو بەلام لەدەرەوە کمیتەی خویبوون نەخشی یەکگرتنی کوردەکانی بەباشی بەڕێوە دەبرد، وەتەنانەت لەگەل ئەمریکا دەستی دوستایەتی دابوو، وەبەتایبەت لەدیترووادا ئەومەتلەبە بەیانکراوە[٦]"

## ٢ ــ هێرشی گەورە (١٩٢٧)

دەست تێکەل کردنو، تالووکەو، هەلەباشی پیاوە ڕامیارەکانی ئیران یان تورکیە وەهاتو، چۆیوان، بەوجورەی دەنوواند کە لە سالی ١٩٢٧ زایینیدا تەواوی ناوچەی کوردستانی تورکیە لە ڕاپەڕینێکی بەتین دایە. لەدەورووبەری دیاربەکرو، مدوش، خونین، بولانیکدا، پیشمەرگەکانی شیخسەعید ناوچەکەیان لەمەترسیدا دانابوو. هەروەها ناوچەکانی بتلیسو، کێوەکانی ئارارات لەو ڕاپەڕینەدا بەشداربوون هەوەلین هێرشی هێزی تورکەکان لەمانگی سپتامبری ١٩٢٧ دا کە بو لای دۆلی زیلان دە چوون، شکانێکی گەورەیان خووارد. بەیارمەتی عەشیرەتێکی کە لەئیران ڕاهات بوون کوردەکان، هیزیتورکەکانیان، کە ٨٠٠٠ سەرباز بوون لەسەنگەردا خۆیان ئارایش نیزامی دابوون دەرێنان، وە ٤ توپ، ٣٥ ڕەشاشیان لێگرتن، وە ١٤ ساحێب مەنسەبو، چەند سەد سەربازیان لێکوشتن، یان بەیەخسیریان گرتـــن. بەوشکانە خوێناویە تورکەکان گەڕانەوە بو دیادین بەشوێنی ئەوشکانە و کشانەوەیە، وەسەرکەوتنو، پیروزی

٦) دیتروا ! لە جیژنیکدا کە لەدیتروا گیرا بوو دوکتور شیرکو بە شداری هەبووە و قسەی کردوە

کوردان ، دەولەتی تورکیە ئاگادار بووکە عەشیرەتی ماکو یارمەتیـــان داون سەرئەنجام حکومەتی تورکیە ئۆلتیماتۆم ی بەدەولەتی ئیران‌دا کە سنووری خوی ببەستێ . وە هەروەها کوردەکان کەلەشەڕدا دەکشێنەوە وەپەنا بوئیران دینن ، بێ‌چەکیان بکات . ٨

## ٣ ـ ڕەوشتو ئاکاری سوویەت

ئاکارو کردەوەی دەولەتی شورەوی لەکاتی شەڕی کوردەکان لەگەل دەولەتی تورکیە لەنهێنی دا بوو ، شەڕنزیک بەسنووری ئەوان‌بوو ، ئینجا لەوبارەیەدا وازی ستراتژێکی خۆیان زۆر ڕوون نەدەکردەوە .
دووپەیمانی کەلە سالی ١٩٢١ دا یەکیان لەگەل دەولەتی تازەی ئیران ، وە ئەوی‌دیکە کە لەگەل دەولەتی تورکیە بە سترابوو ، بەشۆڕەوی بەهیچ‌چەشنێک ڕێگاو ، ڕێ‌دەست نەدەدا ، کەخوییلە راپەرینی کوردەکان تێوەردا .
دەولەتی فەرانسەش بەزور مەبەستانەوە دەی‌دیت‌کەدانی زاتی سەربەخوئی کوردستان‌لە ڕووانگەو چاوەدێری ئینگلیسیانە وە زۆر تاریکو ، نامەعلومە ، جالەکارەکەداشل بۆوە .
وەسەرئەنجام دەولەتی سۆویەت لەمانگی ژوئیەی ١٩٢٧دا ، لەمۆسکۆ بەکاراخان‌کمیسەری کاروباری دەرەوەی سۆویەت‌ی دەستووری‌دا کەلەگەل ئارالوف[٩] بالۆیزی پێشووی شۆڕەوی لەتورکیە ، ئامادەبن‌کە لەگەل زەکی بەگی تورک‌کە پەیمان نامەیەک کەدژی بزوتنەوەی کوردەکان لەمۆسکۆ ئیمزا کـــراوە ، بە ئیمزای‌بگەیێ‌نن . ئینجا قەراردادو ، پەیمانێکی کەکمیتەی خوییبوون لەگەل پارتی نەتەوایەتی داشناک بەست‌بووی ، تەنیا بەو جێگایە گەشت کە شورەوی دژی کورد دووژمنایەتی خو ی پیتردەربڕێ .
لەسالی ١٩٣٠ لەکاتێک‌دا لەوجێگایەی کە شەڕ لە دەوروبەری کێـــوی ئارارات بەگرنگی دەستی پێکرابوو ، لەنێو ئەرمەنستانی شۆڕەوی‌دا نەتـــەوە پەرستەکان هەلستابوون ، وەکوردو ، هەرمەنێکانی شۆرەوی بەشۆڕشگێڕەکانـــی ئارارات یارمەتیان دەکرد ، دەولەتی شورەوی‌لەوکاتە عاستەمەدا چارەی نەما وە بەتەواوی پالی‌وەتورکەکان دا وەپتری‌لێ‌نزیک‌بۆوە ! لە ئارا سێ‌ڕا کە سنووری

تەبیعی شورەوی بوو، هێزەکانی بەگرنگی پارێزگاریان دەکرد، سنوور بەسیمی خاردار دەورەدرابوو، وەسەگ پاسەوانی لێ‌دەکرد، وەهەروەها یاساوڵە سووارەکان زوو ـ زوو دەهاتن‌و، دەڕۆیشتن‌و، جغزێکی گەورەیان لەقەراغی سنوور دەکێشا، وەماوەیەکش دەمانەوە بەلام لەسەر ئەوەشڕا نەیان دەتووانی بەچاکی لەسنوورەکە پارێزگاری بکەن.[١٠] لەئاخری مانگی ژوییەی ١٩٣٠ دا لەپێش ئەوەی کە هێرش بەرنە سەر ناوچەی ئارارات، تاقمێکی ٥٠٠ سوواری شۆڕەوی گەیشتنە گوندی دەوەلوو، کەنزیک‌بە ئاراکس بوو، وەلەوێ‌دا دووڕۆژ مانەوە، لەپاشان بەشەو لەبەرچاوان وون بوون.

وا لەخەلکی دیێ ئاشکراببوو کە ئەو سووارانە بە شەو بۆ یارمەتی تورکەکان چوون. ئەگەر بەڕاستی سۆویەت لەشەڕی ئارارات دا دژی کوردەکان هیچ کارو کردەوەیەکی بەڕێوە نەبردبێ[١١] ئەما دەولەتی‌شورەوی‌بەباشی‌وازی‌خۆیی بە بەستنی پەیمانەکە ڕوون‌کردبۆوە دەگوترێ کە دەولەتی شورەوی بەشوێنی شەڕی ئارارات دا، وە هێندێ هەڵویستی‌دیکە "پەردەی ئاهەنین،ی لە سنووری خۆی‌ڕا بەهەست‌هێنا بوو، وەبەو جورە کاری خۆیی‌توندو، قائم‌گرت‌بوو![١٢]

هیرشی دووهەمی تورکەکان لەنوامبری١٩٣٠دا دژی کوردەکان لە ئارارات دا بەو مەبەستە بوو کە، نێوانی هێزی کوردەکان لەیەکترهەڵبڕن‌و، بی‌پچڕن، بەلام نەیان‌تووانی، وەئەو هیرشە وەک هێرشی هەوەڵ بەقەڕەت‌نەبوو، لەئاکاما تورکەکان هاتنە بایەزید کەزستانێ لەوێدا بمێننەوە ئینجا بۆ هەوەڵین کەڕەت نێو بانگی ئی‌حسان‌نوری بەنێوی فەرماندە، یان "ڕابەرو تە دبیرکەری نیزامی" کوردان وە دەرکەوت. هەرلەو دەمو، جەمەش‌دا بوو کە کوردەکان‌ی بیتلیس هەڵستان، وە تا دەوروبەی شاری هاتن.[١٣]

### ٤ ـ ئی‌حسان نوری‌و، هەڵستانی ئاڕاڕات

ئی‌حسان‌نوری، بنەچەکەی بی‌تلیس‌یە، ماژۆر واتە ئەفسەری پایە بەرزی تورکیەبوو، گوتراوە کە لەسالی ١٩٢٥ دا لەشۆڕشی کیۆەکانی بۆتان لە بەیت‌ئەشەهاب دا بەشداری‌و هاوکاری هەبووە، وەلەپاشان لەگەل چەن سەد مرۆڤیک بۆ کیۆەکانی ئارارات پەنای هێناوە. لەسالی ١٩٢٧ دا لەکۆنگرەی کوردانی

"خویبی بوون" هاوبەشی بووە، وەلەلایەن "شۆڕشگێڕەکانی ئاگری داغ" وە لەو کونگرەدا بەشداربووە "کانگای بەرهەڵستی" ئارارات لەوکونگرە دا بە هەست هات، وە بڕیارنامەیان دا ک( پیوستە کوردەکان لە کێوەکانی ئارارات دا کۆببنەوە.

ئەونەخشیەیەو، کردەوەیە لە لایەن ئیحسان نوری وەپێشنیارکرا، وەلەسالی ١٩٢٧ وە تێک هەڵچونێک لەگەڵ تورکەکان پێکهات لەسالی ١٩٢٨ وە ئیحسان نوری بەسەروکایەتی گشتی داندرا کە هێزی کوردەکان ڕێکو، پێکات وە لەسەر ڕێووشوێنێکی باش وەڕێی خات.

کاروکردەوەی ناوخوی درایە دەستی ئیبراهیم پاشا هەسکی تێللو، کە بە (هەسکی تیللو، ناودەبردرا و دەناسرا. ئینجا ئاڵای کوردان هەڵکراو، لەرێوە وە بەو جورە، کۆماریکی چکۆڵەی کورد بۆ هەوەڵین جار لەکێوەکانی بەرزی ئارارات بەهەستهات. ١٤

## ٥ ــ ئاڕاڕات:

کیوەکانی ئارارات جێگایەکی زۆرعاستەمن، وەلەجیهان دا دەتووانین بڵێن کە باشترین جێیە بوکانگای شەڕی پارتیزانی، بەتایبەت ئاگری داغ، دووقوولەو، تڕووپکی بڵندو نەوی لەئاراراتی گەورەو، چووک هەیە. جێگایەکی پان وبەرین، بە درێژائی ٩٦٠ کیلومتری چووارگوش وە بە بەرینائی ١٢کیلومتر بە دریژائی و بەرینائی مەوادی هەیە. بڵندایی قوللەی گەورە ٥١٥٧ وە بلندایی قووللەی چکۆڵە ٣٣٩٦ متـر لەکەفی دەریایەوە. وەئەودووکێوەکە: دوواییی دەگاتەوە کلکەی سەرداری بلاغ کە بڵندی ویش ٢٤٤٥ مترە ئەوڕۆ لەحالی حازردا سنووری ئیران و تورکیە لەوکێوانەڕایە. ئاڕاڕاتی چکولە واتە ڕۆژهەڵاتی ئەوکێوە بەشی خاکی ئێرانە ئاراراتی چکولە جیگایەکی ووشکە وەکەلی سەردار °٤٥ درجە بەرەو ،ڕۆژە. بەڵام ئاراراتی گەورە پەناو پەسیوی زۆر نالەباری هەیە کەپڕەلە تەقتەقە بەردی زەلام زەلام، وەڕەگی مەعدەنی زۆرە، خووارەکەو پیچەکەیەکی زۆری هەیەکە دەگاتەوە سنووری سۆویەت، وەنزیک بە ٣٠٠٠ مرۆڤی شۆڕشگێــڕ لەوێدا لەگەل مال و، مندال، وەئاژاڵ و، مەرو مالات جێگیر ببون. ١٥

لەشەڕی جیهانی هەوەڵەوە کوردەکانی جەلالی پەنایان بۆ ئاراراتی

گەورە بردبوو، وەتووانی بوویان لەبەرامبەر هیزی ڕوسو، ئەرمەنیکان ڕاوەستن وەبەرنگاری بکەن، وەماوەی سێمانگان کە ١٥٠ کیلومتر لە پشتی جبهەی بوون مابوونەوە، هەلبەت ئەوکوردانە لەسالی ١٩١٨ دا کە تورکەکان لەشەڕێ داشکان وچەککران، لەویدا جێگیر ببوون. ١٦

## ٦ ــ ووتو، ویژی سالی ١٩٢٨

لەسالی ١٩٢٨دا، تورکەکان لەوەی دەگەڕان، کەهەلو مەرجێک هەڵکەوێ کەبتوانێ لەگەل کوردەکان لەسەرمیزیک بو گفتوگو دانیش: لەپیش دا لەلایەن دەولەتەوە دەیانەویست کەبەچەشنی رەسمی یا سایەکی بسەلمێنن کە "ئیعدام هەڵگیرێ" تەقە ڕاوەستێندرێ وەفەرمانی لێخوشبوون بدرێ وەبڕیاربدەن کەکوردەکان لەماوەی سێمانگان دا بگەڕێنەوە وەلاتی خویانوە هەروەها گرتوکانیش لەبەندیخانە ئازاد بکرێن.

بەلام زمانی کوردی هەرواپێشی لێگیرابوو.

تورکەکان لەهەوەل دا بە سووژە یابەگ حاکمی شاری بایەزیدیان گوت کەلەگەل شورشگیرەکان ووتو، ویژبکات. ئەویش لەنامەیەکی دابو هەسکی تێللو سەروکی شورشگیرەکان ئاوایnووسی:

بەڕاستی سەرئەنجامی شۆڕش لەبەرانبەر دەولەتیتورکیە بەئاکامیک ناگات ئەوئیش و کردەوەیە (کارێکی عاقلانەنیە!) لەنێو ئێوەدا ئەوەی کە خوێندویەتی دەزانێ کە حکومەتی تورکیە، حکومەتێکی ٦٠٠سالەیە، من لەئێوە دەپرسم کە تا کوئێستا کە هەزاران کەس کە دژی حکومەت هەڵستاوەتە سەرپێ ئایا پیرۆز بوون وەکەڵکیان لەبزوتنەوەی خۆیان وەرگرتووە؟ من لەجیاتیئێوە وەلام دەدەمەوە، هەرگز. بەراستی حکومەت بۆدانشتووانی وەلات وەک مامۆستا وایە!" وە لەوکاتەش دا کە دەولەت دەیەوێ فەرمانی لێ خوش بوون بەڕیوە بەرێ، پیویستە تەسمیم بگرن.

حاکمی بایەزید هەروەها نووسی بووی کە من چەن ووتەیەکم بۆ ئیحسان نوری هەیەکە پێیبڵێم: تۆ ئەفسەرێکی لەتەمەنی جووان جەحێڵیدا، وەگلێیکی زۆرم لێتهەیە، بۆچ دەبێوابێ نازانم گوناحی تۆچیە کەدەبێ ساحیب

مەنسەبیکی وەکتو لەنیۆئەوان دابێ .)
ئینجا ئەونامێلکە کە بۆ دابین کردنەوەی ڕاپەرینی ئارارات بوو، هیچ کەڵکی لێوەرنەگیرا، وەلامی هاسکی تێللو بەراستی زۆرپیاوانەو، پشت ئەستوورانەبوو وەبونی خوێنیـــی لێ دەهات وەوەلامی ئاوانووسیبووە: ئەگەر لەڕاستەقینەداحکومەتی تورکیە دەیەوی فەرمانی لێبوردن بدات پیوستە فەرمانی لێ بوردنی گشتی بێلەسەرتاسەری کوردستان، وەهەلوێستی ئەوفەرمانەش لەگەل عورفو، یاسای ئەوڕۆ بەتەواوی‌بگونجێ، وە ئەگەر لە فەرمانی لێخوش بوونی گشتی‌دا، قسە لەخەلکێک بکرێ کەبەوەحشی لەلای ئێوە دەناسرێ، ئترئەوفەرمانە هەرنەدرێ باشترە، وەئێمەش قەت ئەوچەشنە یاسا لێبوردنەمان ناوێ. جا کە وابوو، تەنیا لەوکارە دا مەبەست فریودانەو، هیچی‌دی‌بەلێ کوردەکان بەباشی تەجروبەیان وەدست کەوتووە،وەئێوەش بەچاکی دەناسن، ئیترپیێ‌ناوی دەرسمان دا بدەن ئێوە دەبێ ئەوەی بزانن کە لەو ناوچەیەدا ئیدی "خەلکی وەحشی‌و هیچ نەزان ناژین"' وەتا کە نگێ پایە بەرزەکانی حکومەت پێ لەوەی‌نانێن‌و بڕوا ناکەن". هەرلەو نامێلکەیە دا ئەوانەشی تێدا بوو: ئەگەر بەراستی فەرمانی لێ بوردنی گشتی دەدەن بۆچ دەبێ تاکو ئێستا مال‌ومندالانی ئێمە کە لەوولات دوورخراونەوە، بۆوەلات نەگەڕاندراونەوە.بەراستی تاوان و گوناحی ئەوان کـە دووسالە لەمال‌و، وەلاتی خۆیان پچڕاونەوە، و دوورخراونەوە دەبێ چبێت؟ پیۆستە مەسەلەی گەڕانەوەی ئێمە وەکەسو کارمان بۆوەلات‌یەکێک‌لەهەرەمەسەلە گرینگەکان‌بێ[17]" هاوکات لەگەل ڕاگە یاندنی ئەو هەواڵە یەکێک لەکاربەدەستە کانی گەورەی شاری بایەزیدبە شورشگێڕکی ئارارات کەنێوی نوعمان ئەفەندی بوو، وەیەکیک لەکاربەدەستەکانی بو کە لە دەولەتی پیشووی تورکیەدابوو، ئاوای نووسی: تائێستا کە ۴۷ ڕۆژ لە هەڵاتنی تۆ ڕا دەبرێ وە چوویەنێو شورشگیرەکان، لێت‌دەپرسم کە تۆ چۆنت توانیوە تاکوئێستا لەنێو ئەو وەحشیانـە، دا ڕای بوێری، ئەوە فەرمانی لێ خۆش‌بوونی گشتی دەدرێ، بەپیۆست دەزانم کە زووتر بۆ سەرکاری دەولەتی خۆت بگەڕێیەوە، وەهەرشارێکی کە بۆ خۆت هەڵی دەبژێری سەرپشک‌بە ئینجا وەلامی نووعان ئەفەندی کە زور بە توندی درابۆ وە ئەوەبوو! بەلێ ئەوەی کە دەبووبێ‌بینم، دیتم، ئەوەی کە چێوتی‌و نالەباریە، وەڕێم هاتووە وەزۆڕ چاکیشم لێحالی بووە، دیارە داواکردنی مەبەستی واگـــــــــەورە

نارەحەتیوو، چێوتشی تێدایە، وەهەموشتێکی بەدوودا هەیە،[١٨] تو پێت وایە کە من بەونوشتارە گوێت بۆشلدەکەمو، سەرت بۆ دادەخەمو، قسەکانت دەسەلمێنم وە بەسووکو، هاسانی دەگەڕێمەوە، وەئێوەش لیمخۆشدەبن نەهەرگز وهەرگز ئەوکارەساتە و کردەوەیە بۆمن ناسەلمێندرێ، من وەدووی فکرو، ڕایەکی گەورە کەوتوومو، ئیتر هەر بە دوواشی دام پاش ئەوەی کە پارتی ئیمە لەنێو چوو وەتالانکرا، ئیتر هەلوێست ڕئامانچی ژیان زور مەسەلەیەکی گرینگو، لەبەرچاونیە بەسکەوابوو ئێرەو، ئەوێ بۆمەتەفاوت ناکا. ئینجا بەو هەموو فڕوفێڵەو پڕپاکاندەی کەدەولەت لەوبارەیە دا بەڕێوەی برد، نەتیجەی لێنەگرتو، ناکام ماوە.

لەمانگی سیپتامبری ١٩٢٨دا، دەولەت تاقمێکی پایە بەرزی ناردە شاری بایەزید کە دووکەس لەوانە، نوێنەری ئانکارا، وەحاکمی قەرەکلیسا فەرماندەی هەنگی ٢٩ وەهەروەهاقایممەقامی. ناوچەی دیادین وە بایەزید بوون، کە بۆ گفتوگو لەگەل ئیحسان نوری لەشاری بایەزید حازر بوون.

یەکتردیتنی دووکوڕ لە ٣٠کیلومیتری شاری بایەزید لەجێگا یەک بەنێوی شیخلیکەپروو، کەلەڕۆژهەلاتی ئارارات بوو، لەنێوەڕاستی مانگی سیپتامبری ١٩٢٨دا بەڕیوە چوو. ئیحساننوری لەگەل٦٠سوواری خۆیی هاتبوو. ئینجا فەرمانی لێبوردنیگشتی وەخۆبەدەستەوەدانی خوێیو، هاوڕێیەکانی وەدانانی ئەسلەحە لەلایەن دەولەتەوە درایە دەستی. وەهەروەها بەئیحساننوریان پێشنیار کردبوو کە پۆستی وابەستەی نیزامی لەیەکێک لە شارەکانی ئوڕوپایەدا کە بۆخۆیی هە لیبژێری قەبوولبکات.

بەلام کوردە ناسیونالیستەکان، وە هەروەها ئیحساننوریبەو داوخووزاەو پیشنیاری دەولەتیتورکیە بە لێنیان نەدا، لەئاکاما ووتو، وێژ دووائیپیهێندراو بڕدرا.

### ٧ــ سەرەتای سەر

بەفری زستانی کەتوواوە، لەنیوەراستی مانگیمارسی ١٩٢٩ دا تورکەکان لەنزیک شاری ایگدیر، وەبایەزید دووتاقمی ١٢٠٠٠ تا ١٥٠٠٠ سەربازیان لەگەل ٣٠ فڕۆکە کە لەژێر فەرمانی سالحپاشا بوو کۆکردبۆوە. هاوکات لەگــەل

ئەوکارەساتە، دەولەت لەئەرزەڕۆم دەستی بەگرتنی پیاوە کوردەکانکرد، ٩٠مرۆڤیان لەبەندیخانەکرد کەیەکێک لەوانە کوڕی شیخسەعید کەنێوی سەلاحئەددین بووگیرا. لەوگرتوانە هێندێکیان بەکوشتن وەهێندیکیان بە١٥سال زیندانی کاریگران مەحکومکران، کوڕی شیخسەعید کاتی گیرانەکەی تەمەنی ٢١سالبوو،... (هێندێ دەلین ١٢ساڵونیوی لەتەمەنی ڕابردبوو، هێرشی نیزامی ئەسلی لە ١١ی مانگی ژوئنی ١٩٣٠ وە بە هەڵمەت بردن بۆسەر پۆستی هەوەڵی جەبهەی شەڕ بەکۆماری کوردی ئارارات دەستی پێکرا. وە تا ١٥ی ژوئن شەڕ و هیرش دژی کوردەکان لەکێوەکانی ئارارات دا درێژەی هەبوو.

## ٨ ــ دژی هێرش کوردەکان لە١٥ی ژومیەی ١٩٣٠

بەلام کوردەکان زور زوو دەسیان بە هێرش کرد، دەگوترێ بڵێن کە ئەو هیرشە. هیرشیکی لە خۆڕازیانە و جاەتەلەبانە بوو بەیارمەتی عەشیرەتەکوردەکانی تورکو، ئیران، لە دوو وەلاتەوە بە سەروکایەتی ئیحسان نوری وە ئیبراهیم بەگ کە سەرۆکی عێلی جەلالی بوو وەهەروەها محمودبەگ ئەفسەرێکی کۆنی هێزی تورک هیرشیان بو سەربازە تورکەکان لە پشتەوە ڕابرد وەهەوڵیان دا کە بەینی دەستەکان هاتوچۆ ببرن وە بە یارمەتی دانشتوانی شاریش ئەوکارە بەجێبێت. ئینجا لەدپار بەکرەوە بڕۆن بۆجنوب و شمالی بەحریوان.

وە ئەو شەڕە زور زوو لد. بەرەیەک بە بەرینائی ١٥٠کیلومتر لە ئارارات بو شمال تاخوشاب، وە لەروژ ئاواوە تا بەحریوان دریژەی هەبوو.

لە ٥ تا ٩ی ژوییە هیزی تورکەکان وە کوردەکان لەشەڕێکی ڕێکوپێک دا لە دەشتی زیلان لە شمالی ئیرسی وە دەستی پێکرا.کوردەکان بەرەنگارێکی باشیان دەکرد، بەلام سەرئەنجام لە تورکەکان شکان وە لە دووسێ جیگایان پاشەکشەیان کرد وە زەرە رو زیانێکی زۆریان وێ کەوت![19] دەستەیەک لە هیزی کوردەکان لەشمالی بەحریوان دا، هاتوچۆیان لەگەل، هێزەکانی دیکە بڕا و بەتەنێ مانەوە، تەنانەت هێندێکیان پەنایان بۆ ئیران بردو، هێندیکشیان گەرانەوە کێوی ئارارات کوردەکان ٩٠٠ کەسیان لی کوژرا، ٢٤٠٠ کە سیان بریندار بوون، وە٣٦٠٠ کەسیان لێ وون بوو بەلام کوژراو بریندارو ئیخسیرگرتن

لەتورکەکان لەئی کوردەکان زور زیاتر بوو. بەپێی‌هەوالەکان ٢٨٠٠ پیاو کوژران ٤٠٠٥ سەربازیان بریندار بوو وە ١٧٠٠ کەسیان ئی‌خسیرگیران.[٢٠]

کوردەکان ٢٤توپ، ٦٠ رەششاش، ٦٠٠٠٠ فیشەک وە ١٢تەییارەیان لی خستبوون! رۆژنامەکانی تورکەکان نووسیان کە ئەو ژمارەیە درۆیە وەوانیە بەلام شکانی کوردەکانیش بەو سوک وهاسانە ئەبوو لەوکاتەدا ژنێکی ئینگلیزی بەناوی روزیتافوربس "رێ پوڕتاژێکی" پێک‌هێنا کە لەبارەی راپەرینی کوردەکانی ئارارات دابوو: لەپاش ئەوەی کەباسی ئەرمەنیکانی سوویەتی گێڕاوە لەئاخری‌دا گەیشتە سەر مەسەلەی کوردەکان لەتورکیادا وەگوتی لەماوەی ١١ رۆژ کە لەگەڵ شۆڕش گێڕەکانی کورد بووە، وێنەی یەکیک لەتەیارەکانێکی کە لە کلکەی قامچی‌ئارارات‌دا کوردەکان لێ‌یان دابوو نیشانی دا وەهەروەها لە بارەی یەکێ لەتوپەکانێکی کە لە تورکەکان گیرابوو قسەی کرد! ڕۆزیتا هەروەها گێڕایەوە کە شورش گێڕەکان لەلایەن کوردەکانی ئیرانەوە یارمەتی دەدرێن! وە لەئاکاما ئەوەشی گێڕاوە کە کوردەکان نازانن توپەکان بەکاربێ‌نن و( یارمەتیان لە زەفەرئەددەولە فەرماندەی هیزی ئازربایجان (دووژمنی‌کونی سمایل ئاغاسمکو: ویستبوو کە بو بەکاربردنی ئەو توپانە کارسازیمان لە گەل بکەن بەلام ئەویش لەترسان ئەوکارەی نەکرد بوو، یان نەیەویست ئەوکارە بکەن سەرئەنجام زەفەرئەددەولە ئەرمەنێکانێکی کە لەلایەن تورکەکانەوە کە بەکوشتن مەحکوم کرابوون ناردنێ لای کوردەکان تا ئەگەر کوردەکان وەریان گرتن جمێ‌ننەوە،[٢١] ئەگینەبیان‌نیرنەوە.ڕۆزیتافوڕب گوتی: "کە کوردەکان شەڕەکەی بەگالتە وگەپ رادەبوێرن وەدەستی پێوەدەگرن... وەتەواوی ژنەکانیان لەکاتیک‌دا کە مندالەکانیان بەکوڵەوەیە، تفنەگیشیان بۆ شەڕێ بە دەستەوە گرتووە[٢٢]

## ٩ . دوژمنایەتی لە نێوتورک‌وئیران

تورکەکان‌راوتە دبیریان وا بوو کە کاری کوردەکان وە ڕاپەڕینەکەیان دەتوانن زوو بشکێنن بەلام لەنەکاو تووشی کە ندوکوسپێکی گەورە بوون: سنوری تورک‌و ئیران کە لەسالی ١٩١٤وە لە ئاراراتی چووکەوە دیاری کرابوو، کوردەکان دەیان توانی هەمیشە بۆ سنوری ئیران بێن‌و بچن، وەیا پەنابێ‌نن و یارمەتی

ورگرن وە سەرئەنجام تورکەکان‌ش نەتوانن گەمارۆیان بدەن. رە سەرکەوتنی تورکەکان وەهیرشی‌وان بو سەر کوردە شورش گێرەکان بوو بە هوّی ئەوەکەئەو هیرشە بولای ئیران بچیّوە درێژەی پیّبدریّ. لەسنور ٨٠٠ سەربازی ئیرانی کەهیزیکی زور گەورە نەبوو، پارێزگاریان دەکرد.

لەلایەکی دیکەوە حکومەتی ئیران کە هێمنی لەناوچەی کوردستان دا بەجیّ‌هێنابوو، وەشەڕی سمایل آغای‌سمکو بەقازانجی خوّی تەواو کردبوو، بەهیچ چەشنیّک‌نەی‌دەویست ئاژاوەلەوناوچەیەداسازبیّ‌وەنایەویّ، بارو، دوخی ڕامیاریّکی کە بەدەستی هێنابوو، بەخاتری شورشگیرەکانی ئارارات لەدەستی بدات واتە دژی ئەو شورشگێڕانەی کە کەس‌وکاریشیان لە ئیراندا دەژین کاربکات لەسەر ئەوەش ڕاکە هەرچەند ئیران پیّک هێنانیّکی کە لەگەل تورکەکان بەجیّ هێنابوو بەلام بەدانی مافی گشتی بە کوردەکانی تورکیە دوژمنایەتی نەدەکرد وەهەروەها نێوانی ئەرمەنێکانی تەورێزو ئەرمەنیکانی‌تورکیا کە لەگەل کوردەکانی پارێزگاری تورکیا کە پیکەوە سازبوو، زورگوێی نەدەدایە وە ئەوئەرمەنیانە لە ریگای شاری ماکوّوە[٢٣] هات‌وچوّیان هەبووو وە بە درێژائی شەڕدا حکومەتی ئیرانیّ هات‌وچوّی خوی لەگەل سەروکی شورش گێڕەکانی ئارارات تاسالی ١٩٣٠[٢٤] نەبڕی‌بوو ئینجا لەو بەینەدا حکومەتی ئیران و تورکیا، نوشتاریان بە یەکتردەدا، وە ئـــەو نوشتارانەدا بوّنی گلێی لیّ دەهات، وەلەمانگی ئوتی ١٩٣٠ دا کوبونەوەیەکیان لەشاری تاران پیّک‌هێناوە بە تورکەکانیان گوت کە ئیران نایەویّ بەهیچ‌جوریّک لەوناوچەیە دا بەرەنگاری پیّک‌بیّت تورکەکان لەکاتیک‌دا کە دەیانەویست کارەساتی کوردان تەواوبیّت[٢٥] مانگی ژوییەش بەسەرچوو ئینجا لەوە زوّر نیگەران و دڵ‌ دوّنگ‌بوون کە کوردەکان دەیانەویّ هەرواشەڕەکەی درێژە پیّ‌بدەن.

## ١٠ ــ خوّتیّ وەردانی شیّخ ئەحمەدی بارزان

لە عەراق‌دا شیّخ ئەحمەدی بارزانی، لە ٢١ی ژوییەی ١٩٣٠دا، ١٠٠ یا ٢٠٠ پیاوی شەڕ کەری بە یارمەتی کوردەکان لەناوچەی ئورامار بو تورکیا نارد لە ٢٦ ژوئیەی سالی ١٩٣٠ دا، دولەتی‌تورکیا ڕەسمەن لە بالوێزی بریتانیا، دژی ئەو کارە دەنگی خوّی‌دەربڕی. بەشوێنی ئەوەدا لە٨ی ئوت شیخ

ئەحمەد دەستەیەکی دیکەی شەڕکەر بەیارمەتی کوردەکان ناردە وەلاتی تورکیا، کە ئەو تاقمە، لەگەل تورکەکان بەرەنگاربوون، وەهێزیک لە تورکەکان بۆلای جنوب چوون کە جوولانەوە کەی پێش بگرن‌و، نەیەڵن پەرەبگرێ وە ناوچەکانی کوردی دیکەش بگرێتەوە٠جایارمەتی‌دانی شیخ ئەحمەد بە بزوتنەوە کە پتر درێژەی پێ دەدرا: پاش شکانی شەڕی مانگی سیپتامبری ١٩٣٠ هێندێ لە کوردەکانی تورکیا لەدەستی تورکەکان پەنایان بۆ کوردەکانی عەراق لەبارزان هێنابوو. لەئاخری سی‌پتامبر ١٩٣٠دا نوری پاشا، لە حکومەتی تورکیای داخوواز کرد کە بێ‌لێ‌هیزی‌تورک بچێتە نێو خاکی‌عەراق و کاری کوردەکان لەوێ دا تەواو بکات.

شیخ ئەحمەد کاری یارمەتی دانی کوردەناسیونالیستەکانی تورکیای بە ئەستۆ‌گرت بوو، ئینجا ساڵێک پاش واتە لە دی‌سامبری‌سالی ١٩٣١ لەلایەن دەولەتی عەراق‌وە ئاکارو کردەوەی نیزامی دژی‌ئەو دەست‌پێ‌کرا.

## ١١ ـ بزوتنەوەی حاجو

یەکێک لەسەرۆکی کوردەکانی وەلاتی سوریە بەنێوی هاجو کە لەلایەن کمیتەی خۆیی‌بوونەوە، یارمەتی دەکرا لە سنووردا لەگەل تاقمێکی سەدان‌مرۆڤ لەلایەن‌گرەکانی، لە ٥ی ئوتی ١٩٣٠، گوندێکی چکۆڵەیان لەمەل بەندی نسیبێن‌دا، داگیرکرد- وەلەوێ بڕیارنامەیەکیان لەچاپ‌دا، کەمەبەست‌و، هەڵوێستی نەتەوایەتی گشتی سەربەخۆئی‌تێ‌دا دیاری کرابوو،وە بانگە وازیان لە خەلکی کوردکردبوو کە بە یارمەتی وهاوڕێیی لەگەل کوردەکانی ئارارات دەس بکارین.

بەلام هاجۆ لەسووریەدا لەلایەن تورکەکانەوە بزوتنەوەکەی تێک‌شکاوە زوولەنێو چوو هاوکات لەگەل ڕاپەڕینەکەی هاجو، لە ناوچەکانی جووڵامێرک (٧ی ئوت) وە لە لای سیئیرت (٦ی‌ئوت) وە لە لیسی (ئاخری‌ئوت) وە بە تابیەتی لە دەورووبەری شاری دیاربەکر (٢ی سیپتامبر) ئەو بزوتنەوانەی کە لە سەرێ نێو بران دەستی پێکرابوو.

## ١٢ ـ ڕووخانی کۆماری کوردی ئارارات لە (سیپتامبری ١٩٣٠)

لەنێوە ڕاستی مانگی ئوتدا حکومەتی تورکیە تەسمیمی گرت کە بەبێ‌چاوەدێری حکومەتی ئیران، بە ژێنیرال‌سالح‌پاشا فەرمان بدا کە هیرش بۆسەرکوردەکانی ئارارات بەرێ وە پاشماوەی تاقمە کوردەکان کە لە کێوە کە دا پەنایان گرتووە لەنێو بەرێ.

ئینجا هیزی تورکەکان بۆ ئەوەی کە لای ڕۆژهەڵاتی کیوی ئارارات بگرن لە سنوورتێ‌پەڕین، تابەینیو هات‌و،چۆی کوردەکان ببڕن، وە لـە قولین چکێکدا هەڵیان پەسێرن‌و لەبەینیان بەرن. ٢٦١

هێرشی نەهائی کە لەلایەن ژینیرال سالح پاشاوە درا لە ٧ی سیپتامبری ١٩٣٠ بوو کە بۆ لای سەروی تەپەکانی ئارارات بوو.

لە ١٠ی مانگی سیپتامبردا سالح‌پاشا کلکەی زینویێ بەینی دوو ئاراراتی (کەلی‌سەرداربلاغی) داگیر کرد.

بەو تاکتیکەدە هات کۆتاهی بە شەڕەکە بێنێ بەدووای ئەو هیرشەدا، کوردەکان بۆ لای خوارو کشانەوە هیزی تورکەکان بە شوێنیاندا چـوون ئی‌حسان‌نوری (ژینرالیسم)ی کورد پەنای بۆ ئیران برد. ئی‌حسان‌نوری لەتاران دەژیا تاکو لەنیوەی مانگی ئاوریل‌ی ١٩٧٦دا کوچی دووائی کرد بەلام ئەوە پایانی کار نەبوو زۆر بە چاکی دیارە کە تورکەکان لەو ڕاپەڕینەدا بەرداشتێکی غەڵەتیان کرد.

هەروەها مێژوو نووسەکانی کوردیش لەو بابەتەوە کە دەبوو نووشتار بنوسن نەیان نووسیوە، وە ڕاپەڕینەکەیان زۆر بە شانازیێوە باس‌نە کردوە، وە پڕۆپاکاندی بۆ نەکراوە.

دەسا هەر چونیک بوو بێ، ئەوەیان ڕوون نەکردۆتەوە کە ئایـا ئی‌حسان‌نوری کەنگێ لە کانگای ستادی گشتی فەرماندەهی خۆی هاتۆتە دەرێو بۆ خاکی ئیران هاتووە، ئایا پەنای هێناوە، یان سەبارەت بە شکانەکەی هاتە ئیران. ئینجا شەر لە ناوچەی ئارارات لەمەڵبەندی سنووری ئیران بە درێژائی

سالی ١٩٣١ هەر ماوەی هەبوو.

بەگومانی هێندێ لەهاوال دەرەکان وا ئاشکرا بووە کە ئیحسان نوری لەکاتێک دا پەنای بۆ ئیران برد، کەوە ختەکە زۆر عاستەمو، ناسک بوو، بەس لەبەر ئەو مەبەستە ئەوەیان لێ بە ڕخنەوئیراد گرتووە (پائیزی سالی ١٩٣٠) ئەوەی کە شایوباسە کوردەکان لەوبەینەدا پیاوێکی دیکەیان بە سەرۆکی نیزامی دانەنابوو، کە ئەگەر بێتوو ئیحسان‌نوری کارەساتێکی بەسەربێت ئەوجێگای بگرێتەوە، لەوبابەتەشەوە لە کمیتەی خۆئی‌بون رخنە دەگیردرێ! ٢٧

لە لایەکی دیکە شەوە ئاکارو کردەوەو، بیلانی کوماری کورد لەئارارات دا زۆر بە ووردی ڕوون نەبۆتەوە: کوردەکان دوو شکانی گەورەیان تووش‌هات (زیلان، ئارارات) کە لەو دووشکانەدا ئەندامی پێش مەرگەی زۆریان لەدەس‌دا چەکو، ئەسلەو، سازو، بەرگێکی زۆریان کە لە سالەکانی پێشوودا کۆ کردبۆوە، وعەبناریان کرد بوو لەدەس‌چوو، مەلبەندی ئارارات کە زۆر جیگایەئی ناسکو عاستەم بوو، لێیان‌گیرا. لەبارەی شەڕەکەدا هاوالی زور بە خاترجەمی وە دەرنەکەوتووە.

بەلام گوتراوە وە نووسراوە کە کوردەکان تووشی شەڕێکی گەورەی کلاسیکی نیزامی ببونو، خۆیان تیۆەردا وە نەدەبوو نرخ وبایخی شەرەکەی بەو جورە لێبکەن، بەلکو دەبوو، لەکێوەکان دا دەسیان بەشەڕێکی پارتیزانیو، گرێلائی دابایەوە لەتە واوی شارەکانی کوردستان دا بەو چەشنە ئاکاری نیزامی خۆیان درێژە پێ دا بایە.

مێژوو دووپات نابێتەوە بەلام پیاو ناتووانێ بەسەرهاتو، پێش‌هاتەکان لەداهاتوو دا بەچاکی فکر لێ کاتەوەو، ڕوونی کاتەوە، بەلام هەرچێک بێ روو داوەو، بەسەرهات لە کوردستان‌دا یەک‌بەدووای‌یەکی‌دا دێتە پێشـــێ، لەوەلاتی عەراق‌دا پاش نیوسەدان دیسان بەسەرهاتێک دەقەومێ.

## ١٣ ــ کێشانی شەڕ بۆئیران لەبەهاری ١٩٣١

حکومەتی‌ئیران بە بێ‌روحمیو، بەگرنگی لەو دەمەدا لە سنووری خوی پارێزگاریو، بەرگــری دەکرد، وە زورزوو لێی حالی بوو کە کات عاستەم و ناسکە.

لە نیوەی‌مانگی‌مارسی ١٩٣١ بەشوێنی هێرشێک دا لەناوچەی ماکۆ، لەلایەن کوردەکانەوە فەرماندەی نیزامی تەوریز هێرشێکی گەورەی لەژێر فەرمانی سەرلەشکرێک، نارده جەنگەی شەڕێ. پیاوەسیاسێکانی تاران چاوەڕووانی تووانەوەی بەفری زستانیان دەکرد. جا بەرهە چەشنێک بوو حکومەتی‌ئیران چاک یان خراپ سیاسەتی خۆی لەبارەی سەرکوت کردنی کوردەکان‌دا لەسەرڕێبازی حکومەتی تورکەکان دانا وە بەوجورە کوردە جەلالیێکانی کە لە ناوچەی ئارارات و، سنووری شورەوی دەژیان دوور کردەوە. لە هەوەڵی مانگی ئاوریلی ١٩٣١دا ڕێبوارێک دەگێڕێتەوە کە سەفێکی دوورو درێژی کوردانی پەنا بەری دەرکراوی چاو پێ کەوتووە کە ئەوسەفە ١٠کیلومتری درێژائی هەبووکە بۆلای شمال دوور دەکەوتنەوە... ماڵو، مندالیان بەوردو، درشتەوە لەگەڵ بوو، وە کۆچیان دەکردو، پیاویان لەگەل نەبوون، مەڕو ماڵاتیان وەپێش‌خستبوو، وەعارەبەشیان دەکیشا وەئەو ڕێبووارە گوت‌بووی کە ژمارەیان زور بوو، نەدەبژاردران[٢٨]، بەلام دەکرێ بلین ٥٠٠٠ کەس‌پتر بوون. خالدبیک‌ئاغا، یەکیک لەسەرۆکی‌کوردەکانی جەلالی لەگەل پیاوەکانی دیێ‌خۆی شتمەکی تیێک ناو، بۆ خاکی تورکیە پەنای برد. هەر لەو کاتەش‌دا، ڕێبوارێکی دی کە لە ناوچەی بایەزیدەوە ایگ‌دیر ڕا هات‌بوو، گێڕابوویە وە کە ئەوناچەیە پڕ بوو لە تاقمە نیزامێکانی تورک وە دەنگی شەڕە تفەنگ دەهات‌و، ڕەگباری ڕەشاشو، گوللەی تۆپێ لەلای ئاراراتە وە دەبیسترا لەلایەکی دیکەوە تورکەکان ٢٠کیلومتر هاتبوونە نیو خاکی ئیران وە لەناوچەی قۆتور دا خەریکی گۆڕانەوەی جیگایەک بوون لە گەل ئاراراتی چکۆلە.

### ١٤ ــ هێزەکانی حازروئامادە:

لەهەوەڵی مانگی مەی ١٩٣١وە کە هیزی ئیران لە سنووری تورکیە دا جێگیر بوون بریتی بوون لە ٣٨٠٠ سەرباز ٢٠٠٠ چریکی بە کرێ‌گیراو، وە ١٢٠٠ کوردی لایەن‌گری دەولەت ٣ فڕۆکەی کۆن لە ناوچە کە دادەگەڕاو، و لاتی تاقی دەکردەوە لەولایەشەوە هێزی کوردەکان بریتی بوو لـــە ٦٠٠ تــا ٧٠٠ پیاوی عەشیرەتەکانی جەلالی وحەیدەرانلو، وە ٣٠٠ پیاوی کوردی ئاراراتی‌ش هاوکاری

دەکرد،چەکی ئۆتۆماتیکی تازەیان پێبوو کە ٢٥تیریدە خووارد. سەرۆکی ئەوانە یەکێک لەئەندامانی "خوێ بوون" بو کە فەرزندەیان پێدەگوت سەرۆکێ کیدیکە کوری ئیبراهیم ئاغای جەلالی بوو کە نێوی "بڕۆ"ی لەسەرخوی نابوو. ٢٩

لەسالی ١٩٣٠ وە هەرمەنیکانی داشناک بەخاترجەمی هاتو، چۆیان بۆنێو کوردەکان دەکرد.

## ١٥ ـ فازیيەکەمی ئاکاری نیزامی ئێرانیکانلە (مانگی می ـ ژوئنی ١٩٣١)

لە نێوە ڕاستی مانگی میی ١٩٣١ هیزی ئیران هێرشی بردە ســەر مەلبەندی قەرەعەین مەبەست بەوەی کە جەلالیێکانی سمایل ئاغا کە لە ئارارات بوون کۆیان کاتەوە سمایل ئاغا لەو مەبەستە ئاگاداری پەیدا کردو، پەنای بو وەلاتی تورکیە برد، ئینجا فارسەکان ناوچە چولەکانیان کە کوردەکان بەجیيان هێشتبوو داگیر کرد. لە ١٩ی می ١٩٣١ کوردەکانی جەلالی، لەلایەن شەڕ کەرەکانێکی کە لە تورکیە ڕا هات بوون، یارمەتی دران، وەشەوێ هوروژمێکیان بو سەربازخانەیەکی ئیرانیکان برد.

سەرهەنگ کەریم خانی سەبیاح سەرۆکێ هێمنایەتی سنووری ئیران ـ تورک بەو هێرشەی کە کوردەکان کردبوویان سەلماندی کە لەونێوەدا ١٢٤ سەرباز کوژران وەپیترلە ٢٠٠ تا ٣٠٠کەس بریندار کران.بەلام لە سەرگێڕانەوەی هەوال بەری رامیاری ئینگلیسەوە ژمارەی کوژراوەکان پتر لە سێ بەرانبەر لەوەی کە گوتراوە بوون کوژراوی کوردەکان: تەنیا ٧کەس بوون کە لە مەیدانی شەڕێ دەدیتران. "شۆڕشگێڕەکان کوژراوەکانیان وەک هەمووجاری لەمەیدانی شەڕێ بردۆتە دەرێ". دەولەتی ئیران دەیەویست لەوکاتە عاستەمە دا ژمــــارەی کوژراوەکانو، بریندارەکان وە دەرنەخرێوە لەنهێنی دا بمێنێتەوە: لــە جەنگەی شەڕێدا سەربازەکان بلاویان دەکردە وە کە لەڕاستەقیتەدا کوژراو، بریندار زۆرن!

لە ئاکاما ئیرانیکان دەسینان بە گلەییوناکۆکی لە تورکەکان کرد، وە گوتیان کە لەسەر کوت کردنی کوردەکان دا هاوبەشیمان لەگەل ناکەن!

سەرهەنگ کەریم خانی سەبیاح تورکەکانی گوناح بار کرد کە دەیانەوێ لە بە رانبەر کوردەکاندا بە هێمنی و ئارامی بیژونەوە، وە بە سیاسەت لەگەلیان

بدوێن، بە تایبەتی لە ١٩ی مارسڕا تا ٩ی ژوئین کە کاتی شەڕێکی توندی کوردو، ئیرانیکان بوو، تورکەکان خۆیان لەهیچنەگەیاندو، ئیران لەوبابەتەوە زۆر نارحەت بوو. [٣٠]

## ١٦ ـ فازی دووهەمی شەڕ (ژوییەی ١٩٣١)

بەلام لەسەر ئەوەشڕا کە ئیرانیکان، پڕتەو، بۆڵەو، تووندو، تیژیان لە تورکەکان دە کرد، ئینجا ئەوکارەساتە بوو بە هۆی ئەوەکە هاوکاری لەنێو هەردوو دەوڵەتدا، دژی کوردەکان پتربێت: بەپێی شەڕوکردەوەی نیزامی کە تورکەکان دەیان کرد، کۆڕی هێمنایەتی سنووری‌ئیران سێ‌پێشنیاریان کەدا پێویستبوو بە ڕێوەی‌بەرێ.

ـ بەستنی سنووری‌ئیران، بەخاتری ئەوەی کە کوردەکان لە هیـــچ کات‌وساتێکدا نەتوانن بێن‌وبچن.

ـ چۆڵ کردن‌و، لابردنی کوردەکانی ئێران لە خەتتی سنووردا: ئاراراتی لەهەوەڵەوە لەعەشیرەتەکان چول کرابوو، وەنەیان دەهێشت کەکەس بچێتەوە نێوێ.

ـ شەرکردن لەگەل تاقمی‌کوردە "چەردەکان" ! لە ناوچەی فارسەکاندا.

لە هەوەڵی مانگی ژوئیەی ١٩٣١ هیزی ئیران بۆ جاری دووەم قەرەعەینی گرتەوە لەوجێگایە دا لە لایەن کوردەکانی ئیران و تورکەوە لە ١۴ژویـــیەدا هێرشێکیان بۆ کرا، زەرەرو، زیانێکی قورسیان‌لێ‌کەوت‌.بۆڕۆژی داهاتو کوردەکان لە دێیەک دا لە مەلبەندی‌ئیران دەسیان بە قەلت‌و، بڕو تالانێک کرد، وە لەونیوەدا ٥٠کەس‌کوژران.

ئینجا فارسەکان سەربازە تورکەکانیان گوناح‌بار دەکرد کە لە "جلکـی کوردی" دا یارمەتیان بەکوردەکان کردوە، وە هەروەها تورکەکانیش دەولەتی شورەویان تاوان بار دەکرد کە یارمەتی کوردەکان دەکەن، وە چەک و ئەسلەحەیان بۆ ناردوون! [٣١]

## ١٧ ـ یەکەتی عەراق ـ ئێران ـ تورک دژی کورد

پاش ئەوهەموو تاوانبار کردنی یەکترو، توندوتیژیو، نێوان ناخۆشی، لەئاکامدا لەسەر مەسەلەی کوردەکان قەولو، قەرار داندرا کە لەبەینی تاران‌وەئانکارا هاتو،چۆ سازبێت. فارسەکان دەیان گوت کە ئێوە نابێ بەوەی ڕازیبن کە کاتێک کوردەکان لە کێوەکان هەڵ دەبڕین‌وە بلاویان دەکەین، وە بو دەشتەکانی ئیران دێن، ئیتر دەسیان لێ بکێشنەوە. ٣٢

سەرئەنجام لە هەوەڵی سالی ١٩٣٢ دوو کۆڕی تورک بە چەشنی ڕەسمی سەفەریان بوئیرانێ کرد.

سەروکی یە کێ لەو کۆڕانە، جەلال بایار بوو، کە پاش چەندیک بەسەر کۆماری تورکیە داندرا.

ئەو کۆڕە لەسەرەتاوە بۆ مەسەلەی ئابوری و مالی بۆئیران هات بوو، بەلام لەنهێنیدا لەمەسەلەی کورد دەدووا.

کۆڕی دووهەم کە بە سەرۆکایەتی توفیق ڕۆشتۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی تورکیە بوو، هەلوێستی ئەوە بوو:

کە ئاڕاڕاتی چکۆلە کە خاکی ئیران بوو لە گە ل ٦ گوندی کوردنشین بگۆڕێتەوە.

ڕەزاشا تاڵووکەی ئەوەبوو کە ئەوکارە زوو لەبەردەست ڕاپەریو، جێبەجێ بێت! ٣٣

پاش چەن مانگێک، وەزیری کاروباری دەرەوەی عەراق‌ش دووسەفەری لەسالکانی ١٩٣١ - ١٩٣٠ بۆ ئانکارا کرد لەکاتی ووتو، وێژدا تورکەکان بەوەزیری کاروباری دەرەوەی عەراقیان ڕا گەیاید وادەبیندرێ "لە ناوچەی بارزاندا هاتو، چۆ، جوولانەوە زۆر وەبەرچاو دێ، وە هێندێ لەکوردەکانی کۆماری تورکیە، بە پیانووی زیارەت خەریکی ئەوەن کە تاقمی خرابکاری دروست بکەنو، هێمنایەتیو، ئەهوەنی ئەو مەڵبەندە تێک بدەن"!

ئینجا حکومەتی عەراق ڕای گەیاند کە لە هیچکاتێکدا، لەگەل کوردەکان

سازش ناکاتو، پێک نایەو، ڕێک ناکەوێ، وە لە دەوروبەری سنووری عەراق قەت نایەڵێ ئاژاوە سازبێت، وە هاتنە سەرئەوەی کە دژی شیخ ئەحمەدی بارزان لە کردەوەی‌نیزامی‌دا هاوکاری بکات. ٣٤

لە نێوە ڕاستی مانگی ژوئینی ١٩٣١، با لوێزی ئیران لە ئانکارا، لەبەرانبەر بالوێزی‌ئینگلیس‌دا کە لەوێ‌بوو، داوخووازی‌کرد کە "ئەو کۆ بوونەوەیە زیاتر بە خاتری مەسەلەی کوردەکانە،کە پێویستە لەبەینی سێ‌دەولەتــــان‌دا ڕاپەڕێندرێو، حەل بکرێ" وە سەبارەت بەوە دەبێ زۆر بەگرینگی قسەی لێ‌بکرێ وە هەروەها ڕای‌گەیاند کە بۆ هەڵ سەنگاندن و سەنگ و سووک‌کردنی مەسەلەی کورد بزوتنەوەی‌شیخ‌مەحمودیش بەگرینگی لەبەرچاوبێت.

سەرئەنجامی ئەو هاتو، چۆیەو، ووتو،ویژە بەوە گەیشت کە لەسالی ١٩٣٧ دا پەیمانێک بەنێوی پەیمانی سەعدئاباد لە نێو ئەوان‌دا ببەسترێ

لەوپەیمانەدا گوترا بوو کە ئەگەر هەرکاتێک لە کوردەکانی دانشتووی ئەوسێو لاتە سەر بزێویو، نارەحەتی بێننە پێــشێ، بەپیویست دەزاندرێ ئەو سێ دەولەتە بە یارمەتی یەکیتر دژی ئەوکارە قۆڵ هەڵکەن وەنا لە بارێکەو، جوولانەوەکە لە نێوهەڵ گرن.

### ١٨ ـــ وەلامی تورکەکان لەبارەی مەسەلەی کورد

لە ٥ی مەی ١٩٣٢ حکومەتی تورکیا، ڕەسمەن ڕای گەیاند کە یا سایەک لە مەجلس بەجێ‌هاتووە کە ڕێگا دەدا کە لە ناوچەی ڕۆژ ئاوا دا خەڵکەکانی هەڵ گرێو، کۆچیان، پێ‌بدا، وە ڕەوشتو، ئاکاری کوردایەتی لەنێو بەرێ هەروەکو لەزەمانی مستەفا کەمال وە تەوفیق ڕەشید بەگ لەگەل کمیسەری پایە بەرزی ئینگلیز لە بەغدا داوە بالوێزی ئینگلیز لە شاری قوستەن تەنیەدا لە مانگی نووامبری ١٩٢٦ وە ژانویەی ١٩٢٧ دا لە دانشتنێک دا ئەو مەسەلەیان سەلماندبوو.

بەو یاسایە دەستیان ئاواڵە بوو دەیان توانی لە ناوچەی ڕۆژ ئاوادا ئەوەی کە بیانەوێ لەبارەی کوردەکان و، لایەن گرەکانیان‌دا بی‌کەن، واتە سەروک بەگ، ئاغا و شێخ، عەشیرەتەکان، پاڵە و جوتیار وەتەواوی ئورگان و سازمانەکان وە هەر "مرۆڤ وخاوەن قودرەتێک" کەلێی‌دژدۆنگ‌بن وخراپ ببزوێتەوە لەوەلات

دووری خەنەوە ولەوێ هەڵیگرن.

"هەروەها تورکەکان دەتوانن نەهێڵن کە دانشتووی ئەو وەلاتە بەزمانی زکماکیخۆیان قسەو، ووت و ویژبکەن، تەنیا پێویستە بە زمانی تورکی قسە بکرێ، ئەو زمانەی کە بەچەشنێکی تازە لەشارو دێیەکان دا ڕەواجی دەبێ و پێ دەخوێندرێ." [٣٦]

بەلام دوورخستنەوەی کوردەکان لەوەڵاتی خۆیان، زۆر لە پێشدانانی ئەویاسایە دەستی پێکرا بوو. لەمانگی سێپتامبری ١٩٣١، ٢٠٠٠ مرۆڤی کوردی جەلالی، لەگەل مەرو مالاتیان کە٤٠٠٠٠ سەر ئاژال وگیان لەبەر بوو، لەلایەن دەستەیەک لە سەربازە تورکەکانەوە لە ناوچەی کورد، دوور خرانەوە وەلەنێووەلاتی تورکان داگیرایان[٣٧]! ئینجا لە جیگای ئەوان تورکیان دانان، ئەو خەلکە کوردە کە بەنێو شارەکانی تورکان دا دەیان گێڕان زۆریان بێجلک و بەرگ بوون، پێخوواس بوون لەوشار بۆوشار، لەو دێ بۆو دێ ئەومال، و منداڵەیان کە برسی و توونیش بوون لەسەر عەرابەکانیان ئاوارە مابوونەوە وە هەناسە سارد ئەستۆیان خووار کرد بۆوە پاشە ڕۆژیان مەعلوم نەبوو وە ئیوا بوو لەبرسان دەمرد وەیان نەخۆشدەکەوتگیان لەبەرەکانیشیان دەکەوتن و دەمردن."

کاتێک کە دە گەیشتنە شارێکی گەورە کە "دەیان بردنە نەخۆشخانە" وەیان برینیان بۆ دەرمان دەکردن، چیوایان پێ ڕانەدەگەیشتن شەوێ کە دەهاتن بنون، هیچ پێخوستیان نەبوو[٣٨] لە سەرعەرزی خۆلاوی، یـــان لەسەرعەرضیسمیتی دەنوستن" ئینجا ئەوانەی کە لە ناوچەی کوردستان مابوونەوە وازیان خرابتر بوو، بە دیتنی ئەو خەلکە هەژارو، ئاوارەیە، کە بێجلوبەرگ بوون، کوردستانێکی زۆر ناخۆش و وێران لە بەرچاو دەدیترا. لە مانگـــی مەی ١٩٣٠دا ئیدموند، کە لە حکومەتی تورکەکان دا دەستی دەڕۆیشت، بەڕێبووار وسەفەر چوو بۆناوچەی کوردستانو، شارەکانی، مەڕاش، سیویریک، دیاربەکر بیتلیسو مووشی تا بە حریوان دیت بوو، وەگێڕا بوویەوە کـــە:

"لەو شارانەدا تەنیا وێرانی وهەژاریو، بەدبەختی و کوێرەوەری کوردەکان لە بەرچاو بوو، ئیتر هیچی دی.شاری بیتلیس بەتایبەتی زۆر لەغەمباری و وێرانی دابوو، مالەکان بە درێژائی دوو کیلومتر وێران بوون و لەنێو چوبوون ئەوشارەی کە لە پیشدا ٤٠٠٠٠ کەسی تێدا دە ژیا، لەوکاتەی کە دیتم لە٥٠٠٠کەسی

پتر تێدا نه بوو" شاری مووش خرابتربوو، بەڕاستی مرۆڤ بە دیتنی ئەوشاره سەری لێ سووڕدەما، وه دلی تێکەڵ دەهات، ئەوشاره که ٣٠٠٠٠ کەسی دانشتوو هەبوو، بەچەشنی دێیەکی وێرانه دەدیترا کە٣٠٠٠کەسی پتر تێدانه مابوو"! [٣٩]

له تەواوی ئەهەموو وێرانیی کەلە ئاسۆی کوردستان‌ی تورکیەدا دەدیترا، دەنگێک له ئیسانێک دەرنەدەهات تاکو شۆڕشی سالی١٩٣٧ی ناوچەی دەرسیم دەست پێکرا.

# فەسلی ٦

## شورشی ئاخری شیخ‌مەحمود

پاش ئەوەی کە شیخ مەحمودی بە رزەنحی لەمانگی ژوییەی١٩٢٤ دا لە سولەیمانی وەدەرکەوت ، چۆسنووری عەراق وئیران ، وە کاتی شەڕیی بەخۆیی‌گرت لە نیو عەشیرەتەکانێکی کە لە ژێردەستی عەراق دانەبوون ، قودرەتێکی تایبەتی بەدست هێنا بوو. هەرچەند دەولەتی عەراق هەولی‌دەدا کە ئەوکارەساتەی لەبەین بەریَ وتێک‌دا ، بەلام نەی‌دەتووانی. ئینجا (لەسالی ١٩٣١ شیخ‌مەحمود واتەپاش حەوت سال خەبات و ، شەڕ ڕاپەرینەکەی لە سەرڕا دەست پیَ کردەوە ، لەڕاستەقینەدا بزوتنەوەکەی هەر درێژەی هەبوو ، وە نەپسابۆوە ، سەرئەنجام ڕابەرەکانی عەراق بەو نەتیجەیە گەیشت‌بوون کە مەسەلەکەی لە ڕێگای ڕامیاریوە حەل و فەسل بکەن .

## ١ ــ شەڕی سالی‌ی ١٩٢٥

هەولین شەڕی دەولەتی عەراق دژی شیخ‌مەحمود لەهاوینی‌سالی١٩٢٥دا واتە سالێک پاش گرتنەوەی شاری سولەیمانیَ بوو لە مانگی ژوئن‌دا ستوونێک لە هیزی عەراق ناردرا سەر هەڵەبچە کە دژی‌شیخ‌مەحمود دەست بەکاربن ، عەراق بەهیوایە بوو کە ئیرانش لە سنووردا وەک عەراق هێرش بۆ کوردەکان دینیَ .

بەلام هێزی فارسەکان نەگەیشتیَو ، ساوەساوی‌کرد ، شیخ‌مەحمود تووانی

کە پەنابەرێ بو لای مەحمودخانی دزلی وەمەحمودخانی‌کانی‌سانانی، کـــە هەردوکیان سەروکی عەشیرەتی هەورامانو، مەریوان بوون شیخ‌مەحمود دەیەویست لەگەل ئەدوو سەرۆکانە، یارمەتی شازادە سالارو ددەولەی قاجار کە شۆرشی دژی رەزاخانی دەست پێ کردبوو، بدات. ١

## ٢ ـ ئاکاری نیزامی ١٩٢٦

دووای سالیک شیخ‌مەحمود هەلمەتێکی نوێی بە یارمەتی کوردەکانی ئیران لە مانگی‌ژوئن‌دا بردە سەر هێزی عەراق بەلام نەی‌توانی سەرکەوێ، لە سەروەشڕا تووشی قایقیکی ئینگلیس دەبی گەماروی دەدا، مرۆڤی مکانیکەکەی دەگری و زیندانی دەکات‌وە چەندمانگ لە زیندان دا دەمێنێتەوە سەیر ئەوە بوو کە شیخ‌مەحمود ئەو زیندانیێی لەگەل خوێی بو ڕاوێ دەبرد. ٢

ئەوجار حکومەتی ئیران داخووازی عەراقیێ سەلماند، بەلام ئەو داخووازە بۆ ئیران گران تەواوبوو یانی: لە ٣ی سیپتامبری ١٩٢٦، تاقمێکی نیزامی ئیران کە بریتی لە ٣٠٠ سربازی پیادە، وە/٧٠٠ سووواربوون هێرشیان بۆ سەر پشدەریکان کە کانگای ناوەندیان قەلادزێبوو برد. پاش چەند سەعات شەڕ. ئیرانیکان کشانەوە، چەند سەد کەسیان لێ کوژرا، کوردەکانیش لە کاتێک‌دا کە ١٥نەفەر سەربازی یەخسریان پێ بوو گەڕانەوە جێگای خۆیان،وە هەروەها تۆپێ‌کیشیان لەگەل خویان هێنابوو

## ٣ ـ گفت‌و، گۆ لەگەل کۆرن‌والیس (٩ی ئوکتوبری ١٩٢٦)

لە لـەسەر ئەو هەموو خراپەی ڕا کە دەولەتی ئینگلیس لەگـــەل شیخ‌مەحمودی کردبوو، وە هێزی هەوائی سەلتەنەتی ئەوی زوڕ لە سەخلەت دا دانا بوو، شیخ لە ئوکتوبری ١٩٢٦ ئامادەی ووت‌و، ویژ لەگەل کورن‌والیس کمیسەری پایە بەرزی ئینگلیس لە بە غدایەبوو.ئەو گفت‌وگۆیە لە مەلبەندی‌خوڕمال

---

دەبی‌ئەولوتکەیە لەبەحری‌زڕێبار دابووبێ، کەمەکانیکە کەی بەیەخیرگیرابێ.م.ر

بەخوشی و دلپاکیەوه بەرێوه بردرا. ئەو چاوپێ کەوتنه لە جیگایەکی سەرئاواله بەجێهات. پیش مەرگەکانی شیخمەحمود لەلایەکەوه، وەلەلایەکی دیکه شەوه سەربازانی عەراقی ئەو مەلبەندەیان گەمارۆدابوو، وەدیان پاراست. لە هەوەلدا کۆرنوالیس ١٠٠ هەنگاو لەگەل ئەحمەدی بە نجیهاتەپێشێ. شیخمەحمود ٤٠٠متر لەوی دوورتربوو، ئینجا لەگەل هاورێیەکەی کە مکانیکەئینگلیسیکه بوو، لـــە کاتیکدا کە بەرگری لێدەکرا بۆلای کۆرنوالیسی هات، پیاوەکەی بولای ئەو ئازاد کرد، شیخمەحمودو کورنوالیس هەردوکیان لەسەر پشتیندێکی کوردی کە راخرابوو دانشتن، وەماوەی دووسەعاتان چاوپێ کەوتنەکەیان درێژەی هەبوو، وه لەودووسەعاتەدا پیاوەکانێ کیبە قەدرو حورمەت ڕاوەستا بوون لەوبەرو، بەر بەرگریان دەکرد چاویان لەوان بڕیبوو.[٣] ئینجا کمیسەری پایەبەرزی ئینگلیس بەشیخمەحمودی پێشنیار کرد ئتر بەسه، وه قسەی من بسەلمێنـــه، وه بچۆ لە ئیران دابنیشه، ئینجا حاسلێکی کە لەزەویوزاری خۆت لەعەراقی وەدەست دەکەوێ بۆت بنیرنو، ژیانی خۆتی پێ ڕابۆیره. بە کورتی دەگوییدا خوێند کەلەو لات دووربیتەوه شیخمەحمود هیچ قسەی پێ مانەکرا وه لە کنەخـــوی پێوابوو کە دەڵێ بگەرێوه و لاتیخۆت، بەلام کاتیک کـــە پێشنیـــاری دوورخستنەوەی گوێلێ بوو، دەریبڕی و گوتی: کە چارەنووس هەرچونێکبێ دەبێ وابێ، ژیان بۆمن هێندە گرنگنیه، بەلام ئەو ئامانجەو ئاکارەی کوردایەتی کە لەمێشکی من دایە ناتووانم قەت لە بیر خۆمی بەرمەوەو لەدەستی بدەم وه هەروەها درێژەی بە ووتارەکەی داوگوتی: ژیانیمن ونەتەوەکەم لە ریگای کوردستان دایە" وەمن ناتووانم بەووسوکو، هاسانیه دەستی لێ هەڵگرم ئینجا شیخمەحمود بە سافیلکەوه، دەقودۆغری بە کۆرنوالیسی ڕاگەیاند کە حکومەتی بریتانیا دەیەوێ دەست بەسەر کوردەکانی ئێرانش لەنهێنیدا داگرێ

سەرئەنجام کورنوالیس پێشیناری کرد کە بچێته بە غدایە دابنیشێ، لەوێ ژیانی خوی ڕابوێری شیخمەحمود گوتی دەزانم چۆن دەولەتی ئینگلیس لە نهێنیدا پشتیوانی لەودەولەته زوردارانه دەکات، بەلام من پیشنیار دەکەم، کە هەر بەو قودرەتەوه بچمه شاری پیجوون دابنیشم.

لە ئاکامدا ئەو دووپیاوه لەیەکتر جوێبوونەوه، لە کاتیک دا شیخمەحمود کە چاوو پی کەوتنەکەی لە نیوشاری خورمالدا نەسەلماند بوو، سەبارەت بەوه

بوو کە ئەو شارە پڕ لە عەرەب بوو، وە نەیدەویست لەوێ ووتو، وێژ بکرێ، بویە لەدەرەوەی شاری خورمال گفتوگویەکە بەریوە چووبوو.

پاش حەوت ڕۆژان، شەڕ دەستی پێکراوە، وە هێزی هەوائی سەلتەنەتی ئینگلیس دیسان زۆر بەگرنگی، شیخمەحمودی لەمەترسیهاویشت، شیخمەحمود چارەی نەما بو ئیران پەنای برد، وە لەوێرا هیزی زەمینیی عەراق ڕەدووای کەوتو، جیگای پی تەنگ کرد لەسالی١٩٢٧ شیخمەحمود لەگەل حکومەتی عەراق لە بارەی گەڕانەوەکەیدا بو ناوچەی دانشتووی خویی، ووتو، وێژی کرد.

ئەوکوردە ناسیونالیستە مەزهەبیە "کارێکی زۆری بۆ کوردان کرد، بەلام سەرنەکەوت؛ ئەمماله ڕووانگەی رامیاریەوە بۆکوردان گەلیکی قازانج لێوەرگیرا ئەومرۆڤە نەبەزە دەیەویست کوردستانیکی سەربەخۆ پێک بێنێت، ئینگلیسکانش لە سالی ١٩٢١دا لەگەل ڕاو، تەدبیری ئەو بوون، بەلام بە دانانی فەیسەل ئینگلیسیکان گومانیان گۆڕا. وە لە سالی ١٩٢٦ – ١٩٢٧دا تەواوی کوردستانی عەراق لەسەر ڕا بووبەکانگای ئاژاوەی نەتەوەی کورد.

## ٤ – سەرکەوتنی "کۆڕی زانیاری کورد" لە کوردستانی عەراقدا ( ١٩٢٦ – ١٩٢٧)

تەواوی کۆڕی کورد سەرئەنجام بەو نەتیجەیە گەیشتبوون کە تاقمی وەزیرانو کاربەدەستە ئیدارێکانی عەرەب، لە لایەن عەرەبەکانەوە، لایەنگریو بەرگریان لێدەکرێ،وە دەیانەوی بەسەر کاروباردا زالبن." بەلام لە سەر ئەوەشڕا لە سالی ١٩٢٥دا ڕێیان بە کوردەکان دابوو کە زمانی کوردی لە ناوچەی کوردستاندا ڕەسمیبێو بخوێندرێ.ئاشکرا بوو کە خوێندنی زمانی کوردی لە نەتیجەی تێکوشان و هەولی کوردەکاندا بەرێوەبردرا. کۆڕە زانیارەکانی کورد لەوهەلو، دەرفەتەدا لە بنەڕەتەو، فەرهەنگیکی پاکو، خاوێن، کە لە ڕاستەقینەدا ئەوەی کە خەلکی کوردە دەیەویست بەهەستی هێنا.لە شاری سولەیمانی دا یارمەتیک بە نیوی "زانستی کوردستان" واتە کومەلایەتی ویژەوری لە بەهاری ١٩٢٦دا لەلایەن، رەفیق ئەفەندی، ڕەمزی ئەفەندی،

فایق‌بەگ، وەمارف‌بەگ، داندرا، کەمەبەسیتان دروست‌کردن‌و، باش‌کردنی فەرهەنگی توودەی کورد بوو" هەوەڵین هەڵوێستیان ئەوە بوو کە فەرهەنگیگی کوردی کە لەگەل مافی نەتەوایەتی گشتی‌کورد کەڕێکو، پێک بێت دامەزرێنن...
ئەو کومەلە بە ئاکارو، ڕەوشتێکی باش دانشتنی بەجێ‌دینا ئینجا حورمەت‌و، رێزێگی گەورەی بەدەست هێنا ئینجا زۆر زوو هێندێ لە ئەندامانی کورد وەک جەمیل‌بەگ کە نایبی سەرۆک بوو ویستیان ڕەنگی شەرقی سیاسی پێ بدەن.
وە هەرلەوکاتەش‌دا مستەفاپاشا گەراوە سولەیمانیێ (هاوینی ١٩٢٦) کە لە هەل‌بژاردنی نوێنە رایەتی دانشتگەی عەراق داهاوبەشی‌بکات،وە هیوای ئەوە بوو کە پاش هەلێ بژاردنەکەی، تەواوی نوێنەرانی کورد لە دانشتگەکەدا بکاتەیەک
لەشاری ڕەواندز سەیدتاها بۆدانانی کومەلی‌ئەدەبی بەنێوی"هو ژیری" کە"بو باش‌کردنی زمانی‌کوردی وە بۆ ناسینی میژوو ئاکاری کوردی" و وە داب‌وڕوسمی خەلکی کورد بوو پێک‌هێنا، بەلام نەخشەی ئەومرۆڤە نەخشەیەکی رامیاری بوو کە حکومەت پێشی لێ‌گرت.ئینجا دەبێ بگوترێ کە شاری موسل ناوەرووکەی ناوەندی هات‌و، چۆی کوردەکانی تورک، عەراق و ئیران بوو.
لەسالی ١٩٢٦دا حکومەتی ئینگلیس کوڕی زانستێکی نهێنی بە نێوی (پێش‌کەوتن" کە هەلوێستی ئەوە بوو کە لەگەل کوردەکان نێوانی خۆش‌کات، بەهەست هێنا، بەلام زۆر بە گورجی کوڕێکی دیکە دروست کرا.
لەشاری کەرکوک، هەولێر، چەن کوڕێکی‌دی لە نهێنی دا پێک‌هات کە راستەقینەدا شیخ‌مەحمود لەگەل هەموویان هات‌و، چۆیی هەبوو، لە نێو ئەو کوڕانەدا، هات‌و، چۆی زۆر بوو، بەلام لەوەی مەترسیان هەبوو کە هەوا دارەکانی ئینگلیس پتر نفوذ بکەن و، بنکە دابنێن لە ئاکام دا تەواوی ئەوکوڕە زانیارانە، وە هەموو کار بەدەستەکان‌و، عەشیرەتەکان، ئەفسەرەکان‌و، دانشتووانی شارەکان کە ئەندامیان بوون، وردە — وردە بۆلای مافی گشتی‌نەتەوایەتی کوردستان کێشران... ئینجا ئەگەر لەولایەوە ڕێگایان نە دەدرایە کە بۆ قازانجی گەل هەول بدرێ، بەلام، تاقمیک لە کوردەکان لەڕێگای مەجلسەوە، وەک ئیرلەندیکان وە یاسای‌هوم‌ڕوول (قانونی مەجلسی ایرلند) سەریان وەدەردەنا، لە ئاکام‌دا ئەوە حکومەتی عەرەب بوو کە لەگەل دووژمنی خویی لەمەجلسی یاسائی‌دا ڕووبەروو دەبوو، وە چوێتی‌و، نالەباری بودەهاتە پێشی. ٥

٧

## ٥ ـ ڕاپەڕینی سولەیمانی لە (٦ی‌سی پتامبری ١٩٣٠) دا

ڕاوتە دبیری بریتانیای گەورە لەمانگی فیوریەی ١٩٢٩دا لە سەرفەرمانی دان‌بە سەردانان لەووت‌و، ویژدا کە مافێکی تازە بدات، وە لەمانگی ژوئنی ١٩٣٠دا ئیمزای بکات، دەهات تینێکی تازەی نەتەوایەتی بە خەلک بدات، وە شۆڕشی سولەیمانی لە مانگی سی‌پتامبری١٩٣٠دا هاوکات لەگەل ئەوتین‌وحەرارەتە دەستی پێکرا. ئینگلیسٔ دەی‌گوت کە ئەگەر کوردەکان بەوەی ڕازی‌بن کـــە بەچەشنێک مافی نەتەوایەتی بە نێوی "ولایەتی‌کوردی"بسەلمێنن وە بۆخویان ناوچەکە ئیدارە بکەن وە پەیوەندی لەگەل حکومەتی ناوەندی هەبێ زۆرباشە وەکمیسەری‌عالی ئینگلیس‌ش لەوبابەتەو ( چاوەدێری دەکات ئەوەش د بەشوێنی مەبەستی‌سالی١٩٢٥ بوو کە پیویست‌بوو لەبارەی مافی سەربەخۆیی لێی‌بدوێن، بەلام دەولەتی ئینگلیسوعەراق مەسەلەکەیان خستە پاش هەلبژاردنی نوینە رایەتی مەجلس. ٧

لەمانگی فیوریەی دا کۆڕێکی تازەی کورد بە نیۆی"گەلی یە کتائینی کوردان" بڕیارنامەو، تڕاکتی بلاو کردەوە، وەدژی "سیاسەتی تونـــــدی" ئینگلیسیکان، دەنگی خۆیی دەربڕی لەوکاتە دا حاکمی سولەیمانێ تەوفیق‌وەهبی ڕەسمەن دژی هەل بژاردن دەنگی خۆیی دەربڕی ٨

وە پیاوە گەورەکانی سولەیمانی نوشتارێکی‌یان بە سازمانی .S.D.N دا لە ٢٨ ژوئیە وەلە ٣، ٢٠، ٣٠ی مانگی ئوتی١٩٣٠ شکلی حکومەتی کوردی ڕاگەیاندرا وە گوترا کە پیویستە ئەوحکومەتە لەژێر چاو (دێری پایەبەرزی S.D.N دابێ!

چاوپێ کەوتنی شازادە غازی لە ١٠ی ئوت‌دا، وەکاتی بڕیارنامەی دووژمنایەتی، ئەندامانی نوێنەری حکومەتی عەراق وە بەر جنێو دان دران. سەروکی وەزیرانی‌عەراق نوری سەعیدش مەترسی ڕی‌نشت‌و نوشتارێکی بلاوە

---

اس. د. ان کومەلی سازمانی‌بەریوەبەری دایمی. م. ر

کردەوە، وە بەوجورە دژی ئەوکارە دەیەویست تۆڵەی خۆیی بستێنێتەوە.

ئینجا کوردەکان لە لایەکی دیکەشەوە لەسەرووتەی ئینگلیس و عەراق پەڵپو بیانوویان گرت، وە نارەزامەندی خۆیان دەربڕی وە هەمان مەسەلەی ئوتونومی بە جوریکی دی داوا کراکە سەرئەنجام بە بڕینی هات‌و، چوی گەیشت! ٩

لە ٦ی سی‌پتامبری ١٩٣٠ ئەو کارە بەوجیگایە گەیشت کە دەبوو، بتۆقیٚ.

هیزی دەولەتی عەراقی لەسولەیمانی تەققەی لە خەلکی کردو، دەها قوربانی ئەستاند.

حکومەتی عەراقیٚ تەوفیق وەهبی لە سەرکار لابرد. وە لەگەل هێندیٚ ئیمزا لیٚدەرەکانێکی کەعەرزحالیان ئیمزا کردبوو لە بەندیخانە کرد،

وە حکومەتی بریتانیا کەلەکاتیک دا کە نەدەهیشت کە لە بەند کراوەکان هەڵوێست‌و، دەلیلی‌خویان بڵێن، ئەوانیشی تاوان بار دەکرد کە لە هەلستانی راپەرینەکەدا دەسیتان تیدا بووە وە سەرئەنجام لەو وەختەدا کە سازمانی ک.د.پ دەیەویست لەوکارەدا تاقی کرد نەوەیەک بکات، هەوڵ و کۆششی خەلک بە جیگایەک نەگەیشت.

## ٦ ـ هەڵستانی شیخ مەحمودلە (نوامبری١٩٣٠)

شیخ مەحمود ئەو کەرەتەش کاتی هەلستانەکەی جووان لەبەر چاوگرت‌و، وەسرنجی دەدایە: پاش دەرۆژ لەراپەرینی سولەیمانیٚ، نامەیەکی لە کمیسەری پایەبەرزی ئینگلیس لەبەغدایە، نووسی، وە دەنگی خوێیی دژی کارەساتەکەی کە عەرەبەکان لە سولەیمانیٚدا بەرێوەیان دەبرد، وە خەلکی بیٚسووچو، تاوانیان دەکوشت، دەربڕی وە گوتی جا چۆن بەو چەشنە ئاکارە نالەبارانەی کە عەرەبەکان لەگەڵ کوردەکان بە ڕێوەی دەبن، کوردو، عەرەب دەتوانن لە تەنشت یەکتر ژیان ڕابوێرن! بەراستی ئیوە تەنیا لایەن‌گری عەرەبەکانن.

بەشوێنی ئەوەدا شیخ‌مەحمود بە نیٚوی" نەتەوەی ئاریائی " داوای کرد کە گەلی کورد، لەعەرەب جوێبازبیٚ وە بوخوئی سەربەست و ئازاد بژی... وە لەژێر چاوەدێری ئینگلیس سەربەستی خوێی درێژە پیٚبدات" ! ١٠

ئینجا شیخ‌مەحمود لەپاشان سازمانێکی تازەی پیٚک هێنا، وەلە هەوەلی

مانگ ئوکتوبری ١٩٣٠دا عەرزوحالێکی بە چەشنی تۆمار نووسی. لەیەکیک لەو تومارانەدا، کە ٣٢کەس لە مرۆڤە سەرۆکە کوردەکان ئیمزایان کردبو، پایان گەیاند بوو، کە ئیمە دەمانەوێ کە حکومەتێکی جوێیازمان هەبێ،وە ئەویش لەژێر چەتری بەرگری حکومەتی بریتانیا، وە شیخ‌مەحمود ببێتە حاکمی تەواوی ناوچـــەی کوردستان.

وە لە تۆمارێکی دیکەش‌دا کە کوردەکان ئیمزایان کردبوو، نووسی‌بوویان کە "دەولەتی ئینگلیس دەبێ بە چاکی "زوولم و جۆری عەرەبەکان کە لە کوردەکان کراوە، وەبیر خۆیان بێننەوە" وە ئەوەشیان لە تومارەکەدا دووپاتە کردبۆوە کە کورد دەبێ سازمانێکی جودای هەبێ وە حوکم‌دارەکەشی شیخ مەحمودبێ، نەکە سی‌دی لە نوامبری ١٩٣٠ شیخ‌مەحمود، کارەکانـــی سەرراست بەرێوەدەبرد هیواداربوو کە ئەو سەراستیە، بێ‌گومان دەولەتی ئنگلیسی وادار دەکات کە دان بە ووتەی سازمانی/س.د./ن دابێنێ.

بەلام هێستا پاشکوێ شەڕی ئاژاژات ئاشکرا نەببوو، کە بە کـــوی گەویشتووە، وەبەکوی دەگات. پێویستە لێرە دا بە نامەیەکی کە بۆ کمیســـەری پایەبەرزی ئینگلیس لە بەغدایەدا نووسراوە سرنج بدەین: "هومێد وایە کە جیرانە کوردەکان پێکەوە چاکبن" وەشیخ مەحمود ڕاوتەدبیری ئەوەیە کـــە هەلستان‌و، راپەرینەکەی خۆیی لەگەل بزوتنەوەی کوردەکانی ئیران و تورکیە هاوکاپ بکات، وە یەک پارچەبێت. لەمانگی ژوئن‌ی ١٩٣١ لە کۆ بوونە وەیەک‌دا کە بالوێزی ئیڕان لەشاری قوس‌تەن‌تەنیەی پێک هینا بوو، نوشتارێکی بە بالویزی بریتانیا سێرکلێرک هاوتای خوئی تەسلیم کرد، بریتی لەوە بوو کە مەسەلەی شیخ مەحمود، دەبێ بە مەسەلەیەکی "زۆر گرنگ بزاندرێ". ١٢

ئینجا شیخ‌مەحمود هەولی دەدا کە بە هەرچونێک بێ قەولی یارمەتی لە شیخ ئەحمەدی بارزان وەرگرێ بەلام لەو مەبەستەدا پیرۆز.نەبوو! چونکە سەروکی بارزان دەی گوت کە شەڕ لەگەل دەولەتی عەراق کە نەتەوەیەکـــی موسولمانی عەرەبە، باش‌نیە،وە بە ئەرکی سەرشانی خوم دەزانم کە بۆوحکومەتە سەرشۆڕ کەمەوە"! ١٣

لە ٣٠ی ئوکتوبری ١٩٣٠ دا پولیسێک بەدەستی پێش‌مەرگەکانـــی شیخ‌مەحمود لە ١٥ کیلومتری سولەیمانیدا کوژرا، وە هەروەها لە ٣ی نوامبر

شاری‌پێنجوون لەلایەن٣٠٠پیاوی‌چەک‌داری کورد کەهێرشیان‌بوسەر شار هێنابوو، گیرا، ٤٠ پولیس لەوشارە زۆریان بەرگری کرد، وەتەنانەت هێزی هەوائی سەلەتەنەتی ئینگلیس‌ش پینجون بومباران کرد، تا پولیسەکان خوراگرن‌و، بەرگری بکەن.

سەروک و کاربەدەستەکان دژی ئەو شۆڕشەو، قەومانە زۆر ئاکارو کردە وەیەکیان نیشان نەدا، وە چاوەڕووانی سازمانی‌اس. د. ان بوون کە چون تەسمیم دەگرن‌و، ڕاوتەدبیریان‌چیە.

لەوبارەدا ڕاپورتی جۆربەجوردەدرا،کمیسەری پابەبەرزی ئینگلیس لە بە غدادا، داوخووازی کرد کە ئەگەر دەولەتی بریتانیا بە قازانجی کوردەکان دە ڕووانێتە ئەوکارە، تامنش ئی‌حتیات‌و، تەقیە لەدەس نەدەم، ئەگینە پیویستە بە دووای ئەوکارەدا بەوردی‌بروا کە بزانێ بەکوی دەگات. ١٤

لە دی‌سامبری ١٩٣٠ دا حکومەتی بریتانیای گەورە لەپێش هاوالیکی رەسمی خوێ‌دا، راپورتی کومەلی بەریوەبەری دائمی S.D.N ی‌پی‌گەیشت سەرئەنجام داوای سەروکە پایە بەرزەکانی کورد ــ دامەزراندنی حکومەتی کوردستان بوو لەژێر چاوەدیری‌و، فەرمانی S.D.N دا، بەلام ئەو داخووازە لەلایەن "حکومەتی پادشایەتی ئینگلیس، وە کاربەدەستەکانی نەسەلماندرا، وەدانیان بەسەردانەهینا. ١٥

## ٧ ــ ئاخرین شەڕ دژی شێخ‌مەحمود

بو دەولەتی عەراق هیچ شک‌وگومانێک نەمابوو، کە هەلویستی ئەوەبوو کە زۆرزوو دەبێ کاری شیخ‌مەحمود کۆتائی پێ‌بندری وە دژی وی‌ئاکاری نیزامی دەس پێ‌بکردرێ.

لە هەوەڵی مانگی فیوریيەی ١٩٣١دا شیخ مەحمود نامەیەکی بۆ کاپیتان هۆڵت، کمیسەری پایەبەرزی ئینگلیس لە ڕۆژهەڵات‌دا نارد کە لە تووانائی و نفوزی خۆئی کەڵک وەرگرێ وە لەو کارەدا نیۆنجی‌بێت. بەلام پاش شەڕی ئاوی‌بازیکا (٥ی ئاوریل‌ی ١٩٣١) لە مەلبەندی کیفری‌دا شەڕکەرەکان دەیانەویست "دەرسێکی توند) بە دووژمن‌بدەن، کە ناکام مانەوە، وەشیخ‌مەحمود چی‌بۆ

نەکرا .

بەدووای ئەو شەڕەدا شیخ‌مەحمود بۆ ئیران پەنای برد ، لە لای ڕۆژئاوای پێنجوونەوە ، نامەیەکی تازەی لەسەرڕا بۆ کمیسەری پایەبەرزی ئینگلیس لە٢٤ی ئاوریلی ١٩٣١دا نووسی ، وەتکای لیٚ کرد بوو کە کاربە دستیٚکی نهێنی بو ووت‌و ،وێژ لەبارەی خۆ بەدەستدانی‌خوێی بنێرێ . لە هەوەڵی مانگی مەی ١٩٣١ هێزی ئامادەی ئیران لە مەریوان (لەسەر داخووازی حکومەتی عەراق) کاری شیخ مەحمودی بێ‌ووچان کۆتائی پێ دینی . پاش سێ ڕۆژ ووت‌و ،وێژ لەشاری پێنجوون لەگەل کاپیتان هۆلت ، لە ١٣ی‌میٚ ١٩٣١ سەلماندیان کە شیخ مەحمود بگەڕێتەوە وە دەولەتی عەراق بۆ ژیانی لەوەی پاشی شیخ‌مەحمود جێگایەک لەبەر چاوبگری وە هەروەها کۆمەک‌و ، یارمەتیشی بکات .

سەرئەنجام شیخ‌مەحمود لەژێر چاوەدێری چەندسووار وە پۆلیسی عەراق بۆ شاری سولەیمانی‌یان هێناوە ،وە لەوێڕا لە ١٥ مە بە فڕۆکە بو اور ناردرا ، لەوی نەختێک لەمیوان‌خانەی ڕێی ئاسن ماوە ،پاشان بردیانە نزیک شاری ناسریە .

کمیسەری پایەبەرزی ئینگلیس لە هەواڵێک دا لە راپورتی خۆ ی‌دا نووسی بووی کە شیخ‌مەحمود دەیەوێ شەڕێکی قورسی گرێل‌لائی ، دەست پێ‌بکات ئەویش لە پائیزی سالی ١٩٣٠دا ،وە هەروەها نووسی بووی کە بە راستی سەرکەوتن بەسەر شیخ‌مەحمود دا کارێکی زۆر هونەربووە . [١٦]

شیخ مەحمود لە سالی ١٩٤٠دا ئۆلتی‌ماتومێکی‌دا گە بومەیدانی شەر بگەڕێتەوە : هومێدو ، ئاواتی وابوو کە وەک ئاخری شەڕی جیهانی هەوەل ئەوجارەش نەخشێک لەڕاپەڕینی کوردەکان‌دا کایە بکات ، وە لە جەنگەی شەری دووهەمی جیهانی‌دا لەگەل ئینگلیس دەس بەکاربێت .

ئینجا بەو بۆنەیەوە چاوپێ کەوتنێکی لەگەل ئیدموند لە فیورییەی ١٩٤٠دا لە دەفتەری کاری‌خۆئی لەبەغدایە کرد ، وە پێی گوت، "من ئێستا کە پیاوێکی پیرو ، گەڕاوەم وە ئاواتم ئەوەیە کە ماوەی عومرم لە هێمنی‌و ، ئەهوەنی‌دا ڕابوێرم " وە تکام ئەوەیە کە ڕێگابدەن بگەڕێمەوە سولەیمانی. بەشوێنی ئەوەدا بەرنامەیەکی زۆر درێژو ، پڕی لەپێش ئیدموند دانا ،وە گوتی دەیەوێ کە هێندی لەکوردەکان دژی شورەوی ئامادە بکات . (کمیتەی‌کوردانی شاری سولەیمانی دژی سوویەت ) هەولی دەدا کە لەگەل ڕووسەکان بەربەرەکانی بکات . بەلام ئیتر

ئینگلیس لە هیچلاوە، کاری بەشیخمەحمود نەمابوو، جا،چ بەراست،چ بەدرۆ،بێ کارێک بەرێوە بەرێ.

شیخمەحمود لەسالی ١٩٥٦ کوچی دووائی کرد، واتە دووسالپێش شۆڕشی عەراق کە حکومەتی مونارشی، واتە حکومەتی پادشایەتی هاشمیتێک برووخی،ئەو حکومەتەیکە بێووچان دژی (پادشایکوردستان) سەرسەختانە ئاکـــــارو کردەوەیدەکرد.

هێندێ لە کوردەکانی ئەو ڕۆژگارە دەڵێن کە ئینگلیس لایەنگری لە شیخ مەحمود دەکرد، وە بەڕاستی جارجار هەلیدە سووڕاندو، کایەی پێدەکردو، دەیگێڕا.

سەرئەنجام شیخمەحمود "لەسوروشتدا بیرەوەرێکی زۆر خراپی لەئینگلیس لەمێژوودا هەیەوە وجدانی لە لای ئەوانەوە نارەحەت بوو" وە ئەو،نمونەیەکە دژی ئاکارو کردەوەی نالەباری ئینگلیسە:

شیخ مەحمود بەڕاستی لەکاتی بەهەستهاتنی عەراقدا مرۆڤێکـــــی بەنێویو، ناسراوبوو، وە عەراقش ئاکارو کردەوەی وی لە کوردستان دالەبەر چاووە. بەڕاستی شیخمەحمود لەخەباتێکی دوورودرێژ قەت (نەحەساوە وە لە مێژوو دا بە کوردێکی خەباتگەر ناسراوە

## فه سلی ٧

### شێخ ئەحمەدی بارزان

شێخەکانی بارزان لە سەدەی١٩دا بەرەقیبی شیخەکانی شەمزینان دەناسران، بەلام زامی دەستی ئەوانیش بوون، دەگونجێ بلێن کە لەراستەقینەدا نەخشێکی سیاسیئەوتۆیان نەبووە. ئینجا لە سالی ١٩٠٩وە شورشی شیخ عەبدوسەلامی دووهەم دەستی پێکراوە، وە ئەوپیاوەلەسەرەتای سالی ١٩١٤ دا لە لایەن تورکەکانەوە لەدار درا.

براکەی بەهۆی ئەوەوە ناسراوە کە لە نوامبری ١٩١٩دا دوو ئەفسەری ئینگلیسی لەکاتی بزوتنەوەی بادینان‌دا کوشتووە.شیخ ئەحمەد کت‌وپڕ بوو بە دووژمنی بریتانیا و عەراق کە ئەو دوو دەولەتە قازنجیان هەمیشە پێکەوە بووە. ئینجا شیخ ئەحمەد لەلانی شێخایەتی‌و، مەزهەبێوە چەن شەڕێکی کردوە کە ئەویش ئینگلیسیکان بە سەریان دا سەپاندوە، کاتێک‌کە شەڕەکەیان دامرکاندوە، بۆخۆی‌و براکانی لەوولات دوورخراونەوە شەڕەکەلە سالی ١٩٣٤ دا کۆتاهی پێ‌هاتووە.

ناتووانین ئەوڕۆ ئەوەی بسەلمێنین کە شیخ ئەحمەدو، براکەی پتر لایەن‌گری مەسەلەی‌مەزهەب بووبن تەنانەت بەوەی گوناح‌بار کراوە کە ویستوویەتی مەزهەبی مەسیحی لە کوردستان‌دا رەواج پێ‌بدات،وە ئەو تاوانەشیان لەبەر ئەوەی پێ بەستووە کە رێگای بە خەلک داوە کە گوشتی بەرازی بخۆن‌و، خۆنە پارێزن.

شیخ ئەحمەد بەچەشنی باب‌و، باپیری خۆی لە لایەن خەلکی کوردی بارزانەوە لە حوڕمەت‌و، ڕێزیکی تایبەتی کەلک وەرگرتووە، عێل‌و، عەشیرەتی

بنەماڵەی شێخی بارزان
تاجالدین
عەبدەلا
شێخ عەبدوسەلام ١
عەبدورەحمان
شێخ مەحەممەد
شێخ بابو
مەلامستەفا
شێخ ئەحمەد
شێخ عەبدوسەلام ٢
١٩١٤ ؟١٨٨٥
مەسعود
١٩٤٦
ئیدریس
١٩٤٤
لوقمان
عەبەیدیلا
١٩٢٧
محمد خالد شیخ عوسمان

بارزان پێیان وابوو کە شیخ پیاوێکی گەورەی خودایە کە بۆ ڕا بەری هاتووە، وە تەنانەت پێشیان دەگوت خودای بارزان! ١

بەلام لە ڕاستەقینەدا مەبەستو، هۆی ڕاپەڕینی شیخ ئەحمەدی بارزان، پتر مەبەستو هەلوێستی سیاسی بووە، وەدەولەتی عەراقیش لەهەموو بابەتەوەگوێی خوی ئاخنیوەو، خویی مات کردوەو، بەسەر خۆی نەهێناوە.لە سەرئەوەشڕا عەراق لەگەل ئینگلیس دەیانەویست دەرفەتێکیان بۆ هەل کەوێ، کە بتووانن کارەساتێک بەسەر شیخ ئەحمەد بێنن‌و، سەرکوتی کەن.

لە ئاکام‌دا لە سالی ١٩٢٧ وە بوو کە شیخ ئەحمەد بەر هەلستی بۆ عەراق هێنا پێشێ! وە هەر لە ڕێ‌دەستی مەزهەبەوە کە خۆی بە پیاوێکی خوداناس زانیوە، بە ژیریو، وریائی هێزی خۆئی پەرە پێدەدا، وە لە مەلبەندی "ڕۆژئاوای ڕووکوچوک" واتە لەو ناوچەیەی کە عەراق دەیەویست دەستی بەسەر دابکێشێ بزوتنەوەی هەبوو. ٢

دەولەتی عەراق تاقمێکی سەرباز بە سەرۆکایەتی کمیسەرێکی پایە بەرزی عەراق وە بەڕابەرایەتی‌و، چاوەدێری ئەفسەرە ئنگلیسێکان ناردە سەر شیخ ئەحمەد کە بزانی ئایا داوای مافی ئیسلام[٣] دەکات، یان سەروسەودای ڕامیاری لەسەر دایە. بەلام هەرچێک‌بێ ئەوهێزە لە بی‌لیّ واتەلە چەن‌کیلومتری بارزان داماوە وە بو وەلاتی بارزان نەچۆ پێشێ.

**١ ــ شیخ ئەحمەد، وە ڕاپەڕینی ئاڕاڕات:**

چووارسال پاش، یانی لەسالی ١٩٣١دا شۆڕش گەیشتە کاتیکی گرنگ، بەو هێرشەی کە هیزی تورک هێنابوویە سەر کوماری ئارارات، وادیاربوو کە دەیەوێ کاری کوردەکان کۆتائی بێنێ وا تە تێکیان بشکێنێ. لە مانگی‌ژوئیە، وەلەمانگی ئوتی ١٩٣١ دا شیخ ئەحمەد تاقمێکی چەن‌سەد کەسی ناردە شەڕی ئارارات، وە لەونێوەش‌دا دەنگی خۆی[١] دژی دەولەتی تورکیە، وە دەلەتی عەراق دەربڕێ. ئینجا ئەو هاوارە لە بەرئەوەی بوو کە دەولەتی عەراق هێزی ئامادە نیزامی خوی بو ناوچەی بارزان بەڕیّ کردبوو.

لە بارەی ناردنی هێز لەلایەن شیخ ئەحمەدە وە بۆ ئارارات، بریتانیا دەنگی لە بەردەرنەهات، وە مەبەست بە بزوتنەوەی مەلەبەندی بارزانش گوتی کە شیخ ئەحمەد دەیەوێ مەزهەبیکی نوێ لەو ناوچەیەدا ڕەواج بدات!

ئەومەسەلەیە لەلای کار بەدەستێکی ئینگلیس لەعەراق دا لە پەڕتۆکێکی مێژووئی دا نووسرا بوو کە: لەمانگی ژوییەی ١٩٣١ دا شیخ ئەحمەد فەرمانی بە پیاوە لایەن گرەکانی خۆی دا بوو کە لە خواردنی گوشتی بەراز دا ئازادن، وە دەتووانن بی‌خون و، بی‌کەنە کەباب." ۴

هێندێ گومانیان ئەوە بوو کە تا وە دە رکەوتنی فەرمانی ١٩٣٢، دەولەتی عەراق دەیەوی تا سنـــوور ناوچەکە داگیر بکات. ئینجا وادیارە شیخ ئەحمەد کەم و، زۆر تا سالی ١٩٤٣ لە خەبات ڕانەوەستاوە، وە ئەوجار بەئاشکرائی دەنگی خوئی بو وەرگرتنی مافی‌نەتەوایەتی کورد دەربڕی. ۵

بەڕاستی دەبێ بگوترێ کە ئەوهەڵوێستە لەمێژوودا خراپ نووسراوە کە شیخ ئەحمەد مریدەکانی خۆ ی هیبنو تیزە کردوە! وە دەولەتی عەراق مەبەست بەوەی بەهەڵستان و، ڕاپەرینی شیخ‌ئەحمەدی گوتووە کە بزوتنەوەیەکی مەزهەبیە، بۆ ئەوەی کە بو جیگای‌دی بلاوە نەبێتەوە: بەتاییەت لـەسەر کـــوردە ناسیونالیستەکان ئەسەردانەنێ.

ئایا بەراستی دەبێ ڕابتەو، هات‌وچۆی شیخ ئەحمەد لەگەل بزوتنەوەی کوردە ناسیونالیستەکانی تورکیە چۆن بووبێ؟ ئایا دەبێ لەگەل کمیتـــەی خویبی‌بوون هات‌وچۆنی بووبێ؟

ئایا پێش ناردنی هێزی سالی ١٩٣١، هێزێکی دیکەی ناردوٚ؟ ئایا چۆن زاندراوە؟

سەرئەنجام ئەگەر وابووبێ، بۆچی شیخ‌ئەحمەد ووتەی‌یارمەتی دانی لەسالی ١٩٣٠دا ڕەد کردوٚتەوە، وە لەپاشان پاش سالێک سەلماندوویەتی کە کوردەکانی تورکیە یارمەتی بکات؟

بەلام هەمووی ئەوپرسیارانە بێ‌وەڵام ماونەوە.

## ٢ ـ ڕووبەڕووبوون لەگەل شیخ ڕەشیدی لوّلان

ئینجا ئاژاوە لە مەلبەندی برا دوّستەوە دڕستی پێکرا،وە لە نووامبری ١٩٣١دا لەبەینی برادوّستەکان‌و، بارزانیێکان بەرەنگاریێکی گەورە وەدی‌هات. "هەوال دەرێکی ڕامیاری نهێنی" ڕای گەیاند کە شیخ رەشیدی لولان پیاوێکی مەزهەبی‌فەناتیکە، وەجیران‌و، درلوسیّ‌کانی ڕەقیبی خوّی بەوە تاوان باردەکات کە بە سەروّکایەتی شیخ ئەحمەد دەیانەویّ "لەگەل ئاسووریەکان بوّ ئەوەی کە لەدەست موسولمانەکان خونی رزگار بکات،ببێتە یەک،جامەبەست بەوەیە کە دەیەویّ دژی ئەوکافرە دەس بە کاربێت. بەڕاستی شیخ ڕەشیدیان لـــەو داوەخست‌بوو وە لە ٢٦نووامبری ١٩٣١دا هێرشی بردە سەر شیخ ئەحمەد کە لەبەینی بەریّ. حکومەتی عەراقش کە لە مانگی‌مەی ١٩٣١دا لە چنگی شیخ مەحمود رزگاری ببوو، لیرەدا بیانووی وەدەست کەوت‌وە هەروەها بە بیانووی ئەوەی کە شیخ‌ئەحمەد بە کوردەکانی تورکیەی یارمەتی داوە،تەسمیمی گرت کە شیخ‌ئەحمدی بکوتیّ،وە هێرشیێکی گەورە بەرێتە سەر گوندی‌بێلە وە لـــەو کارەساتەش سودو،قازانجی سوروشتی‌و، ئەخلاقی وەرگریّ. ٧

## ٣ ـ هەوەلین شەڕدژی شیخ‌ئەحمەد (دی‌سامبری ١٩٣١)

هەوەلین شەڕ دژی ناوچەی شیخ ئەحمەد تووشی ناکامی بوو: تاقمێک لە هێزی عەراق کە بریتی‌بوون لە ٢توپ وە هێندێ چەکـی ڕەشاش،لە شەوی ٩ی دی‌سامبری ١٩٣١دا مەلبەندی بارزانیان گەماڕوّدا، ئەو تاقمە بە هیوابوو کە لەنەکاو پێش مەرگەکان غافل‌گیر بکات: بەلام بوّ خوّیان لەداوی ئەوان کەوتن، لەدژی ئەو هێرشەدا پارتیزانەکانی شیخ‌ئەحمەد، بەشیێکی زوّریان دیل‌و یەخسیرگرت،کەلە نیێوان‌دا قائم‌مەقامی بێلەی دەدیترا! بوّ دووارڕوّژیّ بەری‌بەیانی هێزی ئاسمانی سەلتـــەنەتی ئینگلیس ئاوائیێکانی بارزانی بومباران کرد!ئینجا شیخ‌ئەحمەد وەلامبەرێکی ئاشتی خووازی نارد،وە ڕای‌گەیاند کە

یەخسیرەکان ئازاددەکات.

### ٤ ـ دووهەمین شەڕ دژی شیخ ئەحمەد (فیورییەی ١٩٣٢)

سەرئەنجام حکومەتی عەراق بەو نەتیجەیە گەیشت کە کاری شیخئەحمەد کۆتائی بێنێت. لەمانگی ژانوییەی ١٩٣٢دا کە کمیسەری‌عالی بریتانیای داوا کرد کە مانوڕێکی ئاسمانی لە ناوچەی زێبار، ئاکراوە بارزان بەڕیوە بەری،وە عەراق هاوکات لەگەڵ ئەوە،ئاکاری نیزامی خوێ دەست پێدەکات[٨].. ئینجا بەبێ‌ئەوەی‌کە چاوەڕووانی تەواوبوونی زستانێ‌بکەن،هێرشێکی تازەیان لە٩ی‌فیورییەدا کرد،ئەوکەڕەتەش شکان! هێزی عەراق١٤کەسی کوژرا،٩ کەسی زامدار بوو، وە لە کوردەکانیش ٢٠کەس کوژران‌و، ٣٠کەسیان بریندار بوون. لە ئاکام‌دا حکومەتی عەراق ڕاو وتەدبیری هێنا سەر ئەوەی کە تا گەیشتنی بەهار لە ئاکاری نیزامی دەس هەڵگرێ.

### ٥ ـ سێهەمین شەڕ دژی‌شیخ ئەحمەد (مارسی ١٩٣٢)

لە ١٢ی مارسی١٩٣٢دا حکومەتی عەراق اولتی‌ماتۆمێکی بە شیخ‌ئەحمەد دا،وە ڕای‌گەیاند کە: دەولەت دەیەوێ ئیدارەیەکی کشوەری لەناوچەی بێلەدا، دامەزرێنی، وە بۆوکارە ٤٨ ساعەتی مۆڵەت دابوو.
شیخ ئەحمەد بەڵێنی بەو کارەنەدا. لە ١٥ی مارسی ١٩٣٢دا هێزێکی گەورە کە بریتی لە سووار(و، توپخانە و هێزی پۆلیس‌ش بوون وە هێزی ئاسمانی سەلتەنەتی ئینگلیس پشتووانی لێ دەکرد، هێرشی‌بردە سەر ناوچەی شیروان.
هێزی عەراق لە لایەن پێش مەرگەکانی شیخ ئەحمەدەوە هەڵبردران،وە دوو دەستەی شەڕکەری‌بارزانی لە ١٩ی‌مارس،وە ٣ی‌ئاوریل‌ی ١٩٣٢دا ٤٠٠ئی‌ستر کە بارگەوبنەی شەڕیان لێ بارکرابوون لەگەل هەموو زووقەواروسەربازەکاینان گەمارۆدا،بەلام لەلایەن هێزی ئاسمانیێوە رزگار دران" وە لە گەمارۆی کوردەکانیان هێنا دەرێ،تەنیا پیاوێکیان لێ کوژراو،چەن کە سی‌کیشیان لێ بریندار بوو. لەئاکاما کوردەکان لە لای شیاکانی‌لنیگ‌لە٦ی‌ئاوریل‌ی ١٩٣٢دا شکان،بەشوینی

ئەوەدا هێزی عەراق هێرشی بردە سەر ناوچەی ئاکراوە بەبێ ئەوەی کە تووشی بەرهەڵستێک بێ ناوچەی بارزانیان گرتوە.

## ٦ ـ لە قوڕێوە چوون ( ئاوریل ی ١٩٣٢)

سەرئەنجام پیرۆزیوسەرکەوتنی عەراق، پیروزیێکی راستەقینە نەبوو: شۆڕشگێرانی کورد تاکتیکی شەڕکەیان گۆڕی، واتە لەگەل رووبەرووبوونی هێزی گەورەی عەراق خۆیان دەپاراست، ئینجا ڕێبازی هێرش کەم کراوە. لەکاتێکدا کە هێزی پێشمەرگە لەسەر کێوەکان بوون وە بەباشی لەوێرا جولانەوەی هێزی عەراقیێکانیان جووان لەبەرچاو بوو، لەنەکاو زۆربەیان لێ دەدان، وەدەگەڕانەوە لای ناوچەی ڕووکوچک.

ئەوجار هێزی عاسمانی عەراق بە فەرمانی حکومەت لە ١١ی ئاوریلی ١٩٣٢دا داوای یارمەتی لە هێزی عاسمانی بریتانیای گەورە کرد. ئەوان بەشکوگومانەوە یارمەتی هێزی عاسمانی عەراقیاندا وە ناوچەی مازوریبالای بەڕاکێتان داگرت. لە ٢٩ی ئاوریل یەکێک لە ئاکاری هێزی عاسمانی شکاو، وە فروکەوانەکان ئەسیرکران

شیخ ئەحمەد ڕاوتەدبیری هێنا سەرەوەی کە شەڕەکەی ڕاوەستێنی وە بە قازانجی خۆی داوای تەقفە وەستاندن بکات وە دەیەویست کە شەڕ ڕاوەستان لە دەورووبەری لای راستی چومی رووکوچکبێ. وە عەراقیش بە هیوا بوو کە بەو تەقفە وەستاندنە، مۆلەتێک بەدەست بێنێ کە ڕێبازی هاتوچۆی کوردەکان لە ڕووکوچکدا ببەستێ، وە لە پردەکانیکی کە ئەوهاتو، چۆیێەی لەسەرە، چاوە دێری بکات، وە هەروەها لە ناوچەی بارزاندا لایەنگرانی شیخ ئەحمەدی گەمارۆ بدات، وە سەرئەنجام تا ئەوجێگایەی کە دەگاتەوە سنووری تورکەکان بگرێتەوە وە لە تورکەکان داوا بکات کە سنوری خۆیی لەو ناوچەیەدا بپارێزێ.

## ٧ ـ تەواو بوونی ئاکاری شەر لە (ژوئنی ١٩٣٢)دا

لە ٢٦مەی ١٩٣٢ هیزی عەراق هیرشیکی تازەی دژی شیخ ئەحمەد دەست

پێکرد ، کە دەگوترێ ئاخرین پەلامار بوو ئەو هێرشە کە لە ئاکاما ڕە سەرکەوت ، ئەوەش سەبارەت بەوە بوو کە هێندێ لە ئەفسەرەکانی ئنگلیزی کە سەرۆکی ئەوان بەنێوی ژێنێرال هیدلام بوو ،هاوبەشیان لە شەڕکە دا دەکرد . ٩

لەوشەڕەدا هێزی عاسمانی ئیگلیزیش نەخشێکی گرینگانەی هەبوو ،جیگای پارتیزانەکانی شیخ‌ئەحمەدی بۆمباران کرد وە بۆ سنوری تورکیا هەڵیان بڕین ، لە ئاکاما شیخ ئەحمەد ، چارەی نەماو بەخۆیو چوارسەد کەسەوە لە ٢١ ژوئن‌ی ١٩٣٢ پەنای بۆ تورکەکان برد : ١٠

شیخ ئەحمەدیان نارده شاری قوس‌تەن‌تەنیەەوە ، لەوێڕا بۆ ئیدرین دوور خراوە لەوکاتەدا حکومەتی تورکیا ١٠ پیاوی لە کوردەکانێ کە لە شوڕشی ئارارات‌دا بەشداریان کردبوو ،وە یارمەتیان دابوون وە لە دووای شەڕەکە پەنایان بو شیخ ئەحمەد هێنابوو ، لەدار د ا . ١١

بەوچەشنە جووڵانەوەی شیخ ئەحمەدی بارزانی دووائی هات ،وە لە دوولایان بەگوناح‌بار دەناسرا واتە هەم لە لای تورکەکان وە هەم لـــە لای عەراقێکانەوە و پێ‌یان‌کوت کە نابێ بەهیچ‌جۆریک بگەڕێتەوە بو ناوچەی بارزان . وە حەقی‌نیە کە بە هیچ چەشنێک لەبارەی شەڕەکەی دا قسان بکات و دەنگی دەرێت .

## ٨ ـ سەربزێوی و شۆڕشی مەحمەدسەدیق و مەلامستەفابارزانی

پاش دامرکانی ئەوشەڕە ،لەسەر ئەوەشڕا حکومەتی عەراق تووانائی ئەوەی نەبوو کە هێمنی‌و ئاشتی واتە (سولح و ئاشتی‌عەرەبی) لە کوردستان‌ی عەراق‌دا بەڕێوە بەرێ لە ئاخری سیپتامبری ١٩٣٢ مودیری ناوچەی شەمزینان لە تورکیە ،لە رەفیقی هاوتای خۆی لە ناوچەی مازوری بالادا داوخووازی کرد کە چاوپێ‌کەوتنێکیان لە سنوری تورکیا لە بیروخ ،سەبارەت بەوەی کە بازرانێکان لە کێوەکانی مانکولاوە وە جەنگەلەکانی ڕوبار ئەل حاجی بەگ‌دا سەربزێوێ دەکەن هەبێ" . ١٢

لە ئاخری ١٩٣٢ دا تورکەکان ، کوردەکانێکی کە لەگەل شیخ‌ئەحمەد پەنایان هێنابوو ئازاد کرد لەنێو ئەوانەدا موحەممەدسەدیق و مەلامستەفاش

لەگەل بوون ،کە ئەوانە هەموویان گەڕانەوە ناوچەی بارزان وە شەڕی گریلایان دەس پێکردەوە لە ٢٢ی دیسامبری ١٩٣٢ دا لە مێرگەسوور ڕووداوەیەک قەوما . وە لە مانگی مارسی ١٩٣٣ ئەو دووبرایە بەخۆیان و ٣٠٠ کەسەی شەرکەرەوە هیزی دەولەتیان تەنگاوکرد وە لەکاتیکدا هێزی حکومەتی عەراق کە دەچوو بۆلای ئاوایەکانی سنور، لە خاکی تورکەکاندا، لە جنوبی دەشتی گوواندا لە ٤٠ کیلومتری شمالی ڕۆژ ئاوای خاکی بارزان،دامەزرابوون .

ئینجا فەیسەل پادشای عەراق بەتایبەتی لە بالۆێزی تورکیا لە بەغدایەدا داخووازی کرد کە پێویستە دەولەتی تورکیا لەو کارەساتەدا هاوبەشی بکات ئەوکارە چەند مانگێک بێدەنگەی لێکرا وە تا ٨ی سیپتامبری ١٩٣٣ باسی لێ نەکراوە تورکەکان هیزیان لەو نانچەیە دانەبوو .

دەگونجێ بلێن کە ماوەی ٤٠سال خەباتەی بارزانیکان، بەتایبەت بەسەروکایەتی ژینیرال بارزانی مەلامستەفاو موحەد سەدیقی برای کە پاشان درێژەی پێدرا، لەوەی ڕا دەستیپێکـراوبەهێز بوو واتە بارزانیکان کاتیـک کە لە سالی ١٩٣٢ دا پەنایان بو تورکیەبرد، هێندیکیان ئەسلەحە لە ژێر خاکدا شاردبۆوە ،وە سەرەتای شەڕی دووایەی بارزانیکان هەر بەو چەک و ئەسلـەحەیـە بوو وە هێزی بارزانیکان لە بەهاری ١٩٣۴ دا ئامادەی شەربوون . ١٣

دەگوترێ بلێن کە هەرچەند ئەو دوو برایە کە لە هەوەلی سالی ١٩٣۴ دا کە لەوولات بو ناسریە دوور خرابوونەوە، بەلام هێستا هێمنی بۆ ناوچەی بارزان نەگەڕا بووە، چونکە لەناوچە کەدا خەلیل خوشەوی ئەفسەر وە یەکێک لە خزمەکانی نیزیکی بارزانی وە ئالۆ بەگ مامی دایکی تا سالـــی ١٩٣٦ (مانگیمارس) سەریان بودەولەت دانەنا ،وە لەنهێنی دا گویزقولاغ ببوون کە کاتیان بۆ هەلکەوێ وەدژی دەولەت هەلستنە سەرپێ . ١۴

## فه سلی ٨

### شۆڕشی دەرسیم

پاش سالی ١٩٣٢ کوردەکانی تورکیا لەلایەن حکومەتەوە زۆر لەفشار دابوون بەبێ‌روحمی تاوان بار دەکران‌و،نازەحەتیان دەکردن وە هەموویان لە تەنگەبەری دابوون،لەئاکاما دانشتو کوردەکان کەس نەی دەتووانی لە سنور نزیک بەبێ‌تەوە وە سنوور بە تەواوی بەسترابوو.

بەلی ئەو پرسیارانە دەهاتنە پێشێ کە ئایا دەها یا سەد،ان وە هەزار،ان کەس کە لە کوردەکان پاش جوولانەوەی ئارارات لە وەلات دوور خرابوونەوە ئێستا کەچەندیان ماون و لە چکاتێک‌دان؟ اوە ئایا جووڵانەوەی دیکە لە کوردستان لەو کاتەدا هە بووە؟ وە سازمانی بەرگری کوردەکان لەنهێنی‌دا پێک‌هات بوو؟ بەلێ ئەوانە پرسیارێک بوون کە بێ‌وەلام ماونەوە.

لە ئاگادارێک‌دا لەسالی ١٩٣٤ ڕاگە یاندرا کە حکومەتی تورکیا سەرلەشکر کەنعان‌پاشا کە فەرماندەی هێزی دیاربەکر بوو ناردە چەڕناک،وە لە مانگی ئوتی ١٩٣٤دا کێوەکانی کوردستان بو ماوەی ٨ ڕۆژ بومباران کرا، تا کوردەکان لە کێوەکان بێ‌نێتە دەرێ.ژێنیرال کەنعان‌پاشا هەروەها لە سالی ٣٥ ــ ١٩٣٤ لە مەعورە تول ئەزیر چەند کەسێک بۆ چاوترساندن لە داردراوە دەبی چاوە ڕووانی شورشی دەرسیم لە ١٩٣٧ دابکرێ کە تورکیە نە ی توانی بیشارێتە وە.

**١ ــ نەخشەی عابدین ئۆزمان بۆ گۆڕانی نەتەوەی کورد.**

بە شوێنی ئەوەدا چەن‌مانگ پاش، سەرسیخورو، پشکنێنەری ناوچەی

روژ هەلات پیاویکی رامیاری تورک بەنیوی عابدینئۆزمان بە دەولەتی ڕاگەیاند
کە ڕێبدات کە لە ناوچەی کوردستاندا بۆ گۆڕانی ئەو گەلە چارەسەرێکو،
نەخشەیەک بەرێوە ببردرێ.
دەولەتی تورکیە لەسالی ١٩٣٢دا لەکانگای دانشتگەی یاسائیدا ،سەلماند
بووی کە یاسای دژی کوردەکان لە ڕۆژهەلاتەوە بوروژئاوا بە ڕێوەبچێ. وە ئەو
نەخشتەیەو ،یاسایە بە تورکەکانی ڕێدەدا کەبێنە ناوچەی کوردستان ،وەجیگای
کوردەکان بگرنەوە وە لە ئاکامدا لە دەوروبەری بەحری وانو ،دەشتی مووشیدا
جیگیر بن ،وە هەروەها ڕێی ئاسن بکێشرێ وە ریگاکان قیلڕێژ بکرێن".
ئینجا بو ئەوەی کە کوردەکان لەسەر ڕێیوشوێنی خۆیان لابدەن، لە
بەرەوە گوتیان کە کوردەکان لە مندالی ڕا نابێ بەزمانی خویان قسەبکەنو،
زمان بکەنەوە، بەڵکو پێویستە بەزمانی تورکی بدوێن وە ئەوکارە دەبێ لەتەواوی
گوندو ،و لاتی کوردستاندا بەرێوە ببردرێ. سەرئەنجام عابدین ئوزمان پێش
نیاری کرد کە سیستمێکی قەزائی تایبەتی دابندرێ کە تەواوی عەشیرەتی ناسراو
لەژێرچەتری ئەو یاسایە دابن ،وە قازی تایبەت بوچارە سەرکردنو ،بەریوەبردنی
ئەوکارە لە هیچ شتێک دریغێ نەکا. [٣]

## ٢ ـ یاسای سالی ١٩٣٧

لە ئاخری سالی ١٩٣٧ حکومەتی تورکیە یاسای تایبەتی مەجلسیی
بەوچەشنە کە چاوەڕووانی دەکرا بەڕێوە برد : کاربەدەستانوئیدارەکانی کشوەری
حوکمیان نەما ،یاسای جەنگیبۆبەڕێوەبردنی حکومەتینیزامی :"کارتیسپی" درایە
دەستی نیزامیکان بۆ ئەوەی کە هەر کارێکی کە پێیان خۆشە ئەنجامی بدەن.
بەوجورە حوکمی مەرگی تەواوی عەشیرەتەکانو ،دانشتووی و لات ئیمزا
کرابوو.
تەعلیمی زمانی کوردی وە هەروەها هەموو زمانێکی خارجی جگە لە زمانی
تورکی لە ناوچەی کوردستان دا بەرگری لێکرا وە خوێندنەوەی هەموو پەرتوک و
نوشتارێک جگە لە کتێبی تورکی پێشی گیرا. [٤]
لە بەهاری ١٩٣٧ لە شاری دەرسیم ئەو ئاکارو کردەوەیە بە چەشنێکی

گرنگــتر بەڕێوە بردرا ، تەنانەت ڕۆژنامەی سونتیلیگراف کە لە قووستەنتەنیە دەردەچوو ،وە وەلایەنگری دەولەتبوو بۆ وەلاتی کوردستان دەهات ،مەبەست بە خەتایەکی چووک نەیان هێشت چاپکرێ وە لە ٢٣مەی١٩٣٧دا بەستــرا . سەرئەنجام مەسەلەی ئاژاوەو ، بزوتنەوەی ئەوکاتەش نەزاندراوە کە چۆنبۆوە وە سەروک و ڕابەریان کێ بووە ،واتە ئەوەش وەک شۆڕشی سالی ١٩٢٥ نەزاندراوە لەگشتدا سەروکەکان چکسانێک بوون .

## ٣ـ سەیدڕەزا (١٩٣٧ ـ ١٨٦٢)

پیاوە دیپلوماتەکانو ، ڕامیاریکانێکی کە لە پوستی ئیدارەی شاری ئانکارا دابوون ، کاتێک کە جووڵانەوەو ،ڕاپەڕینی دەرسیم دەستی پێکرا نەیاندەزانی کە ڕابەروسەرۆکەکەی کێیە هێندێک پێیان وابوو کە سەیدرەزا یەکیکە لــــە "سەروکیناوچە) واتە سەروکیکی مەزهەبی دەبێ ببێ .

٥ دوکتور نوری دەرسیمی تەنیا نووسەری، پەڕتۆکی دەرستیم ،کە بە دریژائی سالەکان لەگەل سەیدەرەزا ژیانی ڕا بووادردوە ،وەشانبەشانی وی خەباتی کردوە ، بەداخەوە زۆربەگە م‌وکوڕێ ئەو بەسەرهاتەی نووسیوە .

بە چەشنێکیکەدوکتور نوریٰ گێڕاوێتە وە ، و نووسیوێتی' سەید رەزا ، کوڕی سەید ئیبراهیم بووە کە ئەو پیاوە سەرۆک عەشیرەتی حەسەنانە کە لەڕۆژئاوای دەرسیمدا ژیاوە کە ئەو عەشیرەتە یەکێ لە هەرە عەشیرەتەکانی بە ناوبانگی ناوچەکە .

ووشەی "شیخ" لە نێو کوردە شیعەکانی دەرسیمدا بە "سەید" نێودە بردرا وە هەروەها لە نێو ئیرانو ، تورکدا بەهەردوک نێو ناسراوە؟

سەیدبرایم کە لە ئاوائی دەریئاهری ژیاوە، لە نیو خەلکی وولاتدا لەحوڕمەتو .ڕێزێکی تایبەتی کەلکی وەرگرتووە ،بە مروڤێکی ڕابەر ناسراوە .

ئینجا سەیدڕەزا یەکێک لە چووار کوڕانی سەیدبرایم بووە کە تەمەنی لەهەمووان چوکتر بووە . وە زۆر لە لای بابی خوشەویست بووە .

سەیدزەزا دەرسی زانایەتی و مەلایەتی لە لای مەحمیت عەلیئەفەند خوێندوە کە یەکێک بووە لە زانایانو ، مرۆڤیی مەزهیو ، بەنفوزی ناوچەکە .

ئەو زانایە کە سەید رەزای تەعلیم داوە، زۆر لە سەر وی ئەسەر و نفوز داناوە وە بە تایبەت لەمەسەلەی نەتەوایەتی وای گویی پڕ کردبوو کە هۆی دابووە.

پاش ئەوەی کە بابی کۆچی دووائی کرد، سەیدەرەزا مەبەست بە ووتەو، وەسییەتی بابی جێی گرتوتەوە،وە لە گوندی ئاغداد نشتە جێ بووە کە ئەو ئاواییە لە داوێنی کێوی تۆژیکە.

شەرحی حال سەیدەرەزا وا نیشان دەدا کە ئەو پیاوە ئاکاروکردەوە (،ڕێنی و شوینی تەواوی کوردایەتی لە سوروشت دا بووە" مرۆڤیک بووە خۆشخولق کە خزمەتی بەخەلکو، نەتەوەکە کردوە، خەڵکش سەبارەت بەوە حورمەتو،ڕێزێکی تایبەتیان بۆ گرتووە.

بەشوێنی شکانی شۆڕشی شیخ سەعید لەسالی ١٩٢٥، سەیدەرەزا بە پەنابەرە کوردەکان خزمەتی زور کردبو خەلکی لاواندبۆوە. ٦

نامەیەک کە لە ئارشیوی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیسەوەدەرخراوە، تەواوی ئەو ئاکارانەی کە لەسەرەوە گوترا دەسەلمێنێ وە دووپاتەی دەکاتەوە کە بەڕاستی سەیدرەزا مرۆڤیکی زانا و ڕووناک بیر بووە: لە بەیانییەکی کە ڕاپەرینەکەی دەرسیم بلاوی کردوتەوە،وا ئاشکرا بووە، کە سەیدرەزا مرۆڤیکی نەبەزەوڵە هیچشتیێک ترسی و باکی نەبووە. ٧

## ٤ ـ "مانی فیسْتی" سەیدەرەزا

لەمێژ ساڵە واتە بە درێژائی حکومەتی تورکەکان، لە و لاتی کوردستاندا کوردێک نەیتووانیوە کە روژنامەی بخوێنێتەوە وە بەزمانی کوردی زگماکی خری بخوێنیو، بنوسێ وە پەرتوکیک لەچاپبدات،وە یان بە زمانی خۆی ووتو،وێژ بکات. هەروەها خەڵکی کوردی وەلات بۆ ناوچەی ئاناتولی دوورخراوەتەوە کە بەراستی وەلاتێکی بێئاوە،وە زەویوزارەکانی بەکەلکی هیچنایە. ئینجا ئەوگەلە تاقمتاقم لەبەین چوون. لە ناوچەی دەرسیم دا حکومەت هەوڵی داوەو،تێکوشیوە کە بەهەر چۆنێک بێت (نفوزبکات) وە خەلکی لە چیۆتی و ناڕەحەتی دا بنێ وە زوڵم و ستەمیان زیاتر بە سەر داسەپێنێ. ئینجا لە بەرامبەرئەوهەموودژی و نالەباریدا تەنانەت لەوە لاتی دوورخراوەدا کوردەکان دەستیان داوەتە چەک،بۆ

ئەوەی کە وولاتەکەیان بپارێزن‌و، مافی بەشخواری خویان وەدەست خەنەوەو بەرگری لێبکەن. نمونەی ئەو بەرگری و هەلستانە، ڕاپەرینی ناوچەی ئارارات لە سالی ١٩٣٠، وە ناوچەی زیلان‌و، بایەزید بووە کە لەڕابردوودا دیتراوە.

هەرچەن ماوەی سێ‌مانگە شەڕێکی بی ئەمان‌و، نابەرانبەر لەو ناوچەیەدا دەستی پێکراوە، وە سەرۆکەکانی‌حکومەتی تورک بە بۆمبی ناپالم‌و، گازی سەممی وولاتی کوردستان بۆمباران دەکات، بەلام لەسەر ئەوکارە ساتەشڕا هێستا نەی‌توانیوە سەرکەوی، تەنانەت تووشی ناکامی‌و، شکانش بووە، لە بەرانبەر ئەو بەرگریو، ڕاوەستانەی ئێمەدا، فڕۆکەکانی تورک ئاوائی‌کان بومباران دەکاو، ژن‌و، مندالی بێ‌تاوان دەکوژێ‌و، ڕووحمی بەو نەتەوەچەوساوەیە نایە، وە خەلکی بێ‌سوچ و تاوان لە و لات دەردەکاو، دووردەخاتەوە.

بە ندیخانەکان تا قوڕقوڕۆچکە لە بەندێ کوردەکان پڕبووە. وە دەستەدەستە پیاوە ڕۆوناک بیرەکان تیرەباران دەکرێن و، لەدار دەدرێن.

سێ‌میلیون کورد کە لە تورکیەدا دەژین، مەبەستیان ئەوەیە کە بەزمانی خۆیان بخوێنن‌و، بنوسن، وە لە هێمنی و ئاشتی دابن، ئازادیان هەبێ داب و، روسم‌و، فەرهەنگ‌و، ڕەگەزی‌خۆی بپارێزێ. ئایا بەراستی کوردەکان کەداوای مافی بەشخووراوی خۆیان دەکەن، دەبێ لە کن‌ئێوە تاوان باربکرێن؟

دەبێ دەولەت بەسەر تەواوی ئەو ئاکارو ڕەوشتانە کە داوا دەکرێ دوائی پێ بێنی، تا ئەو گەلە نەجیبە لەژێر زولم‌وستەمی نەتەوایەتی بێتە دەرێ‌و، ڕزگار بێت.

"ئاغای وەزیر من لە ناخی دلەوە ئەوقسانە دەکەم، هیوا دارم ئی‌حساسات‌و، سروشتی دەروونی من سەبارەت بەوە بسەلمێندرێ‌وە قەبول‌بکرێ وئی‌تر...

ئیمزا ـ ژێنیڕال‌ایسمی دەرسیم ـ سەیدڕەزا

## ٥ ـ هەوەلین ئاژاوەی (١٩٣٦)

دوکتور دەرسیمی کە یەکێک لەخەبات گێڕەکان بووە، گێڕاوێتەوە کە هەوەلین شۆڕش لە سالی ١٩٣٦ دا کاتێک کە هێزی تورکەکان لەنێو شاری دەرسیم

کەدەیەویست لە هێندی جیگادا خۆپەرە پێبدات ، دەستی پێکرا .

بەشوێنی ئەوەدا سەیدرەزا بە سەرۆک عەشیرەتەکانێکی کە دەیانەویست دژی دەولەت بەرنگاری بکەن ڕایگەیاند کە ئامادەبن .

لە ڕۆژێکی سالی ١٩٣٦ذا کە دیاری‌نەکراوە ، چرۆژێکە سەیدرەزا لەگەل عەبدوولائالپ دوگان کە فەرماندەری ناوچەی ئەل عەزیز بوو ، چاوپێکەوتنێکی بە جێ هێنا . هەروەها سەیدرەزا لەوکاتە ناسکەدا ویستی کە دوکتور نوری دەرسیمی بۆ وەلاتی ئوروپایە بنێرێ ، تا بەوجورە لایەن‌گریو ، چاوەدێری جیهانی لە کوردەکان پتر بکرێ . ٨

ئینجا زوری پێنەچوو کە ژێنیرال ئالپ دوگان دەستی بەهان‌دان لەنیو عەشیرەتەکانی کورد دا کردوە پێی‌ڕاگەیاندن‌کەئیوەدەتوانن ٢٠٠٠٠٠ تفەنـــگ ئامادەبکەن .

هەڵبەت مەبەستی گوتنی لەو پێ‌ڕاگەیاندنە ئەوە بوو کە کوردەکان خۆبەخۆ بەرەنگاری یەکترین .

وە بەو چەشنە ڕاپەڕینەکە لەنێو بەرن ، ئەفسەرەکانی دیکەش ووتەی ئالپ دوگانیان سەلماندو ، ددانیان پێداهێنا .

بەشوێنی ئەو ئاکارو کردەوەدا ،تورکەکان لە دەرسیم سەربازخانەیەکی دیکەشیان دانا ، دانانی ئەو سەربازخانەیە بوو بە هۆی هەوەڵین بەرەنگاری : لە دوو لایانەوە بۆ چەک کردنی ئەو سەربازخانانە، کوردەکان دەست بەکار بوون .

هاوکات لەگەل ئەو ئامادەگیی کوردان ،سەیدەرەزا لە ژینیرال‌ئالپ دوگانی ویست کە ئاگادارێکی کە لە بابەت چەکەوە داوێتی بەتاڵی بکاتەوە وە لەشاری دەرسیم "ئیدارەیەکی ناوچەئــی کە قازانجی خەلکی کوردی لەبەر چاوبێ " بکاتەوە .

بەڵام وەلامی ئەو گوتەیەی زوّرزوو دراوە ، وە بە پێچەوانەی ئەو ،هەنگێکی لە هێزەکانی ژاندارمەری ناردە دەرسیم وە بەدووای‌وی‌دا هێزی ٩ی‌چەکدار لە سنووری دەرسیم سەنگەری لێدا . فرۆکەکان بەرۆژ دەسیان بەسووڕانەوەو ، ناسینی‌جیگاو ، پەناو پەسیوی کوردەکان کرد ،وە بە چەشنیکی زۆر دڕندانە ئاکاری خۆیان نیشان‌دا . بەلام بە هاتنی‌زستان کردەوەی نیزامی لەبەر سەرماوسۆڵ

کورتەی پێهاتو ،راوەستێندرا ،وە دەرسیم هەروەها لە حالەتی گەمارۆدانی سەربازانی تورک داماوە. ؟

## ٦ ـ مەبەستی فەوری ڕاپەڕینی ١٩٣٧

تووانەوەی بەفری سالی ١٩٣٧ ڕێدەستی بەوەدا کە تورەکان هیزی خۆیان بە بیانووی چەککردنی عەشیرەتەکان ئامادە بکەن، بەتایبەت لە ناوچەی مازژیرتدا. لە بەهاری ١٩٣٧دا، برائیبراهیم یەکێ لە کور ەکانی سەیدرەزا لە شاری هۆزات بۆ گفتو،گویەکی عادلانە لەگەل پیاوەکانی دەولەت لەستادی هێزی ناوەندی تورکەکان حازر بوو، ووتو، وێژ دەستی پێکرا برا ئبراهیم داوای کرد کە ئاکاری نیزامی ڕاوەستێندرێ بەلام لە گەڕانەوەدا لەقوژبنێکرا لە نەکاو ئەفسەرە تورکەکان ،لەگەل چەندکەسێک لە عێلی کورگان کە دەولەت خوواز بوون دەستڕیژی لێدەکەنو دەی کوژن. کوشتنی برائبراهیم سەرەتای دووژمنایەتی تازەی لە نێو کوردەکانی دەرسیمدا وەدی هێنا.

سەیدرەزا ناوچەی کوردەکانی کورگانی گەمارۆدا ،وە پیێڕاگەیاندن کە کوژراوەکان بدەنەوە ،وە هەروەها ئەو ئاکارە بێتاوان نامێنێتەوە ،وە ئەوکەسانەی کە ئەوکارەیان کردووە پێویستە بکوژرێنەوە وە دەولەتش کە دەیەوێ قاتلەکان خەلات بکات دەبی لەوکارە دەست هەلگرێ.

## ٧ ـ سەرکوت کردنی ڕاپەڕینەکە:

تورکەکان بە گورجی هێزیکی گەورە دنێرنــە ناوچەی شورش، واتە هیزی یارمەتی دەری تیپی٧ لە دیاربەکرەوە، شارەکانی ئورفا، سیرت، وان، ئەل عەزیز، دەگری وەتیپی٦دەچێتەئادەنا.

ئەو دوو هیزە گەورەیە کوردەکان هەلدەبڕن بۆلای جنوب ،وە مانۆڕێکی دەدەنو، بولای سنووری کوردی سووریە دەچن. لەوکاتەدا شیخعەبدورەحیم یەکی لە براکانی شیخسەعید کە لە ناوچەی پالو بوو، لەگەل تورکەکان تووشی شەر دەبێ ،وە دەکوژری، کوردەکان دەشکێن. ١٠

بەشوینی ئەوەدا تورکەکان بۆ سەرکوتکردنی کوردەکان دەچنە ئەرزەجام، هیزی عاسمانی بۆ لەنیّو بردنی سەیدرەزا ئاکاری درِندانەی خۆی دەست پیّدەکات، فرۆکەوانیّک بە نیّوی سابیحەگوکسین کە بە چەشنیکی زۆر دڕندانە ناوچەی دەرسیم بومباران دەکات!! بەوهویەوە "خەلات دەکریّ" وە بۆ هەوەلّین کەرِەت دەبی کە هیّزی تانک لەو شەرِەدا لەگەل فرِۆکەکان هاوکاری دەکەن.

## ٨ ــ ووتو،ویژ

سەرئەنجام سەیدەرەزا ئامادەگی خوی بۆ ووتو،ویژ لەگەل ژینرال ئالپدوگانی ڕادەگەیینیّ[١٢]

لەو ووتو،ویژەدا سەیدەرەزا لە سەرەتاوە گوتی، ئەگەر بیّتوو مافی نەتەوایەتی کورد بەچاکیوە بەرِیّز و حورمەتەوە، لەبەرچاوبیّتوە هەروەها لە دادگایەک دائەو کەنسانەی کە کورِەکەیان بیّگوناح کوشتووم محاکمەمە بکریّن، منش حازرم کە ئەفسەرو سەربازەکانیّکی بە دیلگِراونوە سازوبەرگ و شتمەکیّکی کە گرتومانە بیدەینەوە.

بەلام ژینیرال ئالپ دوگان داوای ٨٥٥٥٥ تفەنگی ماوزیّر لە سەیدرەزا دەکات وە سەیدرەزاش لە بەرانبەر ئەوداویەدا هیچشتیّک ناسەلمیّنیّ

## ٩ ــ نفوزی عەلیشیّرو، کوشتنیوی

مرۆڤیکی ئازاو، نەبەزو، بەڕاوتەدبیر،وە میّشکی بیرکەرەوەی نیزامی کورد، بە نیّوی عەلیشیر کە پیاویّکی زانا بوو، ناوبانگی هەبوو، وە دەگوترا کە تەواوی نەخشەی ئەو شەرِانە بەدەستیوی دەکیّشراو، بەرِیّوە دەچوو.

عەلیشیر لە ناوچەی عومرانی نزیکی کوشگیریّ، لەدایکبووە کە ئەویش وەک شیخڕەزا لەریّزەیعەشیرەتی حەسەنانە. لە مەدرەسەی سیواس دا خویّندوویەتی لەزەمانی سولتان عەبدوولحەمیددا هۆنەریّک بۆ کە هەل بەستی جووانی نەتەوایەتی دەگوت. پیاویّکی زانا خویّندوارو، ئەدیب بووە،پاشان بوّتە نووسەرو، ڕایزەنی مستەفابەگ سەرۆکی عەشیرەتی کوشگیریّ، وە پاش ئەوەیکە

ئەوبەگە لەلایەن حاکمی دەرسیمەوە لەدار دراوە،بەنێوی جێنشین وقەیوم ڕابەرایەتی بووە و کوڕی مستەفابەگی ڕابەری کردوە.

عەلیشیر کە نفوزێکی گەورەی لەنێو عەشیرەتی کۆشگیری دا هەبوو، دەیەویست کە یەکەتی لەنێو ئەوان‌دا بە هەست بێنێ.

بە شوینی ئەوە کە ڕووسەکان لەسالی ۱۹۱۷ دا لە ناوچەی تورکەکان پاشەکشەیان کرد، تورکەکان مەبەست بەوەی کە عەلیشیر نەخشێکی گەورەی لە ناوچەی لواسێک‌دا دەگێڕا بەومەبەستەی کە لە کاری دەرسیم‌دا خۆتێوەرنەدا، چاویان دەقووچاند، دەنگیان نەدەکرد.

بەلام بە پێچەوانەی هەلوێست و ،مەبەستی تورکەکان،عەلیشێر زۆر بەگرنگی خۆی لە ڕاپەرینەکەی دەرسیم وەردا وە لە هیچ چەشنە ئاکارێک کە بە قازانجی کوردەکان بێت،کۆتائی نەدەکرد وە بە ئاشکرائی بۆ سەرکەوتنی ئەوان تێدەکوشی.

لەسالی ۱۹۲۰دا بوو بە ئەندامی کوری "کوردستان تەعالی جەم عییەتی" لەشاری قوستەن‌تەنیەدا. وە هەروەها داوای‌کرد کە لکێک لەو کۆڕە لەشاری دەرسیم‌دا داندرێ.

لەسالی ۱۹۲۱دا عەرزحالێکی بە تێلێگرام بۆ دەولەت‌نارد کە دەیەوی لە کون‌فرانسی سێور دا Sevre بەشداری بکات.

ئینجا لەشۆڕشی ناوچەی کۆشگیرێ دا بە گرنگی هاوکاری دەکات. لەلایەن حکومەتەوە حوکمی کوشتنی وەدەردەکەوێ. بەلام خۆی رزگار دەکات‌و، هەلدێت

لەسالی ۱۹۳۷ دا عەلیشێر نەتەنیا هاوبەشی لەئاکاروکردەوەی‌نیزامی دەکرد،بەلکو لەڕێ‌دەستی هەمووچەشنە ئاکاری نووسین‌واتەلەڕێگای رامیاری‌و، ویژەوەرێوە،خەریکی خەبات بوو، وە هەل‌بەست‌و، ووتارو،مانی‌فیست‌ی دەنووسی وە لەخەلکی داوا دەکرد کە لە دەوروبەری سەیدرەزا کۆببنەوە.

لەمانگی ژوئن‌ێ ۱۹۳۷، سەیدرەزا داوای لێ‌کرد کە بۆ ئیران یان بۆ عەراق پەنا بەرێ وە لەوێ لەگەل پیاوە ڕامیارێکانی ئینگلیس‌یان فەرانسە چاوپێ کەوتنی هەبێ وە ڕابگەئینێ کە لەنێو کوردەکان‌ی تورکیە،وە دەولەت نێونجی بن‌و، چی‌دیکە نەیەلن ئەوبراکوژیە درێژەی پێ‌بدرێ.ئینجا هەر ئەوێ شەوێ کە دەیەویست ئەو سەفەرە بکات، بەهان دانی ژینرال ئالب دوگان لە ئەشکەوتی

ئاغداد دا کە ستادوکانگای ناوەندی کوردەکان بوو، بەدەستی نەوەی سەیدرەزا کە نیوّی ڕاەبەر دەبیّت دەکوژرێ ئەوکوڕە دەپیشدا بیلایەنی خوّی ڕادە گەینی، بەلام لەبنەوە لایەن گری تورکەکان بووە.

لەنیو چوونی عەلیشیر زوّربەیەکی زوّرگەورەی لە ڕاپەڕینی کوردەکان دەدا.

## ۱۰ ـ تەواو بوونی ئاکاری نیزامی

لە ئاخری ژوئنی ۱۹۳۷دا تەواوی خەڵکی شاری ئانکارا دەیان گوت کە ڕاپەڕینی دەرسیم پاش ئاخرین تاقم کە لە ۲۴ی ژوئندا بەرگری دەکرد، تەواو بووەوتێک شکاوە.

نەزاندراوە کە زەرەروزیانی ئەوشەڕە چەندە، بەلام پیاوە ڕامیارەکانی ڕوژئاوا گوتویانە کە هێزی عاسمانیو، ژاندارمری زیانێکی "گەورەیان" لیّکەوتووە.

خاوەنکارێکی دەوڵەتیّ کە لە دەرسیمڕا گە ڕابوّوە وەووتو، وێژیان لەگەل کردبوو، گیڕابوویەوەکەپیاوەڕامیاریکانی ئینگلیسلەئانکاراپێیانوابووکەژینیرال ئالبدوگان ئەوسال بەهیوای ئەوە نەبوو کە تەواوی ڕاپەرینەکەی کوردان تێک بشکینێ، وەدەرسیمی بگرێتەوە، دەیەویست بوّ سالیداهاتوو ئەو کارە بکات. ۱۴

پاش مەرگی عەلیشیر، کانگای بزوتنەوەی کوردەکان بوّلای ناوچەی بەختیار چوو بەلام تورکەکان لەو ناوچەیەشدا زوّر بەبیّڕووحمی کوردەکانیان دەکوتان، جەنگەڵیان لیّ ئاور تیّبەردەدان، وە سەروّکی ئەو ناوچەیەیان بە نیوّی شاهین کوشت.

لە دوّلی دیکسوردا چەن هەزار پیاو، ژنو، مندالی بیّسووچوتاوان کەپەنایان بوّ ئەشکەوتەکان بردبوو، تورکەکان زاری ئەشکەوتیان لیّگرتنو، ئاوریان تیّبەردان یەکێک لە کور ەکانی سەیدرەزا کە نیوّی حسین ڕەسیک بوو وە برینلدار بوو، دایکی دایە دەستی ئەفسەرێکی تورک کە بیباتە ئەلعەزیر ناسوّرەکانی دەرمان بکات، بەلام لەژێر ئەشکەنجەدا، لەنیو چوو لەونیوەدا عەشیرەتەکانی وەک قورەشەوە کورگان کە لەشەڕدا هاوبەشیان نەبوو، وە لایەنگری لە هیچ لایەک نەدەکرد، بەلام کوشت و کوشتاریان لیّ کراوە ڕووحمیان پیّ

نەکردن، ماڵو، منداڵیان بە، ئەخسیر دە گرتنو، دەیان کوشتن وە ماڵو، خانوویان ئاور تێ بەردەدان.

ئینجا لە جەنگەی شەڕو کوشت و بڕیندا جێگای سەیدڕەزا دەبیننەوە، هێزی عاسمانی بۆمبارانی دەکات، بەلام خۆ پەدەستەوە نادا، وە لە گەماڕو خوی رزگار دەکات وە بۆ لای ئواسێک هەڵدێ لەوبەینـــە کە سەدان کەس کوژرابوون کوڕانی سەیدەڕەزا و سێ نەوەی دەدیتران.

سەیدڕەزا کە بۆ شاری ئوئاسێک چوو بوو شارەکە لە لایەن تورکەکانەوە لەلای کوزولکاوەگەمارۆ درابووەرزگارکردنی ئەوشارەزۆر بەنرخبوو، بەلام سەدان کەسش لەوێ دەکوژرێکە لەنێوئەواندا (خێزانی چوکی سەیدرەزا وچەنکە سێکی دیکەش وە هە روەها کوڕەکانی و سێ نە وی لەنێو چوون.

## ١١ ـ گرتنی سەیدەڕەزا

سەرئەنجام سەیدرەزا بە چەشنیکی زۆر خراپ لەداو دەکەوێ. وەک کە کوردەکان گیراویانەتەوە، حاکمی ئەرزەنجام لە مانگی سیپتامبری ١٩٣٧دا ئاگادرایێکیدا کە حکومەتی تورک دەیەوێ بە داخووازەکانی کوردەکان دان دابینێ وە تەقە ڕاوەستێنێ. وە هەروەها ڕایگەیاندبوو کە زەرەروووزیانێکی کە لە خەلکی کورد کەوتووە، دەوڵەت دەیداتەوە. ئینجا سەیدرەزا بە بونەی ئەو ڕاگەیاندنەو، بەیان نامەیە کە لە لایەن حاکمی ئەرزەنجام درابوو بۆوتو، وێژ دێتە شاری ئەرزەنجام، کە دەس بەسەر دەکرێو، دەگیرێ (٥ی سیپتامبری ١٩٣٧) ئەوگرتنە کاتێکبوو کە لە کۆشکی ئوستانداری دێتە خووارێ.

سەیدەرەزاکاتێککە لەسەرپلەکانەکانی ئوستانداری دەهاتەخوارێ ئـــەو "ڕستەیە" دەلێ: ئەی حکومەتی تورکی درۆزنو، بێ شەڕەف، ئاوانا پیاونەدەم گرن."

لە کاتی محاکمەیدا لە ئەلعەزیر دەوڵەت هەوڵیدا کە بە سەیدرەزا "بســـەلمێنی" کە لە گەل دەولەتی شورەوی کەینو، بەینی بووە، وە یارمەتی چەک و ئەسلەحەو، سازوبەرگی نیزامی لێ وەرگرتووە، وە ئەفسەرانی سۆویەت لە نێویان دابوون، بەلام سەیدرەزا ئەوان وە درۆ دەخاتەوە وە دەنگی خو ی دەردەبڕێو، دەلێ من تەنیا پشتوانم گەلی کورد بووە، وە بە درێژائی سالەکانی

خەبات‌دا بۆ قازانجی بەرزی خەلکی کورد حەولم داوە لەدەرەوە کەلکم وەرنەگرتووە بەلام بە داخەوە ناکام ماوەتەوە!

لە ئاکام‌دا لە ١٤ی مانگی نووامبری ١٩٣٧ پاش چووارڕۆژ محاکەمە، هاوکات لەگەل ١٠ سەرۆکی کورد کە لە ڕاپەرینە کەدا هاوبەشیان کردبوو، لە١٨ی نووامبردا لەدار دران: کاتی لەداردان ئەوووتارە بەنرخانەی‌گوت‌بوو:

من ئەوکاتە ٧٥سالم لە تامەن ڕادەبریٚ، وە تا ساتێکی دیکە دەچمە لای شەهیدانی دیکەی کوردستان هەروەک ئاگاتان لێیە، بزوتنەوەکەی دەرسیم‌شکا، بەلام کوردوکوردستان هەروەها لەسەر پێیٚ‌خۆی‌ڕاوەستاوە، ژیانی‌خۆی‌ڕادەبۆێرێ وە هەرگزوهەرگز نامریٚ، گەنجەکان بە هیچ چەشنێک نایەلّن ئەوبزوتنەوەیە بکووژێتەوە، ئەوان تۆلّەی من دەستێننەوە، بژی‌کوردو، کوردستان، بڕووخێ دەزگای زالمان‌و، ستەم‌کاران، نفرین‌بۆوان.[15] هاوکات لەگەل سەیدرەزا، سەیدحسین سەرۆکی عەشیرەتی‌قوژەیشی وە سەرۆکی عێلی‌یوسفیان عەلی‌ئاغا، وە سێ سەرۆک عەشیرەتی دیکە لە داردران چووار سەرۆکی دیکە "مەبەست بە تەمەنی زۆریان" بە سی ٣٠ سال زندان‌ی سزەمەرگی، وە ٣٣کەسی دیکە لە کوردەکان بە زیندانی دوورو، درێژ مەحکوم کران، تەنیا ١٤کەس ئازادکران. لە ١٩ی مانگی نووامبری ١٩٣٧ کۆڕێکی مەزهەبی لە مزگەوتی کوردان لەشاری دمشەق بەبۆنەی شەهید بوونی ئەو قارەمانانە مەجلسی دانا وە یادی لێ‌کردن.

شورشی دەرسیم بە داخەوە لە لایەن مێژوونووسەکان زۆر بەچاکی ڕوون نەبۆتەوە. تەنیا لەو دووایەدا لە لایەن عسمەت‌ئی‌نی‌نۆ لە دانشتگەی تورکیەدا بەوجورە باسی لێکراوە کە: لەوشەڕەدا لە ئێمە ئەفسەریک وە ٢٨ سەرباز کوژران، وە ٥٠کەس بریندار بوون. لە کوردەکان ٢٦٥ کەس کوژران وە ٢٠کەس زامـــدار بوون، وە ٨٤٩ کەس خۆیان بەدەستەوە دان.[16]

بەلام لە ئانکارا لە سەر زاران بوو، کە ئاکاری نیزامی دەرسیم زۆر گەورە بووە. بە گوتنی سەرچاوەکانی هەوال دەری کورد کە ڕاگەیاندراوە، ژمارەی قوربانێکان‌ی شەڕ لە ٤٠٠٠٠کەس پتر بووە. پاش ئەو شەڕە خەم بـــاری‌و، بێ‌دەنگی‌وماتی لەسەرڕا سەرتاسەری کوردستانی تورکیەی داگرت. لە ماوەی ٢٠سالی ڕەبەق، تورکەکان کوشت‌و، کوشتاریان لە کوردەکان کرد. لە سالی ١٩٢٥ تا ١٩٣٧ کە ڕاپەرین لە کوردستان‌دا بەردەوام‌بوو، لە تەواوی سەرۆکەکانی کورد

کە بزوتنەکەیان ڕا بەری دەکرد ، تەنیا ئحسان نوری‌پاشا نەکوژرا ،دەنا تەواوی سەرۆکە کوردەکان ،یان لەشەڕدا کوژران ، وەیان لەدار دران. هێندێ لەو سەرۆکانە لەلایەن بێگانەکانەوە هاندرانبوو.

لەئاکامدا کاتێک کە ئەو قارەمانانە لەنێو دەچوون ،پەردەیەکی ئەستوری تەم‌وغەم بەسەر تەواوی و لاتی کوردستاندا دەکێشرا ،وە حکومەت نەیدەهێشت ووستە لەبەر خەلکی کورد دەرێ"

# فەسلی ١

## ١ ـ هەوەڵین‌شۆڕشی‌بارزان ، وە بەهەست‌هاتنی خیزبەکان (١٩٤٥ ـ ١٩٤٣)

ماوەیەکی زوری پێ‌دەوێ کە نەتەوەیەکی زیندوو کە لەلایەن قودرەت مەندێکی دەرەوە بە زنجیر کێشرابێ ،خوی ڕزگاربکات ئینجا ئەو نەتەوەیە دەبێ بەتەواوی هێزوتوانائی خویەوە،هەوڵ بدات کە دژی دوژمن‌ی دەرەوە خەبات بکات

بەراستی ژیانی ناوخوێ فەلەج بووە،وە ناتووانی ئازادی کومەلایەتی خو ی رەنێوبێنێ

ک ــ م

پاش شکانی ڕاپەڕینی دەرسیم وە هەروەها لە پێش ـــ تیک‌چوونی "کوماری‌کوردی‌ئارارات" لە کوردستان‌ی تورکیەدا کە بەڕاستی ئیشتباهات‌و، هەڵەیان زور بوو ، ماوەیەک بزوتنەو،راپەرین دەمێنێتەوە. ئینجا تەواوی سەروکە مەزهەبێکان ،وە یان ڕابەرە ڕامیارێکان ،یان لەشەڕ دا کوژران یان لەدار دران‌و، تیرەباران کران[١]،وە هەروەها کوڕەکانی گەنج‌و، لاوان‌و،رووناک‌بیران کە بە نوبەی خویان نەخشێکی گەورەیان لە ڕاپەرینەکان‌دا دەگیرا ،ئەوانیش یان لەدار دران ، یان نەمان ،وە یان لەژێر چو پوکەدا مانەوەو، بەگرینگی چاوەدێریان لێ‌کرا .

لە ئاکام‌دا دەبوو ماوەی ٢٥سال‌درێژەی هەبێ،تاکو نەسل و بەرەبابێکی دیکە، بتوانێ، بنکەو، نبەڕەتی کادری کومەلایەتی کوردستان‌ی تورکیە لەسەرڕا دامەزرینێ ،وە خویی لە گێژەلووکەو،گێژاو ڕزگار بکات‌و،نەیەڵێ بخنکــــێ، پەلەقاژەی بکات‌و، وەمەلەبکەوی،واتە لە خەوێکی کە نزیک بەمەرگ‌ونەمان بوو ،

ڕاپەڕیْ و هەلستیْ.

لە کوردستان‌ی عەراق و ئیْران‌دا کە کوردەکان بوْ ئازادی‌و،سەربەستی خەباتیان دریْژە پیْدەدا، سەرئەنجام وا ڕوون‌دەبوْوە کە کەم‌و،زوْر خیزبەکانی رامیاری بەرە و ئدئیولوژی مارکسیستی دەڕوْن. بەلام لەوکات‌وسەردەمەدا پیاویْک وەدەردە کە ویْ کە ماوەی ٣٠ساڵیْ‌ڕەبەق لە مەیدانی ڕامیاری‌دا ئەسپی خوی لینگ‌دەداوە کاروباری حیزبەکان کە ئەوە دەهات بە هەست‌بیْ‌و،خوی‌بگریْ لەمەترسی‌و، خەتەر باویْ.

لەشاری سولەیمانیْ کە نیْوە رووکەی بڵیْسەی ناسیونالیسم‌ی کورد بوو، لەسەرەتاوە واتە لە پیْش شەڕی هەوەڵیْ جیهانی‌دا لە پیاوە ئاگادارەکان‌و، وورياوزیرەکان کە هەروەها کە گوتمان،نیْویان زوْر بەزەحمەت ناسراوە،ئەو ڕاپەڕینە هەربووەو، دریْژەی پیْدراوە،وە سەرئەنجام چەن تاقمی جور بەجور لەچەند دەستەو،کوْڕدا ڕیْکەوتوونووو،پارتیان‌پیْک‌هیْناوە وە یان سازمانیان دروست کردوە.

## "برایەتی"

لەساڵی ١٩٣٧ دوو سازمان کە دەبنە دووبەش،بەنیْوی کـــــوردە نەتەوەپەرستەکان خوْیان وەدەر دەخەن.

کوْمەڵیْ (برایەتی،لەلایەن شیخ لەتیف کە یەکیْ لە کوڕەکانـــی شیخ‌مەحمود بوو داندرا،کە لەسەر ئاکارو، ڕەوشتی کوردەکانی کوْمەڵــــی قوس‌تەن‌تەنیە دەبزووتەوە.ئەوکومەڵە بەتايبەت لە مرۆڤە بەناوبانگەکانی بوورژوای کورد بەهەست‌هاتبوو کە بریتی‌بوون:لە محەممەدسەدیق شاویس (بابی نوری شاویس) سمایل حەقی شاویس (مامی) وە مەلا ئەسەد،مەلای سولەیمانیْ.

ئەو تاقمە ڕووناک‌بیرە دەیەویست نخشیْکی گەورە کایەبکات،چوونکە یەکیْک لە برا سەرۆکەکانی کوردکەبو سولەیمانیْ دوور خرابوْوە ــ وە مە لامستەفـــــای بارزانی‌بوو ــ لـــە کوْبوونەوەی ئەوان‌دا بەنهیْنی هاوبەشی دەکرد.[٢٠]

پاش ئەوەی کە مەلامستەفا تەواوی فرْوفیْلی شەڕیْ لە کیْوەکانی بارزان‌دا لەتەنشت براکەی شیخ‌ئەحمەد فیْر بوو،هەر ئەو پیاوەبوو کە ماوەی ٣٠ساڵ لەگەڵ

پیاوه بوورژواکانی کورد لە مەیدانی سیاسەت‌دا ،لە"پێ‌تەختی کوردستان"دا ، واتە شاری رووناک بیرەکان‌ی عەراق ڕا چ بەنهێنیو،چبە ئاشکرائی دەستی پێ‌کردو، درێژەی پێ‌دا .

## سازمانی"دارکر"

بەلام "برایەتی" کۆمەلێک بوو کە لەکوردە ناسیونالیستەکانی بەنێوبانگی کورد پێک‌هات‌بوو، لەنێو ئەوان‌دا تاقمی گەنجە خەبات گەرەکانی کورد کە سەر بەحیزبی کومونیستی عەراق‌بوو، وە ئەو حیزبەش لە سالی ١٩٣۴وە بنەڕەتە و پایەی داندرابوو،نفوزی زۆر کردبوو،وە ئیتربۆ "ڕیفورمیستەکانی تاقمی بەغدا" ڕێ‌دەستێک نەبووو، جیگایەکیان بۆ نەمابووە. ٣

لەسالی ١٩٣٨ دا گەنجەکانی شاری سولەیمانێ کەلەتەمەن‌و ،ئدیئولوژی ئەوکوڕەیان دەکۆلێوە ،کۆمەلیکیان لەنێو برایەتی‌دا بە "هەست" هینا کە بە ئاشکرائی دیاربوو،وە ئەویش‌نێوی"ئازادی‌کورد" بوو کەئەوانیش سازمانی سی‌هەمیان بەهەست هیناو، بەنێوی سازمانی"دارکر"بەچەشنی‌نهێنی، واتە کاربوناری‌هەولی‌دەدا[١]

دامەزرینەرەکانی ئەو کۆمەلەیە نوری‌شاویس،ئەندامی‌سیاسی‌داهاتووی بارزان،یونس‌رەئوف،هونەرێکی کورد کەنوسەری هونراوەی مارشی ئەی‌رقیب،بە، کە لە پاشان بوو بە ئەندامی حیزبی‌کومونیستی‌عەراق وە عەبدوول لا تەوفیق جوهەر بوون،بەلام ئەندامی دووائی چوون یەکێ لە ئەندامەکانی "برایەتی" بوو وەدەریان‌نا .

"دارکر" ئەندامانی خۆی لە گەنجە رووناک بیرەکان‌ی کورد پێک هینا ــ لە نێو ئەوان‌دا ڕۆستەم جەبباری‌وەکیلی هەولێر بوو،وە مستەفا ئوزەری،کە خاوەن‌کارێکی ئیداری وە خەلکی هەولێر بوو،وە لە پاشان‌بوو بە قازی‌و، حاکم ،وە کە لەبالێ‌چەپی حیزب‌دا بوو،نێودەبردرێ.

---

١) کاربوناری: نیوی تاقمیکی‌رامیاری نهێنی‌بووەکەلەسەدەی١٩دا لەولاتی ئیتالیاپیک‌هات ،بو شارەزائی وتەدبیری‌ئازادی‌خووازان . م ــ ر

١) ئەی‌رەقیب هەرماوە قەومی‌کورد زبان- نای‌شکینی دانەی تۆپی زمان کەس‌نەلی کورد مردوە ، کوردزیندوە ....
لاوی کوردی حازرو ئامادەیە گیان فدایەگیان فدایا ، گیان‌فدان م ــ ر

ئاکارو کردەوە،بەرنامەی ئەو تاقمە پتر لە نەتەوایەتی لایەن گــری دەکرد،وە بۆ وەدەس‌خستنی مافی نەتەوایەتی واتە ئۆتۆنۆمی کوردستان‌ی عەراق وە هەروەها بۆ مافی گشتی نەتەوایەتی واتەئیستقلال تێ‌دەکوشی ــ وە هەروەها کەمێک لە حیزبی کومونیستی عەراق‌دا رخنەی کردبوو،بەلام وازی ئدئیولوژیکی زۆر ڕوون نەبوو: "ئێمە دژی فاشیسم‌و، هیتلیر خەبات دەکەین وە بۆ دیموکراسی تێ‌وەکوشین وە هەروەها دژی ئمپریالیسم وە بەتایبەت دژی بریتانیا خەبات دەکەین." ۴

لەوکاتەدا حیزبی کومونیستی عەراق لە چەند فاکتان‌دا بەش بەش بوو، دەیەویست دژی ئەو ئەندامانەی کەڕێبازیان‌ڕوون‌نەبوو‌وە خەبات بکەن!

لە ئاکام‌دا هەر چونێک بێ "دارکر" لکوپۆکی کردو،بۆ دەرەوەی سولەیمانێ چوو،بە وەلاتان‌دا بلاوبوۆوە، وە لە سالی ۱۹۴۰دا بە نهێنی لە شاری هەولێر، خانەقین،بەغدا،وە موسل خەریکی بزوتنەوەو،کارو باری خەبات بوون.

## ۱ ــ پێک هاتنی "هیوا"

لەسالی ۱۹۴۱ پاش شۆڕش رەشیدعالی (ئاوریل ــ مەی ۱۹۴۱) وە پە یوەندی رە فیق حیلمی بە سازمانی دارکر، کاربە دەستانی جوربە جوری کومە لایەتی کوردلە کۆبوونە وەیە ک دا، ڕاو، تە دبیریان هێناسەرئەوەی کە لە ژێرچاوە دێری حیزبێک دابە نێوی"هیوا" یە ک بگرن، وە تە واوی میلشیای کوردلە وحیز بە دایەک گرتووبن: ڕووناک بیرەکان، ئە نـدامانی زانستگە وە کرێکارانی نەفت‌لە کە رکوک و، لە ڕێگای ئاسن دا، جوتیاران وە هە روەهائە فسە ران کە لە داها توودا دە توانن‌نە خشێکی گە ورە بە دە ستە وە بگرن و،هاوبە ش‌بن.

حیزبی تازە کە کانگای لە دە رە وەی کوردستان ــ بە عذا ــ وە لکەکانی لە شارە کانی دیکەی کوردستان، کەرکوک، هەولیر، سولە یمانێ‌وە‌بە هەست‌ها تبوو. بە شوێنی ئەوە داگۆقارێکیان بە نێوی(ئازادی) لە چاپ دالە و گۆقارەدا، داواکرابو و کە پارتــی کومونیستــی عراق وەهە روەها ئە ندامانــی باڵی چــە پی

هیواش نزیـک ببنەوە.

نە خشی بنە ڕە تی "هیوا" لە پێش هە مووشتێک یارمە تی دان بە هەڵاتنـی مە لامسنە فالە شاری سولە یمانیٚ لە سالی ١٩٤٣ بوو، وە بە دووای و ی دا نەخشەی گرنک ئە وە بووکە پیٚکها تنی (کومەڵەی ژ ـ ک) لەشاری مهابادی ئیٚران دانەخش بگریٚ.

لە ماوەی پترلە٦ سال، مە لامستە فابارزانی، واتە لە سالی ١٩٣٦ وە، لەپاش ئە وەی کە چە ندمانگیٚک لە گە ل شیٚخ ئە حمەد وەخا وخیٚزانی لە شاری ناسریە بوو، وە گە ڕابووە سولە یمانیٚ، دە ست بە سە ربوو، وە بە گرنگی چاوە دیٚری لیٚدە کرا.

لە وکات وساتەدا، بە عذابە نگرسی، هیٚندیٚ بە رئاواڵەئی بە خە ڵک دابوو ئینجالە شەڕی جیهانی دووەم دانرخی شتوومەک وخو واردنە مە نی لە عراق‌دا، دە بە رانبە ر چووبۆسە ریٚ.

دە ولە تی‌عراق لە هەواڵیٚکی تایبە تی دا ڕای گە یاند کە مە بە ستی تیٚ هەڵ هەڵ چونی ئە ونرخانە، مە سە لەی مالیات وە بە دی هاتنی شە ڕی جیهانی وە ئاڵۆزی وولاتە. ٥

هە ڵویٚست لەو وە ختە عاستە مە دا جوربە جوربوو، بۆهە موو مرۆڤیک بە تایبە ت بۆئە وپیا وانەی کە لە مە لامستەفانزیک بوون ،بە چاکی ڕوون ببۆوە کە بیٚ گومان بارزانی لە ڕۆژیٚک دە گە ڕیٚ کە هە ل ومە رجی بۆهە ل کەویٚ. بە لام لە براکەی شیٚخ ئە حمە د تە قیەی دە کرد. ٦

سە رئە نجام ئە وەی کە ئاواتی بوو، بە دی هات و، بە سە رهات بە دووی خوٚ ی داکیٚشای

## ٢ـ هە ڵاتنی‌بارزانی لە ١٣ ژوئیەی ١٩٤٣

لە وکاتە دا مە لامستەفا لە تە مە نی ٤٠ سال ژا برد بوو... بۆپیا ویٚکی کە

له وازی ژیانێکی تاڵ و، ناخوش داژیاوه، ئه ویش له به ینی مه رگ و ژیان دا، ئیتر هیچ پرسیارێک و، مه بەستێک نامێ نێتەوه، که لێی بکرێ هه روەهاله باری رامیاریوه ئه و، وەخت ، ده رفه ت ، زۆرباش هاتبۆ پێشێ – پاش شۆڕش ڕه شید عالی، به ین عراق و ئنگلیس ناخۆشی له نێودابوو وه تا سه رکه وتنی سالی ١٩٤٣ قودڕەتی گه ورەی ده زگای ئینتێلی جینت سێروس ی عراق ته نیابۆسەر که وتنی خۆی هه وڵی ده دا،[٧] لێره دائینگلیس کارتی گه ورەی کایه کردن لەگەل کوردان ڕوو کرد.[٨] وبه تایبه ت نه خشی به شداری کوردان له نێوهێزی ئنگلیس به ڕێوه ده بردرێ .به وجوره ئیدی ده وله تی عراق له شمال داله نێوکوردەکان توانایه کی ئه و تۆ ی نه ما بوو. یارمەتیله لایەن شێخ له تیف له سولەیمانێ که ١٠ ڕوژی خایاند وه هه روەها هه ڵاتنی مه لامسته فا " ژینرال مسته فای دوازۆژی کورد " له ١٣ ی مانگی ژوییەی ١٩٤٣ وه چوون وگەڕانەوەی ئەو بو وڵاتی بارزان ،وه هەروەها بەشوێنی هاتنی ئەو بۆلای ئێران ،ئەوانه هەموو کارەساتێک بوون کەیەک به دووای یەکێدا وەدی دەهات.

### ٣ ــ هەوەڵین گفتوگۆ

ئینجا بارزانی بۆ ناوچەیەک هەڵاتو، پەنایبرد که بەچاکی شارەزابوو ،وه مەڵ بەندەکەی دەناسی: لەو جێگایه بوو کەلەساله کانی ١٩٣٤ –١٩٣٠ – ١٩٣١دا، لەبەینی ڕووکوچوک ،شەمزینان وه سنووری تورکیەدا دژی هیزی عەراق شەڕی کردبوو ،وه تێکی شکاندبوون.

بەڵێ بارزانی لەهەوەڵەوه لەبەرانبەر چێوتیو، نالەباریدا، لەمپەری راگرتو، ڕاوەستا.[٩] دیپلوماتێکی ڕامیاری ئینگلیس لەبارەی مەلامستەفادا گوتویەتی: هێزو، توانائی بەدەست هێنا، لەوەڵاتدا داوخووازی ڕیفورم بوو. لــــه بڕیارنامەیەکدا، که بڵاوی کردبۆوه، داوای ئەوەی کردبوو که دەست بداته دەستی ئیمە ،وه لەگەڵمان ڕێککەوێ.

بەهەستهاتنی پارتیدیموکراتی کوردستان له کاتوساتێکی عاستەم

دابوو: دێیەکان چۆڵ ببوون و،کەسی تێدا نەمابوو،بەشی زۆری وێران ببون،[١٠] لەتەواوی ناوچەکان ئاسەوارێک لەخوێندن و، خویندەواری نەبوو، قات و،قڕی بەرادەیەک گشتبوو کە خەڵکی زۆر لە مەترسی دا هاویشتبوو. خاوەن کارەکانی ئیداری بەرتیلیان لە خەلکی وەردەگرت و، کاریان جێ بەجێ دەکرد، حاکمی هەولێر و،موسل لەبەرئەوەی کـــە دەسەڵاتیان نەبوو نەیان دەتووانی بچنە نێوخەڵکی. ڕێگاکان زۆرجێی مەترسی بوو،وە بەشی زۆری بنکەی حکومەت وەک مەدرەسەکان، نەخوش خانەکان لەکاتی وێرانی دا بوون. کوردێکی دوورخراوە بو و لاتی مسر لە سالی١٩٤٦دا، وای گێڕابۆوە کە لە ٦٠ مەدرەسە کە لـــە کوردستانی عەراق دا بوو، تەنیا دوو دەبیرستان،وە ٣٠ دەبستان ئاواڵە بوون،وە ئەوانیش باغچەی منداڵان بوون[١١]، لە ئاکام دا بە دروستی نەزاندراوە کە لەوساتەدا کە مەلامستەفا ڕاپەرینی دەست پێ کردبوو، چشتێکی لە دەولەت دەویست، بەلام هەواڵەکانێکی کە لە بە غدایە لەلایەن حکومەتەوە دەرچووە،گوتراوە کە مەلامستەفا مەبەستی بوروکراسی بووە،وە هیچ شتێکی دیکەلەبارەی ئەو،نەزاندراوە.

## ٤ ــ برینی هات و، چو

لە ٣ی سپتامبری ١٩٤٣ مەلامستەفای بارزانی یارمەتێکی بە چەشنی تایبەتی لە سەعید بیرۆخی تورکیە وەرگرت. لەوکاتەدا هەڵکەوتیـــکو، ڕوودا وەیەک لەبەینی مەلامستەفاوە پۆلیسی عەراق ڕووی دا[١٢]؛ بەڵام نەزاندراوە ئایا پۆلیس لەپێش دا دەستی وەشاندووە،یان پیاوانی مەلامستەفا.

ئینجا پێش هاتەکان یەک بە دووای یەکی دا قەوماوە: بارزانی پۆستێکی پۆلیسی عەراقیێ لە بەینی بارزان و، سنووری تورکیەدا مەجبور کرد کــە بنکەی خۆیان چۆل بکەن،بەدووای ئەوەدا لە مانگی ئوکتوبری ١٩٤٣ لە نیزیک مێرگە سوور، ١٥٠پولیس چەک کران، وەزەرەرووزیانێکی زۆریان لێ دان.

لە ئاخری ئوکتوبری ١٩٤٣ حکومەتی عەراق،هێزیکی بڕیگاد کە بریتی بوون لە (پیادە نظام، پۆلیس، مۆتوریزە، توپخانە) دژی ٢٠٠ مـــرۆڤی پارتیزانی بارزانی ناردە مەلبەندەکە! لە ٩ی نوامبری ١٩٤٣ حکومەتی عەراق، تاقمێکی پێشەنگ ناردە لای مێرگەسوور، ژێنرال بڕۆمیلو سەرۆکی (کۆڕی نیزامی

بریتانیا) شەڕەکەی چاوەدێری دەکرد. شەڕ لەمەلبەندی "هێنان"، تا ١١ی نوامبری ١٩٤٣ بەردەوام بوو، هێزی عەراق شکا،وە ٥٦کەس کوژرانو، بریندار بوون، بڕۆمیلولەچەنگەدا بەناراحەتی و پەشێوی، خۆی دەرباس کردو، کشاوە

**٥ - بارزانی و ئینگلیسیکان**

پاش کوشتنی سەعید بیرۆخی لە ئاخری ئوکتوبری ١٩٤٣دا بە دەستی تورکەکان، مەلامستەفا لە هەموو دەرکێکی دەداو،بۆ یارمەتی ور گرتن هەولی دەدا، بەلام کەڵکی وەر نەگرت،ئینجا دەستی یارمەتی بۆلای بالوێزی بریتانیا درێژ کردو، پێشنیاری کرد کە هەڵوێستی ئەوەیە خۆی بەدەستەوە بدات،واتە سەرئەنجام دەیەویست کە پێی ئینگلیسێکان لەوبابەتەوە بێ‌نێتە نیوی،وە راپەرینەکەی لەریگای رامیاریوە، جێبەجێ بکات. لەبەرچاوگرتنی کاری رامیاری کوردان لەوکاتەدا زۆر گرنگ‌بوو،دەوڵەتی بریتانیا ئاکاری ستراتژیکی لە ناوچەکەدا بە نرخ‌وبایخ دەزانی، بەلام نەی‌دەویست لەوکارەدا دەست ڕەپێش بخات.[١٣] هاتو،چۆی لەگەل دەوڵەتی ئیرانیی لەو وەختە ناسکەدا بە قازانجی نەبوو،وە حکومەتی بریتانیا نەی‌دەویست لەشەڕی کوردو،عەراق‌دا خۆ تیوەردا. وەزارەتی دەرەوەی دەولەتی ئینگلیس بە ئاشکرا بە کۆرن‌والیس بالوێزی خۆی لەبەغدا،ڕادەگەیێنی کە شەڕ لەگەل مەلامستەفا لەسەرشان‌وئەرکی دەولەتی عەراقە... ئەگەر عەراق لەوکاتەدا ناتووانێ لەگەل کوردەکان ڕووبەرووبێو، شەڕبکات،ئیتر حکومەتی ئینگلیس بە ئەرکی سەرشانی خوی نازانی ئاکاری نیزامی بە ڕێوە بەرێ.[١٤] کۆڕن والیس بە حکومەتی عەراقیێ ڕاگەیاندوە بە تایبەت بەسەروک وەزیری ئاگاداری‌دا، کە ئاکارو کردەوەی نارەوای عەراق لەو وەختەدا کە قاتی‌وقڕی ناوچەی کوردستانی عەراقیێ داگرتووە، لە جیاتی وەی کە چارەسەری ئەوکارە بکات وە یارمەتی شیخ ئەحمەدو، مەلامستەفای دابایە،نایەوێ‌کەئەوکارە بکات، ئەوە بە هیچ‌چەشنێک بە قازانجی‌نیە، وە هەروەها دووپاتەی کردەوەو، بەسەرۆک وەزیری گوت کە تەواوی مەلبەندی بارزان لەمەترسی (قات و قڕی) دایە وە حکومەت لەوبابەتەوە چارەسەرێکی نەکردووە. ١٥

لەسەرئەوەشڕا ، لەمانگی دیسامبری ١٩٤٣ بریتانیا لەبەرامبەر ئاکاری سەرکەوتنی بارزانی خۆفو، ترسی ڕێنشت وە دەستیکرد بە ناردنی هیزی سووکی مۆتوریزە بولای دیانا نیزیک بە شاری رەواندز. ئەویش مەبەست بەوەبوو کە ئەفسەرەکانی ئرتباتی خۆی،وە هەروەها سەربازەئاسۆوریەکان کە لە کەمپێکی هێزی نیزامی دابوون بپارێزی،وە بە هێزی عەراقیێ بسەلمێنی کە بکشێتەوەپاشێ.

وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیس لە کۆرنوالیسی ویست کە بە بارزانی ڕابگەیێنی کە بەوجورەی کە دەبزوێتەوە، "کاری حکومەتی بریتانیا لەزەحمەت داوێ" [١٦]، بەڵام لەسەرئەوەڕا بارزانی هێرشی بۆسەر دیانا برد لە ٦ مانگی دی سامبری ١٩٤٣ گۆڤاری "هیوا" بڕیارنامەیەکی کومەڵێنا وەندیکوردستانی لەچاپداوە بەنەتەوەینەجیبیعەراقیێ ڕاگەیاند کە دژی ئاکاری رامیاری دەولەتی عەراق،وە ڕەوشتی حکومەتی "دیکتاتوری عەراق کە لەژێر نەخشەو،چاوەدێری یاسای ئاتلانتیکدایە ،پێویستە خەبات بکرێ. [١٧]

بەراستی شورشی بارزانی، ئینگلیسێکانی ناوچەی عەراقیێ لەمەترسی هاویشتبوو، لە نیوە راستی مانگی دیسامبری ١٩٤٣دا، کورن والیس چاوپی کەوتنیکی دیکەی لە سەروک وەزیرانی عەراق (نوری سەعید) کرد وە پێیگوت کە "شورشی کورد" وادیارە سەرەتای (مەترسیکی راستەقینە"ی هەیەوە، وادیارە کە بۆ لای داواکردنی مافی نەتەوایەتی گشتی دەچێ. بەلام کورن والیس، لەوشکوگومانەشدابوو کە ڕاپەرینەکەی بارزانی نەکائەترسێکی بۆسەرچـــاوە نەفتەکان بەهەستبێنیو، هاتو،چۆ لەنارەحەتیباوی.

### ٦ــ هاتو، چۆی و ارتباتی بارزانی ــ کۆڕن والیس

کۆڕنوالیس نامێلکەیەکی پڕ لە هەڕەشە لە بارزانی نووسی ،وە پێی ڕاگەیاند بوو کە ئاکاری وی مەترسی بۆ ئێمە هێناوەتەپێشێ ،وە هەروەها نەسیحەتی کردبوو کە خوێی بەدەستەوە بدات. بارزانی کەلەوەلامدا گوتبووی کە لە بالوێزی ئینگلیس داوا دەکات کە لەبەینی کوردەکانو، دەولەتی عەراق دا نیێونجی بێت ، بەلام گوێیان نەدایە. تەواوی ئەوقسانەی کە لە نامێلکەکاندا هاتبوون ،وا

وەدەردەکەوێ کە مەلامستەفالە لە سالەکانی ٤٣ – ١٩٤٤دا بەشێکی تـــازەی هاتوچۆ لەبەینی خۆی و ئینگلیس بەهەستهێنابوو، بەلام هەرلەوکاتەدا "هیوا" لایەنگری لە بارزانی دەکردو، دەینووسی کە بارزانی، بەڕاستی پیاوێکی دژی ئەمپریالیستە. لە ٢٣ دیسامبری ١٩٤٣دا لەپێشئەوەی کە نامەی کۆڕنوالیس بەدەستی مەلامستەفا بگات،بارزانی نامەیەکی بۆ باڵوێزی بریتانیا لەبەغدا نووسیبوو،وەجێژنی "نوئیل"ی پیروزبائی پێگوتبوو،وە هەروەها لە نامەکەدا گوتبووی کە: لە خودای مەزن سەرکەوتن و پیرۆزی دەولەتی بریتانیای بەسەر ئالماندا داوادەکات،چوون ئاواتی هەموو گەلانی جیهانە، بەلام ئەوەی کەجێی سەرسووڕمانە، ئەوەیە کە نووسیبووشی کە: من لە ناخیدڵەوە سەر بۆ ئێوە شۆڕ دەکەمەوە،وە وەک باب و کوڕێک دەبزوومەوە.

بارزانی هەروەها بەچەشنی پیاوەڕامیارێکانیڕۆژهەڵاتزۆربەگرنگینووسی بووی کە: "بیروباوەڕێکی ئەوتۆیلەگشتدا بە دەولەتی ئینگلیس هەیەوە بەلکو پتر لەوەی کە فکر دەکەنەوە لەبەرچاوودایە!

ئینجا بە شوێنی ئەوەیدا کە حکومەتی عەراقیێ تاوانبار کردبوو کە ئەوی مەجبور کردبوو کە "بەرگری لەخۆیی بکات" هەروەها لەنامێلکە کە دا نووسیبووی کە بەراستی ئاگاداری لێ بوردنی عەراق فرۆفێلی زۆرتێدایە وە لە کورنوالیسی ویست بوو کە ئەفسەری عالیمەقامی خۆی بەنیۆی ماژۆرستیپینگ کە بەو لات شارەزایە بۆ پرسیار بنیرێ وە لە بارەی مەسەلەکەدا بیروڕای خەڵکی بزانێ: بارزانی هەروەها لە ئاکامدا نووسی بووی کە: "بەهەر چەشنێک بێ من فەرمانی پادشای ئێوە لەسەرسەرو، لەسەرچاو دادەنێم" – بەڵام لەکاتی خوێندنەوەی نامەکەدا وەرگێڕ ئاوا دەڵێ "ئێمە لەبەرانبەر پادشای ئێوەدا سەر دادەنوێنین"[١٨].

لە ٢٧ دیسامبری ١٩٤٣ لەکاتێکدا کە بارزانی بەچەشنی (ئولتیماتوم" بەکۆڕن والیسی وەڵام دابۆوە، لەسەرڕا داوای کردبوو کە بریتانیا لە لێ بوردنی گشتیدا چاوە دێری بکا ،وە لە باڵوێزی ئینگلیسی ویستبوو کە بە حکومەتی عەراق: "فەرمان بدات" کە پارتیزانەکانی ئازادو، دەستڕۆ بێلێتەوە، وە بۆخویشی ئیدارەکردنی ناوچەی بارزان بەدستەوەبگرێ.

سەرئەنجام کورنوالیس داوای لە دەولەتی عەراق کرد کە پتر قازانجی کوردەکانی لەبەرچاوبێ وە لەگەڵ سەرۆکەکان هاتوچۆی بەڕێوەبەرێ ،تەنانەت

(شیخ‌ئەحمەدو، شیخ مەحمودیش بۆ نوێنەرایەتی دانشتگەی سەنا پێشنیار بکات.
[١]

### ٧ـ سرنجدان‌و، متاڵا لەسەر مەجید مستەفا

لەکاتێک‌دا کە ئینگلیس فشاری‌دێنا، نوری سەعید لە ٢٥ دیسامبری ١٩٤٣دا کابینەی خۆی گۆڕی وە وەزیرێکی کوردی بەنێو مەجید مستەفا کە لە کوردە بە نێودارەکانی سولەیمانیێ بوو، بۆ کابینە هێنا، کە دەگوترێ بـــو[٢] پاراستن‌و، ڕاگرتن لە کابینەی خۆی‌بوو.

هێندێ لە کوردە ناو دارەکان، لەو بارەدا دەیان‌گوت کە مەجید مستەفا لە لایەن گەنجە کوردەکان‌ی سازمانی هیوا بە دوژمن دەناسرێ،وە ئەوی بە پیاوێکی "هەوال بەری بە کرێگیراوی ئینگلیس" دەزانن وە هەروەها خائن بە نەتەوەی کورد. [٢٠]

دیار بوو لە کابینەدا سەرۆک وەزیر لایەن‌گری لە مەجید مستەفای دەکرد، بەلام هێندێ لەئەندامانی کابینە ناخۆشییان‌دەویست،وەلە ئاکام‌دا هەڵبەزان‌و، دابەزانێکی زۆری لەکابینەدا بەهەست‌هێنابوو.

وا وەدەردەکەوت کە ڕاوێژی زاریان یەک‌نیە، چوونکە گفت‌و،گۆی لە کابینەدا جۆر بەجۆر بوو. مەجید مستەفا ڕای‌گەیاند کە من بیرو، باوەڕم وایە کە لە ڕێگای ڕامیاری‌و، تاکتیکەوە. مەسەلەی شۆڕشەکە بەجێ بێت،نە ک لە ڕێگای ناردنی هێز و شەڕ. وە هەروەها گوتی ژمارەی شورشگێڕەکان زۆر بەچاکی دیاری نەکراوە،وە پێویستە بزاندرێ کە سەروکەکانی شورشگێڕ تاکوێ یەکێتیان هەیە، ئینجا پاش ئەو خەبەرانە، ئەووەخت هێز وەکار بکەوێ.

ئەوەی کە شایانی باسە، مەجید مستەفا پێشنیاری کرد کە شیخ ئەحمەد بو و ڵاتی بارزان بگەڕێتەوە وە بە مەلامستەفای بڵێ کە جێگایەکی دوور لە مەیدانی شەڕێ دابنێ تاکو ووت‌و،وێژی لێ‌بکرێ. کاتێک ئەوگفت‌و،گویەکرا، داخووازەکانی مەلامستەفا لە دانشتنی وەزیران دا قسەی لێ‌بکری. سەرئەنجام گەڕانەوەی دووبرا لە سێ‌برایان، بوخو ی نێوان ناکوکی لەبەینیان‌دا بەهەست دێنێ کە بە سوودو، قازانجی ئێمە تەواودەبێ، وە لە ئاکام‌دا شۆڕشەکەیان لێک بڵاو دەبێ وەیان دەبێتە دووبەر. مەجیدمستەفا پێی وابوو کە ئەوسێ‌برایە ناتووانن لەسەر یەک

فکروڕابن ٫٫ مەجید مستەفا هەروەها لە حکومەتی ویست کە لەبەینی ئاکرا ،وە ئامیدیا ، بۆ بیللە خەتی تلفون بکیشرێ تا ئاگامان لەوەمەلەبەندە هەبێ.

بو٫ دانانی پۆستی پۆلیسی "بە هێزو، قەوەت" دەست بەکاربین،وە ئاوە دانیکان بە تەرخان یان بەنرخیکی زۆر کەم بە جوتیارەکان بدرێ کە ئەوە کاریکی زۆر بە قازانجە بۆمە.

لە ئاکامدا مەجید مستەفا پێشنیاری بە کابینە کرد کە ئیدارەیەکـــی ڕاستەقینەی کشوەری کەمەبەست بە "کەم کردنی نفوزی شیخ ئەحمەد" بی دابندرێ. وە بەوەزیری ڕاوتەدبیرکەری گوت کە ئەگەر ئەونەخشەیە بەچاکی بەڕێوە نەبردرا ،ئینجا لەڕێگایەکی دیکەوە بەسەر شۆڕشگێڕەکان دا دەتووانین فایقبین.

ئینجا ووتو،ویژیک لەبەینی مەجید مستەفا و مەلامستەفا،وە هێندێ لە ڕابەرەکوردەکان لە ۱۰ ژانوییەی ۱۹۴۴ لە میرگەسوور پیکهات. لە ئاکامدا سێووتە لەلایەن وەزیری کوردەوە لە پێش مەلامستەفا داندرا: چەشنـــی ووتو،ویژی خو ی بە وەزیرەکانی ڕاو، تەدبیری بدات، کورتەی ئەو،ووتو،ویژە بەکورنوالیس بە وەزارەتی دەرەوەی ئینگلیس ڕابگەیندرێ، وە ڕاویژو،ووتەی کوردەکان ۲۲ بگوترێ. یەکێک لە پێش نیارەکانی مەجیدمستەفا کەدەنگی داوە، مەسەلەی ڕاپەرینی کوردەکان بوو، وەنێو بردنی ئەفسەرە کوردەکان کە بە تایبەت بە نێوی ئەفسەرانی ڕابت هەل بژاردرابوون کە هێمنی لەناوچەکەدا لە ژێرچاوەدیری ئەوان بێت.

حکومەتی عەراق لەوبابەتەوە زۆر پێی نەدەچەقاند،بەلام بەراستی ئەو مەسەلەیە زۆر گرنگبوو: کە "شۆڕشگێڕەکان" لە بەخشین بە شداربن، وە پۆستی پۆلیسی ش لە ناوچەکەدا دابندرێ، هیزی عەراق لەمێرگە سوور بکشێتەوە.

## ۸ ــ سەر دانوواندنی بارزانی بۆکاربەدەستەکانی بەغدا

لە ۲۲ی مانگی فیورییەی ۱۹۴۴ دا بارزانی بەچەشنی ڕەسمی لەگەل دووازدە ئەفسەر لەهاوالەکانی کە یەکیان فەتتاج ئاغای سەرۆکی هەرکیبوو،بو ماوەی چەند ڕۆژان زۆر بە گەرموگوڕیوە. لەلایەن حکومەتی بە غدایـــەوە میوانداریان لێکرا. لەوچەندڕۆژەدا بارزانی لەگەل بالۆیزی ئینگلیس لەبارەی

هێندێ لەمەسەلەکانی کوردستان کەبەراستی چاوەڕووانی نەدەکرا ،ووت‌و ،ویژی کرد ،وە بەهیوای‌وەی‌بووکاتی کەکابینەدەگوری ،وەچەشنی ناوچەی شمـــال‌ش لەئال‌وگورداده‌بی .

مانەوەی کوردەکان لە بەغدایە، واوێدەچوو کە ئەوکۆڕە بۆ سەردانێکی رەسمی چۆتە بەغدایە، نەک‌بۆ "سەر دانوواندن" .

بو کۆرن‌والیس، بالوێزی ئینگلیس، وائاشکرا ببوو کە ئاکارو کردەوەی مەلامستەفا ،وە ڕاپەرینەکەی بەچەشنێکی ڕێک‌وپێک بە ڕیوە دەچێ،وەبەتایبەت ئەوهەڵستانە بۆ لاواز کردنی حکومەتە لەئاکام‌دا . " ۲۳

ئینجا وەختیک کە دیترا لە بەغدایە زۆر بەگەڕم وئینەوە لە مەلامستەفا ،وە هاورێیەکانی پیشوازی‌و، میوانداری کراوە، عەرەبە ناسیونالیستەکان شیروتینیان دەکیشاو، قەڵس‌و، نارەحەت بوون ،وە تا ئەوڕادەیەی کە مەلامستەفا مانەوەی خو.ی لەبەغدایە کورت کردەوە،[۲۴] لەولایە شەوە سیاسەتی مەجیدمستەفا لەلایەن نوێنەرانی مەجلسی سەناوە لە دانشتگەی سەنادا رەخنەی لیٚگرا .

## ۹ ــ پێ لێ خشاندنی وە عدەکان

کات‌و، واز زۆر زوو گۆڕا، وە ڕوو بە خراپی ڕۆیشت . لە نیوەی مانگی ئاوریل‌ی ۱۹۴۴دا بەنیگەرانیوە ڕاگەیاندرا کە ئەو هەموو هەوڵ‌و، تەققەلاو، هەلوێستە کە بۆ "هێمن کردنەوەی ناوچەی کوردستان دراوە، بە هیـــچ‌کوی نەگەیشتووە" کۆرن والیس" گفت و گویەکی زۆر گرنگی" لەگەل عەبدوول‌ئیلاه نایبی پادشای عەراق کرد، ئەو ووت‌و، وێژە کاتێک‌بوو کە دەیەویست بچێتە کوردستانێ وە لەگەل سەرۆکە کوردەکان لەنزیک ئامادیاوە ڕەواندز پێک بگەن وقسەبکەن .

ئینجا لەو دەمەعاستەمەدا بالوێزخانە لە ۱۴ ئاوریـــل‌ی ۱۹۴۴دا نامیلکەیەکی تازەی بارزانی پێگەیشت کە بۆنی‌گلێیی لێ دەهات ،وەبارزانی گوت‌بووی کە حکومەت قەول‌وقەرا ڕێکی کە پێویست‌بوو لەناوچەی کوردستان‌دا ،،بەجێێ نەگەیاندوە، جگە لەوەش هێزی تازەی نیزامـــــی بۆسەربازخانەکانی کوردستان ناردووە ،وە ساخلۆو، پوستەکانی قایم‌ترکردوە .

مەلامستەفا هاوتای ئەو نامێلکەیە، بۆ ئەفسەرانی ڕامیاری شاری موسل،وە هەروەها بۆ مەجید مستەفا، دوونامەی دیکەی ناردبوو، وەگوت‌بووی کە بۆخۆئی لەتەنشت نەتە وەنەجیبەکەی بۆ وەرگرتنی مافەکەیان قەت ڕاناوەستن‌و، خەبات دەکەن، وەتەنانەت حکومەتی بریتانیای گەورەش لەگەل ئاکارو کردەوەی ئێمە بەدڕی نابزوێتەوە، وە دانی بەسەر دادێنێ. ٢٥

بالۆێزخانە هەروەها لە نایبی پادشای عەراقێ داوا کرد کە لەگەل کوردەکانی شاری ڕەواندز کۆبوونەوەیەکی هەبێ کە بتوانن لەگەل بارزانی‌ش لەئاکام‌دا چاوپێ کەوتنیان بەجێبیت.

بەلام (کاتێکی نالەبار) هاتەپێشێ وە کۆبوونەوەی شاری ئامادیای تێک داو، هەروەها کۆبوونەوەی شاریڕەواندزش کورت‌کراوە، وەبارزانی مەبەست بە بارینی باران،وە... مەبەست بەنەهاتنەکەی گوناح بارکرا.

**١٠ ــ نوری سەعیدو، کورد**

لەنێوەڕاستی مانگی مەی ١٩٤٤دا، نوری سەعید سەفەرێکی بۆکوردستان کرد: هاوڕێ لەگەل مەجیدمستەفا "شاربەشار" گەڕا، بۆ شارەکانی موسل،کەرکوک هەولێرچوو، وە لەبەرانبەر سەفی ئەفسەران لە باشگای وان دا ووتاری بڵاودە کردەوە،وە هەروەها خۆی بە هەواداری کوردان‌نیشان دەدا، لەوووتارانەدا بەرگری لەمەسەلەی نەتەوایەتی دەکرد وە تەنانەت گوتی کە من ئامادەم کە کاروکردەوەی کوردەکان بەڕێوە بچێ،وە مافی ناوچەئی(لیوا) بەکوردان بدرێت... ئینجا لەکاتێک دا کە نەخشی لایەن‌گرانەی بەگومانی‌خۆی بەنێوی "وەکیلی کوردان" دەگێڕا. گوتی سەروک وەزیر لە "دایکەوە کوردە". لەکاتێک‌دا کە هەولی‌دەدا لەووتارەکانی خۆیی‌دا وابنوێنێ کە بۆڕێک و پێک‌کردنی مەسەلەکە تێ دەکوشێ وە تەقەل‌لای ئەوەیە کە کوردەکان هەموو لەدەورووبەری مەلامستەفا کۆکاتەوە،[٢٦] واتە لەوسەفەرەدا نوری سەعید لەگەل مستەفامەجیید زۆر بەگەرم‌وگوڕێوە بەدووای مەسەلەکەیەوە بوو،وە هەلوێستیشی ئەوەبوو کە بزانی ڕاوێژی‌زارو، ئاکاری ڕاستەقینەی مەجید مستەفاش بە چ چەشنێکە.

لە ئاکام‌دا نوری سەعید بە مەجید مستەفای ڕاگەیاند کە لە کوردستان

بمێ‌نێتەوە،وە "چەک و ئەسلەحەکان" لە مەلامستەفا بستێیی‌نێتەوە.

مەجیدمستەفا بەپێشنیاری نوری‌سەعیدی ڕی‌دەست‌نەدا وە پێی‌گوت،جا چۆن‌دەبێ کە هەتائێستا حکومەت هەنگاوێکی بەچاکی کە بۆ کوردستان هەل نەهێناوەتەوە،لەو کاتەوساتەدا چەک و ئەسلەحە کۆکاتەوە،وە ئەوکارەساتـــە بەهیچ‌لانیک دروست‌نیە."

ئینجا ئەووت‌و،ویژە بەسەر سوورماوی لەبەینی نوری‌سەعیدو مەجیدمستەفا کە درێژەی هەبوو، نوری سەعید لەنێوان قسەکان‌دا گوتی: ئەوانەی کە گوتت هچیان وەلامی پرسیاری من نەبوون،وە بەهیچ جۆرێک کاروباری کوردستان راست‌ناکاتەوە."

مەجید مستەفا گوتی: "من بەو کارەی کە تۆ لەبەرچاوتە بلێنی نادەم" ئەگەر تو دەتەوێ ڕاوتەدبیرێکی جوان بکەی وە ڕێگایەکی باش بەببینێوە، بەوجۆرەی کە دەلێێ نابێ، تۆ لەو وەختەدا ٣٠ تا ٤٠ ئەفسەری کوردت تەینا بەگوناخی کوردبوون بوچ لەسەر ئیش وکار لابردوون؟" نوری سەعید گوتی: "من نامەوێ هێزی نیزامی لەخۆم نارازی بکەم، بوخاتری ئەوەی کە مەلامستەفا لەمن رازی‌بێت."

مەجید مستەفا لەپاشان پەڕیێ سەرقسەکانی نوری سەعید وگوتی: "پەس تۆ بە هیچ جورێک ناتەوێ کارێک بو کوردەکان بکەی، ئایاوانیە؟

تۆ دەتەوێ بەمن‌بلەی کە بۆ دروست کردنی ئاوەرۆیەک تەنیا ١٥ دیناران خەرج کەی؟ ئایا تۆ تاکووئێستا بۆ بەرێوەبردنی پلەی بەرزی خوێندن بـــو کوردەکان هیچ هەنگاوێکت هەلێناوە؟ وەیان هەلیان هێناوە،ئایا چەن مرۆڤ لەپلەی خوێندنی‌عالی بەشدار بوون؟

سەرئەنجام بەهەر چونێک‌بوو، مەجیدمستەفا بەلێنی‌دا کە بو ووت‌و،وێژ بچێتە لای مەلامستەفا،وە داوای لێ‌کرد کە چەکەکان کۆکاتەوەو، بیان‌داتەوە بەدەولەتێ.

٢٧

ووت‌و،وێژ لە نیوەی مانگی مەی ١٩٤٤دا دەستی پێکرا، حاکمی موسل‌و، ڕای‌زەنی ڕامیاری لەشمال‌دا بەنێوی ماژور کینچ Kinch لەو گفت‌وگویـــەدا بەشداریان کردبوو.

بارزانی بە تێراشکاوی‌و،ئاشکرای ڕای‌گەیاند کە لەساخلوکانی مێرگەسوور

و بیل‌لە کە هەروا دێن بە قەوەت‌بن ،بەچاکی ئاگای‌لێیە وە چاوەڕووانـــی دەکات ،ئەوەش مەبەست بەوەیە کە ئیتر وەک سالی ١٩٣١ی لی‌نەیە کە هێزی عەراق گەمارۆی داو،کارەساتی بەسەرهێنا. وە هەروەها گوتی تا ئەو کاروبارە لەسەر ئەوڕێوشوێنەبێ"بەهیچ چەشنێک لەحکومەتی‌عەراق‌لەو بابەتـــەوە خاترجەم‌نیە"

ئینجا لەوووت‌و ،وێژەدا حاکمی‌موسل بە کەللەشەقیێوە بە بارزانی گوت کە دەبێ ١١ ڕەشاش، ٧٢ تفەنگ‌بدەیەوە،وە ٢٥٠ سەرباز کەهەڵاتوونە لای‌تو وەنایانەوێ بگەڕێنەوە پێویستە بەزۆر بییان‌نێرێوە.

بارزانی گوێی بۆوقسانەدانەخست‌و،تەنیا ڕای‌گەیاند کە دەبێ لەبابەت مەسەلەی لێبووردن باس‌بکرێ وە هەروەها لەبارەی سەربازە گرتوکـان داگوتی، ئەوانە بە قسەی من‌ناکەن‌و،ناگەڕێنەوە! بەکورتی‌بلێێن ئەو ڕستەووت‌و،وێژانە پترلە ٦سەعات بەردەوام بوو!

ئینجا بەسەرهاتێک و هەڵکەوتێک لە لایەن ماژور کتیچەوە ئاشکرا کراوە کە لە بەینی ئینگلیس‌و، بارزانی کەین‌و،بەینێک هەستی هەبووە.

کنێچ سەرئەنجام بارزانی کیشا قەراغێ‌و، پیێ‌گوت کە بەراستی لەگەل ئاور گاڵتە دەکەی! وە لە تۆم دەوێ کە ئیتر ئەو نامێلکە نالیکانە بۆمن نەنووسی. پێی ڕاگەیاند کە ١٠ سەربازی پەنابەری چەکدار بداتەوە [٢٨]

## ١١ ـ وەستانی شەڕ لە ( ژوئن‌ی ١٩٤٤ تا ژوئن‌ی ١٩٤٥ )

نیگەرانی ئینگلیس لەمەسەلەی کوردستان لە ژوئن‌ی ١٩٤٤دا پتر ئاشکرا بوو، واتە پاش لێ کەوتنی نوری سەعید لەسەروکایەتی‌ لە (٣ی ژوئن‌ی ١٩٤٤) زیاتر بەدگومان ببوون، تەنانەت لەسەرکار نەمانی نوری‌سەعید لەگەل مەسەلەی کورد تێکەل ببوو.

لەووت‌و،وێژێکی کەلەبەینی وەزیری ناخۆئی عەراق‌وە کوڕن‌والیس‌کرا، بالوێزی ئنگلیس گوتی کە عەراق پێویستە بەرنامەیەکی تازە بۆ پێش‌کەوتنی کاروبار لەکوردستان‌دا دابنێ،وە مەسەلەی کورد لەبەرچاوبێ تاکو بارزانی لەونێوەدا وەک ((قارەمانی ـ نەتەوایەتی مافەکانی کورد)) نەناســـرێ‌و، تەمەشانەکرێ،وە بە حکومەتی‌عەراقیێ ڕاگەیاند کە ((حکومەت نابێ بێ‌پرس‌و،

ڕای من هێزی بۆ ناوچەی کوردستان بنێرێ)) ! ٢٩
لەئاخری ژوئیەی ١٩٤٤ ماژۆر کنێج، چاوپێ کەوتنێکی تازەی لەبارزانی کردو، بەوبیروڕایەوەگوتی منکەووتو، ویستم لەگەل بارزانی کردوە، زۆر بە زمانێکی چەورو، نەرم دوواوم، وەڕیزم زۆرگرتووەو، پێم هەل کوتوە، بەراستی هەردەبوو واش بێت !
ئینجا بارزانی لەسەردەمی خووازتنی کچی مەحمودئاغای زێباری دابوو، هەلوێستی ئەوە بوو نفوزی خۆیی تاسنووری ئیران پەرەپێدات وە لەگەل ڕەقیبی خۆی یکێتی بەهەست بێنێ وە هەروەها لەعەشیرە کوردەکانی ئیرانێ یارمەتی وەرگرێ.
ئینجا کات واهاتەپێشێ کە ماژورکنێج وازی لە ناوچەی زێبار هێنا، وە لەکاتێکدا کەپێی خۆشنەبوو کە هیچ کاربەدستێک بۆ کوردستان بچێت، ڕای گەیاند کە پێویستە ئێمە خۆمان لەتێنوهاندانی ئاژاوەی کوردستان بپارێزین، مەبەست بەوە کەئەوکارە بە قازانجی مەنیە. " ٣٠
پاش چەندمانگێک کە دەهات شەڕ لە کوردستاندا ڕاوەستێندرێ: هێزی حکومەت لەناوچەی شمالدا پاشەکشەی کرد، وا وەدەردەکەوت کە دەگوترێ کە چەشنە سەربەستێک لە کوردستاندا بە ڕێوەبردراوە، بارزانی بە سەرۆک دەناسرا، وە تادەهوک بەگیروگرفتو، کاروباری هۆزو، عەشیرەتەکان ڕادەگەیشت.
بەلام لە ئاوریلی ١٩٤٥ دا با لوێزی ئینگلیس بە نیوی ستۆن هیوربیرد، بەجێگای کورنوالیس داندرا، بارو، دوخی مەسەلەکە گۆڕدرا.
لەنامەی خودا حافیزیدا کورنوالیس بۆ بارزانی نوسیبوی کە حکومەتی عەراق دەیەوێ یاسای لێبوردن لە دانشتگەی بەغدادا بەڕێوەبەرێ تاهێمنایەتی لە ناوچەکەدا بەهەست بێت. " ٣١
یاسای لێ بوردن لە ١٠ی ئاوریلی ١٩٤٥ سەلماندرا، بەلام ئەو یاسایە زۆرچوکو، مەحدود بوو، واتە سەربازو، پۆلیسێکی کە لەماوەی شەڕدا هاتبوونە نیو شورشی کوردستان وەبەر ئەویاسایە نەدەکەوتن !
ڕۆیشتنی کورنوالیس، وەگۆڕانی وی بەرانبەر بوو لەگەل ئەوەکە دەهات دووژمنایەتیو، شەر لەو لاتی ئورووپادا تەواوبێ، وە هەر بەوجورەش چاوەدێری دەکرا کە ووتو، وێژو، هاتوچۆش لەنێوان ئینگلیسو، بارزانی ببڕدرێو، کۆتائی

پێ بێت .

حکومەتی عەراق لەوبارەوە زۆری پەرۆش بوو ،وە گومانی دەبرد کە مەبەست بەکوردەکانەوە لەوکارەدا دەستی کێشاوەتەوە. بەلام باڵوێزی تازە ئینگلیس رای گەیاند کە حکومەتی بریتانیا لەکاتێکدا کە قازانجی کوردەکانی لەبەرچاوە، لەسەرئەوەشڕا قەت تەفاوەت لەبەینی هەردوکیاندا دانانێ : ئەفسەرانی ئینگلیس نایانەوێ کە بۆ لیدەرە کوردەکان زۆر گوێ شوڕ کەنەوە. . . وە کوردەکان بەچاوی گشتی چاوولێ دەکرێن ، وە هیچ کاتێک مەسەلەی کەمایەتی نەتەوەئی لەبەرچاونە ، بەڵکو مەسەلەی تەواویولات مەبەستو ، هەڵوێستی ئێمەیە . ٣٢

## ١٢- شەڕی ١٩٤٥

لە ڕۆژەکانی ئاخری مانگی مارسی ١٩٤٥ شەڕ دەهات بەگورجی دەستی پێ بکرێ: بە موتەسەریفەی (حاکم)ی شاری هەولێر ڕاگەیاندرابوو کـــە هەلوێستوایە کە مەققەرەکانی پۆلیس لەناوچەکەدا ، دابمەزرێتەوە .

بارزانی زۆرزوو لەوبابەتەوە دەنگی خۆ ی دەربڕی،وە گوتی حکومەت بو قسەی خویی ڕێزدانانێ ، بەلام حکومەت گوێی نەدایە .

لە٦و٧ی ئوتی ١٩٤٥ ، لەبارزاندا پێشهاتێک ڕوویدا ،واتە تاقمێک کەهاتبۆ بارزانەوە دەیەویست مەدرەسە و پۆستی پۆلیس دامەزرێنێتەوە ، پێش مەرگەکانی بارزانی وەدەریاننان. بۆ ڕۆژی ٨ مانگی ئوت ،ئەسەدئاغا خۆشەوی "ئیدارەی ناوچەئی حکومەتی مەرکەزی) لەبارزاندا تێکەوەپێچا .

هەر لەوکاتدا بارزانی زۆر بە توندوتیژیێوە بەکۆلۆنێل عید کە لـــە موسلبوو ، وەلامی دایەکە بەو ئاکارانە دەبێ چاوە ڕووانی پێشهاتی دیکەشی ببیێ ،وە پییڕاگەیاند کە هیواوایە کە هێزی پۆلیسی دەولەتی بەتەواوی لە ناوچەکە بکشێتەوە .

### ١٣ ـ دووبەرەکی ئینگلیسو، عەراق

لە ٨ی ئوتی ١٩٤٥ ڕاو، تەدبیرکەری وەزیری عەراق پێیچەقاندو گوتی پێویستە هێزی نیزامی، ناوچەی بارزان بگرێتەوە وە "بەزوویێکی زوو کە بکرێ"گوناح بارەکان لە بەند بکات.

ژێنیرال ڕانتون گەورەی کۆڕی نیزامی بریتانیا بەحکومەتی عەراقیێ ڕاگەیاند کە لە تەدارەکی هێرش بۆ سەر ناوچەی بارزاندا نەبێت، وە پێویستە ئەوکارە بەشێنەئی بکرێت، وە تا ڕێگاو بانەکان دروست نەکرێ نەخشەی دەست درێژی بۆسەر ناوچەی بارزان بە قازانجنیە، وە بە گومان دەبێ ئەوکـــــارە لە١٥ی‌سی‌پتامبر ڕا دەستی پێبکرێ.

بەلام دەولەتی عەراق بەبیرو، ڕای خۆی پیێوابوو کە لەماوەی دوویاسێ حەوتوواندا دەتووانێ ناوچەی بارزان بگرێتە وە بۆپێشەوەبچێ، جا بەو مەبەستە بەقسەی ژێنیرال ڕانتونی نەکرد.

بەگومانی ژێنیرال ڕانتون، ئاکاری نیزامی هێزی عەراق "لەنـــەزم ونیزامێکی زۆر باش بەشدار نەبوو" وە بەشی زۆری لە سەربازە عەراقیێکـــان (خراپتیگەیشتبوون))، ئینجا لە یارمەتی دانو، ناردنی ئەفسەرەکانی ئینگلیس خۆی پاراست!

وە لە ١٦ی ئوتی١٩٤٥کارداری بریتانیا ئاگاداری بە سەروک وەزیردا کەبریتانیای گەورە تەنیا لەکارێکدا خۆی تێوەردەدا کە بۆ خوی مەسلەحەتی لەسەربێ.

### ١٤ ـ هەوەلین هێرشی عەراقیێکان

ئینجا عەراق گوێی بەقسەکانی بریتانیا کە بەتەقیەوە گوتبووی نەدایە، وە ناوچەی بیلّلەیبۆمباران کرد وە لە ١٣ و ١٥ی‌ئوت خۆی بۆ هێرشێکی گەورە

ئامادەکرد ،وە سێگوردانیان دژی بارزانی ناردە ناوچەی بارزان. بارزانی ۷۵۰ پێشمەرگەی لە ناوچەی برادوست ڕاگرت ،وە دوو کە ماندو ی لە ناوچەی ئامادیای دانا کە ئەوانە بەچەکو، ئەسلەحەو،ڕەشاشی سووک کە لە سالی ۱۹۴۳دا لە عەراقیێکان گرتبوو ،چەکدار ببوون. هەوەڵین شەڕ لە سیدکان دەستی پێکرا: وەهێزی عەراق تووشی بەلایەکی گەورەبوو ،سەد سەربازی لەدەستدا. بەشوێنی ئەوەدا سەرۆک وەزیری عەراق لە هێزی ئاسمانی سەلتەنەتی ئینگلیسی داواکرد کە لە شەڕەکەدا بەشداری بکات ،بەلام کارداری ئنگلیس گوێنەدایـــە ،وە، بەسەرهاتی ۱۶ی‌ئوتی دووپاتە کردەوە! ۳۳

## ۱۵ ــ شکانی تازەی هێزی عەراق

لە هەوەڵی مانگی سی‌پتامبر ،عەراقیێکان ۱۴۰۰سەربازیان لە شاری‌ئاکرا ،وە ڕەواندزوە ناردە ناوچەی بارزان ،وە مێرگەسوور ،وادیاربوو ،ئەوە هەوەڵین هێرشی گەورەیانە. بەلام تووشی شکانێکی گەورە بوون: هەوەڵین ستوونێ‌کە لە ڕەواندزوە بۆپێشەوە دەهات ،لە نێزیک شاری مەزناوە. شەڕێکی توندی کرد ،بەلام شکان و تەسلیم بوون ،وە زەرەروزیانێکی زۆری ویکەوت. دووهەمین ستوونێکی کە لە ئاکراوەهات ،زینار‌تا گەمارودا ،وە پاش شەڕێکی توند کە نەخشەی ئەوە بوو وە دەبوو لە ۸ی سی‌پتامبر پاشەکشەی بکات ،تووشی دەستەیەکی کوردان دەبێ کە دژی هێرشی دەست پێ‌کردبوو ،وە بارزانی بۆخۆی لەوشەڕەدا بوو ،ئینجا لەو بەرەنگاریێدا ۱۶۰ سەرباز بریندار‌بوون وەیان کوژران ،وەسێ توپی سەحرائیان لێگیرا!

ئەو ڕەسەرکەوتنە بۆبارزانی بووبە هۆی‌ئەوە کە دەنگ بداتەوە،وە ناوبانگ بکات ،وە ئاکارو، تاکتیکی نیزامی بارزانی بچێتە سەرێ وە ژمارەی پێشمەرگەکانی پتر بێت ،تەنانەت تارادەی ۲۰۰۰ مرۆف بکات.

چلۆ نایەتی‌وکاتی حکومەت زۆر نالەبار و تاریکبوو ،سەرۆکی پایە بەرزی هێزی عەراق ڕای‌گەیاند کە پیرۆزیو ،سەرکەوتنی شۆڕشگێڕەکان، بێ‌شکو،گومان دەبێ دەستی دەرەوەی تێدابێ ،دەنا چۆن دەبێ ئەوان بەو جورەوە سەرکەون ،وە ئەوە دستی شوڕەوی تێدایەوەیارمەتی ئەوانە!

لەبەینیووتو،ویژیکی کە سەرۆکی حکومەتی عەراق لەگەل ئنگلیسیکان لە (لە١١ی سی پتامبری) کرا، ژێنیرال رانتون لەئاکاری شەڕ لە ناوچەکەدا بە توندی دوواو، گوتی: هێزی عەراق تووشی ئیشتباو، کارەساتیکی تیکنیکی بووە، وە رابە رایەتیو، رەوشتی ئەوکارەش زور غەلەت بووە.

## ١٦ ــ مەحمود ئاغای زێباری پشتی بارزانی بەردەدات، لەنەکاو کاتو، واز گۆڕا!

لە ١٤ی سپتامبری ١٩٤٥دا مەحمود ئاغازێباری کە خەزوورو، هاوکاری بارزانیبوو دەستی لەشەڕ کێشاوە. بەیان نامەیەکی کە بالۆیزی بریتانیا لە بەغدایە بلاوی کردەوە، ئاشکرای کرد کەمەبەستی "پشت بەردانو، گەڕانەوە"ی مەحمود ئاغا ئەویە کە: هەولدان بۆ وەزارەتی ناوخۆ لە لایەن زێباریکان، بو دانانی عەشیرەتەکەیە کە لە ژیانیکی باشدا کە لکەوەرگرن، پیاوە ڕامیاریکانی ئنگلیس ڕایانگەیاند کە[٣٤] ئەسلەحەو، پوول لە ناوچەکەدا بلاو دەکەنەوە، وە سەرۆکی زێباریکان پیاوەکانی خۆی لەژێر فەرمانی حکومەتی عەراق داناوە، وە هەروەها بەشوینی ئەوەدا لەلایەن شیخ رەشیدی لۆلان، وە ڕەقیب ئاغا سەرۆکی عێلی سوورچیکان ئەوکارە دەکری. لەئاکامدا ئەوکارە قەوەت و هێزی عەراقیێ پتر کرد، واتە شارەزایەتیو، پێزانینی کوردەکان لە ناوچەکەدا، بێشک بارزانیکان بێهێزدەکات. وادیاربوو کە سەرۆکە کوردەکان لە لایەن حکومەتەوە بەپوول کردراون.

## ١٧ ــ تەواو بوونی هێرش

لەهەوەلی ئوکتوبری ١٩٤٥دا هێزی دەولەتی کێوی پیریسی گەمارۆدا، وە لە٧ی ئوکتوبرشدا هەروەها ناوچەی بارزان گەمارۆدرا.

بەلام لەسەر ئەوەشڕا، عەراقیکان نەیان توانی تۆلەی شکانی پێشوویان بکەنەوە، وە هەربەوجۆرەی کە ژێنیرال رانتون گوتبووی، هێمنایەتی لە مەلبەندی

بارزاندا بەئاکاروکردەوەی نیزامی پێکنایە،وە پێویستە لە ڕێگای یاساو،کردەوەدا لە نەتەوە عەشیرەتەکان چاوەدێری بکرێ.

ئینجا بارزانی تانەو،رخنەی لێگیرا،وە لە ئاسۆی سەرەوەی سنوور دا واتە لەشمال،تورکەکان سنووریان لێبەست،پاش حەوتوێک هەواڵێکی رەسمی ڕایگەیاند کە بارزانی تووانیویێتی لەگەل هێندێ لە پارتیزانو، پیشمەرگەکانی،بو وڵاتی ئێران پەنابەرێ.

## ١٨ ـ دەنگدانەوەی شەڕ لەدونیادا (لەبەینی نەتەوەگاندا)

گەیشتنی ٢٠٠ تا ٤٠٠ مرۆڤی پیشمەرگەی کوردی ئێران کە لە سنوری عەراق ـ ئیران لە ٢٠ی ئوتی ١٩٤٥،ڕادە بردن وە بە یارمەتی بارزانی دەهاتن، هومێدوارێکی باشی بە کوردەکان دابوو،وە ئەو هێزە دەبوو لە کێوەکانی بارزاندا نشتەجێبن،جا ئەو مەسەلەیە لە دویناد‌ا لە نێو نەتەوەکاندا دەنگی داوە.

بەشوێنی ئەو هەواڵەدا حەوتوێک پاش،بالوێزی شورەوی دەریبڕی کە کوردەکانی ئێران کە لە شوڕشی بارزانیدا،هاوبەشیان کردوە لەگەل ئێمـــە هاتوچۆیان هەیە. پاش دەڕۆژان لەلایەن حکومەتی ئەمریکاوە،بەیاننامەیەک وەدەر کەوت کە ((ئێمە لەوکارە دڕدۆنگین،وە مەبەست بەهەڵستانی و ڕاپەرینی شمالی عەراق نیگەرانن!

لەکاتیووتو،وێژ لەگەل پیاوە ژامیارەکانی باڵوێزی بریتانیا لـــە واشنگتندا،سەرۆکی بەشی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست، لە بەشی دەولەتدا،مەسەلەی لایەنگرتنی دەولەتی شورەوی لە شوڕشی شمالی عەراقدا باسکردوە بەو نەتیجەیە گەیشت کە هاوبەشی کردنی هێزینیزامی دەولەتی ئنگلیس لە شوڕشی شمالی عەراقدا،بەهیچ چەشنێک مەسەلەی شەرقی ناوەڕاست کە هێستا چارەسەری نەکراوە هەروا ماوەتەوە جێبەجێ ناکات"! ٣٥

بوئەمریکا وەک عەراقیێکان ڕوون ببوو کە: بێگومان کوردەکان لەیارمەتی دەولەتێکی "دەرەوە" بەشدار دەبن،وە مەسەلەی چوونی ئارچی ـــــ روزوێلت وابەستەی نیزامیوە ئاجوودانی ئامریکا لەعەراق بۆ کوردستان دیـــارە زۆر بەمەترسی وشکەوە چاوەدێری لێدەکرێ.

پیاوە کاربەدەستەکانی بریتانیا لە بەغدادا پێیان لەوە نابوو کە دەولەتی شورەوی لەمەسەلەیکوردستاندا بەشدارە ،وە کاتێک لە ئاخری سێپتامبری١٩٤٥ سێرریدربولارد بالوێزی بریتانیا لە تاران ،لە لایەن هەواڵێکی رابەری لە سەرۆکی جەنگی ئێران هاوالی وەرگرتووە کە سەرۆکی گەورەی نیزامی (قازی مەحەممەد لە مهاباد لەچاوپێ کەوتنێکی لەگەل نمازعەلییوفی،ووتو وێژی کردوە کە دەولەتی شورەوی تەسمیمی هەیە کە یارمەتی نیزامی بۆ بارزانی بنێری،وە ئنگلیسێکانی دانشتوی بەغدایەش لەوچاوپێکەوتنەوەیە کە بەراستی بەرێوە بردراوە هەواڵیان وەرگرتووە. ئینجا ئەوەیان سەلماند بوو کە چاوپێکەوتنی قازیمەحەممەد لەگەل ئەفسەرەکانی شورەوی کارێکی عادیە،وە هێندە گرنگنیە. دەگونجێ بڵێن قازیمەحەممەد "شایەکی بێتاجو ،تەختی کوردستان ، وە سەرۆکی کمیتەی کوردان لەمهاباد دایە. وە پیاوێکی گەورەیە زۆرپیاوانی ڕامیاری کەدێنە ئەو ناوچەیە چاوپێکەوتنێکی لەوی دەکەن. ئنگلیسێکان دەیان گوت کە ئەمریکایەکان دەبێ لەهەوالەکانیاندا ڕایبگەیینن تا مەسەلەکە بۆخەڵک ڕوونبێتەوە،وەرووانگەی ئەوکارە بەچاکی دووائیبگیرێ. ٣٦

## ١٩ ـــ بارزانیو، حیزبیهیوا

پێشمەرگەکانی مەلامستەفای بارزانی لەپەناو پەسیوی کێوەکانی بارزاندا ، بێخواردنەمەنیو، تفاقو، بێپوولو، پارە، بێدەرمانوە بێ سازوبەرگی نیزامی مابوونەوە،وە تەنیا جێگایەکی کە دەبوو هومێدیان بێت،حیزبی هیوا بوو. بەلام مەلامستەفا هاتوچۆیی لەگەل دوولایان هەبوو، یەک لەگەل حیزبی هیوا،کە ئەویش زۆر بەباشی ڕوون نەبوو،وە هاتوچونیدی لەگەل ئینگلیسێیان بوو. براگەورەی خویی عەبدوسەلامی کردە پیاوی هاتو، چۆیی بەینـــــــی خۆیو،بریتانیا،وە مەبەستی لەوکارەش ئەوە بوو کە ئاکارو ڕەوەشتی خۆی بەچەشنێکیدی لەبەرچاوی ئنگلیسێکان چاک بکاتەوە،وە تۆڵەیان بۆ بکاتەوە،وە ئەوجار بەقسەیان بکات.

میلیشێکانی هیوا هیچ یارمەتێکیان لە لایەن دەوڵەتی ئمپریالیستی بریتانیا نەدەوست وەرگرن،بەڵکو ئەگەر یارمەتیان لەدەرەوە وەرگرتبایـــە

دەیانەویست لە لایەن مۆسکوەبێ واتە لە دەولەتی شورەوێ وە کە دەتوانێ لە لای کوردستانی ئێرانەوە بیکات. بەلام مەسەلەیەکی کە گرینگ بوو، ئەوە بوو کە ئایا بۆچی ئنگلیزێکان لەوبارەدا بە پێچەوانەی ئەمریکایەکان بزوتونەوە، وە نەخشی ڕاستەقینەی شۆڕەویان لەوکارە دا بەچاکی نەکوتووە. ئەوەی شایانی باسەئنگلزیکان چاوە دێری ئەوەیان دەکرد کە لەئێران کەم و زۆر دێ شتێک بەهەستبێت، بەلام ئنگلزێکان تاکو بە باشی لیێ نەکۆڵنەوە وە بەباشی نەزانن کە شورەوی بەڕاستی لە جێگایەکدا ئاژاوە سازناکا، وەک ئەمزیکایەکان لە خۆڕا لەدەهول و، زوڕنا نادەن، وەهات و چۆی خۆیان لەئێران دا لەگەل شورەوێکان لەبەر چاو دەگرن. ئینجا هەرچێک بێ بارزانی نێوانی خۆی لەگەل هیوا لە دووررو نیزیکەوە ڕا دەگری، لەکاتێک دا کە لە هەوەڵەوە نەیسەلماند کە تاقمێک لەو حیزبە بێتەبارزان وە هەروەها پیێی وابوو کە ئەوکارە چەلێ زووە. وە تەنیا لە سالی ١٩٤٤ دا بوو کە بارزانی دەیسەلمێنێ کە تاقمێک لەناسیونالیستە گەنجەکان : وەک [٣٨]

ئەفسەر عیززەت عەزیر، کە یەکێک لە ئەفسەرە ڕابتەکان بوو، کە مەجید مستەفا بەئەستۆی دا بڕی بوو، بۆ ئەوەی کە لە "هێمنی و دابن کردنی" کوردستان دا تێکوشی، وە هێندێ لەئەفسەرەکانی دیکە، وەک سەرهەنگ دووەم ئەمین ڕەواندزی وە کاپیتان عەبدول عەزیزی گیلانی کوڕی شیخ عەبدوللا (وە کوڕی چوکیعەبدولقادر) میرحاج، لە ئاکرا، فواد عارف (نەوەی مەجید مستەفا) لە پشدەر مستەفاخۆشناو مەجیدعالی، بێتە لای بارزانی. ئەوەی کە ئاشکرا بوو مەجید مستەفا بۆ خۆی لە ئەندامانی پارتی هیوا نەبوو، بەلام ئەوە نەزاندراوە کە چۆن تەواوی ئەو تاقمەی کە ناردویەتی، لە ئەندامانی هیوا بوون (جگەلەفواد عارف) کە وا بوو وادیارە، کە لایەنگری ئەو پارتێ بووە.

ئینگلزیکان هەوڵیان دەدا کە بەهەرچونێک بی لە بزوتنەوەی ناسیونالیستی کوردەکانی عەراقدا دەستیان هەبێ، بەلام گومانی دەبرد کە ئەوانە ناسیونالیستێکن کە بۆ لای چەپ چوون.[٣٩] سەرئەنجام بەداخەوە، ئەو بزوتنەوەیە، بەچەند شاخەولک و پۆک بەش کراو دژی یەکتر دەست بەکاربوون وە هەروەها شۆڕشی بارزانی گەیشتە جێگایەکی عاستەم چونکە هێندێ لەوان دژی بارزانی کاریان دەکرد.

یەکیک لە نەخشی گرینگی میلیشیانەی هیوا ئەوە بوو کە هەوڵبدا وە بگەڕێ کە کوردە پوڵدارە دەولەمەندەکانبەبینیێتەوە و،بۆ بارزانی پوولیان لی وەرگرێ وە بەوجورە ئەوان بۆلای یارمەتی نەتەوەکەیان بکێشێ. ٤٠

ئینجا بەشیزۆری لە گەنجەکانی حیزبیهیوا،بارزانیان وەک (شێخێکی مورتەجع) چاو لێ دەکرد. بەڕاستی بارزانی بەشیزۆری لەپیاوە گەورەکانی بەناو بانگی کوردی دڕدۆنگ کردبوو، وە ئەوان دەیانگوت کە بارزانی شوڕش گێڕیکی خەتەرناکە!

یەکێک لەوانە شێخلەتیف بوو کە لەگەل مەلامستەفا نێوانی ناخۆش بوو کە چارەینەماو، لە شۆڕش لایدا،وە هاتە شاری سەردەشت دانشتو،بۆخۆی چەشنە سەربەستیێکی بەهەستهێنابوو.

سەرئەنجام لەکۆبوونەوەیەکدا لە بە غدا کە لەژێر چاوەدێری پارتی هیوا پێکهات، فوادعارف شیخلەتیفی تاوان بار کردو،گوتی کە "لەگەل شورەوی هاتو،چۆی هەیە." وە هەروەها بەدووای ئەوەدا دوو دەولەمەندی کورد، عەلیکامل وە تەوفیقوەهبی (وەزیری ئابووری لە حکومەتی حامیدپاچەچی پاش لابردنی نوریسەعیدلەژوئنی١٩٤٥ادا)،وە دامەزرێنەری سازمانیهیوا،کە ئەوانە داوای پوولیان لە (دەولەتی شورەوی واتە دۆستی بارزانی کردوە) لابردن.[٤١] هەر لەو کاتەدا ڕەفیق حلمی ناسیونال سۆسیالیستیکورد کە لەلای باڵی ڕاستاوە فشاریان بۆ هێنابوو،وە بە چاوی کومونیست تەمەشایان دەکرد لە سازمانی هیوا وەدەرناندرا.

## ٢٠ ـ لێک بلاوبوونی "هیوا"

بەلام باڵی چەپی بزووتنەوەی ناسیونالیستی کورد،هەروەک باڵی ڕاستی بەشبەش بوو، وە لەنێوراستی هاوینی١٩٤٥، "هیوا"بەچووار فاکتی جوربەجور بەشبەش کرا:

ـ شۆڕش،کە ئەندامەکانی ٣٠٠ تا ٣٥٠ کەس بوون[٤٢] کە"پارتی کومونیستی عەراقیێ" پێکهێنا، وە ڕۆژنامەیەکی بە نێوی شۆڕش بلاو دەکردەوە،وە حیزبەکەش هەر بەو نێوەبوو.

سەروکی ئەو تاقمە عەلی عەبدوول‌لا ، نوری شاویس، جەمال حەیدەری ، (بەعس لەسالی ١٩٦٣ شەهیدی کرد ) وەسالح حەیدەری بوون

ـ "ڕزگاری" کە ٥٠٠٠ تا ٦٠٠٠ ئەندامی هەبوو کە مرۆڤەکانی لە پیاوە کوچە و بازارێکان بوون [٤٣] کە لە داهاتوودا ئەو دەستەیەبوو بەحیزبی دیموکراتی کوردستان‌ی عەراق کە بەسەرۆکایەتی‌و ، ڕابەری دوکتور جەعفەر عەبدوول کەریم (برای حەبیت کەریم سێکرێتیری‌گشتی پارتی دیموکراتی کوردستان‌ی عەراق لەداهاتوودا پاش‌بوحرانی ١٩٦٤) وە دوکتور سەدیق ئەترووشی ،وە تاهاموحییەدین (نایب‌ی سەروک کۆماری عەراق لە سالی ١٩٧٥) بوو .

**ـ ئازادی "ڕێ ڕاست"**

کات‌وجێگای هیوا لەجەبهەی ناسیونالیستی کورددا ـ وە بەتایبەتی هات‌و ،چو لەگەڵ مەجید مستەفا یەکێک لەمەسەلەکان بوو کە مەبەستی بڵاوبوونی و تەقینی هیوای بەهەست‌هێنا ،وە بە تایبەتی هەروەها هات‌و ،چۆ لەگەل پارتی کومونیستی عەراقش یەکێ لەمەسەلە هەرگرنگەکان‌ی بڵاوبوونی هیوابوو ، .

**٢١ ـ (پارتی کومونیستی عەراق ) وە مەسەلەی کورد :**

بەراستی پارتی کومونیست لەسەر ڕێبازی بزوتنەوەی خۆ ی ،وە لایەن‌گری لە نەتەوەکەمەکان ئەسەرێکی باشی لەسەر خەڵک دانا ،بە گوێرەی هێندێ لە هەواڵەکان ،کوردەکان لەسەدا سی‌وپنج تا ٤٠% ئەندامی ئەو حیزبە بوون ،وە هەروەها گوتراوە کە لە سەداسی‌کەس٣٠% لەخەلکی عەراق ئەندامی ئەو پارتیە بوون . [٤٤]

ئەندامانی ڕزگاری ،وە شۆڕش لە سازمانی هیوادا پتریان لایەن‌گری پارتی کومونیستی عەراق بوون هەل‌و ،مەرجێکی کە پارت بۆی هەل‌کەوت‌بوو ، لە سەر مەسەلەی کورد لە دوو مەبەستان لایەن‌گری دەکرد ، لەلایەکەوە لەمافی کورد بەرگری دەکرد ،وە لەلایەکی دیکەشەوە داوای کورد تا ڕادەیەکی بەحەق دەزانی .

لە تڕاکت‌تێکی کەبە زمانی عەرەبی‌و ،کوردی بڵاوی کردەوە ،وە هەروەها

لەوکاتەیدا کە هێستا بارزانی سەرۆکی هێزەکانی کوردی لەبەرانبەر هیزەکانی نیزامی عەراقیدا بوو، دەنگی خۆی بەوجورە بلندکردکە: "کمیتـــەی بەڕێوەبەری پارتیکومونیست ،هێرشی نیزامی دژی کوردەکان مەحکوم دەکات ،وە ئینگلیس بە گوناحبار دەزانێ کە نایەوێ ئەوشەڕە بوێستێ،وە ئازادی کوردەکانی لەبەندیخانەکاندا داوادەکات ،وە دەیەوی شەڕ ڕاوەستێندرێوە یاسای هاوسەریو، هاوبەشی لەشمالدا بەڕێوەبچی، لەبەسەرهاتەکانی و لات بەچاکی بکۆلێیتەوە.

بەلام لەبەیاننامەکەدا باسی لەسەر مەسەلەی مافی ناوخویکورد ،چ (ئوتونومی)وە چ مافی گشتی نەتەوایەتی (ئستقلال) نەکرا بوو!

وە هەروەهالەوتراکتەدا بو سەرلقی، شۆڕش،وە ڕزگاری هەلمەتی بــرد، بوو ،وە ڕخنەی گرتبوو کە داوای "جۆیبازی" دەکەن!

پارتی کومونیست لەسەر مەسەلەی کورد بەقوولی دووابوو،وە لەلایەن ئەلقاعدە وەهێندی نووشتار بلاو ببوە. ٤٧

لەکاتێکدا کە تێژی کوردە کومونستەکانی دەبردەوەپاشێ کە دەیانگوت: هەر نەتەوەیەک پێویستە کە پارتی کومونیستی خۆی ڕێوشونێکی جوێیـــازی هەبێ ،بەلام پارتی کومونیستی عەراق دەیگوت لەکاتێکدا کە مافی تەواوی نەتەوەکان وەک کوردو،عەرەب لەبەرچاوە وە لەڕادەیەک دا تەمەشـــای دەکین ،بەلام هەلوێست ئەوەیە کە لەپێش هەمووشتێک دا دژیئمپریالیسم خەباتبکرێ،چوونکە خەباتیچینایەتی جودا لە خەباتی ئمپریالیسم نیە، وە هاوکات پێویستە ئەو خەباتە بەڕێوە ببردرێ،جا لە چوارچێوەی عەراقدا پێویستە هەردووک لقی پارتی کومونیستی کوردو، عەرەبو،نەتەوەکانی دیکە، کە لەژێر ئالای کومونیستدان ،وەدژی ئمپریالیسم خەبات دەکەن ،پێکەوەبن ،وە جودا لەیەکترنەبن.

مەسەلەی بزوتنەوەی کومونیستی انترناسیونال لەگەل کـــــــوردە ناسیونالیستەکان مەسەلەیەک بوو کە راوێژی زاری کوردەکانبوو،وەلە بەینی بزووتنەوەی کومونیستی جیهانیو، ڕاپەرینی کوردەکان ئەوپرسیارە هەرمابۆوە.

سەرئەنجام لەسالی ١٩٤٦ دا پارتی دیموکراتی کوردستان

کە جوی بۆوە ،کومونیستەکان پێکگەیشتنەوە. بەلام بارزانی کاتێک کە لە ئوکتوبری ١٩٤٥دا گەیشتە سنووری ئیران لە مەجموعدا هاتەوە نێو بزووتنـــــەوەی

کوردستان،وە وا ڕوون ببۆوە کە لە داهاتوودا "ژەنیرال" بارزانی لە ڕوو بە روو بوون لەگەل ئەندامانی پارتیکومونیست زۆر ڕووی خۆشی نیشان نەدەدا.

## ۲۲ـ گەیشتنی بارزانی بو ئیران ، هەولێن چاوپێکەوتنی لەگەل شۆڕەویێکان

مەلامستەفا لەپێش ئەوەیدا کە بگاتە ئیرانێ ، سێ پیاوی نارده لای قازی موحەممەد ، وە ڕایگەیاندبوو کە لەگەل پێش مەرگەکان و، مال و مندالی خۆی دیتە ئیرانی ـ بەڕاستی عێلو،عەشیرەتێکی ۱۰۰۰۰ مرۆقی ! لەوکاتەوساتەدا بێتە ئیرانوە بمێنێتەوە،کارێکی واسادە نەبوو،ئینجا قازی موحەممەد بەوکارە بەلێنی نەدەدا، بەلام بارزانی وەڕی کەوتبوو... وە چاوە ڕووانـــــی وەلام نەمابووە ! ۴۸

پاش چەنڕۆژێک بارزانی بۆ هەوەلێن کەرەت چاوپی کەوتنێکی لەگەل شورەویکان کرد. هەروەها نابێ لەبیربچێ کە هەوالێ بەرەکانی ئنگلیس قەت چاویان لەسەر بارزانی هەل نەدەگرت.

بارزانی هاوڕێ لەگەل میرحاج وە هەمزە عەبدوولڵا چاوبێ کە وتنێکیان لەگەل ژەنیرال لیوبۆفی شورەوی کرد: "کە هاتنی بۆ ئیرانیێ بەلێنی دابوو"

بارزانی لەگەل پیاوە چەکدارەکان کە هاتبوو، پێشنیارێکی لەگەل هەمزەعەبدوولڵا لەپێش لیوبۆف، دانا کە بریتی بوو لەوەکە پیاوە چەکدارەکان هەروەها چەکدارو، ئامادە بمێننەوە،وە کەسوکاریشیان جیگیرببن.

پاش دەڕۆژان ژەنیرال لیوبوف وەلامی داوە کە بارزانی پێویستە تەنیا ۴۰پیاوی چەکداری بمێنیتەوە وە بچێتە ناوچەیەکی دوور ولە بەفری[1] دا قوژبنیکی بۆخۆی بگرێ. ۴۹

لەئاکامدا ڕاگەیاندنی پیکهاتنی کۆماری مهاباد لەژانوییەی ۱۹۴۶ ئەومەسەلەیەی لەبار چاو نەگرت.

۱) بەفریواتەزستانی

## فەسلی ٢

### شۆڕەوی لە کوردستانی ئێران‌دا ، وە کۆماری مهاباد

مهاباد بەراستی بەهیچ‌جورێک نەدەزاندراو، مەعلوم نەبوو کە ڕۆژێک شاری مهاباد ببێتە کانگا و ناوە ڕووکەی جوولانەوی کورد ،وە لەنێو شەڕی دووهەمی جیهانی‌دا نەخشێکی گرینگ‌و ،گەورە بەدەستەوە بگرێ.

گوتراوە کە سەرچاوەی بزوتنەوەکەی مهاباد لەشاری سولەیمانیوە یە کە بێ‌گومان ئەسەری لەسەر ڕاپەڕینی ئەو شارە داناوە.

خەڵکی شاری مهاباد موسلمانی سوونی مەزەبن. ڕەزاخان ئەو نیوەی لەسەر دانا، دەنا لەپێش‌دا ساباڵغی نێوبووە. لە سالی ١٩٤٥ی زایینی‌دا (١٣٢٤کوچی) شاری مهاباد جێگایەکی چووک بووە،وە ژمارەی دانشتووانی لە ١٥٠٠٠ کەس پترنە بووە، ئیدارەکانی دەستوری لەشاری ورمێ کە ناوەندی ئوستانە وەرگرتووە،دەگونجێ بڵێن کە ئەوشارە لەپێش‌دا نەخشێکی ڕامیاری‌و، ئابوری نەبووە.

ڕێبواران کە لە سەدەی ١٩ زایینی‌دا لەوشارەوە ڕابووار دوون‌و، بۆ شارەکانی ورمێ‌و، سنە چوون گوتویانە کە تەنیا ئاوەدانیێک بووە کە ٥٠٠٠ مرۆڤی تێدا دانشتووە.

ئەو ڕو ژمارەی دانشتووانی شاری مهاباد، زۆر زیاد بووە، بەڵام ئەو شارەش وەک شارەکانی دیکەی ئێران چاوی‌لێ نەکراوە،وازی لەش‌ساغی باش‌نیە، نەخۆشی لەو شارەدا زۆرە،جا هەرچێک‌بێ مرۆڤ چاوەڕووانی‌ئەوەی نەدەکرد کە ڕۆژێک ببێتە" پێ‌تەختی" کۆمارێک کە دەولەتە هەرە بەقودڕەتەکانی جیهانی

لەمەترسی باوی.

## ٢ ـ بنەماڵەی قازی

بنەماڵی قازی موحەممەد کە شێخو، قازی بوون، لەنێو دانشتووانی ناوچەی مهاباددا، زۆر بەرێزو، حورمەتو، گەورە بوون لەساڵی ١٨٣٠دا بابەگەورەی قازی‌موحەممەد،واتە شێخ‌ئەل مشایخ،لەهۆزو، عەشیرەتەکانی ناوچەی (خۆبات) لە نزیک شاری دیوان‌دەرەدا کۆبوونە وەیەکی پێک‌هێنا،کە لەو کۆبوونەوەیەدا، داوای "جەبهەی یەکێتی" دژی ئنگلیس کرد وە هەروەها ئازادی کوردستانی‌شی پێشنیار کرد. ١

لە ساڵی ١٩١٦زایینی‌دا قازی‌فەتاح‌براچووکەی‌باپیری قازی‌موحەممەد بۆ پاراستنی شاری مهاباد لە بەرامبەر هێرشی ڕووسیەیەی تزاریو،تورکە عوسمانێکان نەخشێکی گرینگی بەدەستەوە گرتو، لەو بەینەدا لەگەل یەکێ لە کورەکانی کوژرا (١٩١٦ ــ ؟ ١٨٣٢)

قازی عەلی بابی قازی موحەممەد (ساڵی ١٩٣٤ کۆچی دووائی کرد) لە پیاوەکانی هەرە زاناو بە ناوبانگی ئەو ناوچەیە بووە،وە برای وی سەیفی‌قازی (وەفات ١٩٤٤) لەساڵی ١٩٢٥ دا سازمانێکی نهێنی بەنێوی ( بزوتنەوەی موحەممەد ) پێک هێنا، ئەو سازمانە لەگەل بزوتنەوەی شیخ موحەممەدی خیابانی لە ئازربایجان داهاتو،چۆی هەبوو.

ئینجا لەووختەدا بوو کەسەیف ئەل‌قوزات هۆنراوەیەکی لـــەبارەی (ڕاپەرینی‌تەورێز) لەرۆژنامەی ئازادستان‌داچاپ‌کردو،بلاوی‌کردەوە.

بنە ماڵەی قازی موحەممەد هەمووبان،زاناو،ڕووناک‌بیر و موسولمانو، کوردخۆشەویست‌بوون، چەن پارچە ئاوائێکیان لەناوچەی بۆکان‌دا هەبوو، وە لەرێزە بنەماڵە دەولەمەندەکانی کوردستان ژماردراوە.

---

١) *ارتباط لەگەل رەحیمی قازی ١٩ مارس‌ی ١٩٧٦ لەباکو لەلا یەن‌نووسری ئەو مێژوویە*
وەرگیر م ــ ر

بنە ماڵەی قازی مەحەممەد
شێخ المشایخ
قازی قاسم
قازی فەتتاح
١٨٣٢؟ ١٩١٦
قازی عەلی
١٩٣٤ ـ ؟
سەیف ئەل قوزات
١٩٤٤ ـ ؟
رحیم
لـ باکویە
سەیف
١٩٤٧ ـ ١٩١١
قازی مەحەممەد
١٩٤٧ ـ ١٩٠٠
سە در ١٩٤٧ ـ ١٩٠٨
حەسەن
عەلی وشەش کچ
کەمال ـ عەبدوولا وەکچێک

### ٣ ــ هاتنی ئینگلیسو، شۆڕەوی بۆئێران

لەسالی ١٩٤١دا هێزی شورەوی لەلایەک،وە هێزی ئینگلیس لەلایەکی دیکەوە خاکی ئێرانیان داگیر کرد، جالە و هەلو، مەرجەدابوو کە شاری مهاباد پشکوتو، شانازیو، بەختەوەری ڕووی تێکرد. لەوکاتەدا هێزی سۆویەت لەپاش ئەوەی کە لە سنوور تێپەڕی وە هات شاری خۆیو، ماکۆی گرت،بۆ لای جنوب هاتە خوواریێ وە تا شارەکانو، مەڵبەندی بانەو،سنە ڕۆیشت وە لە ڕێگاکانی شاری میاندواو، شنووە، هاتە شاری مهاباد.

لەولاشەوە ئنگلیس، چەتربازی لەمەیدانی نەفتی خوزستان هێناخوواری، وە جنوبی خوزستانی تا کرمانشا واتە تا دەگاتەوە سەرڕێی بەغدایە، شارەکانی خانەقین، تارانو،سنەی داگیر کرد. ئینجا لەناوچەکانی بەینی دوو داگیرکەرەکاندا یانیمهاباد ــ سردشت ــ بانە ــ سقز ــ دیواندەرە) هیچ قودرەتیک دەستی بەسەر دانەگرتبوو،بەلام ئەو مەڵبەندە لەسەر ئەوەشڕا هەردوک دەولەتە گەورەکان چاویان لەسەر هەلنەدەگرت. لەئاکامدا سۆویەت لەشمالدا تا شاری مهاباد وە ئنگلیسش تەواوی و لاتی جنوبی ئێرانی داگیر کردبوو. ٢

### ٤ ــ ئنگلیسێکان، کوردەکان، سۆویەتەکان

پاش تیۆەرسوورانی ٢٥سال لەشەری جیهانی هەوەلێ،هێندێ لەئەفسەرە ئنگلیسێکان لەوەی دوو دلو،بەدگومانبوون کە ئایا بەراستی پیویستە کارەساتەکانی پێشوو دووپاتە بێتەوە. کمیتەی فەرماندەرەکانی ستادی ئنگلیس،وە کاربەدەستەکانی نیزامیو، کشوەری،لەئێران لە دوو بڕواڕنامەدا لە ئەفسەرەکانی ئنگلیسی داوا کردبوو کە نەزمو، تەرتیب ڕابگرن. ناوەرووکەی ئەو بڕوارنامەیە بەو جورە بوو: مەبەستی دەوڵەتی ئنگلیس لەوکارەدا ئەوەیە کە بەهەر چەشنێک بێ

١) پاش شۆڕشی ئیلامی نێوی کرمانشابۆتە باختەران م ــ ر

"لایەنگری لە دەولەتی ناوەندی ئێران دەکات" وە بەهیچجۆرێک نایەوێ بە سوودو،قازانجی کوردەکان ببزوێتەوە،چوونکە جووڵانەوەی کوردەکان "ڕەنگی ئرتجاعی هەیەو( ئێمە ناتووانین ئاکارو کردەوەی ئەوان بەچاک بزانیـــنو، چاوەدێری لێبکەین" دەست تێوەردان لە کاروباری کوردەکان لە لای ئێمەوە،جگە لەوەی کە کەڵک و قازانجی تێدانیە،بەڵکو مەترسیشی تێدا هەیە. ئەگەر ئێمە خۆ لەکاری کوردان وەردەێن،بمانەوێیان نەمانەوێ،دەبێ بۆ هێمنو، ئەهوەنکردنی کێشەو، هەرای عێل و عەشیرەتەکان بینیـەپێشێ جا ئەوەش لە ئەرکی سەرشانی مەدانیە. هەروەها لەو بڕواڕنامەیەدا کمیتەی فەرماندەرەی ستادی ئنگلیـــس ڕایگەیاند بوو کە تێ هەڵقوتانی ئێمە لەکاروباری کوردەکانی ئیران، تورکیە... بێگومان دەبێتە هوێ ئەوەکە لەلایەن هێزەکانی شورەوی لەئێراندا، بەسەرهاتێک پێکبێت. ۳

ئنگلیس کە ئێرانی داگیر کردبوو،مەبەست بە کاروکردەوەی ستراتێژیکی بوو، وە ووتەو، قەولو،قەرار وابوو کە پاش تەواو بوونی شەڕی جیهانی لەئیران بچێتە دەرێ.

جا هەر لەبەر ئەوە بوو کە هەوڵیاندەدا کە هاتو،چۆو، هەڵستانو، دانشتنیان لەگەل کوردەکان بەخۆشیبێ،وە هەروەها شتمەکو،ئەسبابێکی کە لەڕێگای ستراتێژێکی بەغدا ــ خانەقین ــ کرمانشا، هەمەدان ــ تاران بۆ شورەوی دەچێ، بە هێمنی و ئارامی بەو مەلبەندەدا بڕوا،وە بە جێگای خۆی بگات.

ئنگلیس بۆی ئاشکرا ببوو کە دەوڵەتی شورەوی لە ئازربایجان دا خەریکی کاروبارێکە،وە ئیتر ئازربایجان بە (داخووازی خۆی) دەبێتە یەکێ لە کۆماری تازەی یەکێتی شورەوی. ئەو هەواڵانە،وە هەروەها مانەوەی هێزی شورەوی،وە بەتاڵ نەکردنی ئازربایجانی ئێران بۆ ئنگلیس دژواریو، چێوتی دێنا پێشێ، لەولایەشەوە بۆ خۆشی جنوبی ئیرانیێ داگیر کردبوو، وە ئەوەشی دەزانی کە ئەگەر شەڕ بە قازانج و سەرکەوتنی ئێمە تەواو بێت بەراستی دەولەتی شورەوی ئەرکێکی زۆر گەورەی لەسەرشانی ئێمە هەیە، سەرئەنجام ئەو بەسەرهاتـــەو، هەڵکەوتەی لەخەلکی ئێران نەدەزانی[۴]،وە لەئاکامدا کارو، کردەوەیئنگلیس وە بزوتنەوەی ئەوان لەگەل کوردەکان،بەو جێگایە گەیشت کە قازیموحەممەد بوو بە لایەنگری شۆڕەویکانو، سەرۆک کۆماری مهاباد.

سوویەت
ماکو
ئەرەس
خوی
قوتور
ئەزدیکان
شەکەریازی
چەریق
تورکیە
شاپور
تەبریز
بەحری ورمی
مە راغە
ئیران
میاندواو
ئوشنو
مهاباد
بوکان
سەردەشت
سەقز
زابی چکولە
بانە
دیواندرە
عراق
سەنەندەج
حەلەبجە
هەمەدان
خانقین
کرمانشاه
کوردستانی ئیران
سنوری ناونەتەوەئی
0
50
100 Kms

### ٥ ــ قازی موحەممەدو ، سۆویەت

بۆ هەوەڵین‌جار لەڕۆژی ٢٥ی سێپتامبری ١٩٤١ دا واتە دروست‌پاش مانگێک‌ڵرگرتنی ئێران لەلایەن شورەوی وەئینگلیسێکانەوە ، دوو ساحێب مەنسەبی ئامریکا و ئینگلیس لەشاری مهاباد چاوپێ کەوتنێکیان لەگەل قازی موحەممەد کرد قازی‌موحەممەد نەخشەی "یەکێتی کوردستان )ی بۆ ئەوان باس‌کرد ، وە بۆی شەرح‌دان وەلەوانی پرسیارکرد کە "چۆن دەکرێو ، دەتووانێ لەگەل سەرۆکی فەرماندەری پایە بەرزی ئینگلیس چاو پێ‌کەوتنێکی هەبێ ؟"

ئەفسەرە ئینگلیسێکە پیاوێکی "سڵو ، ویشک"بوو ، گوێ خوێ بوو قسە شل‌نەکرد ،وە بەوکارە بەڵێنی‌نەدا .

جا بەشوێنی ئەوەدا کە (ناخوشی )و ، ناکۆکـــــــی هێنا گۆڕێ ، قازی مەحەممەد ، لەگەل شۆڕەوێکان دەستی بەووت‌و ، وێژی ڕامیاری کرد .٥

سەرئەنجام ئەوکەڕەتە بۆ دووهەمین جار بەخاترجەمێوە ، قازی موحەممەد لەگەل هاوالەکانی پایەبەرزی کورد ، بۆ شاری باکویە داوەت‌کرد .

### ٦ــ هەوەڵین سەفەری باوەڕ ، پیێکراوەکانی کورد بۆ باکۆ (نوامبری ١٩٤١)

دەگوترێ پاش ئەوەی کە شورەوێکان زانیان کە ئینگلیسێکان دانشتنێکیان لەگەل باوەڕپێ‌کراوەکانی کورد لەبۆکان‌دا پێک هێناوە ، سێ‌کەسی باوەڕپێ‌کراوی کوردیان هاورێ لەگەل دوو ئەفسەری موسلمانی خۆیان کەخەلکی و لاتـــی ئازربایجانی شورەوی بوون ، وەنێویان میرئەسلانوف ، وەعلی‌یەف بوون ، بەسوواری ماشێنی لەڕێگای تەورێزە وەبۆ باکۆیە نارد . ٦

وێژراوێکی دیکە رادەگەێنێ ، لەشاری‌مهاباد ٣٠ مرۆڤی باوەڕپیێکراوی کورد کوبوونەوەیەکەیان پێک‌هێنا ، بەلام لەگەل ئینگلیسیێکان هیچ کۆبونەوەیەک چاوەدێری نەکرابووە .

مەبەست لەوکۆ بوونەوەیە ئەوەبوو کە بزانن حەمەرەشیدخان کەدژی ئیران

هه‌لستاوه‌ته‌سه‌رپێ ، هه‌لۆێستی‌چیه . ئینجا هه‌رچونێک بێ ، گوتراوه که ده‌وله‌تی شوره‌وی میوانی جوربه‌جوری بۆ باکویه بانگ ده‌هێشت ، واته هه‌موو چه‌شنه پیاوی پایه‌به‌رزی باوه‌ڕپێکراوی سوونی مه‌زهه‌بی کوردی تێدابوو : قازی مه‌حه‌ممه‌د له‌مهاباده‌وه ، ئه‌میر ئه‌سعه‌دو ، حاجی بابه‌شێخ له‌مه‌لبه‌ندی بوکانڕا ڕه‌شیدبه‌گو ، زێرۆ، له‌لایه‌ن کورده هه‌رکیێ کانه‌وه، موحه‌ممه‌دی قاسملو (بابی قاسملو سێ کرێیتێری گشتی‌پارتی دیموکراتی کوردستان‌ی ئیران، له‌لایه‌ن کورده‌کانی ده‌وروبه‌ری ورمێوه ، وه‌هه‌روه‌ها مه‌حه‌ممه‌سدیق کوڕی تاهای شمیزنیان داوه‌ت کرابوون‌و ، چووبوون .

ئه‌و مرۆڤه باوه‌ڕپێکراوانه له‌ڕۆژی ٢٥ نوامبری ١٩٤١ تا ٥ی دێسامبری واته ١٠ڕۆژ له‌باکۆیه مانه‌وه، له‌و به‌نیه‌دا له‌جێگاکانی فه‌رهه‌نگی پێش‌که‌وتووی شاری باکۆ وه‌له کارخانه‌کان‌و ، زه‌ویوو ، کشت‌وکاڵی نموونه ، وه ته‌شیساتی نه‌فتی ، سه‌ربازخانه‌کان ،وه چه‌ن جێگای دیکه چاوپێکه‌وتنیان کردبوو . . . ،

پیاوێکی ڕامیاری ئینگلیس ،به‌ته‌وسه‌وه گوتویه‌تی ، که شوره‌ویکان ، دوو حه‌وتوو پێش داوه‌ت کردنی کورده‌کان بۆ باکویه، کۆڕێکی ٨ نه‌فه‌ره‌یـــان له‌بوورژواکان‌ی ته‌ورێزش هه‌ربۆو به‌رنامه‌یه داوه‌ت کردبوو. چاوپێ که‌وتنی ئه‌وکۆڕه کوردانه له‌و لاتی شوره‌وی زۆر جار یه‌ک به‌شوێنی یه‌کێ دابـــوو ، وه‌هه‌موویان له‌سه‌ر ئه‌وگومانه بوون که میرجه‌عفه‌ر باقرۆف سه‌ر کۆماری شۆرای سۆسیالیستی ئازربایجان ، مه‌سه‌له‌ی کورده‌کانی زۆر به‌مه‌ترسیوه باس ده‌کرد . ٧

له‌زمانی ئه‌میر ئه‌سعه‌د ده‌گێڕنه‌وه که ده‌وله‌تی یه‌کێتی شوره‌وی گوتویه‌تی که‌له‌باره‌ی نه‌ته‌وه بچوکه‌کانی‌جیهانی‌دا باش ده‌ڕوانێ ، به‌لام "هێستا کات‌بۆ دانی سه‌ر به‌ستی گشتی‌کوردستان چاک‌نیه ،وه کورده‌کان پێویسته نه‌ختێ چاوه ڕووان بمێننه‌وه . "

به‌شی زۆری له‌کوره‌کورده‌کان به‌گویی باقرۆف‌یان هه‌ڵ کێشا بوو که کورده‌کان هه‌ڵه‌ئێستاوه ، ده‌یانه‌وێ به‌مافی‌گشتی نه‌ته‌وایه‌تی خۆیان بگه‌ن ، وه باقرۆف له‌وپێشنیاره پێکه‌نینی هاتبوویه . ٨

هێندێکی دیکه له‌کورده‌کان گێڕابوویانه‌وه که‌باقروف گوتویه‌تی ده‌بێ سه‌به‌ر ، حه‌وسه‌له له‌ده‌س نه‌ده‌ن وه‌ڕۆژێک دێته‌پێشێ که‌ئێوه به‌ومافه ده‌گه‌ن . ته‌نانه‌ت ده‌گێڕنه‌وه که له‌وسه‌فه‌رانه‌دا که‌کۆڕه‌کـــان‌ی‌کورد بۆ شاری با کۆیان

کردبوو، باقرۆف لەنێو قسەکانیدا ڕایگەیاندبوو کە (پەیوەندیکی هاوخوێنیو، هاوڕەگەزی) لەبەینی ئازربایجانێکانی شورەوی وئیران داهەیە، وەئەوەی کە ئاشکرایە ئێستا کە دەبیندرێ کە 'سنوورێک لەبەینی دووئازربایجان دا کەهەیە نابێتە بڕینی ئاکاری فەرهەنگی و مەعنەوی، وەڕۆژێک دەبێ کەئەو دوو زەویە دەبێتە یەک. ئینجا ئەووتەیە بۆخۆی دەبوو بەهۆی ناخۆشی بۆ کوردەکان. ١٠

## ٧ ــ دەنگ دانەوەی جیهانی لەبابەت سەفەری باکۆ

چوونی کوردە باوەڕ پێکراوەکان بۆ باکویە لەدونیایە دا دەنگی داوە، هەرچند باڵوێزی شورەوی لەتاران گوتی کە ئەو سەفەرە، سەفەرێکی "فەرهەنگی" بووە، بەلام لەجەنگەی شەڕی دووهەمی جیهانی دائەوسەفەرەبۆهاوپەیمانەکانی شەڕی جیهانی، بوو بە مەسەلەیەکی گرنگ، وەباڵوێزی دەولەتی بریتانیا لەمۆسکۆ بەنێوی کریپس، لەمولوتوف، وەزیری کاروباری دەرەوەی سۆویەت داوا کرد کە پێویستە پتر لەوبابەتەوە ئێمە ڕوون کەنەوە (٢٥دیسامبری١٩٤١)! سێڕۆژ پاش سێرڕێدر بولارد، باڵوێزی بریتانیا لەتاران کەبۆ سەفەرێک چوو بو موسکــو ئەومەسەلەیەی لە مۆلۆتۆف دووپاتە کردەوە. مولوتوف لە٢٩ی دیسامبری ١٩٤١دا نووسراوەیەکی لەبارەی ئەو سەفەرەدا بەبالوێزخانەی بریتانیا دە داتەوە

نێوەرووکەی ئەو نووسراوەیە بەو جورە بوو: کوردەکان بۆخویان مەیلیان وابوو، چوونە باکۆیە، وەئیتر مەسەلەی سیاسی لەگۆڕێ دانیە.

هێندەی نەمابوو کە ئەومەسەلەیە ببێتە مەسەلەیەکی گەورەی سیاسی: سێر ئانتونی ئیدین هەوالو، نووشتارێکی کەپیاوە ڕامیارێکانی خۆێ ئامادەیان کردبوو بۆ مۆلۆتۆفی نارد لەوونووشتارەدا قامک لەسەر ئەوهەلۆێستە داندرابوو، کەبەڕاستی بالوێزی سۆپەت لەتاران‌دا، ئاگاو، خەبەری لەئاکارو کردەوەی ناوچە داگیر کراوەکانێکی کە ئێستا کە هێزی شوڕەوی تێیدایەنیەو، دەستەلاتی ناڕووا! ١١

## ٨ ــ ترسو خۆفی تورکەکان :

لەڕاستەقینەدا ئەوە تورکەکان بوون کە بوونە مەبەستی سەفەری کوردە باوەڕ پێکراوەکان بۆباکویە وە شۆڕەوێکانیان وادارکرد کە لەوکارەدا خۆتێوەردن وەتین وهان‌بدرێن . لە ٢ی دیسامبری ١٩٤١ تورکەکان دژی هێزی نیزامی بێگانە کە ئیرانیان داگیر کردبوو (بەبێ ئەوەی کە مەبەستی هێزی نیزامی شورەوی یابریتانیا)بێ، بەدەولەتی بریتانیای شکایەتێک تەسلیم کرد. ئاشکرا بوو کە ئەوشکایەتە لەبەر ئەوەبوو کە تورکەکان پێیان وابوو کە ئاکارو کردەوەی هێزەکانی نیزامی لەئێران‌دا ، دەبێتە هۆی ئەوە کە "کوردەکان بۆ وەرگرتنی مافی‌نەتەوایەتی هان بدرێن‌و، هەوڵ‌بدەن، وە کوردەکانی ناوچەی تورکیەش هەر لەئێستاوە دەستیان بەهێرشو، هەڵمەت کردوە، وەلەکردەوەدا هات‌وچۆی بەینی ئیران‌و تورکیە بڕاوە.

هەر بەوجورەی کە مرۆڤێکی سیاسی ئینگلیس گوتبووی، بەراستی ئاکارو کردەوەی کوردەکان نەبوو کە دەوڵەتی تورکیەیەی لەمەترسی‌هاویشتبوو، بەڵکو، رەفتاری شورەوی لەکوردستان‌دا بوو کە تورکەکان‌ی‌نیگەران‌کردبوو، ئەمما ئەوانیش وەک ئێرانیەکان لەوەی دەترسان کە بەئاشکرائی ئەوەی‌بڵێن وە لەگەڵ شورەوێکان ڕووبەڕوو بن.

## ٩ ــ دەنگ دانەوەی سەفەری باکۆ لە ناوچەکەدا

ئینگلیسێکان دەیان‌گوت کە بێ‌گومان دەولەتی شورەوی بەهۆی تەبلیغاتی خۆی پیرۆزێکی بەیایخی وەدەست هێناوە،جا بەوبونەیەوە لەناردنی مرۆڤی سیاسی بۆ مهاباد چاویان قووچاندو، بێ‌دەنگەیان کرد، وە ئەوناوچەیان لەژێر چاوەدێری شورەوی‌دادەژمارد. بەڕاستی ئەوشارەچووکە(نە شورەوی داگیری کردبوو، نەئینگلیس،وە دەولەتی ناوەندی ئیرانێش قودرەتی تێدا نە مابوو، کەلەنەکاو،کت‌و،پڕلەهەل‌کەوتێک‌دا بووبەکانگای‌ناوەندی‌و بەهەست‌هاتنی‌بزوتەوەی

تایبەتی ،وە لەمێژووی کورددا هاتەرێژەی بنەڕەتی ڕاپەرینەکانی کوردوکوردستان

## ١٠ ـ دووبەرەکیو، بەرهەڵستەکانی ناوچەئی

بەڵام تا ئاخر و ئۆخری سالی ١٩٤١ وە سەرەتای ١٩٤٢ هێستا مهاباد نەگەیشتبۆ ئەو کاتەی کە نەخشی قارەمانانەی خۆی کایەبکات. خەڵکی شاری هەر لەچاوە ڕووانی کاری قازیموحەممەدو، ئەمیر ئەسعەدی دیبۆکری دابوون کە ڕەقیبی یەکتربوونو، بەربەرەکانیان لەگەل یەک دەکرد.

هێستا چەن حەوتویێک لە داگیر کردنی ئێران لەلایەن دەولەتی شورەوی وە ئینگلیس ڕانەبرد بوو کە دەولەتی ناوەندی ئێران هەولیدەدا ،کە قازی موحەممەد کە پیاوێکی ناسرا و بەڕێز بوو بۆ ڕاگرتنی نەزمو، ترتیبی شاری دا بنێ ،ئینجا ئێران ئەوکارەی کردو، قازی کاروباری مهابادی بەئەستوی خۆیگرت.

لەو لایەشەوە، ئەمیر ئەسعەدو، هێندێ لە کوردەکان مەترسیان لەوەبوو کە ئەگەر بیتوو لەبەینی هێزەکانی نیزامی ئیرانو،حەمەرەشیدخان بەرەنگارێک بێتەپێشێ ،شایەد لەونێوە دا هێرش بۆ ئێمەش بێنن،وە ئینجا هێزی نیزامی شورەویش لەوکارەدا خۆ تێهەلقوتێنێ، چونکە نیزامیکان شورەوی لە قوناغی نیزیکی مهابادێ بوون.

جا مەبەست بەوە بوو کە لە فیوریەی ١٩٤٢ دا ئەمیرئەسعەد لەشاری سەقز لەگەل تیمسار شابەختی چاوپێکەوتنێکی کرد، وە پێڕاگەیاند کە حازرو، ئامادەیە کە هێمنی و ئەهوەنی لەشاری مهاباد بەرێوە بەرێ، ئەویش بەلێنی بەوکارە داو،ووتە حوکمی فەرماندارى لەتاران بۆ وەردەگرێ ئەمیر ئەسعەد بو تارانی داوەتکرا، وە لەو سەفەرەیدا ئەوەی کە دەیەویستو، ئاواتیبوو، بەدەستی هێنا ،واتە:بە فەرمانداری شاری مهاباد داندراوە پوولوپارەیەکی زۆریان دایە، وە ماشێنێکی سوواری شان خەڵات کرد ،وە بەڕێزەوە لە ئاخری مانگی فیوریەی سالی ١٩٤٢دا گەڕاوە مهابادێ.

قازی موحەممەد دژی ئەو کارەی دەولەت دەنگی خۆی دەربڕی،وە بێووچان ڕێی تارانێ داگرت . . .

ئەوەی کە شایانی باسە ئەمیر ئەسعەد نەیتووانی هێندە لەمهاباد

خۆی ڕابگرێ ، وە تووانائی ئەوتۆی بۆئیدارە کردن نەبوو ، ناچاز لە مانگیئوتی ١٩٤٢دا لەو کارە وازی هێنا !

ناکۆکیو ،ئاژاوە تەواوی ناوچەی کوردستانی ئێرانیی داگــــرت ،وە لەکردەوەدا ئەو ئاژاوەیە تا ڕۆژئاوای بەحری وورمێ درێژەی هەبوو .

**نەخشی "نێوان کردنی" شۆڕەوێکان لەکوردستان لە ١٩٤٢**

ئینجا کە تەواوی کوردستان لەسالی ١٩٤٢ وە لە هەیەجانو ، ئاژاوەو ، دەنگو ،چەلەمە دابوو هەموو ئەو کارە ساتەیان لە شۆڕەویان دەزانی ،وە هێندێ دیپلوماتەکانی ڕۆژ ئاوایە بەئاشکرائی دەیانگوت کە لەوکارەدا دەستی شورەوی تێدایە .

چوون ئێمە نەمان توانیوە کە تەواوی ئارشیوی شۆڕەوی چاولێبکەینو ، بگەڕێن ،سەرئەنجام ناش تووانین مێژووی ئەو بزوتنەوەیە بە چاکی ڕوون بکەینیەوە

بەلام بە تێراشکاوی دەگوترێ کە کاتێک شورەوێکان لە لای ناوچەی قەقفازەوە لە لایەن دووژمنەوە هەڕەشەی لێدەکرا ،ئیتر مەبەست بەو حەرەکەتە نەیان دەتووانی بە چاکی و ئاشکرائی خۆیان لە کاری کوردستانی ئێرانەوە تێوەردەن : تەنانەت هیتلر کاتێک کە لەیەکێ لە مێشەو،دارستانی ناوچەی ئوکرائین کە ١٥٠٠کیلومیتر لەو لاتی ئالمان دوور کەو تبۆوەوە لە ســـەر کورسێکیداردا دانشتبوو ،گومانی دەبرد کە ڕۆژێک دادێ کە بتووانێ بە یارمەتی پیاوە سەربزێوەکانی خۆی لە ناوچەی ئێران و عەراق دژی ئینگلیس دەس بە کاربێت ،و هەروەها لەفکری ئەوەدابوو کە تا ئاخریسالی١٩٤٣ چادرو ،خێوەتی ئالمانیان لەتاران ،بەغدا ،وە خلیجیفارس هەلبدات . . . جا شورەوی هەر مەبەست بە وەبوو کە مەسەلەی مانگی ئوتی ١٩٤٢ لە بیر خۆی بردەوە .

لە ئاکامدا ئەوجورە (خیالپلاو ، وخەونەێ کە بە هۆی زرێ پۆشەکان و تانککانی ئەلمانی لە ١٢٠٠کیلومیتری ڕۆژهەلاتی و لاتی ئەلمانەوە دامەزرابووو[12] ، بە هیوای هێرشی گەورە بۆسەربەشی ئاسیای شۆڕەوی بوو ، لە سەرزاران دابوو ،پتر باسی لێدەکرا (١٢) جا لەوچەشنە هەلو ، مەرجەدا ،وە هەروەها لەوکاتە ناسک

١٢) ڕوژنامەی سپاندو ،آلبرسپیر ، "گفتو ،گۆ لەگەل هیتلیر لەوینتێز مانگی مە ـ اوت ١٩٤٢

و عاستەمەدا بۆ شورەوی لەڕاستەقینەدا جێگای مەترسی بوو،وە بە چاکی دیاربوو کە ناوچەی جنوبی و لاتی خۆی بۆنی نائارامیو،نارەحەتی لێ‌دی.

دەگوترێ کە دوو بەسەرهات،بوو بە هۆی ئەوە کە شورەوی زۆر بە ئی‌حیتات لەبەرامبەر ڕاپەرینی ناسیۆنالیستی کورددا لەسالی ۱۹۶۲دا ببزویتەوە:لەمانگی ژانوییەی ۱۹۴۲ کاربەدەستەکانی شورەوی کمیتەی حیزبی "ئازادی خووزان"ی کوردو، ئاسوڕیو، ئەرمەنیێکانیێ کی کە لەدەورەی یەک کۆببوونەوە تێکدا،وە هەروەها پاش هێندێ بەسەرهات لەگەل ژاندارمەکان‌ی ئیرانیێ، هێزێک لە ئەرتەشی‌سوور بۆگەڕان لەنێو شەڕدا دەنیردرێو،جی‌گیر دەبێ (۱۳)

### ۱۱ ـ ئاژاوە لە ورمێ (ئاوریل ـ مەی ۱۹۴۲)

دەولەتی ئێران بەرنامەی ئەوەبوو کە کوردەکان لە ناوچەی ورمی‌دا چەک بکات، ئینجا دێنێ ژاندارمی ئازەری شیعی مەزهەب بەخزمەت دەگرێ،لە ئاوریل‌ی ۱۹۴۲دا وازی ئەو ناوچەیە زۆرخراپ دەبێ وە ئاژاوە لە مەلبەندەکەدا پتر دەبێت (ئازەریکان بە زمانی تورکی قسە ـ دەکەن)

لەونێوە دا بە رنگاری ، تێک هەلچوون وەدی‌دێت،وە لە ڕۆژی ۲۸ ئاوریل‌ی ۱۹۴۲ عێل‌وعەشیرەتەکانی کورد لەشاری ورمێ‌دا خۆپێشان دانێک لە شەقامەکانی شاری‌ورمێ بەڕیوە دەبەن، خەتی تەلی‌فون هەل‌دەبڕن،وەشاری گەمارۆ دەدەن حاکمی شاری ورمێ لەوکاتەدا هەل‌دێو، بۆ شاری تەوریز دەچێ

لەروژی ۳۰ئاوریل‌ی هەر ئەوێ سال، کونسول شورەوی لە تەوریز، وەفەرماندەری هێزی نیزامی شورەوی لە ناوچەکەدا،بە فرۆ کە دێنە ورمێ،وە لەگەل سەرۆکەکوردەکان چاوپێکەوتنێکیان دەبێ.

لەو پێک گەیشتنەدا کوردەکان شکایەتێکی کە بریتی لەو داو خووازانەی ژێرەوەبوو تەسلیم دەکەن: کوردەکان دەبێ لەهەلگرتنی چەک ئازادبن، تەواوی ژاندارمەکانی بەینی شاری خۆی وە مهاباد دەبێ لەوناوچەیە بچنەدەرێ. کوردەکان پێویستە لە "کاروباری نەتەوایەتی‌دا ئازادبن" وە نوێنەرانی کورد لە

*۱۳) ڕاگەیاندنی سێرریدیر بوولارد،بالوێزی‌بریتانیا لەتاران ۱۴ژانوییە ۱۹۴۲وە کونسولی تەوریز.*

تەواوی ئیداراتی دەوڵەتی ورمێوە لەمەدرەسەکان دا جێ‌گیربن، زمانی کوردی لەمە درەسەکان‌دا بخوێندرێ وە هەروەها داوای ئازادکردنی ٢٠ کەس‌کە لەبەندیخانەکان دابوون دەکەن.

شۆڕەوی کە چاوی‌پێدەکەوێ وەگوێ‌بیس دەبێ کە لەومەلەبەندەدا پتر لە ١٠٠٠٠ مرۆڤی چەک‌داری کورد هەستی هەیە، نیگەران دەبێ‌و، نەختێ سەبر دەکات.

لە ٧ی‌مانگی‌مەی ١٩٤٢ دا فەرماندەری هێزی شورەوی هاورێ لەگەل وەزیری بەرگری نیزامی ئیران،وە فەهیمی حاکمی تازەی ئاذربایجانێ ڕۆژئاوا دێنەورمێ.

کوردەکان هێستا لە دەوروبەری ورمێ‌دا مابوونەوە، بەلام لەونێوەدا ووت‌و،وێژێکی کە کراوە،ئاشکرا نەبوو ــ ئینجا لەسەر ئەومەبەستە پێک‌دێن کە هیزی نیزامی ئیران بۆشاری ورمێ بگەڕێتەوە، لەسەر ئەو قەول‌وقەراوە لەڕۆژی ٧ ژوئن‌ی ١٩٤٢دا هێزنیزامی ئێران بە هێمنی‌و، وردێوە دێتەوە شاری‌ورمی.

## ١٢ ــ کۆبوونەوە (کون فرانس)ی شاری شنو (سی‌پتامبری ١٩٤٢)

لە روژی ٤ سی‌پتامبری ١٩٤٢ دا تەواوی سەروکە کوردەکانی لای خوواروی ڕۆژئاوای ئاذربایجان وە شمالی کوردستانێ ئیران بە ماوەی چەن ڕۆژ لە شاری شنۆیەدا کۆ دەبنەوە.

هەوالە کانێکی کە بە دەستی پیاوە ڕامیارێکانی ئینگلیس لەوبارەیەوە بۆ تەورێز چووبوو، وا گوترا بوو کە ئەو کۆبوونەوەیە بە دەستوری شورەویکانە، وە لە کوردەکانیان ویستووە کە بەنێوی "دۆستانی وەفاداری شورەوی هەروەها بمێننەوە" وە "کۆمەڵەی یەکیتی کورد" پێک بێنن![14] ئەو کۆبوونەوە دەگوترێ کە مەبەست بە ژن‌هێنان‌و، شائی کوڕی قەرەنی‌ئاغا کە یەکێ لەسەروکە کوردەکانی ئەو ناوچەیە بوو، پێک هات‌بوو، وە ئتر وانیشان‌دراکە، لە راستەقینەدا شورەوی لەو کوبوونەوەیەدا دەستی تیدانیە!

ئەوەی کە شایانی باسە،لەوبارەیەدا کە بزاندرێ شورەوی چ نەخشێکی لێرەدا هەبووە، بە چاکی ڕوون نەبۆوە، بەلام وادیاربوو کە کوردەکان لەو کارەدا

زیاتر مەبەسیتان ئەوەیە کە شورەوی بەگاڵتەبگرن .
ئینجا دوو مەسەلەی گرینگ لەو نێوەدا لە بەینی کوردەکان‌دا هەستی هەبوو ، یەکیان لەنێو سەرۆکە کوردەکان دا هاوکاری‌و ، هاودەنگی نەبوو ، هەڵوێستی‌دیکە ئەوەبوو کە دەبوو ، دەولەتێکی زۆردار لایەن‌گریان لێ‌بکات .
لە حەقیقەت‌دا دووبەرکی‌و ، نێوان ناخۆشی تائەوکاتە ، هەرگز بەو جێگا ناسکە و عاستەمە نەگەیشت بوو . لەبەینی سەرانی عەشیرەتەکان‌دا سێ‌کەس پێکەوە پتر لە دووژمنایەتی‌و ، ناکۆکی‌دا بوون ، کە بریتی‌بوون لە ئەمیر ئەسعەد ئاغای دێبۆکری ، عەبدول‌لائاغا سەرۆک عەشیرەتی مەنگور ، قەرەنی ئاغا سەروک عەشیرەتی مامەش .
ڕابەرە ڕامیارێکانی دیکەی کوردستان وەک قازی موحەممەد ، وە حەمەڕەشیدخان یەکێتی لە بەینی کوردەکانیان بەپێویست‌دەزانی ، وەزۆر بەگرینگی دەیانەویست کە ئەوکارە و مەبەستە لە ڕاپەڕینی کوردستان‌دا بەجێیە بەڕێوە ببردرێ بەتایبەتی قازی موحەممەد لەوەی مەترسی هەبوو کە بەو زووانە کوردەکان نەتوانن یەکتر بگرنەوەو ، وە یەکێتان هەبێ ، وە لەوەی مەترسی هەبوو کە دە ولەتە قو دڕەتمەندەکان پاش تەواوبوونی شەڕی کە زۆر ماندو ، هیلاکن ، ئیتر ناپڕژێنە سەر کاروباری کوردەکان ، جا دەولەتی ئێرانیش بەسووکی‌و ، هاسانی قوتیان‌دەدا

## ۱۳ ــ مانووڕو ، ئاکارو کردەوەی قازی موحەممەد

ئاکارو ، بزوتنەوەی قازی موحەممەدوە ڕووبە ــ ڕووبوون لەگەل دوو دەولەتی قودرەتمەندی گەورە وەک ئینگلیسرو ، شورەوی[۱۵] ، وە بوونی هێزی نیزامی ئەو دوو دەولەتە لە کوردستان‌دا ، بەراستی زۆرناسکو ، نامەعلوم بوو : قازی‌موحەممەد لەوەی دەگەڕا وە بەو گومانەبوو کە لە گەل ئینگلیسەکان هات‌و ، چۆی سازبکات ، بە تایبەت لەنێوە راستی مانگی ئۆکتۆبردا میوانی یارمەتی‌دەری مارشالی هەوائی ئینگلیس لەعەراق‌دا بەنێوی گرسپینی‌بوو کە ئەووەخت لەلای یورکارت کونسوول ئینگلیس لەتەورێز بوو .
ئینجا ئینگلیس زۆر لە کوردەکان دڕدونگ بوو ، وە بە تایبەت گومانیان دەبرد کە قازی‌موحەممەد لەگەڵ شورەوێکان هات‌و ، چۆی هەیە ! ئینگلیسیکان

لەلای ئەو، زۆر بە دەم‌و ،زارێکی گەرمەوە لەشەڕی ستالین‌گراد ،وە ئازایەتی شورەویکان باسیان دەکرد ،وە دەیانەویست بزانن لەو بارەیەدا ،بەرداشتی قازی چۆنە ،بەحەقیقەت ئەوە (داوو)بوو ،بۆیان دا نابوو. وە دەیانەویست فکر قازی موحەممەد هەڵسەنگێنن‌و، سەنگ‌و سووکی بکەن. بەلام قازی‌موحەممەد لەلایەکی دیکەوە دەستی بەقسەکردو، وەڵامی داوە کە ئاکارو کردەوەی ئینگلیسیێکان لەبارەی بزوتنەوەی کوردەکانی عەراق دا زۆرباش بووە،وەئەوەشی لەقسەکانی زیادکرد ئەوە "تەنیابەیارمەتی دەوڵەتی بریتانیایەکە کوردەکان دەتووانن بەگەیشتنی مافی ئازادی خۆیان بگەن) .

یورکات کونسولی ئینگلیس لەوکۆبوونەوەیەدا مەسەلەی ئیسکاتلەندێکانی کە دژی پادشایەتی ئینگلیس خەبات دەکەن، دێنێتە پێشێ وەدەڵێ هەرچەند دەولەتی فەرانسە یارمەتی ئەوانی دەدا، بەلام لەئاکام‌دا، شکان جامەبەست بەگێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتە، کۆنسول دەیەویست کە بەقازی موحەممدی ڕابگەئینێ کە ئینگلیس لەکاروباری‌خوی‌دا مامۆستایە (١٦)

ئینگلیسیکان ئەوەیان بۆ ئاشکرابوو کە قازی‌موحەممەد دەیەوێ بەهۆی ئەوهات‌و، چۆیە لەگەل ئەوان نێوانی چاک بکات وەپتر هەڵوێستی نیگەران کردنی دەولەتی شورەویشە کە بە خێرائی نەخشەیەکی کە هەیانە... کوردەکان کەڵکی لێ‌وەرگرن ١٦٠

سەرئەنجام قازی موحەممەد لەمانەوەی خۆی لەباکۆیە "خوشحال" گەڕا بۆوە بەلام پاش ماوەیەک ناکۆکی خۆی لەکاروباری شورەویکان دەربڕی، وەئەویش هەرمەبەست بەوەبوو کە شورەوی باشتر سودو قازانجی کوردەکانی لەبەرچاوبێت.

هەروەها ئینگلیسیێکانیش لە بابەت کۆ بوونەوەی کۆن‌فرانسی کوردەکان بەو چەشنە نەتیجەی وەردەگرت کە کوردەکان ڕێبازو ،شوێنیان ئەوەیە کە لەبابەت ڕاپەڕینی کوردەکان وە مافی نەتەوەکەیان پتر لەئینگلیس کەڵک‌وەرگرن .

بەکورتی دەگوترێ کەلە هەموولایە کەوە مەسەلە کە زۆر پیچ‌و خەمی هەبوو، نەدەزاندرا ئەوڕێبازە بۆکوی‌دەچێت. لەکاتیک‌دا کە هەوال دەرەکان لەبارەی مەسەلەی کوردستان‌و، بزوتنەوەی مافی خودموختاری ئـــــەوان دەدووان، شورەویکانیش نەیان دەویست کە لەوکاتە عاستەمەدا ئێران هێزی نیزامی خوی

١٦) چاوپی‌کەوتنی ئورکات لەمهاباد بەینی ١٣ – ١٤ ئوکتوبر ١٩٤٢

بوکوردستان بنێرێ و لەومەلەبەندانەدا جێگیریان بکات . . .

وە لە لایەکی دیکەشەوە نەیان دەویست کەبۆخۆیان نەزمو هێمنی لەکوردستان دا بەرقەرار بکەن ، بەڵکو لەسەرۆکە کوردەکانیان داوا دەکرد کەنەزمی وولات بەدەستەوەبگرنو ،ناوچەکەلەئەمەنیو هێمنی باوین .

بەکورتی شایانی باس ئەوەبوو کە شورەویکان لە پیلانێکی ئەوتو دان کەمافی گشتی نەتەوایەتی بەکوردەکان بدەن ، ئەممالەو بابەتەوەمەترسیان لەئینگلیس هەبوو کە هولوێستی ئەوەیە کە زووتر دەس بەکاربن ، وەسەیر ئەوەبوو کەئینگلیسێکانیش هەرئە و مەترسی‌یان لەشورەویکان هەبوو. بەراستی لەوسەردەمە ناسکەدا کوردستان لەناوچەکە دا بەتایبەتی تاق هەڵ کەوتبوو. یارمەتی دەری کونسوولی شورەوی پاش ئەوەی کە سەفەرێک بۆلای مەریوان ، سەقز دەکات لە بەرانبەر یەکێ لەهاوکارەکانی خوێ دەری بڕیو، گوتی کە: "لەکردەوەدا کۆمارێکی بچووکی کورد لەناوچەدا هەستی هەیە" هێندێ وەخت ئیرانیکان مەجبوردەبن کە ٤٠ تا ٥٠ کیلومتر دەور لێبدەن کەلە مەڵبەندێکی ڕا بینە مەلبەندێکی دیکە! وازی نانو ،خواردنەمەنی لەکوردستان دازۆر خراپ بووە: قاتیو ،قڕی لەکرماشان دەنگی‌داوەتەوە،کونسولی ئینگلیس هەرڕۆژێ ٢٠٠کەس نان دەدات. لەسەرەتای ١٩٤٣ داشەقامەکانی کرمانشان پڕبوو لە"ژنو ،پیاوی سووالکەر کەڕووتوقوتبوونو ، برسیو ، تینوو" وە هەموو ڕۆژێ ١٥کەس‌لەوان لەبرسان دەمردن !

لە ٢٧ فیوریبەی ١٩٤٣ دا هەزار جوور نەخۆشی تیفوس لەشاردادە بیندرا وە نەخۆشخانەکان مەبەست بەوەی‌کەدوکتورەکانو ، پەرستارەکان تووشی نەخۆشی نەبن داخرابوون . ١٨

## ١٤ ــ کۆمەڵەی (ژ ــ ک) پێک‌دێ

لەو هەل‌کەوتەدا! بوو کە ١٥مرۆڤ لەخەلکی مهابادی، "کومەلەی ژیانی کوردستان ،یان پێک‌هینا ، ئەومروڤانە بریتی بوون‌لە: عەبدورەحمان‌ی زەبیحی ، کەپاشان بووبە سێکرێتێری گشتی کمیتەی ناوەندی کومەڵە ، موحەممەدی شەرەفی ،

١) ماموستا هەژار هونەری بەناوبانگی کورد کەنەتەنیالەنیونەتەوەی کورددا

موحەممەدی یاهوو، کە بازاری بوون، قاسمقادری ئاموژگار، ئەحمەدی علمی، خاوەن ئیدارە،قادری مودەرسی لە خانەوادەی مەلایان، حسین فروهەر، سەروک پولیس، عەزیززەندی.واباسبوو کەعەزیزەندی پیاویوریای ئەوکۆمەلەیەیە،وە لەگەلقازیموحەممەدیشزۆرنێوانیان خۆشنەبووخو ی بۆرابەرێتی داهاتوودانابوو.

ئەوپیاوانە لەچینە خوردە بورژاوزی وە بەلکو لە هەرە چینە خوواروکانی نەتەوە کە بوون.

وەک رەحمانیزەبیحی کە لە مالێکی هەژار دا گەورە ببوو، کە بۆخوی ، باب و ،براو کەسەکانی تەنیا لە ژوورێکدا ،ژیانیان رادەبووارد.

رەحمانیزەبیحی هەتا پۆلی نوهەمی دەرس خوێندبوو،بەلام چوون پیاوێکی بەهوشو، گوش بوو، زۆر زوو بوو بە گەورەی دەرەبەگەکانی ئــەو ناوچەیە.... هەر ئەو پیاوە بوو کە دەرسی خوێندنو، فێربوونی زمانی کوردی بە هەژار فێرکرد[1] جا هەژار بەشوێنی ئەوەدا بووبە یەکێ لە هەر هۆنەرەکانی پایەبەرزی ئەو زەمانە،وە هەر بەو جۆرەش هێمن یەکێکە لە هۆنەرە بە رێزەکانی گەورەی کوردستان لەکاتی حازردا، کە ئەویش مال و گیانی لەورێگایەدا فیدا کردوە، ئینجا رەحمانیزەبیحی هەوەلین مرۆڤێک بوو کە لە مهاباددا لەبیرورای ئەوەدا بوو لە گەل گانگای بزووتنەوەی کوردی سولەیمانی هاتو،چۆ سازبکات.

نەخشی بزووتنەوەی کوردە عەراقیکان لەدانانی کومەلەدا لە مێژوودا لەنهێنی ماوەتەوە. کوردەکانی ئێران دەلێن کە بۆخومان ئەو ئۆرگانەمان بەهەست هێناوە،ئتر یارمەتیکمان لە کوردەکانی عەراق وەرنەگرتووە!

بەلام هەموو لەسەر ئەوقەولو،قەرارەن کە ئەو بزووتنەوەیە لەسەر چاوەرا لە سولەیمانیوە دەستی پیکراوە،واتە کاتێک کە مەحمود جودەتد کە لەپاشان تاقمێک لەئەفسەرە کوردەکانی هیوا وەک سەروان میرحاج کە جێگای وی گرتەوە ئەوبوو کە (کومەلەی ژیانی کوردستان)ی دامەزراند.

بەلام ئەو پرسیارە دێتە گۆری کە ئایا میرحاج لە کوبوونەوەی هەوەلی

---

بەرزوخوشەویستە،بەلکو لەباریزانائیو،نبوغەوەلەجیهاندا ناسراوە.
هەروەها ماموستا هێمنی خودالێخوشبوو لەریزە هۆنەرە بەنرخەکانی کوردبوو. م-ر

کومەلەدا کە لە ڕۆژی ١٦ی سیپتامبری ١٩٤٢ لەیەکێ لەباغەکانی دەوروبەری مهاباد پێکهات هاوبەشیکردبوو؟
وەئایا هەر ئەبوو کە گوتی کومەلە دەبێ لەتاقمی جوێیاز جوێیاز لەنهێنیدا دەس بەکاربێت؟
ئەندامانی تازەی کۆمەڵە پێشهاتن بۆنێو بزوتنەوەکە، پێویست بوو کە سوێند بەقورئانی بخۆن، ئایا ئەو داب و، رووسمە، سەرۆکەکانی کومەلە هاوڕێ لەگەل میرحاج دایاننا؟

## ئایا کۆمەلە، یەکێک لەلک وپۆکی "هیوا" بوو؟

ئەوانە مەسەلەیەکن کەئەو ڕۆ کوردەکانی عەراق لەوە لایەنگری دەکەن. دەگونجێ بڵێن بەهەر چونێک بووبێ لەنێوان کومەلەو هیوا کەموکوڕ هاتو، چۆهەبووە، لەمانگی مارسی ١٩٤٤ موحەممەدی شەڕەفی بۆ چاوپێ کەوتـــن لەئەفسەرەکانی ناسیونالیستی هیوا (ئەمین ڕەوان دزی، عەبدول عەزیـــزی گەیلانی (شەمزینی) عیزەت عەزیزو، مستەفاخوشناو، دەچێتە کەرکوک.
پاش مانگی مارس، حەمزەعەبدوڵلا، یەکێ لەڕابەرەکانی شاخەی "چەپ"ی هیوا، چەن جارسەفەری بەشاریمهاباد کرد. قادربەگ کوڕی چووکی جەمال پاشا کەخەلکی دیاربەکر بووە لەوکاتدا لەو ڵاتی سووریە دەژیا، وەهەروەها قازی مەلاوەهاب لەو لاتی تورکیەیە، یەکبەدووایەکیدادێنە کوردستانی ئیران.
ئینجا کومەڵە زۆر زوو پایەو، بنەڕەتی جوغرافیائیونەتەوایەتی خویدا دەمەزرێنێ وەپەرەی پێدەدا: کانگای ناوەندی کومەلە لەشاری مهاباد بوو، ئەوکومەلەیە سەرۆکە عەشیرەتەکان لەناوچەی خۆیە ڕا بیگرە تا بۆکانو، سەقز لەچەنووبەوە، بۆ لای شاریخۆی کیشابوو.
سنوورو، نفوزی کومەلە بریتی لە کوردستانی سوننی مەزهەبەوە تاسنووری کوردستان شیعە مەذهەب بوو. وادیاربوو کەسازمانو، ئۆرگانی هیوا، وەپارتی کوردیعەراق لەگەل ئۆرگانی کومەڵە نەختێ لە یەکتر جۆی بوون.
ئەندامانی هیوا زۆرتر لە مارکسیستەکانی شارنشین بوون، ئەمما ئەندامانی کومەلە لەپیاوە باوەڕ پێکراوەکان، وە هێندێ لەمرۆڤە عەشیرەتەکان بوون کە

تاقمی دووائی خاوەن ئیدەئولوژی سیاسی زۆر ڕاستەقینە نەبوون .[1]

مەبەست لەوشەرحو بەستە ئەوەیە کە هیواو ،کۆمەڵە چ لە هەوەڵەوە خاوەن ئۆرگان بن یان نەبن ،بەچاکی دیاربوو کە دوو شاخەی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کورد بوون کە بە ڕێو و شوێنی جودا لەیەک خەباتیان دەکرتوە پەرەیان بە سازمانی خۆیان دەدا .

لە ئاخری سالی ١٩٤٤ لە کوردستانی عەراق ،وە لە کوردستانی ئیران ، وازێکی تایبەتی هاتبۆ پێشێ : لەمانگیمەی ١٩٤٣ لە شاری مهاباد خەلکی شار هێرشیان بۆ سەر شارەوانی بردو ،حەوت کەسیان لە پۆلیس کوشتو ،هێندێکیشیان وەدەرنان ،وە بەو چەشنە قودرەتی ناوەندی ئێران ئەوەندەی کە مابوو ،ئەویش لەنێو هەڵگیرا . لە مەلبەندی بارزان ،مەلامستەفایبارزانی ، لەگەل هێندێ لە هێزە چووکەکانی نیزامی عەراق ڕووبەڕوو دەبوو ،ئەو ئاکارو کردەوەیە بۆخۆی تاقی کردنەوەیەک بوو ،وە لە ئاکامدا بەوجورە زۆربەی خۆیان بەو دوو دەولەتە نیشان دەدانو ،کوردەکان خۆیان بۆ بەدەست گرتنی مافی نەتەوایەتی ،یان مافی گشتی کوردستان لە هەردوک لا ئەمادە دەکرد .

هیچ مرۆڤیک لەوکاتە عاستەمەدا لە فکری ئەوە دانەبوو کە خویی لەوانیدیکە بە پتر بزانێو ، خۆی زل بکات ، هێندێ لە نوینەرە کوردەکان کە لە و لاتی دیکەی کوردەواری ڕا دەهاتن ،تەنیا مەبەسیتان تاقیکردنەوەو ،دانی پێشنیار بوو .[19]

لەمانگی ئوکتوبری ١٩٤٤ دا قازیمەحەممەد بوو بە یەکێ لەئەندامانی کۆمەڵە . لەو ساتەدا دووسال لە دامەزراندنی کومەڵە ڕابردبوو ،بەلام تاکوو ئەوکات ،بەتایبەت سەرۆکەکانی کمیتەی ناوەندی کە لە زانائیو ،بە کاری قازیمەحەممەد ئاگادار بوون ،وە خۆفیان ڕێنیشت ، پێیان لەوەنا کە مرۆڤیکی زوڕ ماقوول و بەڕێزیان بۆ کومەلە بانگ کردوە .[20]

ئینجا قازی مەحەممەد هەرگزوهەرگز نەبوو بە ئەندامی کمیتەی ناوەندی کومەڵە ،بەلام لەسەر ئەوەشڕا سەبارەت بەزانائیو ،ڕامیاری قازی زۆر زوو بەسەر ئورگانی کومەلەدا زاڵبوو وە کومەلەی بەچاکی ڕابەری دەکرد ،وە دەتگوت کە

١) *تەشکیلاتی کومەلەی تازەی زەمانی شورشی ئیران کە بەهەستهاتووە ،هیچ رەبتێکی لەگەڵ کومەلەی ژیانی کوردستان لەپیشوودانیە ــ م ــ ر*

سێ کرێتری کومەلەیە .

لە هەوەلی ئوکتوبری ١٩٤٤ قازیمەحەممەد هاوریٚ لەگەل سەروکــــە کوردەکانی دیکە ،بەداوەتی سەروٚک وەزیری وەختی ئیران بو تاران چوو (٢١)

قازیمەحەممەد لەماوەی مانەوەی لە تاران لەگەڵ تیمسار حەسەن ئەرفەع سەروکی هیزی ئیران گفتوگویی کرد .

بەو چەشنەی کە لەزمانی ئەرفەع ڕا دەگێڕنەوە ،لەو چاووپیکە وتنەدا ، سەدری قازی ،برای قازی مەحەممەد کە نوێنەری مەجلسیٚ بوو ،وە سەیفیقازی ئاموزای ، لایەنگریئەوەبوون .کەکوردەکان دەیانەوێ کاروباریهەردوک لا بەچاکی پیکبیٚت وە بەسوودو ،قازانجی نەتەوەکانی ئیران تەواوبیٚت .

قازی مەحەممەد بەڕاستی ،وە لەقووڵای دڵەوە وە لە ناخی گەرووییەوە قسەی دەکرد ،وە ڕەخنەکانی کوردەکان کە لەمەوپیش لە دەولەتییان هەبوو ،بە ئەوانی ڕادەگەیاند وە هەروەها پیٚیڕادەگەیاندن کە خاوەنکار بەدەستەکانی ئیداری ناوچەی کوردستان بەباشی لە ناوچەکەدا نە بزووتوونەوە ،وە لە دەولەتی ئیرانییٚ ویست کە ئیدارە کردنی ناوچەی کوردستان بەدەستی کار بەدەستەکانی کورد بسپێردریٚ٢٢ . . . لە بەر چاوی ئەرفەع[١] ، قازی مەحەممەد پیاویٚکــــی سەرسەخت بوو ، وە دەیەویست قسەکانی خوٚی بەسەر دەولەتدا ،داسەپێنیٚ و ،بسەلمێنی ،بەلام هێدی ولەسەرخوٚ بوو ،لەبابەت مافی نەتەوایەتی ،وە مافی گشتیو ، جوٚیبوونەوە ، قسەی نەدەکردو ،نەدووا .

## ١٥ ـ دامەزرانی پارتی دیٚموکراتی کوردستان

بەسەرهاتەکان دەقەومان ،وە یەک بە دووای یەکیٚدا ڕووی دەدا . لە ١٦یئوتی١٩٤٥دا لە کوٚبوونەوەیەکی کومەلەدا ،قازیمەحەممەد پێشنیاری دا کە بزوتنەوەکەی کومەلەکە هەتا ئیٚستا لەنهێنییدا بووە ،ئاشکرا بــــیٚ وە[٢٣]

(٢١) اف ٣٧١/٤٠/١٧٣ نەزاندراوەلەچ سەرچاوە یەکە م ـ ر

١) سەرلەشکر ئەرفەع سەروکی ستادی ئیران لەبارەی کورددا پرتوٚکیٚکی بە ناوی *(کردهاویکبررسی تاریخی و سیاسی)*نووسیوە .

٢٢) حەسەن ئەرفەع : *کردها* صفحه ٧٥

بەنیۆی "حیزبی دیموکراتی کوردستان" بناسرێ(٢٣) ئایا لەڕاستەقینەدا مەبەست لەهەست‌هاتن و پێک‌هاتنی ئەو حیزبە تازەیە کە وەک ئورگانـــــی "دیموکراتیکی" شورەویان دەچوو،دەبێ شورەوی نەخشی تێدا هەبووبێ؟ بەلام لەوبابەتەوە شتێک نازانین،

وەهەروەها ئێمە نازانین کە چۆن ئەوحیزبە بەهەست‌هات.

تەنانەت لەژێر چاوەدێری دیپلوماتە ڕۆژئاوایەکان وەک ویلیام ئیگلیٚتۆن وە ئارچی بالدروزوێلت‌ی (کوڕە)کەی‌لە بارەی کوماری مهاباددا نووسی‌ویانە وە گوتویانە کەحیزب‌ی دێموکراتی کوردستان بە شوێنی چەند حەوتووی دووهەمین سەفەری سەرۆکە باوەوڕ پێکراوەکانی کورد بۆ باکویە بوو کە لە مانگی نوامبری ١٩٤٥دا وەدی هات.

ئەو مرۆڤانە کە بۆ باکۆیە چوون لە کوردەکانی عەراقی کە لە باڵــی‌ڕاستی ئینگلیسیکان دەناسران وەک شیخ‌عەبدوول‌لای‌گەیلانی وە کورەکەی عەبدوول‌عەزیز محەمەدسەدیق کە ناوبانگی "پوشو" بوو وە یەکێ لەکوڕەکانی سەید تەها بوو سەریان لەباکویەدا(٢٤) جا هەر چونێک‌بێ پارتی دیموکراتی کوردستـــان بەرنامەیەک کە کۆڕێک لە پیاوە بەرزەکانی کورد ئیمزایان کرد بوو لە "مانی‌فستێک" دا بلاویان کردەوە،وە ئەو داخووازە نەیان ویست‌بوو،

- خودموختاری بۆ کوردستان‌ی ئێران لەچوارچێوەی و لاتی‌ئیران‌دا،
- زمانی کوردی وەک زمانیکی ڕەسمی بناسرێ
- شورای ناوچەئی هەل بژێردرێ.
- خاوەن‌کار بەدەستەکانی ئیداری لە خەلکی خۆنی‌بێت
- قانونێک بۆ هەلۆێستی فئودالەکان و،جوتیارەکان دابندرێ
- هاوکاری لەگەل بزوتنەوەی ئازربایجان
- پیۆیست‌مـانە کە وازی ئابوری‌و، کومەلایەتی کوردستان، بەتایبەتی لەڕێگای وەدەرخستنی کانی مەعدەن، باش‌کردنی وازی کشت‌وکاڵ، وە ڕاگەیشتن بەکاروباری لەش ساغی‌و، دوکتوری، وەتەعلیم‌و، تەربیەت بەچاکی بەرێوە

٢٣) روژی "رەسمی "لەلای میژوو نووسەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان‌ی ئیران پیش‌ترە.

٢٤) مراوەدی نووسەر لەگەل رەحیمی قازی،باکو مارس‌ی١٩٧٦

ببردرێ.

ئەوبەرنامەیە لەبنەڕەتڕا داوخووازێکی نەتەوایەتیو،کوملایەتی هەبوو کە حیزبی تازە پێشنیاری کردبوو،بەلام هێستا زۆر شۆڕش گێڕانە نەبوو.

## ١٦ ـ سەفەری دووەم بۆ باکو،لە (سێپتامبری ١٩٤٥)

دووهەمین سەفەر بۆ باکۆیە لە مانگی سیپتامبری١٩٤٥ بەڕێوە دەبردرێ. ئەو سەفەرە پاش چوونی قازی موحەممەد بۆ تەورێز بۆ هاوبەشیکردن لە دامەزراندنی "حیزبی دیموکراتی ئازربایجان" کە شاخەیەکی حیزب تودە بوو ئەنجام درا.

هاوڕێیەکانی قازی موحەممەد لە دووهەمین سەفەریان بۆ باکۆیە بریتی بوون لە پیاوە بەرزەکانی وەک سەیفیقازیو، منافیکەریمی. سەفەری دووهەمی قازی موحەممەد بۆ باکویە لەگەل سەفەری هەوەلێی تەفاوەتی هەبوو:

لە سیپتامبری١٩٤٥ دا تازە دەهات شەڕی دووهەمی جیهانی تەواوبێت،وە نیۆانیشورەوی، و دەولەتە هاوڕێیەکانیدی "متفقین" نێوان ناکۆکی بەهەست هاتبوو.

شورەوی بەرامبەر بە پەیمانێکی سێ قولی کە لەگەل هاوڕێیەکانی بەست بووی پێویستبوو، پاش ٦ مانگ تەواوبوونی شەڕ،لەو لاتی ئیران بچێتە دەرێ،بەلام لەوبابەتەوە ئیتر گوێی نەدەدایە وە هێزەکانی نەدەبردە دەرێ..

هاوکات لەگەل دووهەمین سەفەری قازی موحەممەد بو باکویە، کاروبار بەچاکی ڕوون دەبێتەوە، واتە ئەوکەڕەتە لەبارەی کاروباری فەرهەنگیوە نەبوو،بەلکومەبەست بەکاروکردەوەی ڕامیاریوە بووەنوێنەرانی کورد نووسراوەیەکی کە مەسەلەی کوردستانی تێدا گونجاوە،ئامادەیان کرد وە لەپێش شورەویان داناوە:

کوردەکان بۆ دامەزراندنی کوردستان داوای پشتیوانی ودانیشتمەک و ئەسلەحە لەشورەوی دەکەن.[1]

ویلیام ئیگلیتون نووسەری پەڕتۆکی "کۆماری کوردستان ١٩٤٦ " دەلی

١ـ کتبیکوماریکوردستان وەرگێڕاوی سەید. سەمەدی. نووسراوەیەکی

لەهەولەوە باقروف بە کوردەکان ڕادەگەێنی کە ئێوە ناتووانن دەولەتیکێ جۆییاز دامەزرێنن . "

لەڕاستەقینەدا باقرۆف ڕاوتەدبیری وابوو کە کوردستان کاتێک ئازاد دەبێ کە بزوتنەوەی گەلی کورد ،نەتەنیا لە نێو کوردستانی ئێــــرانیدا پیویستە ،بەڵکو دەبێ لەنێو کوردستانی عەراق و تورکیەشدا ئەو ڕاپەڕینە بەهەستبێت ،وە هێزەکانی بزوتنەوە تا ئەوکاتەی کە بە یەکێتی نەگە یشتوون ، دەبێ لەژێر چاوەدیری بەشێک لە ئازربایجانی خودمختار دا ببن ،وە بەو کارە بەڵێنی بدەن ،سەرئەنجام سیاسەتی باقرۆف لەبارەی مەسەلەی کوردستاندا لەوەی پتر نەبوو .

بەلام قازی موحەممەد و هاوڕێیەکانی ئەوەیان نەدەویست ،ئینجا لە قسەی باقروف نارەحەت بوون ،وە دژی ئاکاری وی‌دووان ،لە ئاکامدا ئــەو نەسەلماندنە بوو بەهوێ سەرکەوتن و پیرۆزی کوردەکان ، چوون بە شوێنی ئەوەدابوو کە با قروف مستی لەسەر میزەکەی داوگوتی تا شۆڕەوی هەیە ،مافی گشتی نەتەوایەتیش بۆ کوردان هەیە .

پاش ئەوەی کە باقروف بەوچەشنە بەڵێنی بە کوردەکاندا ،ووتەی‌دانی ئەسلەحە و ماشین و توپ و ،ڕەشاشی پیدان ،وە هەروەها قەولی دا کە ژمارەیەک لە کوردە گەنجەکان بۆ خویندن بێنە زانستگەی نیزامی باکویە . ٢٧

باقروف هەروەها ووتەی یارمەتی مالی بە کوردەکاندا ،وەگوتی کــە چاپەمەنی بۆ وەدەرخستنی کتێبو ،ڕۆژنامەی کوردیتان دەدرێتێ . قەول‌بوو کوردەکان بۆ شاری تفلیس‌ش سەفەر بکەن ،بەلام پەکی کەوت چونکە :

بارزانی لە سنوری ئیران دەهات ئاوابێ ،وە باقرۆف بارزانی بە پیاوێکی (سیخوری‌ئینگلیس) دەناسی ، جامەبەست بەوە بەقازی موحەممەد و هاوڕێیەکانی ڕا گەیاند کە بۆ چارە سەرکردنی ئەو کارە ساتە پێویستە زووتر بگەڕێنەوە و لاتی خۆتان . ٢٨

دیکەشی بەنیوی‌شاهد لەزمانی‌ئینگلیسی‌وەبەفارسی‌وەرگێڕاوە — م . ر

## ١٧ ــ کۆماری کوردی ڕاگەیاندراو، دامەزرا (٢٢ی ژانوییەی ١٩٤٦)

لە ناوچەی ئازربایجان ڕوو داوەکان پەیتا پەیتا وەدی هات، لە ٢٠ی نوامبری ١٩٤٥ جەعفەری پیشەوەری خودموختاری ئازربایجانی ڕادەگەێنی. لە ١٥ی دیسامبری ئەوێ سالی، پیشەوەری بە نێوی سەرۆکی (دەولەتــــی خودموختار)ی ئازربایجان، دانشتگەی نەتەوایەتی دەکاتەوە وە لە قـــازی موحەممەد داوا دەکات کە پێنج نوێنەر لە لایەن حیزبی دموکراتی کوردستان بنێرێتە ئەو مەجلسە.

چەند ڕۆژ پاش واتە لە١٧ی دیسامبری١٩٤٥ لە شاری مهاباد ئاهەنگێک دەگێردرێ وە خۆ پینیشاندانێک بەرە و ئیدارەی دادگوستەری کە هەوەڵین و ئاخرین نیشانەی قودرەتی دەولەتی ناوەندی لە مهابادبوو، بەڕێوە دەبردرێ.

ئاڵای سێ ڕەنگی کوردستان کە بریتییبوو لەڕەنگی سوور، سپیو،سەوز وە وێنەی ڕۆژێک لەنێوان دوو شمشیران دا کێشرا بوو،لە لوتکەی خانوێکانــــی دەولەتێکان لەشاری مهاباد،شنو،نەغەدە هەلدەکرێو،دەلەرێتەوە. بەلام لەسەر ئەوەشڕا هێستا هاتوچۆی کوردەکان لەگەل تاران نەبڕابـــــوو، قازیموحەممەد بەلێنی دەدا لەسەر داوخووازی ڕۆژنامەی شەهباز(تاران) ووتو،ویژێک بەڕێوە بردری.

لەو ووت و ویژە دا لەهەوەڵەوە قازی موحەممەد بەرنامەی پارتــــی دیموکراتی کوردستان ڕادەگەینی،بە شوێنی ئەوەدا ڕادەگەێنی کە ئەو حیزبە مەرامی کومونیستی نیە، بەلام دەیەوێ بەچەشنی ڕەژیمی شورەوی (نیزامی دیموکراسی راستەقینە لەو حیزبەدا پیادەبکات).

هەروەها قازی موحەممەد ئەوەش ناسەلمێنی کە حیزب لەگەل کوردەکانی دەرەوەی و لاتی ئیران هاتو، چۆی نیە وە یاسای بنەڕەتی ئێرانیش بەرەسمی دەناسێ وە هەروەها دەلێ "شورای عالی" کە ناوچەی مەهابادی لە بەر دایە لەگەل دەولەتی ناوەندی ئێران لە پەیوەندیو،هاتوچۆ دایە. ئینجا ئەوەش ڕادەگەینی ئازربایجان و کوردستان هەلوێستی جوێیاز بوونەوەیاننیە، بەلکـو

ئەوە دووژمنان وخیانەت پیشەکانن کە ئەو مەسەلەیان کردۆتە ڕاویـــژی زاریخۆیان . . . ٢٩

لە ئاخری و ئۆخری دیسامبری ١٩٤٥ بوو، قازی موحەممەد ، لەلایەن عەبدورەحمانی زەبیحی وە لەگەل کونسولی بریتانیا هات و چۆ بەرقـــەرار دەکات ،وە ئەوەش مەبەست بەو مەسەلەیە بوو کە ئەگەر کوردستان خودموختاری خۆی ڕابگەیێنی ،ئایا دەولەتی بریتانیا لەگەل ئێمە هات و چۆ بەرقەرار دەکات یا نە؟بریتانیا ئەو پێشنیاری قازی موحەممەدی ناسەلمیێنی ،وە وەلامی کونسولی بریتانیا زۆر "بەلالووتی" و دلساردانە دەبێ" . ٣٠

ئەوەی کە شایانی باسە ڕوون نەبۆوە کە شورەوی بەچاکی لەپشت قازی موحەممەدی ڕادەوەستێ ،لە ئاکامدا پاش ئاخرین هات و چۆوە. چاوپێ کەوتن لەگەل نوێنەرانی شوڕەوی لەشاری تەورێز قازیموحەممەد لە ٢٢ ژانوییەی١٩٤٦ دا لە نێو خوێپی نیشاندانو، ئاهەنگێک دا لەمەیدانی چووارچرا لە شاری مەهاباد لە کاتێکدا کە مەلامستەفای بارزانی لەتەنیشتی ڕاوەستا بـــوو، "خودموختاری کۆماری کوردستانی"ی ڕادەگەیێنێ .

بەشوێنی ئەوەدا ،ڕۆژنامەی کوردستان (١١ی فورییەی ١٩٤٥) نێوی وەزیرەکانی "دەولەتی نەتەوایەتی کوردستان"ی بەچەشنی ژێرەوە بـــلاو دەکاتەوە :

حاجی بابا شێخ (سەرۆک وەزیر) سەیفی قازی (وەزیریجەنگ) مەنافی کەریمی (وەزیری تەعلیمو ،تەربیەت) موحەممەد ئەمینی موعینی تاجـــر (وەزیری نێوخو) محمدی ئەیوبیان دەوافروش (وەزیری لەش ساغـــی) سمایلیئیلخانیزادە لە دەرەبەگەکان (وەزیریژنێ) ،ئەحمەدی ئیلاهی تاجر (وەزیری ئابوری) ، کەریمی ئەحمەدێن (وەزیری پۆست) ، مستەفا داودی تاجر (وەزیری بازەرگانی) مەلا حسین مەجدی (وەزیری دادگوستەری) ، مەحمود ولیزادە تاجر (وەزیری کشتوکاڵ) ، سەدیق حەیدەری (وەزیری تەبلیغات) .

پۆستی وەزاڕەتی عەبدوررەحمانی ئیل خانی زادەی مالک هیستا بە چاکی دیاری نەکرابوو .

سەرئەنجام وا چاوپێ دەکەوێ کەبەشی زۆری لە ئاندامانی ئەو کار بەدەستانە لە تاجر و کاسب و فیئودال ،پیکهات بوو .

## ١٨ ـ هێزی مەهاباد و "بارزانیەکان"

قازی موحەممەد کە کۆماری،چووکی مهابادی پێکهێنا،لەهەوڵدا کۆمارێکی بێ‌هێزو،لاواز بوو. ئینجا بەگورجی خەریکی دروستکردنی هێزەکانی بوو، تابتوانێ بەرگری لە کۆمارەکە بکات. شیخ ئەحمەد کە لەگەل ٦٠٠ پیش‌مەرگە هاتبۆ ئیرانیێ، لەنزیک شاری نەغەدە جێگیربوو،وە تا ئاخریتێکڕووخانی کوماری مەهاباد لەو مەلبەندە ماوە،لەوکاتدا شێخ ئەحمەد یەکێ لە کچەکانی سەرۆکی عێلی قەرەپەپاق لە عەشیرەتەکانی ناوچەکە دا، خوواست. (ئەو عەشیرەتە تورکن،بەلام جلکی کوردی لەبەر دەکەن).

مەلا ستەفای بارزانی کە لە مەهاباد جێگیر ببو،هێزە پیش‌مەرگەکانی کە ١٢٠٠ تا ٢٠٠٠ مرۆڤ دەبون لەژێر چاوەدێری کۆماری مەهابادی دانا،وە. بۆ خوشی لە مانگی مارسی ١٩٤٦ وە بوو بە یەکێک لەچووار ئەفسەری هەرە پایە بەرزەکانی کومار،واتە (ژێنیرال).بەلام قازی موحەممەد نەی‌دەویست بە تەواوی پشت بە پێش مەرگەکانی بارزانی و هەروەها هۆز و عەشیرەتەکانی دیکە ببەستێ، جادەستی بە ڕازاندنەوەو، پێکهێنانی (هێزی کلاسیک) واتە نیزامی‌دا، وە ئەو هێزە،هەوەڵین هێزی نیزامی بەنەزمی پێکهێندراوی بزوتنەوەی نەتەوایەتی کوردستان بوو، کە بەڕێوە بردرا.

ئەو هێزە لەدووایەدا وردە ـ وردە ژمارەی گەیشتە١٢٠٠ پیش‌مەرگە،کە بریتی بوون لە٤٠ دەرەجەدار،٧٠ئەفسەر کە بە تایبەت بەشی زۆریان ئی خەلکی مەهاباد و دەوروبەری مەهابادێ بوون.

بەلام بە پێچەوانەی ئەوە کە باقرۆف بەڵێنی دابوو کە یارمەتیێکی باشی نیزامی بە کوردستان دەکات،ئەو یارمەتیە کەم‌بوو، وە تەنیا برتیی لە١٠٠٠٠ تفەنگ،دەمانچە،ڕەشاشی چکوسلەواکی وە ٢٠کامیونی نیزامی بوو.

لە مانگی مارسی ١٩٤٦دا سوویەتەکان کاپیتان سەلاحەددیـــــن(١)

---

(١) سەلاح ئەروین کازم اوف، لە وینەی ژمارە ٢٠ ئاخری میژوکە دا دەبین دری، وە شوللیکی بە دەستەوە یە ـ م ـ ر

کازم‌اوف‌یان نارده مەهاباد ،ئەو ئەفسەره کە کوردەکان پێیان دەگوت ''کاکاغا''
لە دووایەدا بوو بە سەرهەنگ وە یارمەتی دەری ئەفسەره کورده عەراقیێکان کە
لەگەل مەلامستەفای بارزانی هاتبوونە ئیران ،دروست‌کردن و ڕێک و پێک‌هینانی
هێزی ڕازاوەی کلاسیکی بە ئەستۆی خۆی‌گرت . هەر چەند هەوالی زۆرگرینگ لە
روژنامەکانی لایەن گری روژئاوایەکان (غربی)لە بارەی یارمەتی شورەوی بۆ
کوردەکان بەدەهۆلۆ ،زووڕنا بە دونیایە ڕادەگەیاندرا ،وە لە لایەکی دیکەشەوە
قازی موحەممەد پەیتا پەیتا لە شورەوی داوای توپ و کامیون و شتومەکی دیکەی
دەکرد ،وە ئەوانیش قەولیان دابوو ،بەلام ئەو یارمەتیە هەرگز بە کوردستان
نەناردراو ،نەگەیشت . ٣٢

## ١.٩ ـ بۆحرانی ئازربایجان ـ کوردستان

لەنێو تەورێز و مەهاباد ئالۆزێک دێتە پێشێ ،کوردەکان لە ناردنی ٥
نوینەری خویان لە مەهابادەوە بۆ تەورێز بۆ هاوبەشی‌لە مەجلس دا خوڕادەگرن
وە بەو چەشنە نیشان دەدەن کە نایانەوێ لەژێر چاوەدێری ئەوان دابن .

لە فیوریيەی ١٩٤٥ دا جەعفەری پیشەوەری ،قازی‌موحەممەدی بۆ تەورێز
بانگ دەکات ، ئەو بانگ هێشتنە لە بەر ئەوە بوو کە پێی‌بلێ لەکاتێک دا کە ئێمە
خودموختاری‌مان ڕاگەیاندوە ،ئێوە بۆ ئەوکارەتان کردوە وە دەولەتێکی سەربەخۆئی
کوردستانو ڕاگەیاندوە .

قازی موحەممەد بە پێشەوەری دەلێ ،دەپێش ئەوەی دا کە ئێمە کۆماری
سەربەخۆئی کوردستان ڕابگەیێنن ، ،لەگەل یەرماکوف ئەفسەری ڕامیاری شورەوی
لە تەورێزدا ،ووت و وێژمان بووە،وە لەسەر ئەوەشڕا ئەو ئەفسەره لە ڕۆژی
دامەزراندنی کوماری کوردستان دا لە دوورەوە هاوبەشی کردوە . ٣٣

بەلام دەبوو، ئەو ووت‌و، وێژەو، بەرەنگاریە هەر بێتەپێشێ، چوونکە
دەبوو هەردوک کۆمار لەسەر زەوێک دا پێک‌بێت .

کوردەکانی ئاوایێ‌کانی کوردستانی ئیران وەک کوردەکانی دێیەکانی
تورکیە لە نیزیک یەکتربوونو، پێکەوە بوون ،بەلام لە شارەکان ،ئەو یەکێتی
کەمتر دەدیترا ،لەرۆوانگەی سۆسیۆلۆژیۆرامیاریۆە پادشاکان بۆ کەم کردنەوەی

ئاکارو شوێنی کوردە سوننیّکان ،خەلکیکی کە مەذهەبیان شیعەبوو، وە وەفادار بەپادشا بوون ، پشتیان زیاتر دەگرتن .

شارەکانی وەک خۆیە (٣٥٠٠٠ کەس دانشتوو، شاهپور (١٢٠٠٠ کەس) میلندوواو (٨٠٠٠ کەس) ورمێ ( ٥٥٠٠٠) کەس‌یان ژمارە و نفوس هەبوو ،مروڤی جوربەجوری تیدابوون ،بەتایبەتی کە تورکەکان تورکیان دەگوت ،قەومـــــی ئەرمەنی‌و، جولەکە و ئاسۆریشی تێدا دەژیان ،بەلام کوردەکان لەشاری‌دا زور کەم‌بوون ،ئەوان تەنیا لەگەڕەکێک دابوون‌و، ژمارەیان وەک جوولەکەکان بوو .

دەولەتی پیشەوەری ئەوشارانەو ،دەشت‌وچیا پڕ لە نعمەتانەی دەویست، بەلام ئەو جێگایانەی کە لە سنووری تورکیە بوون و کوردنشین بوون وەیان ئەو زەویانەی کە لە دەوروبەری مهاباددا بوون ، دەی‌گوت ئی کوردەکان بی .

ئینجا بە پێچەوانەی ووتەی پیشەوەری ،کوردەکان ناوچەی زەویکانی دەوروبەری ڕۆژئاوای بەحری ورمییان بە ئی‌خۆیان دەزانی .

ورمێ بەهیچ چەشنێک بو کوماری کوردستان نەدەبوو ،نوینەری کوردەکان بەنیوی غەنی‌خوسرەوی لەوێ دانشتە جی‌بوو. کاتی رامیاری ورمێ زۆر عاستەم و ناسک بوو ، لە گەنجەکان کە لەپێش‌دا لەپارتی تودەدا هاوکاریان دەکرد .

کاتێک لەکەیەکێتی لاوانی حیزبی دیموکرات ) پیک‌هات هەموویان ڕوویان لەوێ کرد ئینجا لەورمێ‌دا دوو تاقم خەباتی رامیاریان دەکرد ،تاقمێک بە نێوی لاوانی حیزی دیموکراتی کوردستان، تاقمێکی‌دی بە نێوی (یەکێتی لاوانی حیزی دیموکراتی ئازربایجان ) لەسێپتامبری ١٩٤٥دا .

پێک هەل پڕژان‌و ،بەرەنگار بوونی ئەو دوو تاقمە هەر دەبوو پێش‌بێت .

کوردەکان بۆ لەنێوبردنی ئەو نیوان ناکوکی ،یارمەتیان لە شورەویکان ویست :لە کوبوونەوەیەک‌دا لەگەل هاشموف کونسوولی شورەوی،"مارشال "زێرۆ بەهادری ،یەکێ لەسەروکەکانی عەشیرەتی هەرکی ،سەر بەخۆ ڕای‌گەیاند کـــە "بیگانەکان"ی ورمێ هیچ مافێکیان بەسەر ئەوشارە کوردنشینەوە نیە: ئینجا کورسێکی هەلگرت‌و، لە نێوەڕاستی وەتاقێکی کە کوردەکان‌و، ئازربایجانیکان لەگەل هاشیموف دانشتبوون ،دای‌نا وە لەسەری ڕۆنشت ،وە لەپاشان بە کونسولی شورەوی‌گوت: "ئەو وەتاغەکە ئی تۆیە... ئایا من دەتووانم لەنێوە ڕاستی دانشموو ،بڵێم ئەوە وەتاغی منە؟... نەپەس کەوابوو ،ئەوە ناگونجێ !"

باوەڕ پێکراوەکانو، سەرۆکەکانی ئازربایجان بە هیچ چەشنێک نەیان دەسەلماند کە ورمێ ببێتە ئی کۆماری ئاذربایجان،هەرچەند وابوو کە تەورێز چ بووان ناهێڵێتەوە،وە بە پێچەوانەی ئەوان پێیان خۆشبوو، ببێتە ئی کوماری کوردستان،وە ئەوەشیان بەقازی محەممەد لە سەفەرەکەیدا کە هاتبۆ لای پیشەوەری ڕاگەیاندبوو، بەلام پیشەوەری بە بیانووی ئەوەی کە "ددانیدێشێ" لەو بارەیەوە دەنگی دەرنەبڕی.

مەسەلەی ورمێ هەر لەسەر ڕاوێژی زاریان بوو ــ لە عەراقدا پاش ٢٥سال ڕابردن، مەسەلەی شاری کەرکوک لەسەر زمانانبوو،بەراستی لەسالی ١٩٧٠دا ئەو مەسەلە گرینگە دەهات کە نێوانناخوشێکی زۆر گەورە لە بەینی مەلامستەفای بارزانیو، دەولەتی عەراق سازبکات. پاش ئەوەی کە لەووتو،وێژکاندا ئەو تێک هەلچوونە زوڕ دەهاتە پێشێ،قازیمەحەممەد بۆ هێمن و ئەهوەن کردنەوە دەچێتە شاری میاندوواو،نێوانی تورکەکانو،کوردەکان لەوێ زور پیس تێک چووبوو. لەوکاتوساتەدا دەولەتی شورەوی لە هەردوک کۆماری کوردستانو، ئازربایجان داوا دەکات کە پێکەوە بوووتو،وێژ دانیشن.

ئەو دوو دەولەتە لە ڕۆژی٣ئاوریلی ١٩٤٦دا سەرئەنجام پەیمانێکی دۆستیو،یەکێتان بۆماوەی ٢٠سال ئیمزا کرد. پەیمان نامەکە لەوانەی ژێرەوە بریتی بوون.

ــ ئاڵ و گۆڕی نوێنەرانی ڕامیاری لەبەینی دوو دەولەتدا.

ــ دانانی خاوەنکارەکانی کوردی ئیداری لەو جێگایەی کە کوردی تێدا زیاترە،وە هەروەها دانانی خاوەنکارەکانی ئازربایجانی لەو جێگایەی کە تورکی تێدا پترە.

ــ بەستنی پەیمانێکی تجارەتی

ــ یارمەتیدانی نیزامی لەکاتی پیۆیستدا یەکبەیەکێ.

ــ هەر چەشنە ووتو،ویژێک کە لەگەل دەولەتی مەرکەزیئیران دەکرێ، پیۆیستە هەردوک دەولەت ڕەزامەندیان لەوەدا هەبێ.

هەردوک دەولەت دەبێ مافی فەرهەنگیو،وێژەوری نەتەوەکان لەوەلاتی خویان دا چاوەدێری بکەن، وە هاوکاری لەگەل یەکتر بۆ سەرکوت کردنـــی پیلانەکان دژی شۆڕش، دەبێ ببێت.

بەلام زۆری پێ‌نەچوو دژی ئەوپەیمانە دەنگ بلند بوو. ٣٤

دەولەتی بریتانیا ڕایگەیاند کە ئەو پەیمانە لە لای وان بەرەسمی ناناسرێو، گوتیان ئیمە ڕەدی دەکەینەوە. دەولەتی تاران گفت‌و،گوێەکی لەگەل جەعفەری پیشەوەری بەسەرۆکایەتی تاقمیکی بەنێو کە هاتبوونە تاران وە دوو "نوینەری کوردی بەدەستەلاتیان" دەگەل بوو، دەست پێ‌کرد. ٣٥

لە لایەن دەولەتی ناوەندێوە مزەففەرفیروز[1] کە هەموو کارەبوو وە لەکاتی دەولەت دا قسەوێژی سەرۆک وەزیری ئێران بوو، بۆ گفت و گوێ لەگەل کوردەکان دیاری کرا.

لەبارەی مەسەلەی نیزامی کەندو،کۆسپ هاتە پێشێ، وە لە ١٣ی‌مەی١٩٤٦دا بێ‌دەنگ ماوە. پیشەوەری،لەوکاتەی‌دا،قەوام‌ئەسلتەنەی تاوان‌بار کرد کە دەیەوێ بە سووک‌وهاسانی ڕژیمی ئازربایجان خۆ بەدەستەوەبدا،بەلام لەسەر ئەوەشڕا هیچ لایەک نەی‌دەویست کەهات‌و،چۆ لەنیویان دابرێ.

مانگێک پاش لە ڕۆژی ١٢ ژوئن‌ی ١٩٤٦دا شازادە مزەففەرفیروز هاورێ لەگەل یارمەتی دەری. وەزیری جەنگ،سەرلەشکر هدایەت،وە سەرلەشکر مەحەممەد عەلی مقەددەم،دەچنە تەورێزی.

پەیمانێکی پێک‌هاتن دەنووسرێ. جەعفەرپیشەوەری دووبارە ڕادەگەێنی کە ئازربایجان دەیەوێ لە چووار چێوەی ئیران دا وەک جاران بمێنێتەوە،وە ئەوەش دەسەلمینێ کە فەرمانداریکی کەئیران پێوستێتی لە ئازربایجان دای‌بنێ،پێویستە لەنێو سەرۆکەکانی حیزبی دیموکراتی ئازربایجان‌دا هەل بژێرێو،دای‌بنێ جا بەو پێک‌هاتنە،دوکتور سەلام‌وللای‌جاوید (وەزیری پێشووی‌ئیران) بەفەرمانداری ئازربایجان دادەندرێ.

تاران لەبەر چاووداوادیار بوو ڕزگاری هات‌بوو... وە زیرەکانی پێشوو ببوونە سەروکەکانی ناوچەئی. بەلام بەراستی ئەوە شتێکی ئەوتۆ نەبوو کە لە ئازربایجان‌دا ئال و گۆرێک بەهەست بێ‌نێ،وە ئەو پەیمانە لەلایەن ئیرانیکانەوە

[1] وینەی موزەفە ر فیروز، لە ئاخری میژوکە دا، لە وینەی ژ مادە ٢٧ دا لەگە ل‌قەوام ئەسەلتەنە سەروک وەزیری کات دەبین دری — م — ر

وە پشگوێخرا .

سەرۆکەکانی مهاباد چەرمەسەرەیان بۆ پەیدا بوو: ڕابەرەکانی تەورێزو ،تاران بەبێپرسو ، ڕای کوردەکان لەهێندێ مەبەستدا پێک هاتبوون ،وە دۆکتور جاویدش،سەیفیقازی بە نێوی (فەرماندار)ی مهاباد دانابوو !

قازی مەحەممەد "سەرۆکی دەولەتی گەل" نەبوو ، بەڵکو پیشوای حیزبی دیموکراتی کوردستان بوو .

کوردەکان زۆر لەوپەیمانە کە ژێردەستی دەنوواند ،ئاگایان لێ نەبوو ،وە خەریکی کاروباری خۆیان بوون ،وە دەتگوت کەهیچشتێک نەقەوماوە .

بە کورتی بڵێن واز بەتەواوی تێکەڵو ، پێکەڵ ببوو .

### ٢٠ ــ تەقەوەستاندن (مە ــ سپتامبری ١٩٤٦)

لە٢٤ ئاوریلی ١٩٤٦ دا کوردە بارزانیێکان لە چەند کیلومتری سەرەوەی شاری سەقز هێزێکی ئیرانیان کە بریتی لە ٨٠٠سەرباز بوو وە لە دێی قاراوا دابوون ،گەمارۆدا ،زەرەرووزیانێکی زۆریان لێدان ،لەو گەمارۆیەدا کە شەڕ دەستی پێکرا ، ٢١سەرباز کوژران ، ١٧٠سەرباز بریندار بوون ،وە٤٠٠سەرباز بە دیلگیران .

پاش ئەو"پیروزیێ" کوردەکان ،سەرلەشکر رەزمئارا ،پشکنێری گشتی هیزەکانی ئیران ،ووتو،وێژی لەگەل تاقمێکی کوردو ،ئازربایجان لەشاری سەقز بەڕێوەبرد ،

لە ٣ی‌مەی١٩٤٦ سەرلەشکررەزمئارا لە پێکهاتنێکدا لەگەل کوردەکانو ،ئازربایجانیێکان تەقەیان وەستاندوەپەیماننامەیەکیان نووسی کە لەوپەیماننامەیەدا ،کوردەکان سەلماندیان کە هێزەکانیان تا چەند کیلومتری سەقزو ، سەردەشت بۆدووایە بکێشنەوە .

هێزەکانی شورەوی لە١٠ی‌مەی١٩٤٦دا و ڵاتی ئیران بەجێ دێڵن ،هەر ئەو بەجێ هێشتنە بوو بەهۆی ئەوەکە کۆماری مهابادیی لەمەترسێکی گەورە هاوشت . ئینجا دەورەیەکی هێمنیو ،ئارامی لە کوردستاندا بەهەستدێت کە ئەو هێمنیێ تا سێپتامبری

١٩٤٦ درێژەی هەبوو.
پاش تەقەوەستاندن لە مانگیمەیدا هێندێ لە پیاوەکانی بێگانەکانی دەرەوی و لات کە لەنێو ئەوان‌دا ئامریکائی و فەرانسەویشی تێدابوو سەریان لەمهاباددا، لەچاوپێکەوتنێکدا لەگەل قازی محەممەد، گوتویانە کە زانائیو، ڕامیاری و کارزانیو، پیاوەتیئەومرۆڤەیە کەکوردستان‌ی ڕاگرتووە، وە هەروەها بۆ خۆشی بۆتە سەمبولی نەتەوایەتی کورد لەو لاتی کوردستان‌دا. ٣٦

## ٢١ ـ سەرکۆمار قازی مەحەممەد

قازیمەحەممەد کە ٤٦سالی لەتەمەن ڕادەبرد ( لەمەی ١٩٠٠ لەدایک بووە)لە بنەمالەیەکبوو کە هەموویان زاناو، ژیرو، ڕووناکبیربوون، قازی سەبارەتبەهۆش و، گوشیزانایەکیکەهەیبوولە ناوچەی کوردستان‌ی ئیران بەچاکی حوکمایەتی دەکرد.
قازیمەحەممەد، جگە لەزمانی زگماکی کوردی، زمانفارسی، عەرەبی دەزانی، ئینگلیسیشی قسە دەکرد، وە بەباشی لەپیاوە ئینگلیسیەکان حالی دەبوو. لە لای خۆی خوێندنەوەی زمانی فەرانسە، ئالمانی وە رووسی فێرببوو، کتێبخانەیەکی هەبوو کە پڕ لە پەرتوکی مێژووئی، ویژەوەری، بەزمانە جوربەجورەکان بوو، وە بۆخۆشی چەند نمایشنامە کە سەرچاوەی مێژووئی و نیشتمانیهەبوونووسیبووی. بەتایبەت درامی مێژووئی سەلاحئەددین کە خەبات و شەڕی ئەوپیاوە قارەمانە کوردەی کە دژی مەسحیەکان لە شەڕەکانی سەلیبیدا کردبووی هێنا بوویە سەر نووسین، وە هەروەها نمایشنامەی دایکی نیشتمان کە بەسەرهاتی قەومی کورد پاش بەستنی پەیمانی سەعداباد کە لەبەینی ئیران ـ عەراق ـ تورکیە لە سالی١٩٣٧دا بەسترا بوو، هێنابوویە سەرکاغەز، کە ئەو دوو نمایشنامانە لەمهاباد هاتە سەرسێن‌ی نمایش. ١
قازی پیاوێکی دیندارو، خوداناس بوو، سیغاری نەدەکیشاو مەشروبی

١) *نمایشی دایکی نیشتمان لەلایەن هێندێ لە لاوانی شار بەسەرپەرستی خودا لێخوش بووعەبدوول لای نەهری وە سیروس حەبیبی کەئیستاکە لەکاتی ژیان‌دا وە مامۆستایەکی زانایە هاتەسەرسێن‌ی ونمایش.* م-ر

نەدەخوواردەوە،وێنەەیەکی قازی لە پشتی میزی کاری هەلاوەسرابوو،کە بە باشی دیمەنو،ڕووانگەی ئەوی نیشان‌دەدا،وە لەپشت‌سەری نەخشەیەکی جیهانی دەدیترا .

قازی‌مەحەممەد مرۆڤێکی باریک ئەندام وە نەختێ ڕەنگی زەردبوو،کەمێک ژانی مەعدەی هەبوو، تووکی سەری کورت‌بوو،ڕدینێکی تۆپنەی هەبوو،چاوی وەک ئەستێرەی عاسمان دەدرەوشا دیمەن و ڕووخساری وی ڕووحانیە تـــی لێ‌دەباری.بەراستی بەجووانی دیاربووە کە قازی‌مەحەممەد مرۆڤیک بووە زۆر ماقوول‌و،باوەڕ پێکراو،بەایمان‌و،فیداکار و نەبەز ئـــەو خسلەتانەی وی تێکەڵ لەگەل ڕووناک‌بیری‌و، لەسەرخۆیی و هێمنی بەڕاستی جێێ تی‌ڕابینیە. ٣٧

هەموو ئەو مرۆڤانەی کە لەگەل ئەو هەڵستاون‌و،ڕۆنشتوون‌وەیان هات و چۆیان لەگەل بووە پێیان لەوەی ناوە کە هەرچەند قازی‌مەحەممەد لەگەل شوڕەوێکان زۆر دۆست‌بووە،وە ئاکارو، ڕەوشتی ئەوانی سەلماندوە،بەلام لەسەر ئەوەش‌ڕا زۆرش کورددۆست وە نەتەوە پەرست بووە، جا هەر بەوبۆنەوەیە بووە کە خەلکی بۆلای خویی کێشاوە. ٣٨

لە مەسەلەی پان‌کوردیسم‌دا هەر چەند قازی زۆر خۆت‌ئاسائی نەبوو،بەلام ویستوویەتی کە شاری مهاباد لەجیاتی شارەکانی سولەیمانی‌وە دیمەشق،بکاتە کانگای ناوەندی‌ڕاپەڕینەکەی کورد ،وە هەر بەوجوورەی کە هەواڵ‌بەری ئاژانسی فرانس‌پرێس ڕای‌گەیاندوە لەووت‌و،وێژە دریژە کەی‌دالەژوینی ١٩٤٦کەبوویەتی، داخووازەکانی زور نەبوون،وە ئاوای گێڕابۆوە:

ئەگەر فەرمان بدەم ،لە٣یان٤ڕوژان‌دا، ٤٠٠٠پێش‌مەرگەی کـــــورد بەرەوکرماشان دەچن ،هەلبەت ئەو ژمارەیە جگە لە پێش‌مەرگەی پاشەڕۆژو،زەخیزەیە کە هەمانە،باش دەزانین کە کرمانشاە کانگای نەفتە. بەلام نامەوێ لەو بەینەدا خوێن بڕژێ،کوردەکان هەرگزو، هەرگز لە هەوەل‌دا دەست ڕەپیش ناخن. ٣٩

لە وەلامی هەواڵ‌دەری ئاژانسی فرانس‌پرێس‌دا کە لە قازی پرسیاری کردووە،چلۆنایەتی کاتی حازری کوردستان‌ی لە بەرامبە دەولەتی ناوەندی ئاوا ڕوون بۆتەوە،وە قازی‌مەحەممەد قامکی لەسەر سێ مەسەلان داناوە وە لامەکەی

بریتی لەوانە بووە.

١ ـ ئەگەر دەولەتی ناوەندی ئێران بەراستی گومانی بێ‌نێیتە سەرئەوەی کە قانوونی دێموکراتیک لە سەرتاسەری ئێراندا بەرێوە بەرێ،وە کوردەکان خوێندنەوەو،نووسینیان بەزمانی کوردی بێ،وە هەروەها سەربەستی‌و،سەربەخوی ناوخوی ئیدارات وە هێزی ناوچەئی بەرەسمی بناسێ، ئیمە لەوکارە پیشوازی دەکەن.

٢ ـ دیارە لەوکاتەدا دەولەتی ناوەندی لەوڕادەیە دانیە کە بتووانێ ئەو قانوونە بەرێوەبەری

٣ ـ ئێمە دەمانەوێ کە هەڵبژاردنی ئەندامانی مەجلس زوٚر زوو دەستی پێ‌بکرێ،بە چەشنێکی کە هێزی نیزامی دەستی تێدا نەبێ.

لە وەلامی ئەو پرسیارەدا کە "ئایا لەوەی ناترسێ کە تێک‌هەڵچوون‌و، بەرەنگاری لەنێوان دەولەتی ناوەندی،وە کوردستان‌دا،وەدی‌بێت،وەببێتە هوێ ئەوە کە دەولەتەکانی دی خوتێوەردەن؟"، قازی‌مەحەممەد وەلام دەداتەوە: "چلۆنایەتی‌و،وازی کوردستان لەگەل وازی ئازربایجان تەوافەتی زوٚرە. زەویوزاری مە هیچ‌کاتێک لەلایەن شورەوی‌وە داگیر نەکراوە،کاتێک ڕەزاخان لاچوو،ئتر هێزەکانی جوربەجوری ئێران تا ئێستا لە کوردستان‌دا هیچ‌کارە بوون،پەس لە ئاکام‌دا هەر لەهەوەڵەوە سەربەستی تەواومان هەبووە".

"وە هەروەها ئێمە هەرگز بە هیچ دەولەتێکی بێگانە ڕێگا نادەین کە لەکاروباری کوردستان‌دا دەست تێوەردەن،بەڵکو مەسەلەی کوردستان، مەسەلەیەکی ناوخوێیە کە دەبێ لەبەینی کوردەکان‌و، دەولەتی مەرکەزی‌دا حەل بێت."

لەو ووت‌و،وێژەدا قازی مەحەممەد،هەروەها ڕادەگەێنی کەمێژووی‌خەلکی کورد پڕلەخەبات بوٚ گەیشتن بە ئاواتی ئازادی‌یە،وە لەوبارەوە وەبیری دینێتەوە کە لەپاش شەڕی جیهانی هەوەڵواتە،کاتێک‌کە پەیمانی وێرسای لە گوڕی‌دا بوو، دروست‌کردنی دەولەتێکی کورد لە کوردستان‌دا لەبەر چاوو بوو،بەلام لە کردەوەدا بەرێوە نەبردرا.

قازی‌مەحەممەد لە ئاخری گفت‌وگوێیەکەدا ڕادەگەێنێ‌و،دەلێ "ئەگەر ئەوڕوٚ ئێمە لە سەر مەسەلەی خودموختاری پێ دەچەقێنین، مەبەست بەوەیە کە

تا ئێستا دەولەتی مەرکەزی بۆ زەیووزاری ئێمە هیچ کارێکی نەکردوە.ئێمـــە دەمانەوێ بۆ خۆمان بۆ پێشڕەفتی کوردستان تێبکۆشین.ئینجا نامانەوی لاسای ئەمریکا[٤٠] وەیان شورەوی بکەینەوە،بەلکو لەسەر ڕێوشوێنی خۆمان دەڕوین وە ژیانی دراندانەی دەولەتە موتەممەدینەکان ڕەد دەکەنیەوە.[٤٠] جا ئەو وتانەی قازی وای‌نیشان دەدا کە نایەوێ بۆ هیچ کەس سەر شۆڕکاتەوە، وە هەر بەوجورەی کە ئەوروو ڕەحیمی قازی لەنوشتارەکانی خوی‌دا نووسیویتی : "قازی‌مەحەممەد مروڤیک بوو نەمارکسیست نەسۆسیالیست وە تەنانەت نەلیبرال. بەلکو ڕابەرێک بوو نەتەوە پەرستو، ڕووناکبیر."

ڕەحیمی‌قازی هەروەها دەلێ ! " بەلام ڕۆژ دەگەل ڕۆژێ بۆلای مارکسستی هەنگاوی چاکتر هەلدێناوەڕووانگەی وی لەگەل ڕووانگەی مارکسستی نزیکتر دەبووە،وە تا دەمی مردن لە قوولای دلەوە بیروباوەڕی بە شورەوی بوو". [٤١]

## ٢٢ ـ مهاباد لەکاتی "کۆماری"دا

کۆماری مهاباد ڕووانگەو، دیمەنێکی جووانی‌هەبوو،وە ئەو کەسانەی کەتاهاوینی‌سالی ١٩٤٦ چاویان بەوشارە کەوتووە،پێیان خۆشو،دلگیربووە. بەپێچەوانەی کۆماری ئازربایجان‌ی جیرانی،ڕژیمی پۆلیسی نەبووە،بەدرێژائی ١١مانگ "کۆماری مهاباد"تەنیا یەکێک لەداردرا، ئەویش‌ئەسەرێکی زۆری لەسەرخەلک دانا.

لەوماوەیەدا دەولەتی کۆماری کارێکی واشۆڕشگێڕانەی بەڕێوە نەبرد، نەبانکەکانی مللی‌کرد،وەنە زەوێکانی دابەش‌کرد. کەپێویستبوو،وەک تەورێز بیکات. خەلکی مهاباد بۆهاتو،چۆئازاد بوون لە ١٠ی مەی ١٩٤٦ نزگەی رادێوی ڕەسمی لەمهاباد داندراو،کراوە،بەلام تەنیا بۆنیۆشار کەلکی لێوە وردەگیرا،دەنگی زۆر دوور نەدەڕۆیشت، خەلکی شاری‌پتر لەرادیۆکانـــی دەرەوە کەلکی وەردەگرت. قازی مەحەممەد لـەسالـی ١٩٢٦ تا ١٩٣١ کەسەرۆکی[٤٢] ئیدارەی ئاموزشو، پەروەرشی مهاباد بوو،هەر بەو چەشنەی کەبۆخویندەواربوونی

ڕەحیم ی قا زی ئەو وتا رەی لـەپـەرتۆکی " پێش مە رگە " دا کەنوسرا وە ی خۆیـە تی نووسیوە ـ م د

خەلکی هەولی دەدا ،لەکاتیکومارێکەیدا ،خەڵکی بۆ لای خوێندن دەکێشا ، لەهەوەلیدامەزراندنی کۆماردا ،خوێندنی زمانی کوردی لەمەدرەسەکان دانا ، لەپێش هەموو کارێکدا مامۆستاکان کتیبەکانیفارسیان بەزمانیکوردی وەرگێڕا ، هێندێ کتێبی چاپەمەنیان لەو لاتی کوردستانی عەراق ڕاهێنا بوو ،بـــەڵام لەوکتێبانە کەلکی لیوەرنەگیرا ،چونکە تادەستیتان بەئامادەکردنی ئەوکارانە کرد ،کوماری مهاباد تیکڕووخا .

لە ئاوریلی ١٩٤٦ دا ٦٠ گەنجی — کورد بۆ خونیدن چوونە مەدرەسەی نیزامی شاری باکۆیە ،لەوانە بەشیزۆریان گەڕانەوە ،وەهێندکیشیانمانەوە .

چەن دەزگا ماشێنی چاپەمەنی کە قازی مەحەممەد لە شورەویێکانی وەرگرت بوو ،بەوانە هێندێک ڕۆژنامەو ،کتێبچاپبوو ،یەکێک لەوڕۆژنامانە، ڕوژنامەی ڕەسمی کوردستانبوو کە ڕۆژانەبڵاودەبوۆە، وەلەسەرەتای ڕۆژنامەکەدا ئەو ڕستەیە نووسرابوو "بەناوی خودای مەزنو ،بێهاوتا[٤٣] ، ڕۆژنامەو، گوقاری دیکەش لەمهاباد دەردەچوون، نیشتمان یەکێک لەوانە بوو کە لەلایەن سەرنووسەر عەبدوررەحمانی زەبیحی وەدەردەکەوت ،گۆڤاریژنان بە نیۆی هەڵالە، گۆڤاری ویژەوەری هاوار کەهۆنراوەکانی مامۆستاهێمن (موحەممەدئەمینیشێخئەلئیلامی) وەهـــــــەژار (عەبدوررەحمانی شەرەفکەندی) تێدا دابڵاودە بووە .

## ٢٣ — گفتوگۆی ئاخر (دووائی)

ووتو ،ویژێکی کەپێویست بوو لەمانگی ژوئندا لەتاران دەستیپێ بکرێت ،وەدووایەکەوت ،تاکو لەمانگی ئوتڕا ئەوگفتوگۆیە دەستیپێکراوە . قازی مەحەممەدلەو ووتو،وێژەیدا کەلەگەل قەوام ئەسسەلتەنە سەرۆکوەزیر دەیکات ،داوادەکات کە کوردستان ببێتە ئەیالەتێک کە ئەوئەیالەتە لەسنووری شورەوی ڕا تاکرماشانو، سنەدرێژەی هەبێ ،وەهەروەها بۆخوشیڕابەروحوکمرانی ئەوئەیالەتەبێت . [٤٤]

هێندێهەوال ڕایان گەیاندووە کەقەوامئەو داخووازەی قازی مەحەممەدی سەلماند ،بەلام پێویستبوو دوکتور جاوید کە ئەستانداری ئازربایجانبوو، ئەوپێشنیارەی بسمەلمێنێ . [٤٥]

هەروەها دەگوترێ و، دەڵێن کەقەوام ئەسسەلتەنە، ئەو پێشنیاری سەلماند، بەلام شورەویکان لەوکارە لالوتبوون.[٤٦] ئینجا بەهەرچونێک بووبێت سەرئەنجام ووت و، ویژەکە بەجێیێک نەگەیشت، وەقازی مەحەممەد بێ ئەوەی کە بتووانـێ هەستێتی کۆماری مهابادی بە سەر دەولەتی ئێراندا داسەپێنێ، هەروەها گەڕاوە.

لە ٢٠ی ئوتی ١٩٤٦دا کۆڕێکی ئازربایجانی بەسەرۆکایەتی شەبستەری سەرۆکی دانشتگەی مللی، کەبەشوێنی ئەوەدابوو بەمەجلسی (ناوچەئی) چۆ تاران. هەر چەند خۆتێوەردانی تایبەتی سادچیکۆف باڵوێزی شورەوی لەتاران باسی لێدەکرا، بەلام لەسەرئەوەش ڕا ئەوکۆڕە چەن حەوتووان لەتاران ماوە، وەنەی تووانی بەشای ئێران بسەلمێنێ و، دان لەسەرئەوەدابنـێ کە هێزی خەلکی ی ئازربایجانی هەستی هەبیت.

ئارچی بالدڕووزوێلت، وابەستەی نیزامی باڵوێزخانەی ئەمریکا لەتاران کەلەسی پتامبری ١٩٤٦دا چاوی بەمهاباد کەوتبوو، وازی شاری زورهێمـن وەبەرچاوهات بوو.

پاش ئەوەی کە لەوێ نەهارێکی ڕەسمی خواردبوو، لەگەل ئەندامانی (کابینە)ی کوردستان گفتوگۆیەکی درێژی کردبوو، وەبەتایبەت لەگەل قازی مەحەممەد لەهەمووبارەیەکدا دووابوو قازی مەحەممەد پێی ڕاگەیاندبوو، وەگوتبووی کە (کوماری مهاباد)، (ئیشکەڕنی) دەستی شورەویان نیە، وەپێیگوتبوو، ئەگەر بەراستی وایە، کوواتۆ تاقمێکی شورەوی لێرەدا دەبینی.؟"[٤٧]

لەراستەقینەدا دەهات کاروبار، تەواوبێت.

لەئوکتوبری ١٩٤٦دا دوکتورجاوید (ئوستانداری) ئازربایجان لەگەل قوام ئەسسەلتەنە لەبارەی ئاڵوگۆڕی ناوچەی خەمسە (ئەوناوچەیە لەسنووری ئازربایجانی ڕوژهەلات دایە) وەهەروەها کەهێزی خەلقی ئازربایجـانی تێدابوو، لەگەل ناوچەی سەردەشت و، تکاب گفت و، گودەکات. قەوام حازردەبیت کە ئەوکارە بکات (!) بەلام شاو هێزی ئێران دژی ئەوکارە دەنگیان دەربڕی.

کاتێک کەقازی مەحەممەد کە نووسراوەی سەنەدێکی کەقەوام ئیمزای کردبوو، وەبو گۆڕانەوەی ناوچەکە دەهات بیباتە شاری سەققزبۆلای سەرلەشکر هومایوونی،

،نەچوو. ۴۸

## ۲۴ ـ تێکچوونی کۆماری مهاباد (۱۷ دی‌سامبری ۱۹۴۶)

لەمانگی مەی ۱۹۴۶ بەولاوە، کوماری مهاباد دەورەیەکی باشرو، بەختیاری ڕادەبووارد،بەلام‌لەنەکاو دەهات کەتەمەنی‌ڕابرێ. لەڕاستەقینەدا هەموشتێک بەگورجی دەقەوما: لەنێوە ڕاستی‌مانگی نوامبری ۱۹۴۶ دابوو،کەبەشوێنی گفت‌وگویی شاه ـ قەوام ئەسسەلتەنە،وەزیری‌شەڕ وە سەرلەشکر ئەرفەع فەرماندەی هێز، شا،ڕای گەیاند کە دەزانم سەرۆک وەزیر مەترسی لەوەی هەیە کە دەولەتی شورەوی بە سودو، قازانجی پیشەوەری لەکاروباری ئێمەدا خۆتێوەر،دا،بەلام فەرمان دەدەم کە هێزی ئێران بەرەو، ئازربایجان بڕووا. لە ۲۳ی نوامبری ۱۹۴۶ گوردانی سووەمی هێزی ئیران بەبێ بەرهەلستو، بەرەنگاری هاتە شاری زەنجان کە ناوەرووکەی خەمسەبوو، شابۆخۆیی دژی "کومارەکانی" ئازربایجان‌و، مهاباد دێتە زەنجان وە فەرمانی هێرشی ئاخری دەدات: دەگوترێ کە گوردانی سووەم‌ی‌هێزی ئازربایجان‌وە گوردانی چووارمی هێزی ئیران لە کوردستان‌ی (سنە)وە کە ۳۰۰۰ چرکی‌نازێک‌بوون،وەلەگشت‌دا ۲۰۰۰۰ کەس دژی هەردوک کوماردەست بە هێرش دەبات. لەڕاستەقینەدا هێزی ئێران لەوهێرشەدا بەرگرێکی دژی بونەهاتەپێشێ.

لەشمال‌دا پیشەوەری بەبێ‌ئەوەی کەشەڕ بکات، کۆماری‌تێک دەڕووخێ، ژمارەیەکی زۆر لە سەروکەگەورەکان لە ۱۱ی دی‌سامبر بەرەو‌ لاتی شورەوی هەل‌دێن، لەکاتێک‌دا کەخەلک دژی‌کوماڕهەلستابوونە سەرپێ (دیموکراتەکانیان کەوەچەنگ دەکەوت دەیان‌کوشتن،یەکێک لەوانە مەحەممەدی‌بێریا وەزیری ئاموزشو،پەروەرش‌بوو کە ترمەکەیان لەدووای ماشنێک خست‌بوو وەبەشاری تەورێزدا ڕایان دەکیشا...

لە۱۳ی دی‌سامبری ۱۹۴۶ دا بەرەبەری‌ئێواری،هەوەلین تاقمی هیزی ئیران‌لەگەل سەرلەشکر هاشمی گەیشتە شاری تەورێز.

لەناوچەی کوردستان‌دا،لەمابەینی‌ڕێگای تکاب‌و،میاندوواو، لەنێوان تەپۆلکەو کێوەکانێکی‌کە شاری چکۆلەی شاهین دژی‌یان لەنێوخۆی گرتووە،هیزی

خەلقێ‌تی ئازربایجان ماوەی ٤ ڕۆژان واتە لە ٧ تا ١١ی دی‌سامبری ١٩٤٦دا لەبەرامبەری هێزی ئیران بە رەنگاری‌کرد، بەلام لەئاکام‌دا لەپێش ئەوەی کە پێش مەرگەکانی بارزانی بە یارمەتیان بگەن، سەرکوت کران.

پاش‌ئەوبەرگریە، شەڕێک نەقەوما... پێش مەرگەکانی بارزانی بۆ لای مهابادی پاشەکشەیان کرد، لە ١٣ی دی‌سامبری ١٩٤٦دامیاندوواو تەسلیم‌بوو. لە ٥دی‌سامبردا لە "شۆرای شەڕ"ی مهاباد، قازی مەحەممەد لەگەل براکەی سەدری قازی کە نوێنەری مەجلسی شۆرای تارانێ بوو، وەهەرئەویش‌بوو کە لەبەینی تاران ـ مهاباد دانێونجی‌بوو ـ لەگەل ١٠مرۆڤ لەسەرۆکو، فەماندەرەکانی پایە بەرزی ڕامیاری‌ونیزامی کوماری کوردستان ڕاوتەدبیر دەکەن کە ڕێوووشوێن بکێشێ کەچ‌بکەن، ڕۆژێک‌پاش‌بڕیارنامەیەک لەمزگەوتی هەباس ئاغا لەبەرانبەر خەلک خوێندراوە کەهێزی کورد دەیەوێ لەبەرامبەر هێزی ئیران‌دابەرگری‌بکات‌و، ڕاوەستی. ٤٩

بەلام لە ١٥ی دی‌سامبری ١٩٤٦، ئەسەدوف (نوێنەری) تجارەتی شورەوی لەمهاباد، دەفتەری کاری‌خۆی دەپێچێتە وەو، بەرەو، کونسوول‌گەری شورەوی بۆ ورمێ دەڕووا. ئەسەدوف دەیەویست کە کوردەکان حالی‌بکات کەچوون دەولەتی شورەوی‌پاش شەڕی دووهەمی‌جیهانی[٥٠] زۆر (لاوازو، شەکەتە) ئیتر بۆیەکوماری‌مهاباد بەجێ‌دێلێ، واتە بەوجورە ڕادەگەێنی کە ببوورن‌و، چارەنیە!

کاتێک کەسەرۆکە پایە بەرزەکانی مهاباد بۆیان ئاشکرابوو کە شورەوی یارمەتیان نادا وەپشتی لێ کردوونەوە، ڕاوتەدبیردێننە سەرئەوەی کەخۆیان بەدەستەوەبدەن.

لە ١٦ی دی‌سامبری ١٩٤٦ داقازی مەحەممەد، سەیفی‌قازی، حاجی‌بابا شیخ‌و، سەرۆکەکانی‌دیکەی‌مهاباد بەرەومیاندوواو وەڕێ‌کەوتن، وەخۆیان تەسلیمی سەرلەشکر هومایوونی دەکەن.

پاش گفت‌و، گۆیەکی‌نەختێ دۆستانە، هومایونی بەقازی دەلـــی بگەڕێتە وە مهابادێ.

قازی بۆجاری ئاخر چاوی‌بە مەلامستەفای بارزانی کەوت. بارزانی زۆری هەول‌دا کە گە لی بکەوێ‌و، بڕوا بەلام قازی مەحەممەد لەبەر ئەوەی کە خەلکی مهاباد تووشی کوشت‌و، بڕین نەبێ لەمهاباد دا ماوە، بەقسەی بارزانی‌نەکردو،

لەگەڵی نەچوو.

لە ١٧ دی‌سامبری ١٩٤٦، قازی مەحەممەد ڕەسمەن شاری مهابادیێ دابەدەستی کاربەدەستانی دەولەتی ئێران. بەشوێنی ئەوەداچەندڕۆژ کەڕابرد، سەروکەپایەبەرزەکانی کۆماری کوردستان کەبریتی لە ٣٠مرۆڤ بوون‌گیران‌و، لەبەندیخانە کران.

## ٢٥ ـ محاکەمەی قازی مەحەممەد

لەهەوەڵی مانگی ژانوییەی ١٩٤٧ قازی مەحەممەد، براکەی سەدری قازی‌وەئامۆزای وی سەیفی قازی لەدادگاهێکی نیزامی تایبەتی‌دا کەسەروکی ئەودادگایە سەرهەنگ پارسی‌تەباربوو محاکەمەیان کردن، دادستانی ئەودادگایەش سەرهەنگ‌فیوزی، سەروکی ستادی سەرلەشکر هومایونی‌بوو.

محاکەمەکە لەنهێنی‌دا پێک‌هات، خێزانی‌قازی‌مەحەممەد زۆری هەوڵ‌دا کەسەرلەشکرهمایونی کاری قازیێکان سووک‌بگرێ‌و، تاوان‌بار نەکرێن‌و، ڕزگاریان‌بێت تەنانەت١٨هەزارتمەنـــی قەول‌پێدا، بەلام نەکراو هەرسێکیان بەمەرگ ناسران‌و، حوکمی لەداردانێیان لە ٢٣ی ژانوییەی ١٩٤٧بەڕێوەبردرا ،وە بەجورە یەک‌سال‌و، یەک‌روژ لەتەمەنی دامەزراندنی کۆماری کوردستان ڕا بوواردبوو.

ئینجا هەر لەوکاتەش‌دا قەوام ئەسسەلتەنە لەگەل شۆڕەوێکان بەگرینگی لەووت‌و، ویژدابوو، وە ٥ حەوتوو لە دانی‌حوکمی دادگای‌مهاباد ڕابردبوو (لەوماوەیەدا هێندێ هەواڵان گوتویانە کە چووار کە ڕەت قازی مەحەممەدیان هێنا تارانێ ـ ٥ـ کە دادگایەکی تایبەتی بۆ بەڕێوە بردنی ئەو تەشکیل بێت، لەتاران لە ٢٨ تا ٣٠ مارس لەبارەی دانی‌حوکمی دادگای‌مهاباد ڕاوتـــە دبیریان‌کرد، وائاشکرا بوو کە حوکمی دادگاە بەپەلە دراوە، سەرلەشکر همایونی‌ش ئەوکات لەورمێ بوو، وەلەشەڕی دژی‌بارزانی چاوەدێری دەکرد، کە هەوالی حوکمی لەداردانی سەروکەکوردەکانی پیٚ‌گەیشت، وەبەرادیودەستـــــوری‌دا کەسی‌ڤازێکان هەلاوەسرێن، جائەوسێ مرۆڤەیان لەبەرەبەری‌بەیانی ٣١مارسی ١٩٤٧ لەمەیدانی چووارچرای مهاباد، هەرلەو چێگایەی کەقازی‌مەحەممەد کە جلکی ئونیفورمی شورەوی لەبەردابوو، وەحکومەتی کۆماری‌مهادیـــــی

ڕاگەیاندبوو ،لەدار دران .

ترمەی ئەوان تائێوارێ لەسەر دارمابوونەوە. . . (بوتەنبی‌بوونی‌خەڵک)

لەئاکام‌دا لەنێوان چەندڕۆژان‌داهەموو شوێن‌و ئاکاری کوردەواری کە مابوۆوە لەنیۆیان‌برد ئەوکەسانەی کە لە ڕاپەرینە کەدا دەسیتان تێدابوو، زور بەتاڵوولە تەواوی‌کاغەزو نووسراوەیەکی کەجیێ مەترسی بوو ، وەک وێنەو ،روژنامەو ، ئەسنادو، ئاڵاو، هەرشتێکی کە مابۆوەلەنیۆیان‌برد. تەواوی ئەوکتێبانەی‌کە دەولەتی کوردستان بەکوردی لەچاپی‌دابوو ،کۆیان کردەوەولەمەیدانی‌مهاباد سووتاندرا ،وەسەرئەنجام مهاباد دووبارە لەتەم وخەم‌داماوە.

## ٢٦ ــ کۆماری‌مهاباد بۆتێک‌چوو؟ (مەبەستی تێک‌چوونی کۆماری مهاباد)

بەڕاستی ئەوە کورد نەبوو کە لەبەرامبەر ئێران داشکابوو، . . . بەڵکو دەولەتی شورەوی بووکەلەبەرانبەر ئەمریکاو، بریتانیادا شکابوو!" بارزانی ئەومەبەستەی لەپێش‌دا لە ١١ی‌دی‌سامبری١٩٤٦دا لەبۆکان بەژیری‌و ،وریائیۆە ڕای‌گەیاندبوو ،وەهەروەها گوت‌بووی‌کەڕابەرەکانی کۆماری‌مهاباد لەوبابەتەوەزۆر لەکاروباری دەولەتەکانی جیهانیوە ئاگادارنین. [٥٢]

قازی مەحەممەدو، هاوڕێیەکانی لەمهاباد داسوور دەیان زانی کەئتر "کوماری‌مهاباد" تەواو لەمەترسی دایە: یەکێ‌لەنیگە رانێکانیان ئەوەبوو کە هێزەکانی شورەوی‌لەە ١مەی١٩٤٦دا ، واتە پاش‌نێوان‌ناخوشێکی دەولەتە گەورەکان کەلەبەینی گفت‌وگۆیەکانیان‌دا قەومابوو ،دەبووئیران‌بەجێ بێڵن. دووەم بریتی‌بوو لەوە کە وەزیرەکانی "تودەئی" لە ١٩ ئوکتوبری ١٩٤٦کەلەکابینەی دەولەتی ئیران وەدەریان نابوون ،سووهەم ،وتارەکەی جورج‌ئالێن‌بالوێزی تازەی ئەمریکا لەتاران‌بوو کە لە ٢٧نوامبری ١٩٤٦دا گوت‌بووی کە دەولەتی ئەمریکا دان بەسەر"پاراستنی تەواوی زەیوی‌ئیران دادەنێ وەدەیەوی دەولەتی مەرکەزی بە هێزبێ" بەراستی ئەوەی کە بۆ کوماری مهابادزۆر پێویست بوو ،لەسەرڕێی ڕاوەستانی‌کۆماربوو ،دەبوو ڕابەرەکان هەرلە هەوەڵەوە لەبیروڕای ئەوەدابین، وەنەدەبوو بەهیوای قودرەتی‌نیزامی‌وڕامیاری دەولەتی شورەوی‌بن ،دەگوترێ کە تەنیا قازی مەحەممەدو، چەن‌کەسێکی دیکە لەهاوڕێیەکانی بوون کە ژیرو، [٥٣]

زانابوون. کوماری مهاباد هەرچەند ناوچەی چووکبوو، وەتەمەنی حکومەتەکەی زور درێژەی نەبوو بەڵام لەڕاپەرینی نەتەوایەتی کورد لەمێژوودا جیگایەکی بەرزو بەرێزی هەیە: ئەوەیەکەم بزوتنەوەی کوردبوو کە دەدیترا "ڕووناک بیرەکان" ئەوڕاپەرینەی بەڕێوە دەبەن. ئەگەر کۆماری مهاباد بەردەوام بایە،کوردەکان بە دونیایان نیشان دەدا کە کورد بەڕاستی مل هوڕنیـــە، بەڵکو توواناییوەیهەیە کە خویی بەڕێوەبەری.

سمکۆ لەراپەرینەکەی دا نەختێ توند ڕۆیشتبوو، ئینجا پاش سی سال رابوو اردن لەڕاپەرینی پێشوودا، شکان وتێکچوونی کوماری مهابادش نەی توانی تۆ لەورەگرێتەوە.

دەگوترێ کەشکانی دووائی مەبەست بەوەبوو کە بزوتنەوە کە لەسەداسەد بزوتنەوەیەکی نەتەوایەتی بوو بەبێ ئیدئیولوژی کـــە هەرگزوهەرگز نەی دەتووانی خەباتی ڕزگاری تێدا بەبیندرێ کە نەتەوەیەکی ڕابەری بکات.

## ٢٧ ـ دوواڕۆژی بارزانیو، هاوڕێیەکانی

بارزان نیێکان هەموویان بەتەواوی لەشساغو، چەکداربوون،کاتێک کە لەمهاباد ڕاوەدەر.. دەکەوتن، لەئەنباری ئەسلەحەی (کۆماری) لەمهاباد، نزیک بە ٣٠٠٠ تفەنگ، ١٢٠ ڕەشاشو ٢دووقەبزە تۆپیان لەگەل خۆیان برد[٥٥].

لەڕۆژی ٢٠دیسامبری ١٩٤٦دا بارزانی لەمهاباد چاوپێ کەوتنێکی لەگەل سەرلەشکر همایونی بەڕیوەبردو، پێێ ڕاگەیاند کەئەگەر باڵوێزی بریتانیایە، دەتووانێ تەئمینم بۆوەرگری کەلەعەراق دا بەخاترجەمی بژیم،من خـــــۆم بەدەستەوە دەدەم.

ئینجا مەلامستەفا بەشوێنی نووسینی نامەیەک بەزمان عەرەبی کە سەر شۆڕکردنەوەی خۆی تێدا نووسیبوو، هاوڕێ لەگەل میرحاج، عززەت عەزیز، نوری تاها، بۆ ووتو، وێژلەگەل پیاوەکانی ئێرانی وپیاوەڕامیاریکانی بالویزی بریتانیا لەبابەت پاشەڕۆژی خۆیو،هاوڕییەکانی هاتە تاران. بارزانی ماوەی مانگێک لەتارانێ ماوە، لەوماوەیەدا لە (باشگای ئەفسەران) ڕووبەڕووی دەفتەری ستادیهێزی نیزامی ئێران جێگیر ببوو، وەلەپێشگەڕانەوەی بۆ مهاباد لەڕۆژی

٢٩ ژانوییەی ١٩٤٧ دابوو کە لەگەڵ شای‌ئیران‌و،پیاوە ڕامیاریێکانی بریتانیاو، ئەمریکا چاوپێ کەوتنی بەرپێوە بردبوو.

بارزانی نەی‌توانی لەگەل ئنگلیسێکان‌پیک‌بێت، بەلام ئەوپێشنیارەی ئیرانیێ سەلماندکە ١٠٠٠٠ کەس لە "عێلی" بارزانی‌لە ناوچەی ئەلوند لەنزیک هەمەدان جیێگیر ببن.

لەوکاتەدا شیێخ‌ئەحمەد لەشاری نەغەدە دژی ئەونەخشەیە بزوتەوە.

ئینجا لەگفت‌وگوی ئاخری‌دا کە لەڕوژی ١٩ فورییەی ١٩٤٧دا لەبەینی شیێخ‌ئەحمەدو مەلامستەفا لەلایەکەوە، وەلە لایەکی‌دیکەوە سەرلەشکر همایونی وەدی‌هات، حازر بەخوەدەستدان‌بوون.

لە ١١ی مارس تا ١٢ی ئاوریل‌ی ١٩٤٧ واتە لەماوەی مانگیێک‌دا، هیێزی ئیران، هیێزەکانی بارزانییان لەمەلەبەندی کیوەکانی‌کی کەلە ڕوژئاوای شاری شنویەرا تاکووسنووری ئیران وعەراق‌وتورکیە دەستی پی‌دەکری، وە دوو‌ویان کەوتن.

لەبابەت کاروبارو، فرەفیێلی نیزامیوە،هیێزەکانی بارزانی خویـــان وانیشان‌دەدا کە شک‌وگومانیان‌لەنیێو شەرکرەرەکان‌دا هەیە، لەنیێوەڕاستی مانگی مارس‌دا ١٢ئیرانی لەتیێک‌هەلی چونیێک داکوژران‌و ٧٠کەسیان‌یەخسیرکران... پاش حەوتویەک هیێزی‌ئیێران دووبارە لەشەرێکی‌دیکەدا٢٠سەربازی کوژرا ،وە ١٥کەسی‌شیان ئەخسیرکران. لەنیێوان بارزانیێکان‌دا لەوانەی کەشەڕیـــان پی‌نەدەکرا، ڕایان هیێنا سەرئەوەی کەلەگەل‌شیخ‌ئەحمەد خویان بەدەستەوە بدەن،ئەوانەچەند هزارکەس ژن‌و،منداڵ‌و،پیاوبوون کەلەگەل بارزانی‌بوون وەلەژیێر بومبارانی فروکەکانی ئیێران،وەسەرماو سەخلەتی زستان‌دا ئەوی‌ساڵی مابوونەوە.

لەهەوەلی مانگی ئاوریلەوەشیخ‌ئەحمەد بوعەراق پەنای هیێناوە لەگەڵ زوربەی عیێل" چـــەنـــد ڕوژپاش لە ١٣ی‌ئاوریل‌ی ١٩٤٦ دا بارزانی هاوری لەگەل‌هاوالەکانی کەچندسەد کەس‌بوون بولای‌عەراق وەری کەوتن ک بچنەوە و لاتی بارزان.

## ٢٨ – ڕی پێوانی دوورو ، درێژی بارزنێکان بۆلای و لاتی سوویەت

بارزانی لەلای خوی پێیوابوو کە عەراق ڕێی دەداتەوە،بەڵام زوو وەلامی دراوە کە بەڵێنی نادرێتێ،نوێنەرەکانی کورد لەمەجلسی یاسائی دا دەنگیان دەربڕی،بەلام کە لکی لیوەرنەگیرا، لەسەر ئەوەش ڕاچووار ئەفسەری کوردی عەراق بەناوانی مستەفا خۆشناو،خێروڵلا ، مەحەممەد مەحمود وەغززەت عەزیز،کە لەگەل شیخ ئەحمەد خۆیان بە دەستەوە دابوو لە ١٩ژوئنی ١٩٤٧دا لەدار دران.

سەرئەنجام تەنیا ڕێگایەک بۆ بارزانی دەماوە ئەویش پەنابردن بۆو لاتی سوویەتبوو.

چونکە نەدەولەتی ئیران،نەتورکیە، بەهیچ جۆرێک ڕێگای مەلامستافایان بو ولات نەدەدا.

وادیار بوو کە لەئاخری سال ١٩٤٥را کە مەلامستەفادەیەویست بوئیرانێ بێ، لەگومانی وەیدابوو کە ئەگەرنەی توانی لەئیران بمێنێتە بچێتە شورەوی: لەئاکام داپاش چەندێک، وەپاش گەیشتنی بوئیرانێ،وە چاوپێ کەوتن کەلەگەل ژێنیرال لیوبوفێ. همزە عەبدوول لا بەنیوی بارزانی نامێلکەیەکی بۆستالین نووسی وەلەوێدا داخووازی کردبوو،کە بۆبەرگری لەکۆماری کوردستان لەئیران دابمێنێتەوە.

وەئەگەر هاتو، کۆمار سەری نەگرت،شورەوی حەقی پەنابەری بوو لات بداتێ. ٥٦

پاشڕابردنی سالێک،بارزانی لەسەرڕا لەدەولەتی شورەوی داخووازی کرد کە ئەو داوەتە بکرێ...

لە ٢٧ ی مەی ١٩٤٧،عەراق بەئیرانیی ڕاگەیاند کەئەوە بارزانی لەسنووری تورکیە ڕادەبرێوە دەیەوێ لەشمالی و لاتی بارزانەوە بێتەوە بۆلای ئیران.

مەلامستەفای بارزانی هاوڕێ لەگەل ٥٠٠ مروف لەپێش مەرگەکانی بەشوینیڕی پێوانێکی دوورو، درێژ واتە ٣٥٠کیلومتر کە لە ٤ ڕۆژان دا پێوابووی،

گەیشتە آرازێ(ارس) وەپەنابو شورەویدەبات! شای ئیران لەوکاتەدا لەشاری ئەردەوێلێ بوو،وەدەستووریدابوو، بەهەر چونێک بێ،پیشیبارزانیکان بگرن،وە هەڕەشەی لەئەفسەرەکان کردبوو، ئەگەر بێتو بەپاشی هەول نەدەن دەدرێنە دادگاینیزامی. بەلام بارزانیبەزۆرویائی ئاکاری نیزامی ئیرانیێ ناکام هێشتەوە وەڕێگای سنووری ئیرانو، تورکیەیەی پێوا وەخوێی گەیاندە مەلبەندی کێوەکانی ئاراڕات، کاتێک کە هێزی ئیرانیان لەقەراغ بارزانێکان ڕادەبردن،وە کەمێک چووبوونە نێوخاکی تورکیە، ئینجا بارزانێکان بەبێ زانییی هێـــزی ئیران بەپشتسەریانداڕادەبردن.

سەرئەنجام بارزانی و هاوڕێیەکانی لە ٩ی ژوئنی ١٩٤٧ وە، لەشمالی شاریخوێەڕا، ئاخرین زۆربەیخۆیان لەهێزیئیراندا

حەوتوێک پاش لە ئارازێ ڕابردن،وەبوماوەی ١١سال لەوەلاتی شورەویدا مانەوە، وە"لەبەرچاوان" وونبوون.

## فەسلی ۳

### پارتی دیموکراتی کوردستانی ئیران

لەپاش تێک چوونی کۆماری مهاباد تاشۆڕشی عەراق (۱۹۵۸)
بە دووای تێک چوونی کوماری مهاباد ،لەداردانی سێ قاضی، لەبەندکردنی هێندێ لەئەندامانی کمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان،
وەهەڵاتنی هێندێ لەوان بۆعەراق ،حەرەکەتی نەتەوایەتی کورد لەئیراندا ڕاوەستێندرا.
۱ ــ ک ک ک وە پ ــ د ک لەهەوەلی سالی ۱۹۴۸ ڕاپارتی دیموکراتی کوردستان هەولی داوە کەلەگەل کمیتەی کومونیستی کوردستان (ک ک ک) وەبەتایبەتی لەگەل رەحیم ی سولتانیان هاتوچوی دامەزرێنی کەدەگوترێ بلێن کەجێ نشینی قازی مەحەممەد بوو لەپارتی دیموکراتی کوردستان دا.
پارتی دیموکرات بەشێک وەشاخەیەک لە (حیزبی تودە)ی بوو لە کوردستان :
ئەندامانی پارتی دیموکراتی مهاباد کەهاتبوونە تاران هەر لەحیزبی تودە دامانەوە. فشاریان بۆ خەلک پتردەکرد، هەواداران ،واتەمیلی شیای ئەندامانی تازە، تازەکاربوون ،زۆر تەجرو بەیان نەبوو ،وەزۆر زوو لەلایەن پۆلیسەوە سەرۆکەکانیان گیران، کەیەکێک لەوانە عەزیزی یوسفی بوو کەلەسالی ۱۹۴۸ وە تاسالی ۱۹۵۲ لەبەندیخانەکرا.
ب ـ مصدق ــ پاش سالی ۱۹۵۱ کە موسەددق هاتەسەر ئیشوکار ،ئازادی بەخەلکی زیاتردرا، وەلەژێر چاوەدێری دووئەندام بە ناوانی عەزیزی یوسفی

وەغەنی‌بلوریان پارتی‌دیموکرات بووژاوە. لەهەل‌بژاردنی سالی ١٩٥٢ ئەندامێک لەپارتی دیموکراتی کوردستان بە نیوی سادق‌وەزیری‌لەمهاباد هەل‌بژاردرا...

هەر چەند، پۆلیسو،کاربەدەستەکانی دەزگای دەولەت لەوکارەپێشی‌گرت، بەلام بە نوێنەر هەل دەبژێردری .لە سەرئەوەشڕا بەدەستوری حەمەرەضاشا هەل‌بژاردنە کە لە مهاباد قەبول نەکرا، بەجێگای ئەو، امامی جومعەی تاران کە شیعەبوو،داندرا. خەلکی مهاباد قەت ئەوپیاوەی نەدیت‌بوو نەناسی‌بووی. جا امامی جومعەی‌تاران بووبەنیونەری داسەپاوی خەلکی مهاباد لەدانشتگەی شورای‌میللی‌دا.

لەناوچەی دەوروبەری مهاباد هێندێ بزوتنەوەو، ڕاپەڕین دەست‌پێ‌کرا: لەسالی ١٩٥٢ دا شۆڕشی جویتاری لەناوچەی بوکان دژی ئەربابە فئودالەکان دەستی پێ‌کرا. لەمانگەکانی مە و ژوئنی ١٩٥٣ چەند خۆپی‌نیشـان‌دان لەمهابادوە وەدی‌هات، لەونێوەدا گەنجێک‌بەدەستی پولیس کوژرا وە هێندێک لەخەلک‌گیران.

لە ١٦ی ئوتی ١٩٥٣ دا خۆ پێ‌نیشان دانێکی گەورە بە لایەن‌گری موسەدق لەمهاباد بەرێوەهات. بۆ هەوەلین جارپاش شکانی شۆڕشی کۆماری مهاباد، هێمن هونەری‌کورد،هونراوەیەکی بەزمانی کوردی لە خۆپێ‌نیشـان ـ دانێک‌دا خویندەوە[1]

شەقامی پەهلەوی بەنێوی(١٦ی‌ئوت) واتە ٢٥ی‌مرداد گۆڕدرا،ئەوکارە بەخاتری ئەوە بوو کە قازی موحەممەد لەسالی ١٩٤٥ دا لە (١٦ی ئوت) حیزبی دیموکراتی دامەزراند.

بەلام‌پاش چەندێک لاپەڕی مێژوو پەڕی لێدرا، شا کە چووبۆ شاری‌ڕۆم‌ی ئی‌تالیایە، هێندێ لەلایەن‌گرەکانی لەئێران بە یارمەتی ئەمریکا چەیان کودتایان کرد، وەشالە ١٩ی ئوتی ١٩٥٤ دووبارە گەڕاوە ئێران! ئینجا لەنیوەشەوێ‌داشاری مهاباد لەلایەن سەربازەکانی شاوە،گەمارۆدرا،وەئەوجاریش دەسیان بەگرتنی خەلکی شارکردو، دووبارە حیزبی دموکرات کردەوەکانی بووە بەنهێنی

*١) هێمن هونەری بەناوبانگ لە ٢٥ی مردادی سالی ١٣٣٢ دا بەبونەی هەلاتنی‌شاوەچونی‌بوروم ئیزگەی‌بەغدایەوە هونراوەیەکی‌باشی‌خویندوە کەئاخریکەی ئەوەبوو: برو ئەی‌شای‌خائن بەغدا نیوەی رییەت‌بی ـ م ـ ر*

### ٣ـ جیاوازی پارتی دێموکراتی، کوردستان لەحیزبی توودە

خەبات گێڕەکانی هەوا داری پارتی دیموکراتی کوردستان چاوە ڕووانی ئەوەیان بوو کە ٧٠٠ ئەفسەری توودەیی لەهێزبی گشتی ئیران داهەن، بزوێکیزوو هەل دەستنە سەرپێوکاروبار بەدەستدەگرن، وەحیزب وابە قەوەتبوو تائەوڕادەیەی کە هێندێ لەوئەفسەرانە تانێوە رووکەو،دەروونی دەرباری شای چووبوونە تێو،وەهەروەها یەکێ لەسەروکەکانی (ڕوکنیدوو) کە چووبوسەر کوت کردنی کارگەرەکان بۆ ئابادان لەئەندامانی حیزبی توودەبوو. بەلام نەیانتووانی کارێکی بکەن، جامەبەست بەوبەهانەیەحیزب دەنگیدەربڕی،وە جوی بوونەوەی هینا پیشی.

بەراستی هێزی حیزبی توودە لەشاری سەنعەتی ئابادان زور بەقەوەت بوو،پاش ئەوەی کە ساواک پێکهات، ئەوهێزەیان بەتەواویتێکدا

ئینجا لەوکاتەدابوو کە پارتی دیموکرات خۆی لەحیزبی تودە جوێ کردە وە ـ سەرئەنجام لەسالی ١٩٥٥ ئەوکارەکرا. پاش ئەوجوێبوونەوەیە،پارتی دێموکراتی کوردستان لە گەل حیزبی تودە نێوان ناکۆکیان لێپەیدابوو،وە لە ئاکاما کاتێک کە لەسالی ١٩٥٥ پولیس سازمانی حیزبیتودەی تێکدا، حزبی دیموکرات تەدبیریهێنا سەرئەوەی کە خەباتی خۆی لەحیزبی تودە جوی کاتەوە.

### ٤ـ کمیتەی مهابادو،سنە

لەو کاتەدا کە لەلایەن دەولەتی ئیران خەلکیان لەبەندیخانە دەکردو، زۆریان بو خەلکی دێنا،سازمانێکی کە بتوانێ بەچاکی هێزبگری پێـــک نەهاتبوو، ئەندامانی بەنێوی ئەوحیزبەکەبریتیبوون لە عەزیزیوسفی، غەنی بلوریان،عەبدوورەحمانی قاسملو، ڕەحیمی سولتانیان،کەریمی ئووەیسی وە عەبدوولڵای ئیسحاقی (ئەحمەدتەوفیق) [٣] وەلەشاری سنەلەلایەن شەریعەتیو، هێندێ لە ئەندامانیدیکە، کمیتەی ناوەندی حیزبی دیموکراتی کوردستانیان،

پێک هینا . . . .

لەسالی ١٩٥٤ – ١٩٥٥ داغەنی‌بلوریان ، توانی‌چەند ژمارەیـــەک رۆژنامەی کوردستان لەچاپخانەی تەورێز لەچاپ‌بدا ، بەلام پاش ئەوەی‌کە پۆلیس بەوکارەی زانی ،نەیان‌توانی پتر لە پێنج ژمارە ئەورۆژنامەیە لەچاپ‌بدەن‌و ، وەدەری خەن (ئوتی ١٩٥٥) ئەوروژنامەیە لەبارەی دامەزراندنی‌حیزبی دیموکراتی کوردستان دەی‌نووسی‌وهەوالی‌شی بلاودە کردەوە .

## ٥ – کمیتەی ناوەندی سالی ١٩٥٤

لەسالی ١٩٥٤ زاینی‌دا دووکمیتەی مهابادو سنە یە کێتی خۆیان راگەیاند وە (کمیتەی مەرکەزی) لەئەندامانی هەردوک شارپێک‌هات .

لەمەی ١٩٥٥کمیتەی مەرکەزی کۆبوونەوەیەکی پێک هێنا وە لەچەنـــد کیلومەتری شاری مهاباد کۆن‌فرانسێکیان بەرێوەبرد کە ٢٠مرۆقی ئەنـــدام ئەوکمیتەیە دا بەشداری کرد لەئاوەدانیکان‌و ، دێیەکانی‌دەوروبەری مهاباد دا ئەندامی حیزبی دیموکراتی کوردستان زۆربوو هەروەها لەشاری سنـــەو کرمانشانیش‌دا چەند هەزار مرۆقێک ئەندامی حیزب بوون . سازمانی‌حیزب زورباش پێک‌هات‌بوو ، بەلام بزوتنەوەکەی هەر بەنهێنی بوو ، وەهەروەها یەک‌جار بە نهێنی‌و ،دزی ، لەگەل پارتی چەپی‌عەراق پ.د.ک.ک.ع وەپارتی دیموکراتی کوردستان عەراق پ.د.ک. کە خۆیان بەپارتێکی‌سەر بەخۆ دەزانی هات‌و ،چۆیان پێک‌هێنا ، وەتائەوزادەیەی کە ئەدوو حیزبە نێوان ناخوشیان لی‌پەیدا ببوو ویستیان کە حیزبی‌دیموکرات‌کوردستانی‌ئیران لەوبارەیەدا قەزاوەت لەنێوانیان دابکات ،وەپێکیان بی‌نێتەوە .

## ٦ – پروگرامی پ.د.ک ئیران (١٩٥٦)

لەسالی ١٩٥٩ حیزبی دیموکراتی کوردستان ئێران هەوەلین "بەرنامەی خۆی لەچاپ‌دا ، واتە "نەخشەی‌بەرنامەی" خۆی بەرێوە برد ، کە هەر دووائی بەرنامەی حیزبی دیموکراتی زەمانی قازی‌موحممەدبوو ئینجا حیزب دەنگر

ئاهەنگ و ، هەوای گۆڕی! دروشمی (خەبات دژی ئیمپریالیسم وەسەر کەوتنی ـ نەتەوایەتی " لەڕووی نەزم و ، ئاهەنگێکی دروستەوە دەگوترا ، نووسەرەکانی کورد لە هەوەلەوە لەبارەی چێوتی‌و نالەباری‌و ناڕەحەتێکی‌دا کە بە درێژائی مێژوو لە کوردستانی‌ئیران کراوە ، دەیان‌نووسی‌و ، بڵاویان دەکردەوە کە بریتی‌بوون لەوگوتراوانە : منداڵانی‌کورد ناتووانن بە زمانی خۆیان بخوێنن‌و ، بنووسن ، وەبەزۆر زمانێکیان پێ فێردەکەن ،کەپێیان‌خۆش‌نیە وەئەویش زمانی فارسیە . . . . وەئەوەی کە بۆنی کوردێیەتی لێ‌دێ نابی‌بەسەرزار دابێ ، تەواوی کاربەدەستەکانی کوردستان لەتارانەوە دەنێردرێن ،لەکوردستان‌دا هێزی‌نیزامی زۆرە ،واتە "میللی‌تاریزەبووە ، پۆلیس دەسیان بۆ سەرناموسی خەڵک درێژ دەکەن . "

وە هەروەها نوسەرەکان بەوجورەیان دەنویسی کە : نەتەوەی کورد لەژێر دەست‌و ، پێی سێ ملهورو ،زورداردا "فشاری ئیمپریالیسم ، حکومەتی ناوەندی سەرمایەداری‌و ، فئوداڵ بوورژوا ،وەفئوداڵەکانی کورد " بەسەردەبات . . .

هەروەها دەریان دەبڕی کە پێویسیە دژی شوێنیسم ئیرانی کە دان بەسەرمافی نەتەوایەتی کورد دانانێ وەمافی‌هیچ‌یەک‌لەنەتەوە بەش‌خوراوەکان‌و ، چەوساوەکانی ئیران نادا ،وەلەئاکاما دژی حکومەتی مەرکەزی مۆنارشی ـ فاشیستی (شای خەبات دەکات ، تابتوانێ مافی‌خۆی بەدەست‌بێنێ‌وەحکومەتی نەتەوایەتی کورد دامەزرینێ ،وە داوادەکا پاڕلمانێکی لەنێوئەرانی نەتەوەکان دروست بێت ، تاکاروباری نەتەوەکان بەچاکی بەڕێوە بچێت . ژنان پێویستە لەکاروباری و لات داهاوبەش‌بن‌و ، هەل بژێردرێن ،وە لەگەل پیاومافیان بەرامبەربێت .

زمانی کوردی پێویسیتە زمانێکی ڕەسمی کوردستان بێت ، وەمافی نەتەوە چکۆلەکان‌و ، کەمەکان‌ش لەوبارەدا لەبەرچاوبێت .

ئازادی مەزهەبی ، قەڵەمی لەبەرچاوبێت ، سەرئەنجام حیزبی دیموکراتی کوردستان دیەوێ حکومەتیکی دیموکراتیک پێک‌بێت ، حکومەتێک ، بێت کە زۆری سەرنێزەوپۆلیسی تێدانەبێ . ئینجا هێزی نیزامی وپولیسی ، پیویسیە لەخەلک‌بی بەنێوی هیزی نەتەوایەتی ) .

هەروەها لەبەرنامەی حیزب‌دا ، مەسەلەی دانانی کارخانە لەو لاتی کوردستان ، بەشداربوون لەکان‌و ، مەعدەنی ژێرزەوێکان‌و ، بەشدار بوونی‌خەلک لەئاوو ، سەرسەبزەدیمەنەکان‌و ، جەنگەلەکان ، دابەش کردنی زەویەکانی

فیۆدالەکان لە نێوخەلکە چەوساوەکان ،وە ئەستاندنی‌زەیو ، زارەکان‌لەدووژمنانی خەلک‌و ، بەشکردنی لەجوتیارەکان‌و فەلەکانی،چەوساوە،بەڕێوەپچێ وە هەروەها تاکو تەمەنی ١٤سالە سێیسیتە خوێندن ئی‌جباری بێت ، دانانی کانگای تێئاترو، ئیزگەی‌رادیو ، زانستگە ، وەدانانی مەدرەسەی نەتەوایەتی بە زمانی کوردی. وە هەروەها حیزی دیموکراتی کوردستان بۆ ئەوەی‌خەبات‌دەکات ،کەئەواوی ، نەتەوە کوردەکان‌ی جیرانی خوێی لە دیلی و ئیێخسیری ڕزکاربکات ، وە بۆ ئازادی ئەوان تێدەکوشی . "

سەرئەنجام بەو بۆنە یەوەبوو کە لەسالی ١٩٧٣ ، لەکێشەکێش‌وشۆڕشی‌دا کە حیزبی‌دیموکراتی‌کوردستان‌ی ئیران "ڕەسمەن" ڕای‌گەیاند کە خەباتی "چەک‌دارانە" دژی ڕەژیمی شادەکات . بەلام‌حیزبی دیموکرات لەسالەکانی ١٩٥٨ – ١٩٥٥ ، ڕووناکی کردەوە کەلەحەرەکەتی نەتەوایەتی شۆڕش گێڕانە دوومەبەستی هەیە ،واتەوەدەرنانی‌شاوەبەدەست‌هێنانی‌مافی نەتەوایـــەتـــی وەیارمەتی بەکوردە چەوساوەکانی و لاتی جیران وەخەبات‌بۆسەرتاسەری کوردستان

## فەسلی ۴

### ـ حیزبی دێموکراتی کوردستان لەکاتی دامە زرانێوە (۱۹۴۶) وەشۆڕشی ۱۹۵۸

پێشوازیو، دڵنوازی قازی مەحەممەد لەمەلامستەفای بارزانی وە ۱۰/۰۰۰ کوردی هاوڕێی، مەسەلەیەکی گرنگی هێنا گۆڕێ... قازی مەحەممەد تێدەکۆشی کەبە مەلا مستەفای لەپێش‌هاتنی ڕابگەیێنێ کە لەو کاتەدا کە دەیەوێ پەنای بۆ کوردستان‌ی ئیران بێ‌نێ، مەسەلەی‌قاتی‌و، قڕیو، بێ‌نانی لەگۆڕێ دایە، وەهاتنی وان بۆئیران پڕ لەمەترسی‌و، دژواریە.

سەرئەنجام مەلامستەفاو، هاورێیەکانی لەلایەن هێزی عەراقەوە لەسالی ۱۹۴۵ بوئیران ڕەپال دران وەبەبێ ئەوەی کە چاوە ڕووانی وەڵامی قازی‌مەحەممەدبێ، وەبیرلەکارەکە بکاتەوە، لەگەل مرۆڤەکانی لەسنوور ڕادەبرن، وەدێنە ناوچەی شنۆ، مهاباد. ئینجا بە هاتنی ئەوان قاتی‌و،قڕی، نەخۆشی کە وتووئی زەرەروزیانێکی زۆری لەومەلبەندەدا.

کوردەکانی ئێران بەچەشنی کوردەکانی عەراق زۆر سڕ پۆش بوون، وەلە چەشنی ووت‌و،ویژێکی کەلەبەینی قازی مەحەممەد، وە مەلامستەفادا ڕادەبرد، حالی نەبوون. سەرئەنجام واڕوون‌بووە کە مەلامستەفا بەچاکی سەری بۆ قازی‌مەحەممەد شوڕ کردوتە وە،وەگەورەئی وی‌سەلماندووە. لەڕاستەقینە دامەسەلەی گفت‌وگوێ ئەودوومرۆڤە بەچاکی‌دیاربوو، ئەویش‌مە بەستی هەردوکیان ئەوەبوو کە مەسەلەی (پەیام‌و، وەلامی مێژووایەتی) کەلەوکات‌و، دەمەدا، کە لە گۆڕێ دایە، بەڕێوەببردرێ!

لەمانگی فیووریەی‌سالی ۱۹۴۶ دامانێگ پاش‌قازی مەحەممەدو، حکومەتی

کۆماری کوردستانی ئێران لە (٢٢ ژانوییەی ١٩٤٦) ڕایگەیاند کە ٩کەس لەکوردیعەراق واتەبارزانیو، هەمزەعەبدوولڵا کمیتەی پارتی دیموکراتی کوردستانیئیران بۆ چارە سەرکردنی بارزانیێکان لەئێران داپێکهاتووە[1]. مەبەستی دانانی ئەوکمیتەیە ئەوەبوو کە هەستینەتەوایەتی خۆی بۆ کوردانی عەراق، چاوەدێریبکات! لەهەوەڵەوە قازی مەحەممەد لەسەر دامەزراندنی ئەوکمیتەیە ڕازیبوو، ماشێنی تایپی لە ژێردەستی دانان،بەلام وردە ـ وردەپێی حالی کردن کە تەنیاحیزبێک لە کوردستانی ئێراندا، پێویستە، لەکارو کردەوەدا ببزوێتەوە.

پاش چەندێک هەمزەعەبدوول لا گەڕاوەعەراق،وە نامێلکەیەکی پێبوو کە بۆ باباعلینووسرابوو، کە ئەومرۆڤە یەکێک لەقەومەکانی شێخمەحمودبوو، نووسراوەی ئەو نامێلکەیە بریتی بووە لە داخووازی گەڕانەوەی مەلامستەفا بوعەراق،وەووتو،وێژکردن لەگەل دەولەتی عەراق. —، هەروەها بارزانی ویست بووی‌کە پیاوە چەک دارەکانی عەراق بەیارمەتی هەمزە عەبدوولڵا پارتی دیموکراتیکی کورد لەعەراق،دامەزرێنن.

## ١ ـ گەڕانەوەی بارزانی بۆعەراق

پێویستە بگوترێ کە نێوانی قازیموحمەد، لەگەڵ مەلامستەفایبارزانی هەروا دەهات ناکوکترو، خراپتربێت ـ وازوچلۆ نایەتی پەنابەرەکان لەبابەت لەشساغیو، خواردنەمەنی ڕۆژبەڕۆژ بەرەوخراپ دەڕۆیشت. لەلایەکی دیکەشەوە بارزانی لەگەل ٣٣ کەس لەهاوڕێیەکانی،وەشیخ ئەحمەد لەسالی ١٩٤٥ دا لەدادگای بەغدایەدا بە ئیعدام مەحکوم کرابوو، چونکە لە دادگایەدا خازرنەبوو.[2]

بەلام وادیاربوو کە چوونەوەی بارزانی بۆخۆی تاکتیکێک بوو، بیروڕای بارزانی ئەوە بوو کەلەسەر ئەوەشڕاکەنێوانیان لەگەل قازیموحەممەدو هاوڕێتەکانی زۆرخوشنەبوو بەلام بارزانی دەیەویست بەهەرچونێک بێ دلیقازی بەجێ بێنێ، وە بۆ لای خوێ زیاتر بکێشێ.

برایم ئەحمەد نەیدەویست کە کۆماری کوردستان لەمهاباد لەڕو،

لاوازبێ ، ئینجا نامەیەکی لەقازی موحەممەد نووسی کە لە بارزانی زیاتـــــر چاوەدێری بکرێ ،وەباشتر ئاگای لێ‌بێ‌وە تاکتیکی حیزبی‌دیموکراتی عەراق لە شاری سولەیمانێ دا بەوجورە بە شکان ڕووبەروو بوو . ٣

بەشوێنی ئەوە دالەچاپەمەنیکان‌دا بەتایبەت لەڕۆژنامەی کوردستان لە سالی ١٩٤٦ نیوی بارزانی‌نیان بە ژێنیرال مەلامستەفای بارزانی نیوبرد و مەسەلەی گەڕانەوەکەی دووائی‌هات‌و ، ئی‌دی‌باسی‌نەکرا .

## ٢ ـ پێک هاتنی حیزبێکی کورد لەعراق‌دا

کوڕی هەمزەعەبدوولڵا کە بەشی دووهەمی کوڕەکە بوو ،بەو نەتیجەیە گەیشت کەبۆسەر کەوتنی گەلەکە لە داهاتوودا پێویستە "حیزبی دیموکراتیک کوردستان لەعەراق دا پێک‌بێت ،وەبەدووای ئەوەدالەکوردستانی تورکیەش‌دا حیزبێک هەستی هەبێت وە بەوجورە هات‌و ،چۆ لەنێوان ئەوان‌دا وەدی‌بێ ،وە پەرەی پێ بدرێت . لەوبەینەدا بەرەنگارێک لەبەینی برایم ئەحمەدو ، ئەوانی‌دی رووی‌دا ،چەند سالێک ئەوە هەردرێژەی هەبوو ، حیزبی دیموکراتی عەراق لەبەینی دوو ڕەقیب ،واتەبرایم ئەحمەد وە هەمزە عەبدوولڵا ، کاروباری خوی دەکرد ، ئینجا هەوڵ دەدرا ،بەینی ئەو دووانە نێونجی بکرێ‌و ،پێک بێنەوە وەنەخشێکی ئەوتۆیان ڕەچاوکرد ،کەئەو دووانە بکەنەخزم‌و ، بەنێوان ناخۆشیکە دووای پێ‌بدەن‌ە جاهێنایان خوشکی برایم ئەحمەدیان دابە هەمزەعەبدوولڵا ، و خوشکەزای هەمزە عەبدوولڵاشیان لەبرایم ئەحمەد مارەکرد . وەتەنانەت ئەوئال وگۆڕە بە کوردەکانی مهابادێش ڕاگەیان‌درا . لەبەینی کوردەکانی عەراق‌دا ئەوکارە بەچاکی‌دەنگی داوە ،وە سەبارەت بەوەبوو کەسەرئەنجام کوردەکان ببنەیەک پارچەوە نبنەباعسی ئەوەی کە "کوماری مهاباد[٤] لەڕو لاواز بکەن‌و ، لەیەکتر بڵاوبێ" . ئەمما پاش سی‌سال واوەدەرکەوت کە بزوتنەوەی کوردەکان لەمهاباددا کە لەئاکاما "کوماری کوردستان" بەهەست هات ،لەگەل بزوتنەوەو، ڕاپەڕینی کوردەکان لەعەراق ـ کەتەنیامەبەستیان مافی‌نەتەوایەتی لەچوارچێوەی عەراق دابوو ، فەرقی هەبوو .[٥] بە بونەی ئەوەوەبوو کە کوڕی دامەزرێنەرەکانی حیزبی دیموکراتی عەراق ،زۆر بەزەحمەت دەی توانی لەگەل کوماری مهابادهات‌و ،

چۆ بەرقەرار بکات‌ەوە دەستوری کاروباریان لێ‌وەرگرێت. سەرئەنجام کۆماری مهاباد بەوانی ڕاگەیاند کە ئۆتۆنۆمی واتەمافی نەتەوایەتی لەئێران‌دا لەگەل ئوتونومی لەعەراق‌دا تەفاوەتی زۆرە،وەپێکەوە جوورنایەنەوە. ۶

پاش‌ئەو ڕاگەیاندنە،هەمزەعەبدوول‌ڵا کە لایەن‌گری شیوعیەکان‌بوو، هیوای بەهەست هێناوەگەڕاوەباڵ "شۆڕش" وەهەستا چوبەغدایە وەچاوپێـــی کەوتنێکی لەگەڵ لیدێرەکانی شیوعی بەجێ‌هێناوە لەکونگرەی حیزبی‌کومونیست‌دا بەشداری‌کرد وەلەگەل‌جەمال وەسالح‌حەیدەری وە نەفەریونی چاوپێ کە وتنێکی کردو، دژی بارزانی لەگەل ئەوان ڕێک‌کەوت،وەلەگەل (براکانی‌حەیدری وە نەفەریونی بوونە "ئەندامی کمیتەی ناوەندی" لەکاتێک‌دا بەشی‌زور پێشنیاری دالەگەل حیزبی دیموکرات هات‌وچوی ببردرێ،وەئەویش بەنێوی کەمایەتی شورش لەگەلیان تیکەل‌بوو. لەژوئینی ١٩٤٦ هەمزە عەبدوول‌لا گەراوەو لات‌وە ڕێگایەکی تازەی حیزبایەتی بۆمەلامستەفادانا، وەبارزانی بووبە سەرۆکی‌حیزب،وەشیخ لەتیف، یەکێک لە کورڕەکانی شیخ مەحمود، وەزیاد مەحەممەد، بووبە نایب سەرۆکی، حیزب

## ٣ ــ هەوەڵین کۆنگرەی حیزبی دێموکراتی کوردستان‌ی عەراق (١٦ ئوت‌ی ١٩٤٦)

لە١٦ی ئوتی ١٩٤٦ نوێنەرانی تەواوی ئۆرگانی کورەکوردەکان لەکاتێک‌دا کەسەرۆکایەتی بارزانیان سەلماندبوو،لەنهێنی‌دا هەوەڵین کۆبوونەوەیەکیان بەڕێوەبرد. بارزانی لەمهاباد لەلایەن هەمزە عەبدوول لاوە ناساندرا.

برایم ئەحمەد (لەکاتێک‌دا کە دەیەویست لەو کونگرەیەدا بەشداربێت، بەلام مەبەستی ئەوەبوو کە سەروە حیزب‌بێ، نەسەلماندراو،لەحیزب وەدەریان‌نا! (پاش‌تێک جوونی کۆماری مهاباد لەمانگی مارسی ١٩٤٧ بووبە ئەندامی حیزب).

لەسەربیروڕای ئورگان‌و،سازمان، هەمزە عەبدوول‌لا بەنێوی سێ‌کرێتێری گشتی حیزبی‌دیموکرات‌ی کوردستان هەڵ بژێردرا. کەتەواوی نەخشەو، ئاکاری ئەوحیزبەلەسەر ڕێو شوێنی‌حیزبی کومونیستی شوڕەوی‌بوو، وەکمیتەی ناوەندی دە لە ئەفسەرەکانی میللي کە بریتي‌بوون. لەمیر حاج، عززەت‌عەزیر، مستەفـا

خۆشناو، وەنوری ئەحمەدتاها، وئەندامانی «پۆلیت بوورو»(١) کە بریتی بوون لە کارەبەدەستان ودەستەڵاتدارانی هەرە سەرووی حیزب، کە هەمزە عەبدوولڵا، عەلی عەبدوول لا وە دوکتور جەعفەرعەبدوول کەریم بوون.

بەرنامەی تازەحیزبی کوردستان عەراق، بەرنامەیەکی کە لەسەرپلەی ژووروبو ، هاوڕێ لەگەل ئەوپارتیە خەباتێکی گرینگی کوردایەتی ناسیونالیستی ڕەچاو کردبوو، ـ لەسەرەتای ئەوبەرنامەیەدا، ئۆتۆنومی بو کوردستانی عەراق ـ بەرنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لەسەر داوا کردنی مافی ئیجتماعی بۆ گەل کە بریتی بوون لە:ئیسلاحاتی زەوی، چاک کردنی کارو، باری ژیان، باشکردنی پێشرو کردەوەی ئابوری، میللیکردنی ئاوەکان و مەعدەنەکانی ژێرعەرزی،جوێ بوونەوەی کلیسا لەدەولەت) لەئاکاما، حیزبی دیموکراتی کوردستانی عەراق ڕایگەیاندبوو کە لەبنەڕەتڕا حیزبێکی دژی ئیمپریالیستو، دژی ئیرتجاعیو، کۆنەپەرستیە، کەبەشدار دەبێ لە (جەبهەیملی) لەگەل حیزبی خەلکی، عەزیزشەریف، وەلەگەڵ پارتیناسیونال دێموکرات،وە حیزبی کومونیستی عەراق، هاتوچۆ دادەمەزرێنی

ئەندامانی ئەو سازمانە شۆڕشە کە لەنهێنیدا بوون لە ٥٠٠ تا ٢٠٠٠ مرۆف پێکهات بوو[٨] ئینجاحیزب ڕۆژنامەیەکی حەوتووئی، بەنێوی ڕزگاری بە عەرەبی چاپکرد. بەلامنزیک بوونەوەوهاتو،چوێ حیزب لەگەل سازمانی هیوا زۆربەزەحمەتپێکهات، چوونکە بارزانی لەوکارە پێشکیریدەکرد، وە گەنجەکانی کوردیش دەیانەویست،ئەوهاتوچوێیە بەرقەرار بێت. جا هەرچونیک بوو بەو هەموو دەردی سەرێوو ناڕەحەتیە،حیزب پێکهات، بەلام دەهات "هەتیو" بمێنیتەوە. لەمانکی ئاوریلی ١٩٤٧ مەلامستەفا چۆ و لاتی شورەویوە پارتی دیموکراتی کوردستان، تائەوڕادەیە گەیشت کەلەگەل بارزانی هاتوچوی ببرێوە تا سالی ١٩٥٥ ئەوکارە بەردەوام بوو.

(١) پولیت بورو: دەفتەری رامیاری حیزب

## ٤ ـ حیزبی دێموکراتی کوردستان عەراق بەبێ مەلامستەفا ( ٤٧ ـ ١٩٥٨ )

ئاکارو ، کردەوەی مەلامستەفای بارزانی لەلایە کەوە ، وەبیرو ، ڕای ڕووناک بیرەکانی کومونیست لەلایەکیدیکەوە (شۆڕش) ، سەرئەنجام دەهاتبەوجێگایە بگاتکەحیزبیدیموکراتی عەراق ببێتە دووبەش ، جالە نێو ئەندامەکاندا ، باسو ، دمەتەقە ڕوویدەدا .

لەسالی ١٩٤٦ڕا ، لەکاتی کەئەندامانی پایەبەرزی حیزب کوبوونەوەیەکیان لەبەغدایە پێکهێنا بوو ، فشار بۆخەلک زۆر پتربوو ، وەبی سووچو ، تاوان خەلکیان دەکوشت ، هەروەها ڕژانە سەرسەرۆکەکان ،گرتیتانن ، هێندێ لەخەلک کوژران . بالی چەپی حیزب لەنێودەولەتەوە کە بریتی لە شوێدی بوولایەنگری لیدەکرا ، بەلام ئەرشەدئەلعومەریجێنشینی ئەو دژی ئەوکارە دەبزوتەوە .

لە ژانوییەی ١٩٤٧ ـ نوری سەعید بە قودرەتکەیشت ، پۆلیس لەنەکاو نووسەریگشتیی حیزبی کومونیستی عەراقی کە بەنێوی یوسف سەلمانیۆسفبوو ، وە و دوو ئەندانیدیکەی حیزب کومونیستگرت دادائاگائەوانیبەمەرگ ناساندوەیان بەزیندانی ئەشکەنجەئی مەحکومکران لەسەرئەوەش ڕا کوردەکان پترخەباتیان دەکردو ، ڕانەدەوەستان : لە ١٩ مانگی ژوئینی ١٩٤٧ دا چووار ئەفسەر بەناوانی سەرهەنگ عززەت عەبدوول عەزیز مستەفاخۆشناو ، وەخێڕوولڵا ، عەبدوولکەریم وەسەروانمەحەممەد مەحمود کە لەگەل خانەوادەی بارزانی لە ئێران ڕاگەڕابوونەوە عەراق ، لە بە غدا لە داردران

ئەوکارەساتە بە شوێنی تێک چوونی کۆماری مهاباد دابوو ، کەلەگەل ئەوکەسانەی کە لەداردران نزیک بە ٥٠٠٠ کەس ژنو ، مندال ، پیاویپیر ،بوون ، لەسەر بازخانەیەکدا ، نزیکبەدیانا زیندانی کران ،وە پیاوەکانێکی کەلەگەل مەلامستەفا نەچوو بوونە و لاتی شورەوی وەنێزیکبە ١٠٠٠ مرۆف دەبوون لەبەندیخانەکانی کەرکوکو ،سولەیمانێ دا زیندانیکران[٩] ،وە شیخ ئەحمەدیش لەگەل ئەوان بوو لەسالی ١٩٤٨ دا ، دەولەتپالەو ، پەستوێکی زۆری بوسەر لایچەپی حیزب هێنا . هەر لەوکاتەشدا پەیمان نامەیەکی تازە بەنێوی پەیمانی

پۆرتسموت کە جێگای پەیمان‌نامەی سالی ١٩٣٠ دەگرتەوە، لەلایەن سالح جابرە، کەسەروک وەزیر بوو ،لەنهێنی دا بەسترا . ئەو پەیمان نامەیە پێک هاتنێکی بەرگری بوو لەنێوان عەراق و دەولەتی ئینگلیس لە درێژائی مانگی ژانوییەی سالی ١٩٤٨ دا لەبەیان‌نامە کانێکی کەلەبەغدایە ،وەدەر دەکەوت بریتی لەوەبوو کەشۆڕشێک بەشوێنی ئەو کارەساتەداهەیە. بەدووای بەیان‌نامەی ٢٧ی ژانوییەی ١٩٤٨ وەکوەحشیان لەگەل‌خەلک دەبزوتنەوە ،وەنزیک بە ٣٠کەس کوژران وە ٣٠٠ کەس بریندار بوون ، بۆلای ئێوارێ حکومەت گۆڕا ، وەجێ‌نشینی‌تازە پەیمانی پۆرتسموتی ئیمزاو ، دووپاتە کردە وە؛

لەکاتی هەوەلّین شەڕی عەڕەب ـ ئیسرائیل یاسای جەنگی ڕا گەیاندرا وەهێندێ لە سەرۆکەکانی حیزی دیموکراتی کوردستانی عەراق مەبەست بە "کومونیست" بوون پالەستۆدران‌و ،گیران ،وەبرایم ئەحمەد بە دووسال‌زیندا[٥] مەحکوم‌کرا ، ئەوانی‌دی پەنایان بۆ و لاتەکانی دیکەبرد ، وەهێندێکیش خۆیان شاردە وەو ، بێ‌دەنگ بوون . لەوبەینەدا حیزب لەگەل پارتی کومونیست ، وە حیزبەپیش کەوتوکانی دیکە، شان‌بەشان خەباتی‌دەکرد . لەئاکاما حیزبی دیموکراتی‌کوردستان لەتەنیشت حیزبی کومونیستی عەراق بەخەبات و ژیانی‌خوی درێژەی دەدا ،وەبرایم ئەحمەد بەنیۆی سی‌کریتیری حیزب هەل بژێردراوە. ١٠

## ٥ ـ بارزانی لەولاتی شۆڕەوی‌دا

مەلامستەفا لەکاتێک‌دا کە زۆر بەزەحمەت‌و ، کوێرەوەری بۆ ولاتی شورەوی‌هات بوولە بە ڕچاوی دەولەتی‌شورەوی باش ناسرابوو . دەولەتی شورەوی زۆر لەمێژ بوو لەوەی‌دەگەڕا کە نەخشەی بکێشێ کە پیاوێکی مەخفی ئینگلیس لە داوخا بەو چەشنە لە ڕووانگەی ولاتە غەربێکان (روژئاوەیەکان) دا ، "ئشکەڕینگی کوردی مسکەوی" لەڕۆژ هەلاتی ناوەڕاست دا پێک بێنی ! لەڕۆژنامەی نیویورک[١] تایم لەسەر هەوالێکی کەدابووی ، کاتی ڕامیاری شورەوی لە ڕۆژهەلاتی ناوەراست‌دا ڕووناک کردبۆوە ،وە سایروس سالیزبێرگێر گوتی : کەچۆن کوردان ، بوونە ستوونی پێ‌نجمی سوۆیەت ، وەمەلامستەفا بەئاشکرائی مەدرە سەیەکی

(١) روژنامەی نیویورک تایم‌لە ٣ آوریل‌ی ١٩٥٠

تایبەتی ڕامیاری بە یارمەتی شوڕەویکان لەشاری نەخجوان ، داناوه کە ئەندامی هاوڕێی خۆی بۆرخنه لەر وڵاتەکانی تورکیه ، عەراق وەئیران ، لەومەدرەسەیەدا تەعلیم ، وەپەروه رده دەکرێن ! ١١

بەشوینی ئەوەدا لەئەندامانیحیزب لەوڵاتی ئورووپاداتێ کوشان کە مرۆڤێکی ئەفسانەی کورد بەنێوی "ژێنیرالیسوور بەهەستبێنن.[1] بولتەنی

متالای ــ ناوەندی لێکوڵینەوەی کورد کەلەپاریسدا لەلایەن ئەمیرکامران بەدرخانەوه بە چاپ دەگەیشت ، ڕایگەیاند کەمەلامستەفا لەوەیپاش بەچەشنێکی ڕازاوه،ڕوژی سەعاتێک لەرادیو باکو،قسان بلاودەکاتەوه،وه خەلکی کورد بەیەکەتی داوەت دەکات،وەمزگێنیشیدا کەئەگەر سەبرو، حەوسەلەتانبێ، ڕوژێک دێ کە ڕوژی پیروزی بۆ کوردان دەبێ. بەلام نەزاندرا کە چۆن ئەمیر بە درخان ئەوهەوالەی پێگەیشت بوو، وەبلاوی کردبۆوه ــ پاشان ئەمیر بەدرخان لەپاریس گوشەنشینبوو وەئەوهەواڵەش ڕاست نەبوو ! ١٢

ئینجا بەگەیشتنی مەلامستەفا بەو لاتی شورەوی لەگەل میرجەعفەربا قرۆف سەرۆکی ئاذربایجانی شورەوی چاوپێ کە وتنێکیکرد ، وەلەبابەت مەسەلەی پەرەوازەو، بالبەسەرڕاکێشانی دەوروبەری ڕوژئاوای ورمێ ووت،ویــــژی دەستپێکرد ، وەمەسەلەی کۆماری ئاذربایجانیش قسەیلێ کرابوو. بارزانی بەومەسەلەیه ڕوویخۆشی نیشان نەدا ، ئەومەسەلەیه دەپێشدا لەگەل قازی موحەممەدیش باسیلێ کرابووگوتی کە دەزانین ئەوناچەیه کوردەکانی تێدان.

دەگێڕنەوه کە لە جێژنێکی ڕەسمی ڕامیاریدا کە باقرۆف ، بارزانی بانگ هێشت بوو ، مەلامستەفا گوتی کەمن : چون دەتوانم لەوجیژنه داشادبم وەشتبخۆمو، بخۆمەوه ! لە کاتێکدا هێستا ٥٠٠کەس لەهاوڕێیەکانم لەو لاتی شورەوی برسیانەوه کاروئشیان بۆ ڕەچاونەکراوه (ئایا ئەوقسه، راست بێیان درۆ، بەهەرچونێک بێهاتو، چۆله بەینیبارزانی و قودرەتەکاتی ناوچەکەم ببۆوه.ئینجا پاش ئەوکاره ساته پیاوەکانێکی کەلەگەل بارزانی هاتبوون ، بو ئاوەدانیێکانی هەرمەنینشین ناردران ،بەلام پاشچەندێک نازریاننه ئوزبەکستان وەبەنێوی پەنابەر جێگیربوون ، ئترنێوی پەنابەری ڕامیاریان لەسەرنبوو . .

بارزانیو، هاوڕێیەکانی کەلەو لاتی شورەویجێگیر بوون وردە-وردە

[1] ٢ بولتن ناوەری متا لای کوردان ژماره ١٠/١٩٥٠

وازیان باش‌بوو وەبەچاکی دەژیان ،بەلام هیچ نەخشێکیان بەتایبەت بارزانی لەکاری ڕامیاری دانەبوو چاپەمێکانی کوردی‌لەرادیونهێنی کوردەکان بەرنامەی بەڕێوە دەبرد ، ڕوژنامەی ئاذربایجان هەموو ڕوژێ لاپەڕێکی تایبەتی بۆ کوردان هەبوو ،وە رادیوی نهینی لەباکو هەروەها ووت‌و ، وێژی لەبارەی حیزبـــی دیموکراتەی ئاذربایجان وەکوردستان‌دا تاسالی ١٩٥٥ – ١٩٥٤ بەنیـّـــوی کوردستان بلاو دەکردەوە . وەبارزانی وەک ئەندامێکی سادە لەوڕوژنامەدا وەیان رادیو دا ، دەی‌نوسی ویاقسەی‌دەکرد . پاش مردنی ستالین ، دوژمنایەتی لەنێوان‌باقروف وە مەلامستەفا ناخۆشتر ببوو ، وازی کوردە پەنا بەرەکان ئسلاح کرا . بارزانی بەفرۆکە چۆ شاری مسکو ، وەلەگەل کمیتەی ناوەندی حیزبی کومونیستی شورەوی کە بریتی بوون لەخروشچف ، مالنکوف ،وە مۆلۆتۆف تووانی چاوپێکەوتنێکی بەجێ‌بێ‌نێت‌وەوەک‌ئەندامێک‌بێ .

بارزانی لەو کۆ بوونەوەیەدا هێندێ بەقین ئەستورێوە لەهەوەلەوە دەستی بەقسەکردن کرد ، وەلەبابەت هاوڕییەکانی خۆی دەنگی دەربڕی وەگوتی تکام ئەوەبوو کە پەنام بدرێتێ ، پەناتان دام ، وەپێم‌وایە کە شورەوی دۆستـــی کوردانە ،وە هەروەها بەقسەکانی درێژەی پێدا ، کەبۆنی گلێیی لێ‌دەهات" ئینجا بارزانی لەووتارەکەی‌دا ڕای‌گەیاند کەرەجادەکەم کە ڕێگا بدەن کـــە گەنجەکانی کورد بتوانن بچنە قوتابخانەکانی سەنعەتی ،وە بچنە قوتابخانەکانی حیزب کە درێژە بەکاروباری‌خۆیان بدەن ، وە تاقمێکی کەمیش لەسەرۆکەکان لەمسکوی‌بمێننەوە ، وەلەمەکتبی سیاسی ڕامیاری ، مارکسیسم‌دا دەرس بخوێنن

پاش‌چەندێک کە جەلال تالەبانی کە چۆشاری‌وەرشۆ ،وەلەفێستیوالی جیهانی گەنجان‌دا لەسالی ١٩٥٥ بەشداری‌کرد ، تووانی‌لەمۆسکوی لەسەرڕێگای خۆی‌لەگەل مەلامستەفا چاوپێکەوتنێکی بەجێ‌بێنێ ،ئەوە هەوەلین چاوپێکەوتنی بارزانی لەگەل خەبات گەرەکانی کوردی عەراق‌بوو ، پاش سالی ١٩٤٧ !

لەکاتێک‌دا کەبارزانی وەدەرنانی شیخ‌لەتیفی لەحیزبی دیموکراتی کوردستان‌زانی ، بەجەلال تالەبانی‌گوت کە پێویستە دووبارە پەیوەندی خوتان لەگەل نایب‌رەیس ، تازەبکەنەوە ، وە هەروەک سالی ١٩٤٦ هات‌وچۆتان بەرقەراربێ وەهەروەها ئەوەشی‌گوت کە : ئێوەدەبێ لەگەل تودەی خەلک نیزیکێکی زۆرترو هەبێ . . . حیزب نابێ سازمانێکی تەنگ نەزەر سەربەست‌بێ ، بەلکودەبێ لە

ڕووانگەی دوور بڕوانێ ! "جەلال تالەبانی بۆباری دووەم هاتەوە مسکوی وەلە فێستیوالی ١٩٥٧ دا بەشداری کرد . ئەوە دووهەمین کەرەت ،وە ئاخرین جاری چاوپێ کەوتنی حیزبی دیموکراتی کوردستان ، لەگەل سەرۆکی خۆیمەلامستەفابوو کاتێک کەمەلامستەفا لەگەلهاوڕێیەکانی چۆشورەوی ، خەلکی کوردهەربەو هیوایەبوو کەئایا ڕۆژێک دادێ کە بارزانی بگەڕێتەوەعەراقێ؟ وەئەوڕۆژەیان چاوەڕوانی دەکرد .

## ٦ ـ پە یوەندی بنەڕەتی حیزبی دێموکراتی کوردستان (ڕادیکالیزاسیون)

لەسالەکانی ١٩٤٧ تا ١٩٤٩ لەکاروباری حیزب پێشگیری لێکرا ، واتە حیزب بەهیچچەشنێک بزوتنەوەینەبوو ، وەهەروەها ئامانجیشی نامەعلوم بوو . سەرۆکەکانی حیزب تازەلەبەندیخانە ئازادببوون ، هەولیان دا بەلکو یەکتر بگرنەوە وەژیانی تازە بەحیزب بدەنەوە .

لەمانگی سیپتامبری ١٩٥٠ لەیەک گرتنێک دا ڕایان هێنا سەرئەوەی کەلەمارسی ١٩٥١دا دووهەمین کنگرەی حیزبی دیموکرات پێکبێنن .

لەسەردەمی کوبوونەوە - دا ئەندامە سەرۆکەکان لە پێشدا دەیانەویست کەبرینی کۆنیان سارێژ بکەنەوە وە تەرتیبێکی باشتر بە سازمانی خۆیان بدەن .[١٣] برایمئەحمەد دەبیری حیزب دوومانگ بوو کە لەزیندان وەدەرکەتبوو . لەوکاتەدا بەشوێینی دامەزراند نەوەی سازمانی حیزب چەشنە "کودتا"یەکلەناوخۆیدا دژی هەمزە عەبدوولا بەڕێوە بردرا . کۆڕی کونگرە بۆ بەهەست هێنانی سێهەمین کنگرە بەرنامەیەکی تازەیدانا . ئینجا لە ژانوییەی سالی ١٩٥٣ لە شاری کەرکوک سوهەمین کنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان عەراق پێکهات . لەو کنگرە یە دابرایم ئەحمەد بۆ کەرەتیدووەم بۆوە بە دەبیری حیزب وەهەل بژێردراوە . ئاکارو کردەوی حیزب ،وادیاربوو بۆلای چەپ دەڕووا وەتەنانەت کێشرا بۆلای پارتی کومونیستی عەراق ! کیشانی حیزب بۆلای مەرامی "مارکسیسم ـ لنینیسم"[١٤] هاوکات لەگەل ئەو ئاگاداریێو ، ڕاگەیاندنە بوو کە حیزب داخووازی خۆی بەنیۆی مافینەتەوایەتی لەچووار چێوەی عەراقدا واتە بەنیۆی دەولەتی فێدراتیو ڕایگەیاند ! بەلام ڕاشی گەیاندبوو کە حیزب خەباتیخۆی کە خەباتێکی دژی

کونەپەرستی و ئرتجاع و، دژیئمپریالیستە،درێژەی پێدەدا. هەروەها نوری شاوێس کەیەکێک لەسەرۆکەکانی حیزب بووگوتی :

ئیمە براوامان وایە کە قازانجی گەلەکەمان دەبێ لە پێناوی قازانجی کۆماردابێ. " لەرابردوودا،وە هەروەها لەکاتی حازردا بۆ کوردستانی عەراق دووشت واتەدوو ڕێگا لەپێشە،ئەویش ئمپریالیستو، سوسیالیستە، مرۆڤ دەبێ لەودووڕێگایەی کەهەرکامیان بۆ کورد بەختەوەری تێدایە هەڵ بژیری، ئینجا هەرکەسێکی، لەبەینی ئەو دووانەشدا بمێنیتەوە وادیارە لەخزمـــــــەت ئمپریالیستەکاندایە. " ١٥

خەباتو، دووبەرەکی کە لەنێو حیزبدا واتە لە نێوان برایم ئەحمەد، وە هەمزە عەبدوولڵا دابوو لەئاکاما بەوجێکایە گەیشت کە حیزبی‌دیموکراتی کوردستان لەسالی ١٩٥٥ ببێتە دووشاخە، بەشێک برایم ئەحمەد بەســــەری ڕادەگەیشت ،وەبەشی پێشکەوتووی‌حیزب کە لەلایەن هەمزە عەبدوولڵاوە ئیدارە دەکرا، کاروکردەوەی خۆی بەجوێ بەڕێوە دەبرد. لەکاتی دامەزراندنی‌حیزب کەسالی ١٩٤٦دا حیزب لەگەل دوومەسەلەی گرنگ ڕووبەڕووببوو. یەکیان مەسەلەی ناسیونالیستی واتە نەتەوایەتی بوو وە ئەوی‌دیش مەسەلەی سۆسیالیست؟

ئەوەی کە ئاشکرا بوو، حیزب هەمیشە لەلایەن‌قودرەت مەندەکائەوە لەمەترسی دابوو وەبە ڕاشکاوی لەوەی بەرگری‌دەکرا کە حیزب‌دیموکرات دژی حیزبی کومونیست ببزوێتەوە.

ئاکارو، کردەوەی‌حیزب بەچەشنێکی تازە لەسەر ڕێبازی مارکیسیستەکان دەڕۆیشت، بەلام لەسەر ئەوەش ڕا لەسازمانی حیزبی کومونیستی عەراق هەر جودابوو، وەئەوەشی دەزانی کەئەو جوێبیازیە لەبەرچیە. دەسالی ڕەبەق کە لە دامەزراندنی ئەوحیزبە ڕابردبوو، هێستا بەچاکی ئدئۆلۆژی خۆی ڕوون نەکردبۆوە. لەسالی ١٩٥٥دا سەروکە ناسیونالیستەکان‌وە هەروەها سەرۆکە پێش کەوتوکانی نێوحیزب،بۆ لەنێوبردنی کێشەو، نێوان ناخۆشی خۆیان داوایان لەحیزبی دیموکراتی کوردستان ئێران کرد، کە نێونجی‌بی، وەلەبابـــەت دوومەسەلەی نەتەوایەتی و سۆسیالیستی‌دا باسی‌لی‌بکری، ئیتر هەموو کوردەکان لەیەکڕێبازداخەبات‌بکەن، ئەوەش بەریوەبردرا، وەهەردکیان بوونەوەیەک! بەشوێنی ئەوەدا پێشنیاد دراکە یەک گرتینکی گشتی لەبەینی حیزبەکانی کوردی

عەراق‌و ، ئیران‌و ، تورکیە بەجێ‌بێت .
سی‌سال پاش، حیزبی دیموکراتی کوردستان‌ی ئیران وەحیزبی دیموکراتی کوردستانی عەراق کۆ بوونەوەیەکیان بەنێوی کۆنگرە پێک‌هێنا ، بەلام نەتیجەیەک لەوکارە وەرنەگیرا . ئینجا لەسالی ١٩٥٦ حیزبی دیموکراتی کوردستان‌ی‌عەراق لەسەر ڕاو تەدبیرێکی تازەوە نێوی خۆی نا "پارتی یەکێتی دیموکراتی کوردستان وەدەبیری کشتی هەمزەعەبدوول‌لا بوو، وە ڕوژنامەی خەباتی کوردستان‌ی" بەچاپ‌گەیاند .

### ٧ ـ حیزبی کومونیستی عەراق ـــ وەمەسەلەی کورد

لەمانگی سێپتامبری ١٩٥٦ لەکاتی دووهەمین کۆنفرانسی حیزبی کۆمونیستی عەراق پاش باسێکی دووورو درێژو گرینگ لەسەرمەسەلەی کورد ئاکارو کردەویەکی‌تارەبەڕێوەبردراوەبەو ئاکاما گەیشت کەلەڕاستەقینەدا ، "ولاتی عەراق سەرزە مینێکی عەرەبە" بەلام ئەوە نەخشەیەکی ئمپریالیستەوە عەراق بەشێکش لەکوردستان دەگرێتەوە. لەو کونفرانسەدا ڕاگەیاندرا کە "دروستە کەنەتەوەی کورد لەعەراق داهەن ، ئەمما لەنێو ولاتی تورک و ئێرانیش داکورد، دەژین ، جائەوە دابەش کردنێکە کەلەلایەن ئمپریالیستەکانەوە بەڕێوە بردراوە. نەتەوەی کورد لەعەراق‌دا خاوەن زەویوزارە ، لەو سێ‌ولاتانەدا بۆخۆی‌خاوەن، زمان‌و داب‌وروسمێکی تایبەتیە، وەزۆرلە - مێژە ولەسالەکانی درێژەوە ، مێژوو ئەوەی دیاری کردوە بەدرێژانی مێژوو دا پیاوانی کورد لەوُو لاتانەدا بوون ، کەبەو سەرزەمینە خوو ، عادەتی‌یان گرتووە ، لەزەویێکانی‌دا ،کشت‌و ،کالێ‌یان‌کردوە ، ومەسەلەی‌ئابوری ناو خۆی بەدەستەوە گرتووە ، وەڕیشەو ، بنەچەکەی نەتەوایەتی لەوولاتی کوردایەتی دامەزراندوە . "
هەروەها حیزبی کومونیستی عەراق ڕای‌گەیاند کە خەباتی گشتی لەتەنشت نەتەوەی‌عەرەب بەوە ڕێگا دەدا کە گەلی کوردش بەمافی نەتەوایەتی خۆی بگات وەدان بەسەر ئەوەش دادێنی کە نەتەوەی کورد لەسەرزەوی کوردستان ، دەولەتێکی سەربەستی تایبەتی پێک بێ‌نێت . [١٦]
ئینجا لەپێشنهادی حیزبی کومونیستی عەراق بەئاشکرایێوە ڕا ،گەیاندرا

کە لەزۆر مەسەلان دا پارتی کومونیستی عەراق بەو نەتیجەیە گەیشتوە کەلەکاتی حازردا تەنیا ڕێگایەک کە لە هەمووان گرنگ‌ترە وە پێویستە دووائیو، درێژەی بدرێ، کەئەوڕێگایە بۆ گەیشتنی ئاواتی خەباتی گشتی دژی ئمپریالیسم و،هاو پەیمانەکانیتی ،وەئەوخەباتە بۆ وەدەست هێنانی‌مافی کورد، وە گەیشتن بە ئامانجی نەتەوەکانی کوردو،عەرەب‌وەبۆ وەدەست خستنی ئازادی هەردوو نەتەوە کەپێویستی بەخەباتێکی گرنگ هەیە." سەرئەنجام حیزبی کومونیستی عەراق هەلوێستی ئەوەبوو کە: "حیزبی کومونیستی عەراق‌وەبەتایبەت شاخەی کومونیستی کوردستان، تابەدەست‌هێنانی مافی نەتەوەکەی وە پیرۆزی، خەباتی درێژەپی‌دەداو، ڕاناوەستێ.

هەروەها ڕای‌گەیاند کەلەکاتێک‌دا کە پێویستە خەباتێکی گشتی‌گرنگ‌بکات، جودالەوە خەبات دژی‌تەنگ نەزەرەکانی نەتەوایەتی وجوێباربوون پێویستە بەریوەبەری.

ئەو بڕوارە کاتی‌تایبەتی هەبوو، چوونکە هیچ‌کاتێک، هیچ‌پارتی ڕامیاری عەراقی بەو چەشنە تایبەتیەلەسەرمافی نەتەوایەتی کوردی عەراقی هاوڕێ لەگەڵ مافی نەتەوایەتی گشتی کورد کەمەبەستی مێژووئی، ئابوری،وەفەرهەنگی تێ‌دابوو نەدووابوو، وەلەسەری نەڕۆیشت‌بوون. بەلام ڤامک لەسەردانان لەسەرمەسەلەی خەباتی گشتی" دەبووە هۆی ئەوە کە مەسەلەی نەتەوایەتی لە بیربچێتەوەو، وردە ـ وردە خەباتی گشتی‌وڵات وەبەش‌کردنی کاروئەرکی سەرشانی دەهات مەسەلەی ـ ناسیونالیستی تەنگ نەزەرانە، لەبەرچاو لاچێ، جائەومەبەستە بەجێگاپەک دەگات کە تۆوی دووبەرەکایەتی دابچێندرێ، وەسەرئەنجام بەو جێگایە بگات‌کە حیزبی دیموکراتی عەراق خۆ لەپارتی کومونیست جوێیاز بکاتەوە ،وە کەڵکو، قازانج‌لەو هەلو یستە وەرنەگیرێ

١) ئەووتارە لە روژنامەی *اتحادالشعب* دا لە ٣٠ ژانویەی سالی ١٩٥٩ داپاش سێ‌سال نوسراوە

## ٨ ـ پارتی دێموکراتی کوردستان‌و، شاخەی حیزبی کومونیستی کوردستان‌ی عەراق

لەمانگی ژوئن‌ی سالی ١٩٤٧ دا بە شوێنی پێک گەیشتن بۆ ئیدارە کردنی ناوخۆی حیزبی دیموکراتی کوردستان‌ی گەورە،وەبەڕێوبردنی (لکی حیزبی کومونیستی کوردستان‌ی عەراق) ڕایان هێنا سەرئەوەی کە لەگەل حیزبی یەکێتی دیموکراتی کوردستان یەکبن، وەلە"ئۆرگارنی یەکێتی هیزی دیموکراتیکی کوردستان‌ی عەراق داخاترجەمی وە دیارکەوێ." ١٧

لکی حیزبی کومونیستی عەراق لەو کارە دازۆر بەباشی نەهاتەپێشێ: لەکاتێکدا کە لەحیزبی دیموکراتی کوردستان نێزیک ببووە،بەلام وەک‌حیزبێک چاوی‌لی‌نەدەکرد، جابەجوێیازی کاری خوی بەڕێوەدەبرد وەلەگەل ئەمریکاوە ڕاپەڕینەکەیان کەوت‌وە ڕەخنەی لەمە گرت کە دروشیمی مەسەلەی مافی‌نەتەوایەتی گشتی کوردستان کارێکی بەجێ‌نیە.

وە پێویستە دژی ئیمپریالیسم خەبات بکرێ،وە لەڕێگای ئـــازادی ڕاستەقینەدا لەعەراقێکی ئازادی سەربەخۆ داخەبات بکرێ،[18] وەبەوچەشنە حیزبی کومونیستی عەراق لەسەرڕابە جوێیازی‌کاری‌خۆی دەست پێ‌کرد.

## ٩ ـ پارتی دێموکراتی کوردستان پێش شۆڕشی ١٩٥٨

لەسالی ١٩٥٨ بەشوێنی بە هەست‌هاتنی کۆماری یەک گرتووی عەرەبی (مسروسوریە) سەرۆکە کوردەکان دژی پادشایەتی عەراق خۆیان نوواند. چاوپێ کە وتنێکیان لەگەل ناسرکرد، وە یارمەتیان لێ‌ویست وەچاپ‌کردنی گۆڤارێکیان بەزمانی کوردی وە بلاو کردنەوەکەی لە رادیو قاهرەدا داوخووازبوون.

لەنیوەراستی سالی ١٩٥٨دا حیزبی بەکێتی دێموکراتی کوردستان، ٥٠٠ مروڤی بۆ شەڕی چریکی گرێل‌لائی لەناوچەی کوردستان‌دا ئامادەکرد، وە لەژێرچاوەدێری کمیتەی ناوەندی، لە ٢٦ ژوییەلەکەرکوک دا کۆبوونەوەکی

پێکهێنا تالەبارەی دەستپێکردنی شۆڕشو ، ڕاپەرینەکەی تەسمیم بگرێ .

بەلام لە ١٤ی ژوییەی ١٩٥٨ پادشایەتی عەراق بەدەستی کەریم قاسم ڕووخا ! "پارتکوتی نیوەی کاری ئێمەی کرد ، وەلەکاتی کۆبوو نەوەکەمان لەشاری کەرکوکدا ئێمە تەسمیمان گرت کە لایەنگری لێ بکەینوە سەرئەنجام کۆڕێکمان بۆلای قاسمنارد . ١٩

فەسلی ٥

## لەشۆرشی عەراق (١٩٥٨) تابڕینی‌هات‌و،چوّی لەگەل‌قاسم

١ ــ هومید ــ ئێرە ئُزگەی کوّماری عەراقەئە ورۆ ڕوژی سەرکەوتن‌و، پیرۆزی ئێوەیە، دووژمنانی خوداو، خەلک ئەوە لە کولانەکانی عەراق‌دا، جەندەکی بوّگەنیویان لەسەر ئەرزێ کەوتووە وەبەدەستی گەلی قارەمانی عەراق لەنێو چوون". ئەوە ووتارێک بوو کە لە ئیزگە کوّماری عەراق بلّاودەبوّوە. هەروەها ئەو ئُزگەیە لەکاتی ٧ی بەیانیِ لە ١٤ مانگی ژوییەی[1] ١٩٥٨ داپاش چەندسەعات سەرکەوتنی شوّڕش بەدەنگێکی بەرز دووپاتەی دەکردەوەو، دەی‌گوت "دووژمنی خودا" نوری سەعید، پیاوی ئینگلیسێکان، لە هەرە گلاوەکانی ڕۆژهەلّاتی ناوەڕاست‌کە لەچەپەلی داهاوتای نەبوو، لەبەین چوو،وە هەروەها نایب‌ئەسلتەنەی عەراق ئەربابی‌ویش عەبدوول ئیلاە لەنێوچوون.ئەو رادیویە بەووتاری خوّی درێژەدەداو،دەی‌گوت کە ئەو بوّگەنیو و چەپەلانە کەهەمیشە خەلکیان لەچارەڕەشی‌و، بەد بەختی داهێشت‌بوّوە، لەگەل تاقمە کەسیفەکان کە پەیوونە دڕکو، دڕووی چاوی خەلکی چەوساوەی‌کورد، دەم‌و، دەزگای سەلتەنەتیان لێ ڕووخا، وەخانەدانی‌هاشمی هەموو کوژران، ئەوڕۆ ڕۆژی وەیە کەگەل پیروزبایی بە یەکتربلێ، ڕۆژی گەورەی شانازی گەلی عەراقە.

ئینجا هەربوّ ڕۆژێک‌پاش سەر لەبەیانی تاقمێک بەنێوی تاقمی شوّڕشگێڕی عەراق کە بریتی بوون لە خانەدانی شیخ خالدی نەقشبەندی بامەڕنی، وە لەپیاوە عەرە بەکان‌ی سوونی‌و،شیعە، کاروباری ناوخوّی شوّڕشیان لەعەراق‌دا بەدەستەوەگرت[2].

ئینجا لە ٢٠ی مانگی ژوئیەی پاش حەوتوێک کە لە پێک هاتنی کوّماری

عەراق ڕابردبوو، فەرمانی لێخوش بوونی گشتی بەخەلک ڕاگەیندرا، وەگوترا کەتەواوی بەندێکان لەبەندیخانەکان بەردەدرێن وە هەروەها ئەو کەسانەی کە لە ڕژیم ڕابردوودا لەوڵات دوورخراونەوە، بۆمالبەندو،ناوچەکانی خۆیان دە گەڕێنەوە، لەوانە مرۆڤە بەناوبانگەکان وەک شێخ ئەحمەد،شێخلەتیف، وەمامۆستا گۆران‌ی هونەری کورد، کە نێویان لەنێو مرۆڤە دوورخراوەکان دابوون، گەڕانەوە ناوچەی کوردستان. هەروەها لە مادەی ٣ی یاسای مووەققەتی‌عەراق‌دا کەلە ٢٧ی ژوییەدا نووسرابوو، وەبڵاوبێووە گوترابوو،کە: "مافی نەتەوایەتـــــی خەلکەکانی عەراق لەژێربناوە لەسەر ڕایگشتی نەتەوایەتی،وەبەڕێز گرتنی مافی مەدەنی،وە مافی ئازاد، لە بەرچاوە، نەتەوەی کوردو، عەرەب لەتەنشت یەکدالە مافێک بەشداردەبن واتە دوو نەتەوەی کوردو، عەرەب لەباوەشی‌نشتمان‌ێ خۆی‌دا لەمافی نەتەوایەتی بەشداردەبن،وە بۆ هەوەڵین کەڕەت لە بەهەست‌هاتن‌و، پێکەبوون لە کوماری تازەی عەراق دا هاوکاری‌دەکەن. نیشانە وەسەمبولی کوماری عەراق خەنجەری کوردی‌وە شمشیری عەرەبیە کەچەپو،ڕاست‌بەیەکـــــەوە دەبین‌درێ.

## ٢ ـ گۆڤارەپێشکەوتوکان

یەکێک لەهەرەکارە گرینکەکانی شۆڕش کە بۆ کوردەکان زۆر بەنرخ‌بایخ بوو ئازادی ڕوژنامەکان‌و، نووسین‌و، وە دەرختنی نامێلکەو، مەجللە کوردێکان بوون، کە نووسراوەی ئەدەبی‌و وێژەوەری وەدەردەخراو، بڵاو دەبۆوە: هێندێ لەوانە چیرۆک‌و، هەڵبەست‌و،نووسینی لاپەڕەی مێژووئی‌بوو، وەبەهیچ چەشنێک نەیان دەتووانی، بەسرهاتی ڕامیاری بگێڕنەوە، وەبی‌نووسن: هیوای دەست‌نووس لەسالی ١٩٥٣ لە سولەیمانی دەردەکەوت،وە هەروەها کەلاوێژ پاش شورش جێگای هیوای گرتووە. وە"ژین هەر بەدوو حەوتووان کەڕەتێک وەدەر دەکەوت.

پاش‌شۆڕش، کوردەکانی سولەیمانیێ هەروەها گوقاری "پێش کەوتن"، "شەفەق" چاپ دەکران لەشاری کەرکوک "بەیان" وە ڕۆژانویێ وەدەردەکەوت،وە شەفەق دەردەچوو پارتی دیموکرات‌یکوردستان لەسەردەمی ئاوریل‌ی ١٩٥٩ گوڤاری "خەبات"ی وەدەردەخست بەشوێنی تێک چوونی رژیم پادشایەتی عەراق

روژنامەکانو، گوڤارەکانی کوردی، بەباشیچاپدەکران، لەدژیحکومەتی ڕەشی پادشایەتی وەنوکەرانی ئمپریالیسم، ووتەو، ڕستەی باش باشیان دەنووسی، وە دروشمی کوردو، عەرەب، بران لە روژنامەکاندا دەتیران.

تەنانەت ئەو دروشیمەیان دەدا کە: لەکاتیکدا کە پیویستە هەربەو جورەی کەلەیاسای موقەتیدا نووسراوە و گوتراوە" برایەتیو، دوستایەتی لەگشت و.لاتی عەراقدا" واتە دەبیٚ هەبیٚوە هیوا ڕایگەیاندبوو کە کوردو، عەرەب پیکەوە بەچاکیبژین وە بە مافی نەتەوایەتی خویان بگەن، هەروەها پیویستە، نەتەوە بچووکەکان وەک ئاسوری، تورکمەن، هەرمەنی کانیش لەنیو و.لاتی عەراقدا وەک کوردو، عەرەب لەمافی نەتەوایەتی بەشداربن. ئینجاکوردەکان: مەبەست بەوە دلیان خوش کردبوو وە بە هیوا بوون کە لەسەر ڕیبازیکی ڕاستەقینە، مافینەتەوایەتی خەلکیکورد لەچووارچیوەی عەراق دا بیدریتی، روژنامەو، گوڤارەکان زوریان لەسەر ئەو هولویستە دەڕویشتن وە دەیان نووسیو، ڕایاندەگەیاند کە کوردو، عەرەب زور بەچاکیو،بەباشی دەتووانن لەتەنشت یەکترا ژیانیخویان ڕا بویرن، کوردان سنووری عەراق بەچاکی چاوەدیری بکەنو، بیپاریزن. ٣

## ٣ــ سەر لیٚشیوان لەنیوریژیمی تازەی عەراقدا

بەراستی ریژیمی تازەعەراق لەنیوخویدا سەری لیٚشیوابوو، لەنیو ئەفسەرەکانی عەراق کەشورشەکەیان پیک هینابوو، (تاقمی ئەفسەرانی ئازاد دروستکرا.

نیوان ناخوشی لەنیهنی دا لەبەینی ژەنیرال عەبدولکەریم قاسم سەروک ومدیر، وەوەزیری بەرگریبوو، وە کولونیل عەبدووسەلام عارف کە نای سەروک وەزیر وەوەزیری ناوخوی عەراق بوو وەدیهات. پارتی کومونیستی عەر وەتەواوی حیزبەکانو، سازمانەکانی ئوپوزیسیونیعەراق لایەنگریان لە حکومە تازەدەکرد، پارتی بەعس، پارتی ملی دیموکراتی کەمال چادرچی وەپار دیموکراتی کوردستانش بەقازانجی دەولەت دەبزوتنەوە.

ئینجا لەمادەی ٢ی یاسای مووەقەتی عەراق دا نە شار درابووە کە وولا

عەراق بریتیە لەخەلکی عەرەب ، وە دەولەت زیاتر لایەن‌گری لەوگەلەدەکات !
پاش ئەوەی کە تاقمی ئەفسەرانی گەنجی ئازاد ، پێک‌هات ، دروشمیان ئەوەبوو کە پێویستە گەلی عەرەب یەک‌گرتووبێت . وەئەویەک گرتنە لە فیوریيەی ١٩٥٨ وەدی‌هات . عارف لەگەل بەعسێکان وە لە تەنشت ناسرێکان پێنج زۆژپاش سەرکەوتنی شوڕش وەشکان‌و ڕووخانی حکومەتی پادشایەتی لەبەرانبەر دەهەزار کەس داگوتی : نێزیک بونەوە لەوپەیمانە زۆر پێویستە . بەلام ناسر لەوکاڕە قەلس بوو ، وەدەری‌بڕی کە عەبدوسەلام "بەبێ پرسو ، ڕای‌ئێمە" کاری زۆر هەلەباشانەو مندالانە دەکات ! ٤
وا ئاشکرابوو کە قاسم وەک ژێنیرال نەجیبی مسر وردە ـ وردە تووانائی‌و ئیدارەکردنی حکومەتی عەراق لەدەست دەدات ، وەعارف بەتەواوی هێزو دەستەلاتی خۆیەوە بەسەرئیش‌وکاری عەراق‌دا ، دەهات‌زال‌بێت . ٥
کوردەکان پاش چەندێک دەست دەدەنەچەک ، وەهێزێکی کوردی پێک دێنن ، وەقاسم کە لە هەوەلەوە لایەن‌گری لە شیوعێکان دەکرد ، دژی ئەوان دەست بەکاربوو .
لەمانگی ئوتی ١٩٥٨ ، شۆڕش لە کوردستان‌ی عەراق دەستی‌پێکرا . ٦
عارف ڕاوتەدبیری هات‌بۆ سەرئەومەبەستەی کە یەکێتی ٣٦میلیون عەرەب بەنێوی‌پان عەرەبیسم نەحشەیەکی‌باشو ، گرینگە ، وە مەبەستی گەورەی خەلکی عەرەبە ، لەکاتێک‌دا کورد زۆرکەمن ، ئیتر بەهۆی ئەویەک‌گرتنە ، خەلکی کورد وەلاش بندرێ ، قەیدی ناکا ، چونکە گەلی کورد لەبەرامبەرگەلی‌عەرەب‌داوەک دلۆپێک لە بەرامبەر دەریایە داوایە .
بەلام لەو لایە شەوە دژی‌یەک‌گرتنی‌خەلکی عەرەب ، پارتی کومونیستی عەراق ،وە کوردەکان لەلایەن دەولەتی شورەوی‌وە لایەن‌گری لێکرا . ٧
ئینجا لە نێوەراستی مانگی سیپتامبری ١٩٥٨ دا قاسم لەگەل‌عارف نێوان ناخوشێکی زۆریان لێ‌پەیدابوو ، لەئاکاما عارف لەبەر چاوی خەلک بەنێوی بالوێزی عەراق بۆشاری بۆن پێ‌تەختی ئالمان لەبەغدا دوورخراوە ، وەئەوکارە لە ١٣ی مانگی ئوکتوبردا بەڕێوە بردرا ، ئەمما بەراستی ئەوە دوورخراوەیەکی ڕامیاری‌بوو ، ئینجاقاسم بۆخوی بووبەهەمەکارەی و لاتی عەراق . سەرئەنجام قاسم وردەوردەکە لەگەل بالی‌راستی عەراق‌وەبەعسێ‌کان هات و چوی خوی‌بڕی ،

بەپێویستی زانی لەگەل پارتی شیوعیو، کوردەکان نێوانی خۆیساز بکاتەوە،وە هەروەها لە دەولەتی شۆڕەویش نیزیک بۆوە، وە بە گەڕانەوەی بارزانی بۆ وولاتی عەراق ئەوکارە پەرەی زیاتر پەیداو، وەراست گەڕا.

## ٤ ـ گەڕانەوەی ژێنێرال بارزانی بۆ وڵات لە دوورخراوە کەیەوە

بەبیستنی تێک چوونی پادشایەتی لەسەرزەویعەراق، ژینیرال بارزانی لەگەل میرحاج وە ئەسعد خوشناو، دەچنەشاری پراگ، وەلە هوتێل دوپارتی (میوان خانەی حیزب) نیشتەجێ دەبنو، ماوەی مانگێک لەوێ دەمێننەوە.

ئەوەی کە شایانی باسە دەلێن کە دەولەتی شورەوی نەیدەویست کە مەلامستەفا لەولاتـی شورەویبمێنێتەوە، جامەبەست بەمە ناردی پیتەختی چکوسلواکی کە لەوێ لەبابەت گەڕانەوەکەی دا ووتو، وێژبکات. لەئاکاماتێلێ گرامێکی بۆسەرۆک قاسم لێدەدا، وە داخووازی لێدەکا کە ڕێگا بدا بگەڕێتەوە ولاتی عەراق.

عارف گەڕانەوەی بارزانی زۆر پیناخوشبوو تەنانەت بەقاسم دەلێ کە لەوەلامی تێلێ گرامەکە دا تەنیا ئەو دوو ووشەی وەلام بداتەوە: بڕۆ! بڕۆ

لەسێپتامبری ١٩٥٨ دا حیزبی دیموکراتی کوردستانی عراق کۆڕێکی کە بریتی بوون لە، برایم ئەحمەد، نوری ئەحمەد تاها، سەدیق بارزانی (کوڕی شیخ بابۆ، وەعوبەی دوولا بارزانی بۆ شاری پراگ دەنێری. سەرئەنجام بەغدا ڕێگادەدا کە ژینیرال بارزانی بگەڕێتەوە، لەسەر ڕێگای خۆی بارزانی لەشاری قاهرە چاوپێ کە وتنێکی لەگەل ناسردەبێ، وە لە ٧ی ئوکتوبری ١٩٥٨ بەفڕۆکە دەگاتەوە بەغدایە، پیاوە دەولەتێکان لەفڕۆکەخانە، بەگەرموگوڕێوە، پێشوازی لەبارزانی دەکەن

پاش ڕۆژێک کەلە میوان خانەی سمیرامیس دەمێنێتەوە، بەدەستووری قاسم کۆشکی کوڕی نوری سە عید بەتایبەت دەدەن بەبارزانی

لەمانگی ئاوریلی ١٩٥٨ پاپۆڕێکی دەولەتی شورەوی بەنێوی گرۆزیا، ٤٦٥ مرۆف، ١٠٨ ژن وەلەگەل ٢٢٥ مندال لەولاتی شورەوی ئوزەبەک دە هێنێنەوە ولاتی عەراق. ٨

## ٥ – بارزانی کێ‌بوو؟

پاش‌یازدەسال دوورکەوتنەوە لەعەراق، بارزانی وەک قارەمانێک کەدژی دەوڵەتی ئینگلیس، وە دوو دەولەتی پادشایەتی عەراق‌و، ئێران بەشەر هات‌بوو ئەوە گەڕاوە‌ولاتی خۆی .

بارزانی چ لەلایەن کوردانەوە،وەچ‌لەلایەن شیوعی کانی عەراقەوە ناسیونالیستەکان، قارەمان دەناسراوەهەمووخۆشیان دەویست‌و، لایەن‌گریان‌لێ دەکرد . لەبارەی بارزانی دادەگوترێ کە هەرچەند بارزانی، ماویەکی زۆر لەشاری مۆسکو وەلەولاتەکا نی شورەوی مابۆوە، بەلام، ڕەنگ‌ورِوو نهادی هەر شەرقیانە بووە، وەپیاوێکی خۆخۆرو، مەرمووز مابۆوە .

پاش گەڕانەوەی‌خوێ، مەلامستەفا چوو بو لای شێخ ئەحمەدی برای کە یازدەسال‌بوو واتە پاش تێک چوونی کوماری مهاباد لێ دوور کە وتیـــــــوۆوە . لەوچاووپێکە وتنە دا شیخ ئەحمەدومەلامستەفا یەکتریان لەباوەش‌گرت شێخ ئەحمەد بەمەلامستەفای گوت : تۆ ماوەیەکی زۆرە ڕۆیشتووی‌و، دوور کەو تبوویەوە ئایا وانیە. . . پاش ٢٠ دەقیقە بی‌دەنگی‌و، بێ‌هەستی، شیخ ئەحمەد لە بارزانی پرسیار کرد : ئایالە شورەوی دەچوویە ڕاوەبەرازێ؟

لەڕووانگەی سیاسی‌و، دیپلۆماتیکەوە، زۆر بە زەحمەت پیاو دەتووانێ بلێ کە بارزانی لایەن گری‌چەلایەک‌بوو . ئەو پیاوانەی کە لەسیپتامبری ١٩٥٨ لەشاری پراگ‌چاویان بەمەلامستەفا کەوت‌بوو ئەوانیش بۆیان وەدەرنەکەوت‌بوو، کەچۆن‌بووە .

ئەوەی کە برێک بۆمان ڕوون بۆتەوە ئەویە کەمەلامستەفا لە گفــــــت‌و، گۆیەکانی‌دا ووشەی مارکسستی بەکاردەبرد، وادیاربوو کە پلەی ســـــــەرووی لەشورەوی‌دا دیتووە، وەخوێبدوویەتی . بەلام لەئیشو، کردەوەدا زۆر ئاشکرانەبوو

نوری ئەحمەد تاها، یەکێک لەکوردەکانی‌عەراق کە چوبۆو لای مەلامستەفا، گوت بووی‌کە : مەلامستەفا، مارکسیسمی ڕووسی‌باش‌دەناسێ، وەدەی‌زانێ، بەڵام ناتووانێ کە ئەو شێوەی لەنێوکوردەکان‌و، عەرەبەکان دابەباشی ڕەنێوبنێ ٩

بارزانی مرۆڤێکی زۆر زانا نەبوو، بەلام ڕاوێژی زاری وەک روشنبیران دەچوو، ئەوەی کە واوەدەردەکەوێ بارزانی بەگرینکی بۆلای شورەوی هەنگاوی هەلنەدەهێنا، ئەمما ڕوون بۆتەوە کە لایەنگری قاسم، وە دژی عارف بوو، قاسم ش سەربەسوویەتەکانبوو. لەڕاستەقینە دا بە چاکی نەزاندراوە کە ئاکارو، ڕەوشتی چۆن بووە، وەئایا سەربە کۆمەلی ڕووناکبیری پلەی تەرەقی خووازە، یان هەروا فکری دەرەبەگایەتیو، فئودالیتەی هەیە!؟

کاتی گەرانەوە دەهات بەسەربچێ، بارزانی وردە ــ وردە بۆلای شورەویو شیوعیکان دەچوو، وە هەروەها لەگەل هەمزە عەبدوولڵا کە سیکرێتری پارتی دیموکراتی کوردستانی عراق بوو، وەئەویش لەگەل پارتی سوسیالیستی عەراق لە ١٠ینووامبری ١٩٥٨ داکە پەیمانێکیان دەبەست نیزیک ببۆوە، جائەو ڕێک کەوتنە، دەهات کە مزگێنی بداتو، شائیلەدلان باوێ کەبێنو، دەست بەکاری ئەوەبن یــاسایەکی کەعەراق ئامادەی کردوە، وەلە مادەی ٣ی ئەو قانوونەدا چاوەڕووانی مافیگەلەکان دراوە، بەڕێوە ببردرێ. ١٠

٦ ــ بەرنامەی کۆنگرەی (پانکورد)ی بارزانی

لەوساتەدا، واتەلەئاخری نووامبری ١٩٥٨ لە کۆبوونەوەیەکدا کە هەمزە عەبدوولڵا، وەبرایم ئەحمەد، وەهەروەها ئەندامانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی ئیران بەشداریان کردبوو، بارزانی پێشنیاریکرد کەئەو حیزبانە ببنەیەک، وە بەوچەشنە دەستی بەووتاریک کردوگوتی: "بۆمن لایەنگری کردن لەولا، یان لەملا، لەبەرچاوونیە!" بەڵکو یەک گرتنە، ودە بێبزانین، کەسنوور هێندە گرنگولەبەرچاوونیە، بۆهەڵ بژاردنی سیکرێتری گشتی پارتی تەنانەت دەتوانین لەئەندامی پارتی دیموکراتی ئیرانیش هەڵ بژێرین! لەوکاتەدا ئیرانیکە کەدەلی من ئیرانیم، بارزانی وەلامدەداتەوە، تۆش کوردی، هەموومان هەرکوردین."

بەلام بە باشی ڕوون ببۆوە، کە کوردە ئێرانیێکان تەماشای زەمان دەکەن مەبەسیتان شتێکی دیکەیە، وە وەلەبەرامبەرحیزبی کومونیستی عەراق، وە ڕووناک بیرەکان وە کوردەکان ئێران کەهەموویان لایەنگری دەولەتی سۆویەت بوون،

"کەسانی بارزانی‌ش لایەن‌گری دەستڕاستیێکان بوون‌وە، بەرنامەیەکی ڕاستەقینە یان نەبوو" مەبەستی بارزانی ئەوەبوو، کەسەرۆکایەتی گشتی کـــوردەکـــان بەدەستەوەبگریّ.

چەند حـــەوتویێک کە لەو کنگرەیە ڕابرد، دەولەتی تورکیە نوێنەرێکی‌کوردی خەلکی تورکیەیەی لەئاخری سالی ١٩٥٨ بونێو کوردەکان نارد. حەزی کرد کە یارمەتی چەک‌و پوول وەرگرن،... بەلّام بارزانی ئەوەی بەپیلانیێک زانی، رازی بەوکارە نەبوو، وەگوتی، پیێویستە بچە لای ئامریکا،یان شورەوی [١١]

لەهەوەلّی سالی ١٩٥٩ دەولەتی شورەوی، لە کوردان پشتووانی دەکات. بارزانی لەگەل برایم ئەحمەد کە سەرۆکی حیزبی یەکەتی دێموکراتی کوردستان پ . د . ک وەتاقمێک کەبریتی‌بوون لە هەمزەعەبدوول‌لا، خسرو تەوفیق، نووری شاوێس، نەجات‌عەزیز، وەحامدعوسمان کەهەمووی ئەوانە بالّی‌چەبی‌حیزب بوون، کۆبوونەوەیەکیان دەبێ وە عەهدو،پەیمانیێک دەبەستن." [١٢]

دەگونجی بلّێن کە بەڕاستی بارزانی سەرۆک عەشیرەیەک بوو، بەلام. کردەوەو، ئاکاری‌ڕووناک بیرانەی هەبوو،وە هەروەها خۆی بە لایەن گرێکی گرنگی قاسم زانیوە، وەلەشەڕو، شۆڕشی شاری موسل‌دا بەباشی‌پێش مەرگەکانی خۆی بەشدارکردو، بەوچەشنە لایەن‌گری لەقاسم‌نیشان‌دا

## ٧ ــ هەلّستان و شۆڕشی موسل (٨ مارس ١٩٥٩)

لەمانگی فیوّرییەی‌سالی ١٩٥٩ قاسم ئالّ و گۆڕێک لەحکومەتی خۆی‌دا بەڕیوّە دەبا، واتە دەست ڕاستیێکان لەنێو دەولەت وەدەردەنی وەهەوا دارانی (یەکی‌تی عەرەب) ار ــ ا ــ یو لادەبا. کۆلۆنێل عارف لە ٥ی نووامبری ١٩٥٨ کە دەیەویست "پیلانێک" بکات، دەیگرێ وەلەبەندیخانەی دەکات وەحوکمی کوشتنی داوە،[١٣] لە ٧ی مارس بەیانی‌زوو، لەکوچەو، کۆلانەکانی‌شاری‌موسل کە دووهەمین شاری‌لای سنووری سووریە بوو، شۆڕشێک بەڕێوە دەبردرێ. لە٨ی مارسی ١٩٥٩ سەرلەبەیانی کولونێل وەهاب شەوواف فەرماندەی هێزی ٥ی موسل لەرادیو دا ووتاریکی بلاو کردەوە،بەتووندی هێرشی بردە سەرقاسم‌وەگوتی: من‌عەراق لەدەستی ئەوزالّم‌و،ملهورە ڕزگار دەکەم.

شەوواف، لایەن گرەکانی چە پی کە بۆ"کنگرەی ئاشتی خووازان"هات بوونە موسل لە بەندیخانەی کردن (٥ – ٧ مارس ١٩٥٩) وەئالای (یەکەتیعەرەب ار – ا – یو هەڵ کرد وەعەشیرەتی بێدووئینی عەرەبی شەممار کە لە قەراغشاری موسلبوون بۆ یارمەتی وی حازربوون. بەلام سەرئەنجام ئەوشۆڕشە زۆر زوتێک شکا، شەش فرۆکە هاتنە سەرشاری موسل، دوویان بۆسەرشاری بە غدایەچوون، فرۆکەکان کانگای ناوەندی شەووافیان بۆمباران کردو تێک وپێکیاندا، عەشیرەتی دووئینی عەرەبش، تەرتوتونا کرانو، پەرش و بڵاو بوون جا بەو جورە شورشی شەوواف ناکام ماوە.

ژێنێرال تاباک کەلیفەرماندەی هێزی دووهەمی نیزامی کە رکوک، کە چاوەڕووانی ئەو تێکشکانەی دەکرد، لەتێلێ گرامێک داپشتووانی خوی لەقاسم دەربڕی.

هەروەککە گوترا، بارزانی لایەنگری نێزیکی قاسم بۆتێک شکانی ئەو شۆڕشەکوتائی نەکردو، بەباشی بەشداری کرد، وەلە ٥ی مـــــارسی ١٩٥٩ پێشمەرگانی کورد بەهاوکاری دەوڵەت شۆڕشی موسلیان لەنێو برد، وەهەروەها لە ٤ی نووامبری ١٩٥٨ شورشی عارفیان تێک شکاندو، بەوجۆرە فیۆدالە لایەن گرەکانی شەووافیان لەنێوبرد.

سەرئەنجام شەوواف کە لەسەر تەختی نەخۆشخانە کەوتبوو، وەبریندار کرابوو ئیتر کەلەلابوو،چیلەدەست نەدەهات، هەوا دارەکانیشی بڵاو ببون، بۆخوشی مرد.

پاش٤٨سەعاتموسلوە دەست کوردان کەوت، کۆ بە کۆپێش مەرگەکان دەگەڕان، خەلکیان دەکوشتو، دەبڕی وەڕوحمیان بەکەس نەدەکرد، لەئاکاما تاقمێکی ٤٠٠ کەسی پەنایان بۆ مـزگەوت برد، کە لەدەستیکووشتنیکوردەکان ڕزگاربن.[١٤] ئەوکاتەی کە کوردە جوتیارەپێشمەرگەکان شاری موسلیان دژی شۆڕش خاوێن کردەوە، دەگونجێ بلێن ئەوە بزوتنەوەیەکیجوتیاریو، کرێکاری بوو، کە دژی فئودالە گەورەکانی موسل بەڕێوەهات. نەخشی خسروتەوفیق ئەندامی سەروکی پ - د - ک لەیارمەتیو، کۆمەگ دانەخشێکی زۆر گرنگانەیبوو، کەبەوجورە لەهێدیوهێمن کردنەوەی شاری موسلوە هەروەها لە کوشتنوبڕینی عەشیرەتی دووئین (شەمر) کە لە سووریەوە یارمەتی دەکران زۆر بەجێبوو. جاهەمووی

ئەوئاکارانە، بەباشی لایەنگری کوردەکان لە قاسم دەگەیێنێ.

سەرئەنجام یەکەتی دوو سازمانی گەورە کە بریتی لە پ.د.ک.پ.ی.د.ک پارتی کومونیستی عەراق پارتی یەکەتی دیموکراتی کوردستان کە لەپاشان حکومەتی عەراقیان پێکهینا، بووبە هوی یەک گرتنی پارتو، قاسم، کەبەراستی ژووانو، سێ ڕوژانەی ئەدوو پارتیەبوو. ئینجاتووانائی و حوڕمەتی پارت زوّر چوّسەرێ وە تاڕادەیەک کە بە چاپکردنی روژنامەی خەبات دووهەمین روژنامە وەنووسینی هە والی باش جێگای حیزب زوّر لەسەرێبوو. (۴ئاوریلی ۱۹۵۹)

## ۸ـ (نەوروزی ۱۹۵۹)

یازدەروژپاش شکانی شوڕشی موسل، کوردەکان لەشاری سولەیمانی جێژنی نوروزیان بەشادیو، بەخوشیگرت. شاربەوێنەی هەرگەورەی قاسمو، بارزانی ڕازاوە، وەلەتەنشت ئەدووویێنانە، وێنەی شیخ سەعید، شیخ مەحمـــــود، وەقارەمانانی دیکەی کورد، لەشەقامەکانولەدەرکو، دیوار درابوو.

پارتی دیموکراتی کوردستان بەچەشنێکی باش خو پێنیشاندانی دەها هەزار کەسیلە سازمانی گەنجان وە یەکێتی جوتیارانو، کرێکاران وە بە تایبەتی سەندیکای کرێکارانی پێک هینابوو. سەروکە کوردەکان زوّربەتێن و گرینگ لەبارەی شوڕشی قاسم وەیەکێتی کوردو، عەرەبقسەیاندەکرد، وەهەموویان سلاویان بوکوردە چەوساوەکان کە بە درێژائی مێژوودا خەباتیان کردوە دەنارد.

سەروکە کوردەکان لەو تارەکانی خوّیان دا بیرەوەری ئەوەیان دەکرد کە چوّنکاوەیئەسینگەری کورد بەسەر زووحاکیزالموملهور دازالبوّوە، وە هەروەها دژیئمپریالیسمی ئینگلیس و ئەمریکا وەدژی لایەنگری فاناتیسمەکانی ناسر دروشمیان دەدا.

## ۹ـ بەیانییەی پارتی یەکێتی کوردستانیعەراق (مەی۱۹۵۹)

پارتی دیموکراتی کوردستان کەلەئاخری بەهاری ۱۹۵۹ لەژێر چاوە

دیرّیهەمزەعەبدوول‌لاوە بەسەرۆکایەتی ژێنیرال بارزانی پێکهاتبوو، ئتر پشتی پارتی سۆسیالیستی عەراقیێ بەرنەدا، وە لەمانیفێستێکدا کـەوە دەریخست بەوجورەی گوتبوو:

"پارتی ئێمە هەمیشە دژی ئمپریالیسم و کۆنەپەرستو، فیئودال ڕاوەستاوە ولەگەل ئەوان ئاشتی ناکات، بەرگری لەمافی نەتەوایەتی، بەتایبەت لەبەشدار بوونی کە مایەتی دەکات، وەشەڕی چینایەتی بەقزانجی گەل درێژە پێدەدا، تاکوبەئاواتی خوی دەگات.

پارتی ئێمە لە چووار چیوەی و لاتی، کوردستان عەراقدا بووەدەست هێنانی مافیگەل و نەتەوایەتی خەبات دەکات، وە بۆ یەکێتی ڕەگەزی کوردو، عەرەب وەبەدەست خستنی مافی دیموکراتیک وە دانانی کۆماری خەلق، وە هەروەها بۆ پێش کەوتنی کاری ئابوریو، ڕامیاری لەهیچ تێکوشانێک ڕاناوەستیٚ.

برایەتی کوردو، عەرەب ڕوژلەگەل ڕوژێ بەپەرەتر دەبیٚ، وەلەڕاستەقینەدا ئەوەدیٚ وەدیبێت کە بنکەی دیموکراسی لەسەریەکیتی ئەو دوو گەلەدا مەزرینێت.[١٥]

ئەوانەی کە دووژمنی گەلی ئازادی خووازی ئێمەن، دەسا دووژمنی گشتی ئازادی خووزانی جیهانن. کەسانێک کە دەنگیجیاوازی دەردەبڕن، ئەوانە دووژمنی سەرسەختیئێمەن، وەدژی دیموکراسی وپارتیئێمە دەبزونەوە.

خەبات، ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستانی عەراق لەهەوەلین ژمارەی خو یدا "داوای مافی نەتەوایەتیو، سەربەخۆیی وە وێژەوەری خو ی کردبوو"[١۶]

بەلام نێوان تێک چوونو، بڕینی هاتو، چۆلە نێوان پارتی کومونیستو

بارزانی زۆریپیٚنەچوو، کاتێکی زۆر باریکو، عاستەم ونامەعلومو، نەزاندراو هاتبۆپێشیٚ، وە ئەوکارە ساتە لەکاتیهەلستانی سەروکە کوردەکانی فیئودالی ناوچەی ڕەوان دزوەریهات .

## ١٠ــ هەلٚستانی سەروکە کوردەکانی ڕەواندزلە (مانگی مەی ١٩٥٩)دا

ماوەی حەوتـوو کە لە شۆڕشی موسل ڕابردبوو سەرۆکە کوردەکانی مەلبەندی ڕەواندز لەکاتێکی زۆر تاریک داشۆڕشیان دەست پیٚکرد. لەوهەلٚستانە

داشێخ رەشیدی لۆلان، وە زاواکەی مەحمود خەلیفە وەمەحەممەد ئاغای زێباری وە داودجاف، دووژمنانی هەرکۆنی بارزانی، بەشدار بوون، بەلام شێخ مەحەممەد سدیق یەکێک لە کوڕەکانی تاها لەگەل بارزانی هەروەها نیوانی خوشبوو.

ئەو شۆڕشە بە هۆی ئەوە بوو کە بە شدارکردنی جوتیارەکان لەبەشەکانی زەوی وەلایەن گری کومونیستەکان لە کاروباری جوتیارەکانی موسلو، ڕەواندز، مەسەلەیەکی گرنگبووە بۆ ئەو فئودالانە کە نەیان دەویست، زەوی لەنێوان جوتیارەکاندا بەشبکرێ، جائەوکارە ساتەیان هێنا بۆ پێشێ

شورشلەلایەن هیزی عەراقەوە، وە بە یارمەتی یەکێتی (جوتیارەکان) وە بارزانی تێک شکاوەنزیکەی ٤٠٠٠ کەس بۆ تورکیە وە ٢٠٠٠٠ کەس بۆئیران پەنایانبرد.

هەڵبەت پاش ئەو کارەساتەبوو، بارزانی کە گەڕاوە بۆ کوردستان وەلە ووتارێکدا گوتی کە "کومونیستەکان دەیانەویست ئەمن بکوژن!" پێویسیە مرۆڤ پرسیاربکا، ئایا بەڕاستی دژی بارزانی پیلانێک لە کاردابوو، یان بارزانی لەوەی قەڵس ببوو کە چریکەکان لە جوتیارەکان دەپرسن: "ئایاتو، کوردی؟یان کومونیست؟"

جالە بەرئەوە بوو، کە ڕووناک بیرەکان زۆر لە بارزانی خاترجەم نەبوون، لەئاکامدا پاش ماوەیەک مەلامستەفا لەگەل هەمزە عەبدووڵلاهاتو، چۆیی خۆی بڕی وەدەنگی لێگۆڕێ.

دەگونجێ بڵێن کە بارزانی لەپێش کەوتنی کاری کومونیستەکان، سەری سووڕمابوو، وەلە وەی دەترسا کە پارتی دیموکراتی کوردستان کە زۆر لەپارتی سۆسیالیستی عەراق نزیک بۆتەوە ئەوی‌وەلابنێن. چوونکە لەشاری سولەیمانێ، کەرکوک، هەولێر بە جووانی ئۆرگانەکانی پارتی سۆسیالیست نەختێک بەئاشکرائی دەبزوتنەوە،وە کاریوباری خۆی لە سەرریبوو، شوێنێکی دروستەوەدەبردەپێشێ.[١٧]

ئینجا نووسەرەکانی کورد لێرە دا بێدەنگ ببوون، وەلەکاتێکی ناسکدا، گۆیی خۆیان هەڵ خست ببوو.[١٨]

چووارەمین کونگرەی پارتی یەکێتی کوردستان ( پ دیو . ک ) وەپارتی دیموکراتی کوردستان پ.د.ک کەسەرئەنجام ئەونێوەی لەسەرداندرا، لەگەل

پیاوەنیزامێکان هەموویان بەڕاوتە دبیری بارزانی تاقمێکیان هەڵ بژاردو، هەمزەعەبدوولڵایان لابرد.

ئەوکەسانە: ئیبراهیم ئەحمەد بەنێوی سکرێتێری گشتیپارتی دیموکراتی کوردستان، جەلال تالەبانی ئەندامی ڕامیاری پارتی، کەئەندامی جیاوازی ڕادیکال بوو![19] عومەرمستەفا، نوری شاوێس، وەعەلیعەبدوولڵا، کە لە لایەن بارزانی وە قامکی لەسەر داندرابوو هەڵ بژاردران،هێندێلەوئەندامانە کە لایەنگری بالی چەپی پارتی دیموکراتی کوردستان بوون، یەکێک لەوانە دوکتور مەحمود عوسمان بوو کە لەسالی ١٩٦٢ بووبە ئەندامی پارتی دیموکرات کەلەلایەن گرەکانی نزێکی بارزانیبوو.

## ١١ ــ قاسمهاتوچۆیی‌خۆیی‌لەگەل بارزانی دەبڕێ

لە ٦ی ژانوییەی ١٩٦٠ ژێنیرالقاسم، سەرئەنجام لەگەڵ سێ قودرەتان ڕووبەروو ببوو کە ئەوسێ قودرەتە لە دەمو، دەزگای دەوڵەتی داهەستیان هەبوو. پارتی نەتەوایەتی دیموکراسی،پارتی دیموکراتی کوردستان، وەپارتیکومونیست کــە لەگەل پارتی ئەسلی کومونیستی عەراقێ لەپاش ڕوو داوەکەی شاری کەرکوک (١٤ی ژوییەی سالی ١٩٥٩) نێوانی نەبوو. پارتی دیموکراتیکوردستان لەوکاتەدا کە هێزێکی گەورەبوو،دەستی بە وەدەرخستنی روژنامە یەک بەنێوی کوردستان کرد [120]

بەلام بەینی قاسمو،کورد،دەهات بەتەواویتاریکبێ، هەروەکو مێژوو نووسانی کورد نووسیویانە عسمەت شەریف وانلی، وەژێنیرالقاســم لەدانشتنێکی دۆستانەدا کە لە هەوەڵی ژانوویەی ١٩٦٠ دا کۆببوونەوە، قاسم داوای کردکەهیچشتێکباس نەکرێ، ئینجا کوردەکان، "مەسەلەی مافینەتەوایەتی کورد لە چووار چێوەی عەراق داهێنابوویانەپێشێ[21] برایم ئەحمەد وەکمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان، سەلماندیان کە ئەومەسەلەیەلە کۆنگرەی ٥ی پارتی دیموکرات کەلە٥ی یان ١٠ی مەی ١٩٦٠ پێکدێ باسبکرێ. لەبەندی ٦ بەرنامەی کۆنگرە دا لە ئاکام دا نووسرابوو، کە پارت پێویسیە پشتیوانی لێ بکرێ، وەبرایەتی کوردو، عەرەب پترپەرەی پێبدرێ، وەمەسەلەی نەتەوایەتی

کورد لەچووارچێوەی عەراقدا دەبێ لەیاسای مەجلسی عەراق چاوەڕووانی بکری

بەلام لەسەرئەوەشڕا زۆر مەسەلەی دیکە لەبەرچاوونەگیرابوو ، نێوانی پارتی دیموکرات لەگەل بارزانی بە باشی ڕوون نە بوو ، وە هەروەها نەدەزاندرا کە قاسم لەگەل کوردان چلۆن دەیەوێ بجووڵێتەوە ، وەجگەلەوانە کۆمونیستەکان نێوانیان وردە ــ وردە دەهات لەگەل قاسم ببردری . لەمارسی ١٩٦٠ داقاسم لایەنگری خوی لەپارتی دیموکراتی کوردستانی ئێران کە پاش شۆڕشی ١٩٥٨ هاتبوونە ولاتی عەراق مەبەست بەوەی کە تاوان بارکراون کە لەگەل کومونیستە کانن بڕی . یەکێک لە ئەندامانی پارتی بە بارزانی گوت کە قاسم گاڵتەت پێ دەکات پاش ئەوەی کە کۆمونیستەکانی سەرکوت کرد ، وەبلاوی کردن ، ئینجا نۆبەی کوردە کانیش دێ .

بەلام بارزانی نەتەنیا بـــەقاسمی ڕانەگەیاند ، وەلەوکارەشدا نێونجێتی نەکرد ، تەنانەت ئەندامانی پارتی دیموکراتی کوردستانی ئێرانیشی لەعەراق وەدەرنان .

لەکۆنگرەی ٥ ی مانگی مەی ١٩٦٠دا ، پاش ئەوەی کە بارزانی لەگەل کومونیستەکان نێوان ناخۆشی لێ وەدەرکەوت ، سەرئەنجام حیزبی دیموکراتی کوردستانش بووبەپارتی (شۆڕش) . لەبەیان نامەیەکدا کە دەربڕی بوو گوتبووی کە : "تەواوی خەلکی کورد ، چکرێکار ، جوتیار ، پالە ، سەنعەتکار ، گەنجانی ڕووناک بیری شۆڕشی کورد" دەتوانن لەدەوری یەکتر کۆببنەوە . بەشوێنی ئەوەدا ، لەڕاو تەدبیرێکی دا کە گیرا ، هەموویان گوتیان کەپێویستە ڕێوو ، شوێنی (دکترین)ی مارکسیيسم ــ لێنین نیسم لەبەر چاوبگرن ، ئینجا دانیان بەسەر داناوگوتیان ئەومەبەستە لەئاکامدا خەباتی ڕامیاری چینیایەتی وەمەسەلەی ئانالیزی لێ کۆلینەوەی خەلکایەتی تێدا دەبیندرێ . "

لە ٣ی مانگی نووامبری ١٩٦٠ بارزانی ، بەبۆنەی سالی تێوە ڕسووڕانی شۆڕش شورەوی چۆشاری مسکۆ ، کە بە شداری لەوجێژنە دابکات . لەوێ لەلایەن خروشچوفەوە ، ڕێزێکی تایبەتی لێ گیرا تانیوەی مانگی ژانوییەی ١٩٦١ نەگەراوە بەغدایە . ئینجانەزاندرا کە چاوپی کە وتنە کەی لەگەل پیاوەکانی شورەوی چ سودو ، قازانجێکی لەبەر دابوو ، وە بەکوێ گەیشت .

لەئاکامدا هەر مەبەست بەوەبوو کە قاسم لەو گفتوگویە درێ دۆنگ بوو ،

وە بە شوێنی ئەوە دا هێندەی پێ نەچوو کە نیوان‌و، هات‌و، چویی قاسم لەگەل بارزانی برا.

## ١٢ ـ مەبەستی برینی‌هات‌و،چۆ لەگەڵ‌قاسم

لە پاش‌ئەوەی کە زوریان کەندو، کۆسپ بو کومونیستەکان ،وە کوردەکان لەعەراق‌دا هێناپێشێ، وەپاش ساڵێک کە لەشورشی ژوئیەی (١۴ ژوئیە ١٩٥٨ ـ ١۴ ژوئیە ١٩٥٩) زادەبرد قاسم‌کە لەبە قودرەت‌گەیشتنی کۆمونیستەکان مەترسی زور بوو، ئینجا رووی لەبالی‌راستی پارتی ناسیونال دیموکرات‌ی سە کرد، وەبەتایبەتی بۆ لای ناسیونالیستی عەرەب‌چوو. بەوجورە چلۆنایەتی وازی قاسم لەبارەی مەسەلەی کوردەکان‌دا زۆرنامەعلوم بوو.

لەیاسای مەجلسی عەراق دالەمادەی ٢ و ٣ی یاساکەدا، مەسەلەی کورد بەباشی ڕوون نە بوو. برایم ئەحمەد، لەڕۆژی ٩ی نوامبری ١٩٦٠ کە ببووبە سێ کرێتیری پارتی دیموکرات‌ی کوردستان لەسەرتای روژنامەی خەبــات‌ی کوردستان‌دا لە ١٩ای ئۆکتۆبری ١٩٦٠[٢٢] بەچاکی ئاشکرای کرد. چەندمانگێک بە شوێنی ئەوەدا، شەڕی قەلەمی لە لایەن حکومەتی شۆڕشی عەراق لە ڕۆژنامەی "الثورە، دا دەستی پیکرا، وەلە نوشتارێک دا لەژێر عینوانی: (شۆڕشی عەرەب وەمەسەلەی نەتەوەکەمان) ڕاگەیاندرا، کە سەرئەنجامی (کوردی عەراقی) لە چووارچێوەی ناسیونالیستی عەرەب دالەبەرچاوە، وەپیویستە "نەتەوەکەمەکان واتە "ئەقەل‌لیت" بۆلای ناسیونالیست‌ی عەرەب بکێشرێن"[٢٣].

ڕەژیمی عەراق کوردەکان‌ی لە کاتی چێوتی‌و نالەباری‌دا، دانابوو، لەمانگی مارسی ١٩٦١ برایم ئەحمەد گوناح‌بارکرا کە پیاوێکی لە فیئودا لە دەربەگەکوردەکان‌ی بەنێوی سەدیق نیران عوسمانی، لەفیورییەی سالی ١٩٦٠ دالەشاری شەقلاوێ لەکاتێک دا کە بەرەنگاری‌پێش مەرگەیەکی بارزانی بووە، کوشتوە.

هەروەها ئەندامێک، بەنێوی عومەر مستەفا دەگیرێ وە لەولات بوجنوب دوور دەخرێتەوە.

هاوکات لەگەل ئەو تاوان‌بارکردنە، قاسم دەستوردەدا، کە روژنامە

کوردەکان ،وەک کوردستان ، دەنگی کورد ، هەتاو ، لەچاپ‌نەدرێن . وەڕۆژنامەی خەبات ئۆرگانی ڕەسمی ئیداری ( پ‌دک ) لەنووسین بوێستێندرێ (ئاخری مارسی ١٩٦١) .

بەرانبەری مارسی ١٩٦١ ، ژێنێرال بارزانی ، کە ئەو کارەساتانەی چاوپێ کەوت ، ئتربەچاکی لیێ‌حالی‌بوو ، وەمەسڵەحەتی نەزانی لەبەغدایە بمێنیتەوە ،وە بو ناوچەی بارزان ، گەراوە .

پاش شەش مانگ شەڕ دەستی پیکرا ، وەهات‌و ، چوێ لەبەینی بارزانی‌و ، قاسم بەتەواوی‌بڕا . وازی ناوچە ڕۆژبەڕۆژ خرابتردەبوو ، لەمانگی ئاوریل‌ی ١٩٦١ ، کمیتەی ناوەندی پ د ک لەبەغدایە کۆبوونەوەیەکی پیکهینا ، لەو کۆبوونەوەیەدا ، دەبوو ، تەسمیم بگرن کە ئایا لەشۆڕش لایەن‌گری بکەن یان دژی شۆڕش دەست بەکار بن‌و ، بۆبەرگری ئامادە بن . قاسم لەوکاتەدا بە تایبەتی دژی بارزانی ، وەلە مەجموع دا دژی کوردستان ووتاری‌بڵاو کردەدەو ، هەڵمە تی بردە سەرکوردان.[24] جەلال تالەبانی لایەن‌گری ئەوەبوو کە دەبێ شەڕی پارتیزانی دەست‌پێ‌بکرێ

لە هاوینی ١٩٦١ لەمانگی ژوئن وە ژوئیە دا پارتی دیموکرات‌ی کوردستان دووبڕوارنامەی‌بە حکومەتی عەراق‌دا ، بەلام‌قاسم وەپشت گوێی‌خـــوێ‌دا ، وەمەسەلەی کوردستان‌ی لەبەرچاونەبوو . تەنیا لە بیروڕای مەسەلەی نەتەوایەتی ناسیونالیست‌ی توندی) عەرەب‌بوو کەپێی‌گرنگ‌بوو ، جامەسەلەی کوویەت‌ی هێناگۆڕێ . هەروەها لەکاتێک‌دا کە کوردەکان دەیانەویست تێ‌وەرسووڕانی سووەمین سالی شورشی ژوییەی ١٩٥٨ ، جێژن‌بگرن ، حکومەت‌نەی‌هێشت ، وەلەمەلبەندی بارزان پێش‌مەرگەکانی بارزانی لەگەل پیاوە چەکدارەکانی مەحمود ئاغازیباری بەرەنگاری یەکتربوون .

## ١٣ ــ بیلان ــ تەرازنامە

سێ‌سال سوڵح‌و ، ئاشتی لە مێژووی کورد دازۆر بەنرخ‌وبایخ‌بوو ، بەلام قسەکردن لەسەریاسای عەراق کە مافی نەتەوایەتی کوردانی تێدا گونجابوو ، لەکردەوەدا بەجێ نەهات‌و ، کەڵکی لێ‌وەرنەگیرا . لەماوەی ئەو سێ‌ساڵەدا

کوردەکانی عەراق لەئازادی دادەژیان، ووتارو، نوشتاریان ئازادبوو، هەرچەند قاسم پیاوێکی ملهور بوو، بەڵام لەسەر ئەوەشڕا کوردەکان هەولو، تەقەلایان هەردەدا. بەتایبەتی ڕۆژنامەکان نەخشێکی گەورەیان دەگێڕا.

هێندێ لەپیاوە سەرۆکە بە نرخە کوردەکانی ئێرانیش، لەکاروباری شۆڕشدا لەشاری بەغدا هاوبەشێکی گرنگیان‌دەکرد. ڕاپەرینی باشی پارتی دیموکراتی کوردستان توانی بەشیکی زور لەهەوادارەکانو، لایەن‌گرەکانی خوی لەسەرپیڕاگرێ، وەسازمانیکی جووان بەشیوەیەکی دروست پیک‌بێنێ.

لەسالەکانی (١٩٣٤ – ١٩٣١) نەخشی بارزانی بەنیوی سەروک زور گرنگ بوو، هەوەڵین دوور کەوتنەوەی بارزانی لەعەراق لەسالی (١٩٤٣ – ١٩٣٤) کەسالەکانی پڕپیتو، تاقی‌کردنەوەی بارزانی‌بوو، وەدی‌هات، هەروەهادووهەمین دوورکەوتنەوەی بارزانی بو ولاتی شورەوی (١٩٤٧ – ١٩٥٨) بووبەهۆی ئەوە کە بەرزتربێ

وەسەرئەنجام بارزانی بەنێوی پیشمەرگە، سەرۆک‌هیز، سەروکی‌نیزامی، وە هەروەها بە نیوی مرۆڤیک لەکاری کوردایەتی دانەخشی دەگێڕا.

بەوجورە بارزانی بەسەرهاتو، چلۆنایەتی کوردی عەراقیێ بەدەست دەگرێ‌وەلەگەل پارتی دیموکراتی کوردستان بەنیوی سەروک هاوکاری‌دەکات. بارزانی دەیەویست کە سەرۆکایەتی تەواوی کوردەکان بەدەست بگری، وەتەنانەت قاسم‌وە شورەوی‌ش‌ئەوەی بسەلمینن‌و، بە لیدیری کوردەکانی بناسن، بەڵام لەوکارەدا ناکام‌ما. ئینجا ئەوە هەوەڵین ناکامی و شکانی بارزانی نەبوو، بەڵکو شکانی دیکەشی بەدووائی دا هەبوو. عەیب و عاری گەورەی ژینیرال بارزانی ئەوەبوو کە قەت لە دڵەوە لەگەل حیزب هاوکاری نەبوو وتەنیا "ئالەتی" دەستی دادەنا تەنانەت دەیەویست بەتەنیا، تەواوی هیزوتووانائی و قودڕەتی لەچنگ دابێ ،وە کارەکان بوخوی هەلسووڕێنێ.

وادیار بووقەت نەخش‌و، ڕێبازی دیموکراسی‌و، رامیاری نازانی وەبۆیی ناچێ"

بەڕاستی پیویستە بڵین کە بارزانی بە دریژائی دامەزرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان‌وە سالەکانی شۆڕش‌دا واتەئەو چەند سالانەی کەحیزب هەستی هەبوو، قەت بە چاکی هاوبەشی نەکردبوو، بۆ ئەوەی کە بڵین کارێکی

کردوە، جارجاریەکێکی لەئەندامی سەرۆکی حیزب لادەبرد، وەمرۆڤێکی دیکەی لەجێ دادەنا...

سەرئەنجام لەو کردەوەیە کەس رەزامەندی، نەبوو، بەکورتی بڵێین کەنێوانی بەینی پارتی و سەرۆک قەت خۆشنەبوو. سەرئەنجام ئەوکارو، کردەوانەبوو، بەهۆی ئەوە کە سەرەتای چێوتیو، نالەباریو، ئالۆزیو، بوحران لەسالی ١٩٦٤ دا پەیدا بوو، وەلەئاخردا بە شکان و ناکامی بارزانی لەسالی ١٩٧٥ دا گەیشت.

کوردستانی عراق
سنوری ناونەتەوەئی
ریگا ،
چوم ،
0 25 50 75 100 kms
مقیاس ١٠٠ کیلومتر
تورکیه
بەحری ورمی
سوریه
ئیران
عراق
شیرانیش
کانی ماسی
زاخو
ئامادیا
بامەرنی
دهوک
سەرسەنگ
ئەتروش
شیخان
عەل کوش
ئەکرا
بارزان
بیلە
میرگەسور
دیانا
گەلالە
حاج عمران
رەواندز
شەقلاوی
رانیە
قەلادزە
سەبخار
موسل
زابی گەورە
هەولیر
کوی
دوکان
زابی چکولە
تیگر
چەمچەمال
کەرکوک
چوارتا
پەنجون
سولەیمانی
بەرزنجە
دەربەندی خان
حەلەبجە
کیفری
خانەقین
Takrit

## فه سلی ٦

### شەڕی قاسم :

بەڕاستی گەلەکانی عەراق هومێدێکی زۆریان بە شۆڕشی١٤مانگی ژوییەی سالی ١٩٥٨ بوو، بەلام دەهات شورشەکەلەڕێگای‌خۆی لابدات، وەمافی گەلەکانی عەراق بەتایبەتی مافی کوردەکان لەژێرپی‌دابندرێ. سێ‌سالی ئازگار بەشوێنێ ئاگاداری یاسای کاتی‌مەجلسی عەراق، کەلەژێرسایەی کۆماری عەراق داپیک‌هات‌بوو، دەولەتی عەراق یاساکەی لەبەرچاونەگرت، وە،وردە ــ وردە دەهات کە شەڕی حکومەت لەگەڵ خەڵکی کورد هەل بایسێتەوە.

لەئاکام‌دا لەسالی ١٩٦١ زاینی شەر دەستی پێکرا، وە وائاشکرا بوو کە بەو زووانە ناکوژێتەوە، وەحکومەت بەتەواوی هێزو، تووانائی خۆیـــەوە تێ دەکوشی کە کاری کوردەکان تەواوبکات ،وە شۆڕشەکەیان سەرکوت‌کات. ئینجا کاتێک شەڕ زۆر بەتین دەبوو، وەکاتێکی تر هێمنی‌و، ئەهوەنی لەناوچەکە دا بەرقەرار دەبووە. کاتێک کە حکومەت شێوەی ڕامیاری لەپاش دەبوو، کوردەکانی دەلاواندەوە، سەرئەنجام بە درێژائی ١٤ سال کە چووارڕژیم گۆڕا، وەبەوجێگایە دەگەیشت کە وازی کوردەکان لەگەل دەولەت بـاش بیت، لەنەکاو، حکومەت سەرەوژیر دەبووە، هەڵمەتی دەبردە سەرخەلک، زوری لێ دەکوشتن، هات‌و، چوێ‌و، وت‌و، وێژ دەبڕا، ئیشوکار لەگرێژەنە دەچوو، دوژمنایەتی‌و، بەرەنگاری لەمابەینی کوردەکان‌و، حکومەت تازە دەبۆوە.

دەگونجێ تەنیا پێک هاتنێک کە ١٠ی مارسی ١٩٧٠دا، لەبەینی حکومەت‌و، کوردەکان وەدی‌هات، هەرچەند، ریشەو، بنەرەتی‌سست‌و، بێ‌دەوام

بوو ، بەلام ، هات وچوّی دەکرا ، وەنێوان ناخوشی کەمتر دەبوو .
تاکو ٥سال پاش واتە لەسالی ١٩٧٥ بارزانی کە سەروٚکی ئەو شوٚڕشەبوو ، بوٚ لایەکی دیکە کێشراوە سەرئەنجام ڕاپەڕین‌و ، شوڕشەکەی‌تێک شکا .

## ١ ــ دەست پێکردنی دووژمنایەتی

دووژمنایەتی لەکاتێکی زوٚر گرنگ‌وباریک دادەست پێکرا.[١] ئینجا لەپاش ئەوەی کەژی‌نیرال بارزانی بوٚ بارزان گەڕاوە ، لەمانگی مارسی ١٩٦١دا لەبەینی دانشتوانی ناوچەی بارزان‌و ، عێلی‌زێباری شەڕ وەدی‌هات . حکومەت بەپوول‌و پارەو ، هیزی چەکداری خوٚی ، یارمەتی زێباریکانی‌دەدا .

لە١٥مانگی ژوییەدا بارزانی بوٚتێک‌شکانی تاقمی زێباری هەڵمەتێکی بردەسەریان : بەرەنگاری‌و ، شەڕ تا ١٩ی ژوییە ١٩٦١ بەردەوام‌بوو ، سەرئەنجام سەروکەکانی زێباری بوٚتورکیە پەنایان‌بردو ، شەڕەکە دووائی‌هات . ئینجا لەکارو کردەوەدا حیزبی دیموکراتی کوردستان خوٚیی باش نشان‌دا ، وە هەروەها مەلبەندی کوردستان ، بەبێ ئەوەی کە چاوەڕووانی دەستوری حیزب‌بێ یەک پارچە هەڵستا سەرپێ ، وەدژی حکومەت لەمانگی سێپتامبری ١٩٦١دا دەست بەکاربوو . وەخوٚیی‌بوٚ هەڵمەت و هێرش ئامادەکرد . لەوبەینەدا ، کەس‌نەی‌دەزانی کە نەخشی بارزانی چیە !

خەلک لەیەکتریان دەپرسی کە ، آیالەودەم‌و ، دەستەدا پێویست‌نیە کە مەلامستەفا ئاکارو ڕەوشتی خوٚی بنوێنێ ؟ بەلام ئەوپرسیارانە هەروا بێ‌وەلام مانەوە ، وەتاکوئێستاش نەزاندراوە کەبوٚچی مەلامستەفا لە وکارەدا بێ‌مەیلی لەخویی‌نشان‌دا ، ئایا بەهوی ئەوە بوو کە دەیەویست هەربوٚخویی خاوەن‌جێی‌و ، مەقام‌بێ ، وە دیکتاتور بمی نیَتەوە ، بەراستی هەرواش‌بوو ، وەشورشە کە بە رابەرایەتی مەلامستەفا لەڕێگای خوٚیی لای‌دا .

لە ٦ی مانگی سی‌پتامبری ١٩٦١ ، پارتی دیموکراتی کوردستان ، بەبوٚنەی بیرەوەری شوٚڕشی شاری سولەیمانیٚ کەلە٦سی‌پتامبری ١٩٣٠ دا ڕووی دابوو ، مان گرتنێکی ڕازاندەوە . بەشوێنی ئەووازە حکومەت‌پاش سێ‌ڕوژ هێرشێکی بوٚسەر عەشیرەتەکانی کوردبرد . مەلامستەفاش لەبەرانبەر ئەو هێرشە داخوٚی ڕاگرت

وەدژی هێرشێکی لە ١٦دا ،کرد .لەئاکامداژی نیرال قاسم لە٢٤ مانگی سێپتامبری ١٩٦١ دابەهەوال دەرەکانی حکومەت ڕادەگەینێ کە شۆڕشی کوردەکان سەرکوت کرا ، وەحیزبی دیموکراتی کوردستانش پێویستە لەنێوان دانەمێنێ ٢

## ٢ ــ کاتی پارتی دێموکراتی کوردستان

لە پاش ئەوەی کە حەرەکەتی پارتی دیموکرات لە عەراقدا پێشی لێ گیرا ، حیزب ماوەی چەندمانگ بێدەنگ و بێهەست دەبی ، بەلام سەرۆکی پارت برایم ئەحمەد ، لەشاری بەغدایەلەگەل قاسم ، هاتو ، چۆو ، ووتو ، وێژی خۆیی درێژە پێدەدات . لەگفتوگۆیەکی کە برایم ئەحمەد لەگەل ئێریک ڕولو ، هەوال دەری ڕوژنامەی لوموند[٢] بەڕێوەی بردبوو ، دەنگی خۆیی دەربڕی بوو ، وەگوت بووی کە ،هێزی حکومەتی عەراق ، بەهەمووهێزو ، تووانائی خۆیەوە هێرشی بردۆتە سەر ناوچەی کوردستان ،وە لەوێدا جوتیارو ، فەلەو ، ڕەنخبەرەکان قەتلیعام دەکات ، وەدەیەوێ شەڕێکی دوورو ، درێژ بە سەرخەلکی زەحمەت کێشی کورد ، داسەپێنێ ، تەنانەت حیزبی دیموکرات دەتوانێ زۆرباش لەژێر عودەی ئەو کارەنالەبارەێ کە حکومەت لەو گەلە چەوساوەیە دەکات بێتەدەرێو ، سەربەرزبێت . ئینجا بە هۆی ئەومەبەستەیە لەمانگی سێپتامبرەوە کارو کردەوەی ناوچەی شەڕە کە بە ئەستۆدەگرێ . بەلام لەسەر ئەوەشڕا ، حیزب تا هەوەلی مانگی مارسی ١٩٦٢ لەشەڕدا زۆر بەگرنگی بەشداری ناکا ، کەوایە ، سەبارەت بەوەبووە بەلکو داخووا بتوانێ لەڕێگای گفتوگــــــــــووە ، مافی ژیانی نەتەوایەتی کورد وەدەست بێنێ وەبەپیاوکوژی و نالەباری لەناوچەکە دا کو تایی بێنێ

بەلام بارزانی هەر بەخۆی هەل بەزندانو ، هەڕە شەو ، گوڕەشە کارەکەی ناحەزتردەکات وە حازرنابێ کەهەنگاویک بەقازانجی کوردەکان بۆپێشەوە هەلێنێ ، بەلکو هەر بەقسەی خویی دەکاو ، پرس بەکس ناکات .

لەوبەینەش دا پارتی کومونیستی عەراق ( پ . ک . ع ) بەتەواوی هێزەوە دژی فەردپەرستی حکومەتی قاسم دەست بەکاربببوو پێیوابوو کەکوردەکان ، حکومەتی عەراق دە ڕووخێنن ، جابەوجورە ڕاوتەدبیری هێناسەر ئەوهەلوێستەی

که "جــبهەی خەلقی" پێکبێنێ وەلەناوچەی کوردستان واته شمالی عەراق دابه دووژمنایەتی‌و، بەربەرەکانی خۆی درێژەپێبدات. ۴

وادیار بوو که حیزبی کومونیستی عەراق لەمانگی مارسی ۱۹۶۲ وه، ڕاو، تەدبیری بەقازانجی کوردەکان گۆڕی‌وه، وه دروشمی "مافی ڕەوای‌نەتەوایەتی" خەلکی کوردی، لەبەرچاووگرتووه، وەئیدی نایەوێ له ئیدارەکردنی وڵات دا لەگەل سەرۆکەکانی حکومەت به شداری بکات وەداوای مافی خۆشی‌شان بەشان لەگەل مافی ڕەوای نەتەوایەتی کوردەکان به چاکی بەڕێوه دەبات. ۵

## ٣ ـ هەوەڵین شکانی کوردەکان

ئینجا لەدەست پێکردنی شەڕە کەدا، هەردووک لا یەک‌یەکیی تاوان‌بار دەکرد. بەلام هەرچێک‌بێ، ئەو شەڕه بۆ کوردان زور گران تەواوبوو. هێزی عەراق لــــه خواروی با کوریێه پەلاماریکی بۆسەر ناوچەی کوردستان برد، وه له دەوروبەری شاری سولەیمانیێ کوردەکان سەرکوت کران،وەتێک شکان! بەلام لەناوچەی شاری هەولێر،زیاتر لەچەند سەد پێش مەرگه بەسەرۆکایەتی عەبدوول‌لا اسماعیل لەبەرامبەر هێرشی هێزی عەراق‌دا، ماوەی سێ مانگان بەرەنگاری کردو، لەمپەری ڕاگرت. هەرچێک بێ لەبەرئەوەبووکه زۆر بەی هێزی عەراقی‌هات‌بوو، ناوچەی‌کوردەکان، وەپیاوەکانی کورد، چەکیان نەبوو، وەسەرۆکی باشیان‌نەبــــوو کەڕابەریان‌بکات،جابووبەمەبەستی‌ئەوەکه نەتوانن زۆر بەباشی لەبەرامبەرهورۆژمی هێزی عەراقی‌دا خۆیان ڕابگرن، بەتایبەتی فرۆکەکانی عەراق، بەبۆمبــــی ویرانگەرانەهێرشی‌دەکرد

ژەنیرال بارزانی پترله ٦٦٠ پێش مەرگەی چەکداری نەبوو، ئەوپێش مەرگانەش‌تەنیا ئەسلەحەیان تفەنگ‌بوو[٧] جاحەق‌وایه کەبگوترێ دەستی بەکارێکی زۆر نەترسانەو، پیاوانەدا. ناوچەی بارزانی، بەنیوی ناوچەیەکی "بێ‌لایەن" بوشیخ ئەحمەدی برای بەجێ هێشت، وه بەخۆی‌و، بەپیش مەرگەکانیوه، بۆوەلاتی بادینان ڕێی داگرت‌و، چۆ زاخۆیه، کەئەو جێگایه لەخووارووی،رۆژئاوای ناوچەی بادینانه، وەزستانی سالی ۱۹۶۱ ـ ۱۹۶۲ی لەپەناو،پەسیوان دا ڕابــوارد، کەلەهێرشی دووژمن به دووربێ

لەدی‌سامبری ١٩٦١ دا برایم ئەحمەد سەرۆکی پارتی دیموکرات پاش ئەوەی کە بەچاکی‌بۆ ی‌ڕوون‌ببۆوەکە، ئیدی ووت‌و، وێژ لەگەڵ حکومەتی قاسم کەڵکی لیی وەرناگیرێ، لەشاری بەغدایە، وەدەرکەوت‌و، هاتەوە ناوچـــەی سولەیمانێ، لەوێ داکانگای حیزبی دامەزراندەوە، تابەهاری سالی١٩٦٢، زۆر بەخۆف‌و، ترسەوە لەوێ ماوە،وە سازمانی پارتی هەڵ دەسووڕاندو،ئیدارەی دەکرد.

## ٤ ــ پارتی دێموکراتی کوردستان و، سازمانی بە رگری

٨ روزنامەی خەبات ئۆرگانی حیزب، ڕای‌گەیاند کە پیویستەلەو کاتـــە عاستەمەدا،سازمانێکی بەرگری دەست بەکاربکات، وەزیاتر مەبەستی کوشتنی پیاوە خراپەکان‌و، خائنەکان‌وە تێرڕۆڕی ئەوان بێت، هیندی جیگاش بسووتێنێ، ئەوسازمانە دەبی لەژیر چاوەدیری حیزبی دیموکرات بزوێتەوە. دروست‌کردن‌و بەڕێوەبردنی ئەوسازمانە پترمەبەست‌بەوەبوو کە سازمانێکی بەرگـــــــری شەرکەربەهەست‌بی، کە کوردەکانی ناوگوندو، شارەکان بەچاکی ڕێک‌وپێک بکرێن وەنیزامێکی تایبەتی هەبی. سەرئەنجام ئەوسازمانە لەدەستەی ١٠ کەســـــی پیٚشمەرگە وە پەلی ٥٠ کەسی‌وەلکی ٣٥٠ کەسی پێش مەرگەی چەکدار دروست‌بوو، کە ٧٥٪ واتە لەسەدا ٧٥ مرۆڤی ئەندامی حیزبٚ لە شکری شورش گیری کوردٚ بون.

ئەوپێش مەرگانەلەسەر ڕێو شوێینێکی باش،نزم‌و، تەرتیب درابوون، ئاکارو کردەوەیان زۆرباش بوو، لەگەل خەلکی بەچاکی دەبزوتنەوە، وەرزشیان پیٚ‌دەکردن، لەشوبەندەنیکی‌ساغیان هەبوو، هەرپیش‌مەرگەی سەلت٧٥٠ فلس لەمانگی دا ١٢ فرانگ)پوولیان دەدایە،پیش مە رگەی خاوەن خیزان لە مانگی دا ٣ دینار (٤٥ فرانگ) ی‌وە ردە گرت. (١٥) . جابەوچەشنە هێزێکی گەورەی باشوئازا لە کوردستان پێک‌هات، کە ئەوهێزە لە٧٠٠٠ مرۆڤی پێش مەرگەی شەڕکەر دروست ببووەتاسالی ١٩٦٢ ئەوهێزە نزم‌وتەرتیب‌و، ئاڕایش‌درا، ئامادەی هەموو کارێک‌بوو. هاوکات لەگەل پێک‌هاتنی ئەو هێزە، سازمـــانـــی پ . د . ک لەسەرتاسەری کوردستان عەراق‌دا بەچەشنێکی ڕامیاری‌باش دەبزووتەوە. ١٥ کمیتە تەواوی مەلبەندی کوردستان ئیدارە دەکرد ئەو ١٥ کمیتەیە لەشاخەکانی

نیزامی، ڕامیاری، زانیاری، بەڕێوە بردنی کاری ئیداری، بەئەستۆ گرتنی کاروباری لۆژیستیکی‌وە. . . ئیش و کردەوەی دیکەبوو کە دەتوانین بڵێن کوردستان بەوانە لەسەرپێ‌خۆی ڕاوەستا بوو، واتە ناوچەی کوردستان بەچەشنی حکومەتی بە و دو حیزبە ئیدارە دە کرا

**٥ ــ نێوان وهات‌و، چۆ ی حیزبی‌دیموکرات و بارزانی**

ئەوسازمانە بەهێزو، تووانایە کە بەڕاستی بەجۆریکی چاک‌وباش پێک‌هات بوو، وەزۆر لەڕووی‌نزم و تەرتیبێکی تایبەتیوە دەبزووتەوە، وە بەخسوس لەجنوبی کوردستان دا دسەلاتی‌زۆر بوو، وەبرایم ئەحمەد لە چوا رتا جەلال تا لە با-نی لە چەمی رە زا ن‌عومە ر مستە فا لە بیتوا ت دا نا وە ندیا ن ) بە ئە ستوگرت بوو، دە ها ت کە لە شما ل‌و مە رکە زدا پەرەپێ‌بدەن، بەداخەوە چێوتی و نالەباریان بۆ حیزب هێناپێشێ، وەلەڕو، لاوازیان کرد. ڕۆژێک هەوال بەرێکی دەرەوە لە سێ‌پتامبری ۱۹۶۲ دا لەگەل مەلامستەفای بارزانی، ووت‌و، وێژیکی بەڕێوە بردو، لیێ‌پرسی: ئایا نەخشو، کردەوەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە هەڵستان‌و، بزووتنەوە کەی کورد دا تاچ ڕادەیەکە؟ بارزانی بەدەنگێکی بلند وەلامی داوە وەگوتی هەموو، کە لێرە حازرن گوێ‌تان‌لێ‌بێ: تائەو کاتەی کە من ئاگادارم‌و، دەزانم، حیزب هەستی‌نیە، بەلکو تەنیا نەتەوەی کوردە کەڕاپەریوەو، بۆ مافی ڕەوای خۆی تێ‌دەکوشێ‌و، هەوڵ دەداو، خەبات دەکات. [۱۲]

لەئاکاما بەوجورە نێوان ناخوشی لەبەینی‌مەلامستەفا،وحیزب پەیدابوو،[۱۳] هات‌و،چۆیان نەماو، ئالۆزی و ناکۆکی پتر لەبەینی کوردەکان دا وەدی‌هات. [۱۴]

**٦ ــ ڕووناک بیرەکانی حیزبی دێموکرات**

بەوبیرو باوەڕە لەڕاستەقینەدا دەگوترێ کە بارزانی لە کاروباری پارتی دیموکراتی کوردستان بەتایبەت لەکارو،کردەوەی‌گەنجو، لاوەکانی ڕووناک بیر ڕازی نەبوو. ئەوەش مەبەست بەوەبوو کە وردە وردە دەهات‌کەهێزو ڕابەرایەتی

لەمەلا مستەفا بستێندرێ.

برایم ئەحمەدیەکێک لەو ڕۆشن‌بیرانەبوو: لەسالی ١٩١٣ی زاینی‌دا لەشاری سولەیمانێ لەدایک‌بووە وەپاشان چۆتەنێو بزوتنەوەی کوردەکان، قوتابی مەدرەسەی حقوق بووە، زانستگەی حقوقی لەسالی ١٩٣٧ لەبەغدایە تەواودەکات. لەزانستگە لەبارەی مەسەلەی کورد ــ عەرەب دەکۆڵێتەوە، وەڕسالەی خۆی لەو بارە دادە نووسی؛[15] کۆڕی مامۆستاکانی زانستگە لەو رسالەیە بەرگری دەکا. گۆڤاری گەلاوێژ لە ژێرچاوەدێری ئەو بەچاپ دەگات. لەسالی ١٩٤٦ دەبێتە سەرۆکی یەکێک لە شاخەی پ . د . ک ی ئێران کە قازی‌محەممەدلە سولەیمانی‌ی دانابوو.

بارزانی لەگەل ئەو لکەی حیزب ڕووی‌خۆشی نیشان نەدا. بەلام هەتا کۆماری کوردی مهابادتێک نەچووبوو، مەلامستەفا ناچار بوو، لەبەر چاووان‌دا، لەگەلیان بێ. تەنانەت لە پاشان پالی‌وە حیزبی دێموکراتی عەراق‌دا، تاکوو چۆولاتی شورەوی وەهات وچوی بارزانی لەگە ل حیزب برا .

ئیبرایم ئەحمەد کەسەروکی گەنجە ڕۆشن بیرەکان بوو، مروڤێکی زانا ،

لەکتێبی ژانی گەل‌دا ئیبرایم ئەحمەد لەپێشدا بە پیاوێکی خاوەن ئیدەی ڕۆمانتیک‌وە بەشێوەی ئەودابە نووسەرێکی ڕئالیست ناســـان دراوە. گوتراوەبەڕاستی ئیراهیم ئــەحمەدا نوێنەرێکی پێشرەوی ڕێبـــــــــازی ڕئالیزمە. . . ،

دەسەلاتی بەسەرئەدەبیاتی زمانی کوردی، عەرەبی، ئینگلیسی، فارسی‌راهەبوو![16] چەندمانگیک پاش کە لەکاتێک‌دا لەبەر چاوان نەماو، لەغارێک‌دا خوی شاردبووە روژنامە نووسەکان چوونە لای وە پرس و جۆیان لێ‌کرد، لەغارە کە داچاویان بەکتێب خانەیەکی کەوت کەکتێبی، راسێل، داستایوفسکی، مارکس لنین، لوئی‌پاسترناک، پەڕتوکی‌سالیسبوری، وەژان‌پول سارتری‌تێدایە.[17] بەراستی ئەو هەمووکتێبانە لەوغارە دووردەستەوە دەبین‌درا، جائیبرایم ئەحمەد، دەپرژا کەمۆتالای بکاو، لەوەختی‌خوی‌دا بیان خوێنێتەوە. بەلام بەپێچە وانەی ئەو، کەسێک نەبوو کەقەت کتێبێک، بەدەست بارزانی‌وەببینێ، هەوال نووسێکـــــــی بریتانیانی بەنێوی داود ئادامسۆن دەگێڕێتەوە کەتەنیا کەڕەتیک بو کە چاوم پێ‌کەوت کە بارزانی کتێبی دەخوێنێتەوە، ئەویش کتێبی عومەری‌خەییام بوو ![18]

لەهەلوتیستی ڕامیاڕیوە ئیبرایم ئەحمەد بەباشی نەزاندراوە ،وە نەناسراوە کە چۆن پیاوێک بووە. ئەوەی کە ڕوون ببۆوە، پارتی دیموکراتی کوردستان، پارتێکی مارکسیست ـ لنینیست بوو، ڕەقیبە لای راستێکانی ئیبرایم ئەحمەد دەیان گوت کە پیاوێکی کریپتۆکومونستە[19] کە وردەوردە بۆلای "دیموکراسی لیبرال" دەڕووا"! ڕخنەگیڕەکانی چەپ پێیان دەگوت کە پیاوێکی ناسیونالیستە کە زۆرتر بەعارف نێزیکترە تابەقاسم. خالد بەکتاش دەبیری گشتی پارتی کومونیستی سووریە کە لەڕەگەزەوە کوردە، دەڵێ کاتێک کەبرایم ئەحمەدم لەسالی ١٩٥٨ لەشاری پراگ چاووم پێ کەوت ،وەووتو ،وێژم لەگەڵ کرد، لەسەر ڕێوو، ڕەوشتی بەعسیکانم دیت ،پیمۆوایە بەعسییە.[20]

جەلال تالەبانی لەسالی ١٩٣٣ لەکۆی سەنجاق لەدایک بووە، ذانستگەی حقوقی بە غدایەی تەواوکردەوە، دەگونجێ بلێن کە نەسلێک لەگەل بارزانی وە هەروەها لەگەل برایم ئەحمەد ،وە هەمزە عەبدوولڵاتەفاوەتی تەمەنیان هەیە، وەزاوای بووە. جەلال تالەبانی زۆر زوو خۆیی بەخەلکناساند، وەبەچەشنی "گەنجێکی ژیو رادیکال" لەحیزب[21] داناسرا. ئاکارو کردەوەکەی لەبەرچاوی ژێنێرال بارزانی جووان دیتراوە، تەنانەت بارزانی ئەوی وەک "کوڕی" خوی تەمەشادە کرد!

هەواداری خەبات بوو ولەئەندامی کە مایەتی کمیتەی حیزب دا دەبزوتەوە[22]

ئینجا جەلال تالەبانی "ڕابەرو، تیۆریسین ی حیزب بوو" وەبۆ سەر بلندی حیزبو، ڕازاوەکەی چاکتی دەکوشی

### ٧ــ نیۆان ناخۆشی لە بزوتنەوەی کورددا

لەسالی ١٩٦٢ ـ ١٩٦٣ لەنێو بزوتنەوەی کوردەکان دا ئاژاوەیەک سازدەبێ واتە لایەن گرەکانی بنەرەتی دەستبەچەک دەبن، ئەوشۆڕشە ،ئیمروقە رادیکالەکان دەبێ.

ئێوارێ تەنگی بانگی شەوان سەرۆکەکانی کورد لەدەورووبەری ئاورێکی

١ــ لەنهینی دا لایەن گرییان بوو م.ر

کەهەلیانکرد بوو، کۆببوونەوە، وەسرودی نەتەوایەتی کوردی "ئەیڕەقیب" یان بەدەنگێکی بەرزو، بڵندەوە دەخوێندەوە... کەس نەڵێ کورد مردوە... کورد زیندوە، زیندوە، قەت نانەوێ ئاڵاکەمان... وەهەروەها چەندسرودێکی دیکەی کوردی، "ئازادیخوازین کوردین ئیمە" یان، خوێندەوە...

بەڵێ "ئاغاو، کوڕەبەگەکان خوێنی کرێکاران و جوتیارانو، فەلەکان دەمژن." شانبەشانی تەواوی نەتەوەچەوساوەکانو، زوولملێکراوەکان[23] ئێمە خەبات دەکەین، وەدژیدووژمنی خوێن خۆرمان کەچنگو، ددانیبەسەر هەستو ژیانی ئێمە داگرتووەیانی ئیستسمار گەرەکان کە دووژمنی هەموو گەلەچەوساوەکانە خەبات دەکەێن.

ئەندامەکانی ڕادیکالی حیزبی دموکرات لەبەر چاووی بارزانی وا دەبزونەوە کە هیچ بیانوێکی نەدەنەدەستوی بەتایبەت مەترسیان لەوەبوو کە جووتیارەکان دژی حیزب هانبدرێن وەسازمانی حیزب لەڕو، لاوازبکەن برایم ئەحمەد لەچاوپێ کە وتنێک دا کەلەگەل هەوالدەری روژنامەی "لوموند"ی کرد[24] ئەوەی ئاشکرا کردو، دەریبڕی کە: ئێمە لە هانوتیندانی جوتیارەکان مەترسیمانزۆرە،وەلەتوی ناشارمەوە،وە هەروەها ڕادەگەێنی کە ئێمە بەجوتیارە کانمان قەولو، قەرارێکیزۆر ڕوونمان نەداوە، بەلام پێمان ڕاگەیاندوون کە پێویستە مافیڕەوای نەتەوایەتیمان بەدەست بێنین،وەهاوکات لەگەل وادەپێدانی ئەومەسەلەیە واتەپێگەیشتن بە بەهەشتی مەوعود، ئینجا هەلو، مەرجی باش هەل دەکەوی کە هەنگاوێکی گرنگبۆ جوتیاران هەلێنن.

هەروەک کەدەزانی بۆ جوتیارو، فەلەکانی کورد، "مەسەلەی گرنگ زەویە" ئەگەرهاتوو نەخشی فئودالیتە لەنێو هەڵگیرا وەزەویەکانیش دابەش کرا ئیتر جوتیارو، فەلەکاریان باش دەبێت. برائم ئەحمەد درێژە بە قسەکەی داوگوتی[25] بەلام لەوکاتە عاستەمو، ناسکەدا ئێمە دەست لەهیچ نادێن، چونکە حکومەتی بەغدا، لەبیانوان دەگەڕێ جا سەرۆکەعەشیرەتەکان هان دەداو، دژی ئیمەی دەکات، پەس کەوابوو، پێویسیە جارێ بێدەنگ بین.

سرودیئەیرەقیبریکخراویو‌نسرئوف

## ٨ ـ مەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناوخۆ (ئۆتۆنۆمی)

دروشیمی ! یان کوردستان ، یان نەمان ، لەسەر زاران دەگوترا . وەیەک لەیەکێ دەپرسی کەئایا مافی‌ڕەوای‌گشتی نەتەوایەتی واتەئستقلال داوا دەکرێ؟ هێستا کەبەچاکی مەبەستی پارتی دیموکراتی کوردستان ، ڕوون نەبوۆوە : هێندێ لە کوردەکان لەشەڕ مەترسیان هەبوو وەنەیان دەویست لەگەڵ هێزی حکومەتی قاسم ڕووبەڕووبن ، وە هەروەها قاسم‌ش نەی دەویست کە بەتەواوی بەرەنگاری کوردەکان‌بێت ، بەلام لانی عەرەبەکانیشی بەر نەدەدا . ٢٦

ڕابەرە کوردەکانی پ . د . ی بەدرێژائی ٦ مانگی هەوەڵدا ، وەبەشوێنی ئەمەدا نەیان‌دەویست ووشەی "مافی‌گشتی نەتەوایەتی" بەسەرزمان دا بێنن ، بەڵکو ووشەی "ئۆتۆنۆمی )یان دەگوت ! لەمانگی ئاوریلی ١٩٦٢ وە ، حکومەتی عەراق بۆوەدەرکەوت کە کوردەکان تەنیا لەچووار چێوەی عەراق‌دا مافی ڕەوای خۆیان دەوێ . خەبات ئۆرگانی ڕەسمی پ . د . ک ڕای‌گەیاند کە لە چوارچێوەی یاسای حکومەتی عەراق‌دا شوڕشی کورد بەسەرۆ کایەتی مستەفا بارزانی قارەمانی کورد " پیویستە بەجی بێت ، وەدەبی‌ئەوانەشی تێ‌دابێ . ٢٧

١ ـ هەل پەساردنی جاشەکان کەلە لایەن حکومەتی عەراقەوە ، بەکرێ‌گیراون وە بەنەتەوە کەخائنن

٢ ـ وەستاندنی بۆمباردمان لە ناوچەکەدا .

٣ ـ ئازادی ڕامیاری لەناوچەکەدا

٤ ـ لەناوبردنی شەڕ لە کوردستان دا ، وگەڕانەوەی هێمنی‌بۆ وڵات وە دانانی حکومەتی دیموکراسی

٥ ـ کۆبونەوەیەک واتە ئورۆدامەزرێ ، لەئەندامانی ڕامیاری عەراق کە لەبارەی دانانی دانشتگەیەکی سالم ، وە خاوەن پاک کە" دان بەمەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناو خوی کورد دابنێ لە ناو چووارچێورەی کۆمارەکەدا

٦ ـ دان بەسەر داهێنانی زەوی بەش‌کردن ، بەم جورەی کە لە کوردستان

دا دەگونجێ، وەحکومەت دەتوانێ جێ بە جێ‌ی‌بکات، وەقازانجی کرێکارەکان و جوتیارەکانی تێ‌دابێ، بەشی کاروپیشەی سەنعەتی لە کوردستان دا ڕەواجی‌پێ‌بدرێ وەکە لکی لێ وەرگیرێ...

ووشەی (ئوتونومی) کە سەرئەنجام لەبەندی ٥ دا نووسرا وبوو، زۆر بە لاساری ومەترسیوە نێوبردرابوو.

ئینجا ووردە وردە داوا کردنی (ئوتونومی) لە لایەن پ. د. ک نەوە بەتێراشکاوی دەگوترا، حیزب دەیەویست کە دەوڵەتە عەرەبەکان وەک مسرو، "ولاتەعەرەبێکانی‌دی‌مێ‌شکیان لەو ووشەیە پڕ بێ‌و، گوێیان شل‌کەن (، سەبارەت بەمەسەلەکە ڕەزامەندی بدەن. حیزبی دیموکرات هەروەها ڕای‌دەگەیاند کە هەلوێست‌و، مەبەستی کوردان تەنیا[28] لە چووارچێوەی عەراق‌دا داواکردنی مافی ڕەوای‌نەتەوایەتیە، وەبەهیچ چەشنێک مەسەلەی جودای لەگۆڕێ دا نیە. لەسالی ١٩٦٢ و ١٩٦٣٥ دا هەواڵ بەرەکانی چەند ڕۆژنامە، وەک لوّموّند، نیویورک تایمز، ساندی تێلێ‌گراف، کەلەگەل برایم ئەحمەد وەبارزانی چاوپێ کە وتنێ کیان بەجێ هێنا، مەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناوخۆیان بەچاکی ڕوون کردبۆوە.

## ٩ ـ بارزانی‌و، گاڵتەی دەوڵەتەگەورەکان

ناسینی ژێنێراڵ بارزانی لەبەر چاوی نەتەوەکانی جیهان‌دا، لەمەجموع‌دا گوتراوە، مەبەست بە دوومەسەلان بوو، یەکێک سەبارەت بە ڕاپەڕینی ساڵەکانی ١٩٤٣ ـ ١٩٤٥ وەئەوی‌دیش مەسەلەی پێک هاتنی کوّماری کوردستان لەشاری مهاباد بوو، کە بارزانی، پاش ئەوەی کە دوور کەوتەوە وە بۆ شورەوی چوو، بە (ژێنێراڵ‌ی سوور) دەناسرا.

جامەبەست بەوەبوو کە خاوەن ڕۆژنامەکان‌و، گوّڤارەکانی ئەمریکاو ئورووپا دەهاتنە لای، وە هەواڵ بە رەکانیان، ووت‌و، وێژیان لەگەل دەکرد، وەبەنێوی پیاوێکی نیشتمان دۆست دەیان ناساند.[29] بارزانی ٦٠ سال لەتەمەنی ڕابردبوو، لەکاروکردەوەکان‌دا بە "سەرۆکی حکومەت" واتە سەرۆکی بزوتنەوەی کورد دەناسرا، پیاوێک بوو کە قەت دووجار لەجێی‌و، بانێک دا نەدەنوست، زووزوو جێگای خۆیی دە گۆڕی، لەلایەن مرۆڤەکانی نێزیکی خۆی بەرگری‌و، پارێزگاری لێدەکرا،

ەزۆر بەگرنگی تیدەکوشان کەلەهەمووپیلانو، بەلایەک بی‌پارێزن.

لەبارەی رابردووی‌خۆیی دا لە پەردە داقسەی دەکرد، دەی‌گێڕاوە کە "بابو،باپیریو، کەسەکانی، بە درێژائی ١٢٠٠سال سەرۆک عەشیرەبوون"[٣٠]!
بەڵام لەبارەی مانەوەی خۆیی لەوڵاتی شورەوی‌دا وەهەروەها، هاتو، چۆلەگەڵ خەلکی سوویەت بێ‌دەنگ دەبوو، وەچی‌نەدەگوت.

بەزمانی کوردی، عەرەبی، فارسی‌و... ڕووسی جووان قسەی دەکرد، بەلام بە زمانەکانی ئینگلیسی‌و، فەرانسە زۆر شارەزانەبوو، وەرگێڕ دەبوو، ووتارەکانی وەرگێڕێیەوەو، لەسەری بڕووا.[٣١]

قەدو بالای نێونجی بوو، جلکی کوردی لەبەردەکرد، لەچاوی ڕا دیار بوو، کە مرۆڤێکی زاناو، ژیرو، ووشیارە، وەچاوە وریاکانی لەژێر بڕۆی پڕلەموو، دەدرەوشاو،گەشەی‌دەهات‌وپیاوی بو لای خویی دەکێشا.

لەشێکی ساغی هەبوو، بەلام نەختێک قەلەو، بەخۆوەبوو، قەت لە کاروئیش ماندو نەدەبوو، وەڕانەدەوەستا، وەلەبەرانبەر ڕووداوەکانی‌ژیان‌دا وەک پۆلا لەمپەری دەگرت، وەقودڕەتو، دەسەڵاتی دەنووان‌د.

هەواڵ بەرەکانو، ڕۆژنامە نووسەکان، لەکاتی دەس‌پێ‌کردنی شەڕی ١٩٦٢ ــ ١٩٦٣دا بۆ ناوچەی کوردستان، سەرەوژێردەبوون، وە هێندێ جار ماوەی دەڕۆژی دەخایاند کە لەلای بارزانی دەمانەوە، وەشتی‌وایان چاوپێ دەکەوت کە سەریان سووڕدەما.

ئینجا هەوال بەرەکان بەشێنەیو، حەوسەلە پرسو، جۆیان لێدەکردو، ووشەی وردو، ناسکیان لێ‌پرسیاردەکرد،وە جاری واچەندسەعاتێکی‌دەخایاندو ووشەیەکی نەدەگوت بەلام لەسەرئەوەشڕا کە وەڵامی دەدانەوە، دارێکی تیژی چکولەی (داوی داری‌کەوی بەدەستەوە بوو، دەستی بەقسە کردن دەکردو، لەسەری دەرویشت، وەمەتڵەبێکی زوری نەدە دادەستی ڕۆژنامە نووسەکان بارزانی پترقسەی لەوەرگرتنی چەکو، ئەسلەحە دەکرد، واتە بە ڕۆژنامە نووسەکانی دەگوت کەدەولەتانی‌گەورە پێویستە بەخەڵکی کورد یارمەتی‌چەکی‌قورس بکەن، وە هەروەها لەگەل ڕۆژنامە نووسەکانو، هەوال بەرەکانی ئینگلیسو، ئەمریکا کە دەدوا،وەوتو، وێژی، دەکرد، یارمەتی لە حکومەتەکانی دەویست.

جاروبار قسەکانی دەگۆڕیو، لەبارەی شتێکی دیکە داباسی دەهێنا

گۆڕێ، پاشیەک دوسەعاتان ،دیسان لەسەرڕا بۆ قسەکانی پێشوو دەگەڕاوە.
واوەدەردە کەوت کە قسەی زۆرپێیە، بەلام لە گوتن خۆی دەپاراست، تەنانەت: لەبارەی‌هات‌و، چۆلەگەل سوویەت زۆر بەترسەوە دەدوا، واتەترسی دیپلوماسی هەبوو! سەرئەنجام ڕۆژنامە نووسەکان کە ماوەیەکی زۆر لەلای مەلامستەفا دەمانەوە، بۆیان ڕوون دەبۆوە، کەلەبابەت هەڵوێستەکانی، وەک ئابوری، نەتەوایەتی، ناتووانێ زوز بەباشی لەسەری بڕوا، وەمەترسی لەوەهەیە کە بە لکووەلامەکانێکی کە دەی داتەوە دروست نەبێ"!
وەجارجاریش لە بەر خۆیە قسەی دەکرد!
لەئاخری سالی ١٩٦٢ دا لەبارەی مەسەلەی "ئۆتۆنۆمی کورد" دووا، وەبەتایبەت قامکی لەسەر قازانجی، داهاتوی،نەفت داناوە گوتی پێویستە لەسێ بەشان بەشێک بە کورد بدرێ، وە حکومەت دەبێ دان بەسەر مەسەلەی کورد دا بنێ، وەهەروەها پۆلیس لەخۆیی‌بێ، مالیاتی مەلەبەندە کە لەنێو خۆ ی دا وەرگیرێ و خەرج بکرێ، منداڵانی کورد بە زمانی زکماکی بخوێین، وەهێزی بەرگری لەناوچەکەدا لەمرۆقە کوردەکان بێت.
وەبارزانی گوتی تەنیا حکومەتی عەراق دەبێ کاروباری دەرەوە چاوە دێری بکات، وەئەگەربێتو هێزی نیزامی بۆ مەلەبەندی کوردستان بنێرێ، پیویستە ریگالە ئێمە وەرگرێ. ٣٢
کاتێک کە لێیان پرسیار دەکرد کە، چ فرقێک لەبەینی مافی‌نەتەوایەتی گشتی‌وە ئوتونومی واتە مافی نەتەوایەتی ناوخۆ هەیە، مات‌و، بێ‌دەنگ دەماوەو، چی‌نەدەگوت! کەرەتیک کەلەبارەی حەل کردنی مەسەلەی کورد لێ‌یان‌پرسی کە بەغدا دەلێ‌چی‌و، چاوەڕووان‌ی چۆنە؟ بەناهومێدی وەلامی داوە وە هەرەشەی کرد کە ئەگەر حکومەتی بەغدا قسەی‌مە نەسەلمێنێ، ئێمە هەول‌دەین کە لەبەینی کوردەکانی عەراق‌و، ئێران یەکەتی پێک‌بێت!
لەوبارەدا بە هەوال بەرێکی دەرەوەی گوت بوو، کە ئێمە وەلاممان بۆ کوردەکانی ئێران ناردووە کە یارمەتی و کۆمەگی خۆیان ڕابگەینن، بەلام هێستا خەبەرەکەمان بۆنەهاتۆتەوە جارو بار وەلامی بۆ وەزیری دەرەوەی فرانسە،وە بۆ ئیدارەی دەرەوەی ئینگلیس دەنارد، وەڕاو، تەدبیری لەوان دەویست‌و، لەبابەت ڕاپەرینەکە دەیەویست بزانێ چۆن دەڕوانن.

ئەوەی کە شایانی باسە بارزانی زۆرجار بەهەناسەساردیەوە کە لە ناخی دڵە وەهەناسەی هەڵ دەکێشاو، بەرۆژنامە نووسەکان‌و، هەوال دەرەکانی دەگوت کەبەداخەوە "کورد دوستێکی باشی‌نیە". بەراستی بۆخەلکی کورد لایەن گریک وە یا پشتی‌وانێ وەیان "دوستێکی" چاکی نەبووە کە یارمەتی بکات. وەگێرایەوە کە تەنیاهەمزاغای مەنگوربووکە بەچەشنێکی‌باش‌لەشێخ عوبەی دیل‌لای پشتی‌وانی کرد،دەستی‌لێ‌بەرنەدا هەروەها بارزانی‌ش لەخەلکی کوردی ئێران ئەوچاوەدێری هەبوو.

عەزیز عەقراوی کە سەرهەنگ دووەمێکی کوردبوو، گوت‌بووی:کە "ژینیرال بارزانی، ڕابەرێکی گەورەی کوردە بەلام لە کاروباری ڕامیاری دا زۆرسەری دەرناچێ!" ٣٥

بەلام ئەو قەزاوەتە زۆر دروست‌نیە، واتە لەسەتحی خووارەوەیە ڕۆژنامە نووسێکی ڕۆژئاوائی (غەربی) دەگێرێتەوە کەمن ڕەوانشناسێکم، وەبەو جۆرە چاوم بەبارزانی‌کەوت کەبەڕاستی پیاوێکی بەگرێ‌وگۆڵو، مەرموزە و سەرلێ سووڕماو، تاساوەیە، وە مەبەستی لە درەنگ وەلام دانەوەی هەوال‌بەرەکان ئەوەیە کە زۆرشتان نازانێ کەوەلام بداتەوە، وەلەخۆ‌ی خاترجەم نیەوەترسی لەویە کە هەودای ڕەشو، سپی، وەدیاربکەوی. ٣٦

ئینجا تەنیا شتێکی کە لەبەرچاوی بارزانی‌بوو و دیاربو: دیپلوماسی گەورەبوو. لەسالی ١٩٤٥وەکەلە ڕاپەرینەکە دابوو، هیوای بە ئینگلیسێکان بوو، جاوردە وردە کێشرا بولای شۆڕەوێکان، لەکاتی حکومەتی کۆماری قازی مەحەممەد لەمهاباد دا چاوی بەوە کەوت بوو، وە خورد ببۆوە کە چۆن دەولەتی شورەوی پشتی لەقازی‌بەردا وسەرئەنجام چۆن حکومەتی ئەمریکا بەسەر تەواوی ڕۆژهەلاتی ناوەراست‌دا، زاڵ و حاکم‌بووە.

وەهەروەها لەسەر ئەوگومان‌و، تەدبیرەبوو کە ڕۆژێک پێویستە قاسم برووخێ وەعەراق ببێتە قەلایەکی‌گەورە لەڕۆژهەلاتی ناوەڕاست‌دا بۆغەرب کەئەمریکا پشتیوانی لێ‌بکات وە،یەکێ بێ‌لەپەیوەندیکای هەرگرینگی ئەمریکا. بارزانی پیاوێکی سادەبوو، جارجار هەرەشەی دەکرد، کەرەت کەرەت دەیەویست لەریگای فرۆفێلەوە بدوێ.

دەی‌گوت کە "ئەگەر ئەمریکا تەنیا قازانجی خو،ی لەوەدا دەبینێ کە

یارمەتی ئیران‌و، تورکیە بدات‌وەئێمەوە لابنێت، جائێمە چارەمان نیە کەیارمەتی لە کومونیستەکان وەربگرین... پەس کەوابوو، ئەوە مەترسێکە کە بوگەلی کورد لەبەرچاوە"

هەربەو جوّرە لەووتارەکەی خوی داگوتی‌و، درێژەی پێدا کە! "تەمەشا کـە وازی‌ستراتیژیکی سنووری ئێمە چونە،

"لەوەختی پێویست دا ئێوە نیازو، بەئێمە دەبێ. پەس کە وابوو ئێمە دەتوانین سەبارەت بە هێزی گەورەی خومان نەخشێکی ئەوتو کایە بکەین کەوینەی‌نەبێ، واتە دەتوانین هێزەکەمان بەچەشنی ڕازاوەو،بنەخشێن،وەیان بەچەشنـــــی گریلائی،لەشەڕدا بەکار بێنین، دەڕووانن کە هێزی‌مە لەبالی سەرەوە لەسنووری قەفقازی شورەوی‌ڕا وەلە ڕوژهەلاتی ناوەڕاست‌دا بە جووانی هەل سووڕێ وە باشترین هێز لە روژهەلاتی ـ ناوەڕاست دابێ... ئێمە دەتووانین وەک پارتی کومونیست کە بو قازانجی شورەوی کاردەکات، بو ئەمکریکا کەلکو قازانجمان هەبێ."

ئەومەبەست‌و، ووتارانە کە ماوەی دەسالان چاپلوسانە دەگوترا، نەک‌بو وەی‌بوو کە خوی بولای ئەمریکا بکێشێ، بەلکوپتر لەبەروەی بوو کە خوی‌وکوردەکان لە داوێنی سیا باوێ. کەبەڕاستی بەدبەختی‌و، ڕوژێکی ڕەشی گـــــــەورەی بەدوواوەبوو.

لەئاکام‌دا بارزانی هێستا لەگەل شورەوی نێوانی‌و، هات‌و، چـــوی هەرمابوو، لەهاوینی ١٩٦٢ دا، لە هەوالێک‌دا کە هەوال بەرێک‌ڕای‌گەیاندبوو، دەری‌بڕی‌بوو کەبارزانی، لەڕێگای پارتی کومونیستی عەراق پ.ک.ع وەحیزبی تودەوە لەگەل شورەوی‌هاموشوی هەرهەبوو.

وە هەروەها ڕا گەیاندرابوو کە ئەگەر بزوتنەوەکەی بکێشیتە و لاتی تورک‌و، ئێران دەتووانێ کانگای ناوەندی "ستادی مەرکەزی، لەکن سنووری شورەوی دامەزرێنێ، ئینجا دەولەتی شورەوی هەموو چەشنە یارمەتێک ـ وەک ئەسلەحە، سازوبەرگی شەڕێ، وەپوول دریغی ناکا، ... واتە هەرشتێکی پێویستی‌بێ دەی داتێ." ٣٨

ئەگەر بارزانی بەو ووتارەی وەلامی نەداوەتەوە سەبارەت بەوە بوو. لەوکات‌و، سەردەمەدا شورەوی گەورەترین دەولەتێک‌بوو کە سازو بەرگی نیزامی

بۆ قاسم دەنارد ،
وەپێویست بوو کە یارمەتیێکی خاترجەمی هەبێ ، وەپاش ڕووخانیقاسم لەباری ژامیاریو ، ئەسلەحەو سازوبەرگەوە بەهیوای شورەوێکان بێت .

**١٠ ـ شەڕدەستی پێدەکرێتەوە**

لەمانگی فیوریەی سالی ١٩٦٢ دابارزانی ، لەپەنای کێوەکان نزیکبەزاخۆ وەدەردەکەوی ، وەهێرش دەباتە سەر پۆستەکانی پۆلیسو ، هێزی عەراق . وەچەکیان دەکات بەم جۆرە کەلک لەهێرشەکانی خۆیدەبا ،وە شوێنی تێلێفۆنی هێزەکانی عەراق دەبڕێ ، وەدەست دەکا بە شەڕی چریکی ، وەلەناوچەی گەلیسپی وەگەلی زاوێتا پیرۆزی بەدەست دێنێ ، وەلە ئاخری مانگی مارسی ١٩٦٢ دەگاتە کێوەکانی ئاکرا .
٣٩ ئینجا هەر لەم کاتەدا ، تاقمێک لەلایەن ژێنێرال قاسم ،کـــە سەرۆکیان ژێنیرال عەبدود،بوو ، دێتەلای مەلامستەفا . داخووازی بارزانی لە حکومەت زۆر قورسنیە ، وەسەنگو ، سووک کراوە . واتە داوادەکا ، کە کوردەکان لەبەندیخانە بەردرێن ، حکومەت بەتەڕدەستی مەدرەسەکان بکاتەوە ، کشتوکاڵ پەرەپێبدرێ سەنعەت لە کوردستاندا ڕەواجی هەبێ ، زمانی کوردی لە ناوچەی کوردستان دا ڕەسمیبێ . بەلام ووتو ،ویژ هەروەها درێژەی هەبوو ، وەشەڕیش پاشڕاوەستانێکی کەم ، لەسەر رادەستی پێدەکرێتەوە . ٤٠
لەئاخری مانگی مەی ١٩٦٢ دا ناوچەی بادینان لەهێزی عەراقوە جاشەکان پاک دەکاتەوە ،وەیەکێک لە سەرۆکەکان بەناوی ئەسەد خۆشەوی کە لە شورەویڕا لەگەلی گەڕاوەتەوە بەفەرماندە دادەنێ . مەبەستی ئەم پیشڕەویە ئەمەبوو ، کە بارزانی خۆی بگەێنێتە ، چۆمی زابیگەورە ، پۆستی حاجی عومەران وەپۆستیڕایەتێ پــاش ٣٣ ڕۆژ گەمارۆ دان دەگرێ ، وەڕێگای هامیلتون کە سەربە شاری رەوان دزێیەوە لەسنوری ئێرانەوەیە دەگرێ ، وەئەوشەڕە نەخشێکی گەورە لەدرێژائی بزوتنەوەی کورد دا کایەدەکات ، جا مەبەست بەوەبوو کە هێزی عەراق بەو زووانەئیدینەیتووانی ،تێکشکانی کوردەکان بە ڕێوەبەرێ وەتاسالی

١٩٧٥ ، بەسەرئەو ناوچەیە دا زال‌بێتەوە.

بەوجورە بارزانی لە سنووری تورکیەوە تا مەلەبەندی زاخۆ،وەلەوی را تا سنووری ئێران ئەو بەشەی بەدەستەوەبوو،ئینجا بەرەبەرە دەچۆ پێشێو، پیتری دەگرت.

بەلام هاوکات لەگەل ئەو پیرۆزو، پێش‌کەوتنەی، دووژمنەکانی بارزانی وەک زێباریکان کە لەزەمانی شیخ ئەحمەدەوە لاساریو، دووژمنایەتیان دەکرد، وە هەروەها پێش مەرگەکانی شێخ رەشیدی لولان، وەمەحمود خەلیفە کە لە برادوست دابوون، چێوتی و نالەبارییان بۆدێناپێشی.

لەسالی ١٩٦٢ داهێزی عەراق تەنیا بریتی بوو لە ٤ لەشکر. مەسەلەی کوویەت کە بوعەراق هاتبۆ پێشی، لەشکرونیوێک لە هیزەکان لەسنووری جنوبدا ڕاگیرابوو بەشی کە می لە شمال‌دا مابۆوە وەلەجنوبی کوردستانیش داواتە نیزیکی شاری سولەیمانی‌لەبەرەی چووارتادابەشێک‌مابووە ——— . .هێزیعەراق بەراستی لە چووار بەشان‌بەشێک ( — ) وەبەلکو ($\frac{1}{3}$)ی کورد بوو کەئەوانیش دەیانەویست تیکەل‌بە شۆڕشی مەلامستەفابن، نەیان‌دەویست کەشەڕبۆ حکومەتی عەراق بکەن. لەودەم‌ودەستەدا یەکێک لەسەروکەکانی کورد بەنیـــوی عەبدول‌وەهاب ئوتڕوشی کە لەسالی ١٩٣٨دا لەناوچەی ئوتڕووش‌دا لە دایک ببوو، کەئەو جیێ‌یە یەکێک لەگوندەکانی شاری دەهۆکە، هەل‌دێتە، نێو هێزی کورد، ئەو پیاوە یەکێک لە ئەفسەرە کۆنەکانی حکومەتی عەراق لەسالی ١٩٦٥ — ١٩٦٦ بووە کە بەنهێنی، سەرۆک دەفتەری هێزی بەرگری کوردوە هەروەها فەرماندەی نیزامی بەشی سولەیمانی بووە. ٤٢

هێزی عەراق بەینابەین بە فڕۆکەو هێزی زەویی داهێرش دەباتـــە سەرکوردەکان، بەلام چی‌بۆناکری تەنانەت ئەوهەوالەش لەلایەن روژنامەی ساندی تایمزدا لە ئاخری سال ١٩٦٢ دا لە هەوال‌بەرەکەی‌کە هاتۆتەکوردستان تێلی‌گرام کراوە.

هیزی عەراق توانی کیوەکانی بگریتەوەو بەبی بەرەنگاری بچێتەپێشێ وەهەروەها بەگرنگی ناوچەی کوردەکان بۆمباران بکات.

عەزیر عەقراوی لە دەروازەکانی هەولێر وعەزیز عەسکری وە جەلال‌تالەبانی لە دەوروبەری کە رکوک خەریکی شەڕ بوون. تەسیساتی‌نەفتی زۆرلە پێشمەرگەکانی

کورد دوورنەبوو وەئاگاداری باشی لیّ نەدەکرا شاری کەرکوکو، هەولیـــر، سولەیمانیّ وە کۆی سەنجاق شەوانە لەژێرچاوەدێری پێش‌مەرگەکان‌دابوو.

**١١ ـ سقوتی‌قاسم :**

لەکردەوەدا ئاکـاری شەڕ دژی "کوردە شۆڕشگێڕەکان" لەلەلایەن پۆلیس عەراقی‌وە بەسوک‌وهاسانی‌بەڕێوە دەبردرا، بەلام وادیاربوو کەئەوشەڕە بەوزووانە تەواونابیّ بەبی ئەوەی کە قازانجێک بە کوردەکان بگات.

دەگونجیّ بلێن کە لە سەدا ٤٠ی بودجەی عەراقیّ خەرجی هێزی نیزامی ئەبوو وە قاسمی دیکتاتۆرش هەروەها لەبیری شەڕیٚ دابوو.

وادیاربو لەگشت دا تەواوی بیروڕای خەلک دژی قاسم‌بوو! هێزی‌نیزامی پیێ‌وابوو کە قاسم کەرەسەوئەسبابی شەڕی‌بەدەستەوەنادا کەدژی کوردەکان بەکاربگیرێ. وە هەروەها نەتەوەپەرستەکانی عەرەب وەناسرێکان وەیان‌بەعسیکان کارێک‌ناکەن.لەونیێوە داوەلەو ئاخریانە دا تاقمێکی "ئەفسەرانی ئازاد" کـــە هاووشویان لەگەل لیدەرە کوردە شۆڕشگێڕەکان دەبێت. هات‌وچۆوپەیوەندی لەبەینی‌بەعسییکان‌و کوردەکان شتێکی تەبیعی نەبوو... وەسەرئەنجام‌دیترا کە هەرگزوهەرگز "پەیمانێک" وەیا "نووسراوەکی‌پەیوەندی" لەبەینی ئەودووانەدا نەگونجا.

بەلام لە ١٩٦٢دا تاهریحیا، سەرۆکی‌ستادی داهاتووی حکومەتی حەسەن‌ئەل بەکر لە (فیورییەی ١٩٦٢ ـ نوامبری ١٩٦٣)چاوپێکەوتنێکی لەگەل ئەفسەریکی جەحێلّی کورد کە رابطی بەینی حیزب دیموکرات بوو وە نێوی کەریم قەرەنی بوو کرد[٤٣]. بەپێچە وانەی عەرە بەناسیونالیستەکان لە ٢٨ی ئاوریلی ١٩٦٢ دا برایم ئەحمەد ئەوەی سەلماند کە پێویستە دژی‌قاسم لەگەل دووژمنانی‌ئەو هاوڕێبی. بەلام لەسەرئەوەش ڕا کەکوردستانی‌لە مەترسێکی گەورەدادەدیت لە نامێلکە یەکی دوورو، درێژدا، بەتێگرائی مەسەلەی کوردەکانی ڕاگەیاندبوو، وەمەسەلەی مافی ڕەوای نەتەوایەتی کوردی،وەبیر هێنانەوە، وەهەروەها ئەوەشی‌گوت‌بوو. کە کوردەکان وازیان بەجیاوازبوون لەدەولەتی عەراق‌دانیە. جابەوجورە حکومەتێکی کە لەداهاتوو دادەیەوێ‌بێتە سەرکار،

پیۆیسیەدان بەسەر ئۆتۆنۆمی کوردستان‌دا بەگرنگی دابنێ ،وە هەروەها لەنیۆ ئەندامانی شۆڕشی عەراق وەلەحکومەت‌دا بنووسرێ‌و ،باس‌بکرێ[٤٤]،وە بۆ پاراستن لەدڕدۆنگی‌و، دووقسەئی، پیۆیستە تەواوی مەسەلەکانی داهاتو، وەهەروەها مەسەلەی خودموختاری لەناوچەی کوردستان‌دا بەڕەسمی‌بناسرێ وەئەوهەلوێستە دەبێ لە بڕوارنامەیەک‌دا لەشۆڕشی داهاتوو دا نیۆببردرێ .

برایم ئەحمەد هەروەها داوای‌لە ئەفسەرانی‌ئازاد کرد ،دەبی لەکردەوەدا ؛ بگونجێندرێ کە مەلامستەفا وەک سەروک وەزیرێک لە حکومەتی کوردستان‌دا دابندرێ. [٤٥]

بەلام واڕوون بوۆە کە کوردەکان لەکردەوەدا لەوپێشنیارانە کەڵکیان وەرنەگرت ،بەلکو هەر سەرزارەکی‌بوو، کەئەویش لەمانگی ئوتی ١٩٦٢دا لەلایەن فواد عارفەوە کەلەحکومەتی قاسم، تۆریا بوو وەجوێ ببوۆە، وەلە دەولەتی حەسن ئەل بەکردا پۆستی هەبوو، سەرزارەکی‌باسی‌لیکرا؟ لەڕۆژی جومعەی ٨ی مانگی فیورییەی سالی ١٩٦٣ لە کاتی سەعاتی ٨/٥ بەری‌بەیانی رادیو بەغـــدا لەدووتاری خوی‌دا،پاش‌ماوەیە کڕاوەستان گوتی: "دیکتاتوری‌خائن بەنەتەوەکە،

وەک مشکێک ئەوە لەژێر خانووی بەسەردا ڕووخاوی، خراپ کراوی وەزارەتی بەرگری دالەنیۆ چوو" بەڵام قاسم هێستا کە نەکوژرابوو، هەرئەوێ‌ڕۆژێ جومعەی لـــە بەغدایەدا خۆ ی بەخەلکی نشان‌دا، وەگوتی درۆیەمن‌ماوم‌و ،نەکوژراوم ئینجا لە ئێوارەی جومعە وەزارەتی بەرگری لەلایەن زرێپۆشەکانی پادگانـــی رەشیدیەوەگەمارۆ دەدرێ وەقاسم لەڕۆژی شەممودا سەعاتی ٦ بەریبەیانی‌کاتێک‌کە هەڕەشەی دەکردتەسلیم‌بوو. لەوێرا بەنیوەگیان دەی‌هێننە، سەرئیزگەی رادیو، لە لایەن سەرهەنگ عەبدوسەلام عارف کەلە شۆڕشی ١٤ ژوییەی سالی ١٩٦١ دابەشدار ببوو، "پرس وجوێ" لیۆدەکرێ، وەپێی دەلێ خـائن بەنەتەوەکەی، وەتۆ سەرۆکی ڕاستەقینەی ژوئیەی سالی ١٩٥٨ نەبووە"[٤٦].

لەئاکام‌دا قاسم لەسەعاتی ١٠/٣٠ لەبەرانبەر دووربینی تلویزیون ڕەشاشێکی گوللە لیۆدەدەن‌و ،دەی‌کوژن.

## ١٢ ـ راو کردنی کۆمونیستەکان

لەنێو چوونی قاسم بووبە هۆی ئەوەکە کۆمونیستەکان لەچیوتیو، نالەباری بکەون، وەراویان بکەن. (هێزی نەتەوایەتی بەعس) واتە قۆڵ سەوزەکان بەدووی کومونیستەکان دا بوون، یانی راویان دەکردن، یان دەیان کوشتن، وەیان لەسەر بازخانەکان لەبەندی خانەدەکران لەکۆد تاو، شورشی بەعسیکان دا پتر لە ١٠٠٠ کەس[47] لەبەغدایە دا کووژران، بەشوێنی ئەوکووشتو، کوشتارە دا بوو کە راوی کومونیستەکان لەلایەن بەعسیکانە وە دەستی پیکرا، تەنانەت بەتانکو، زری پوشان لەکوچەو، شەقامەکان دا لییان دەگەران، لەوەزارەتی نەفتدا تەنیا دووخاوەن کارمابوونەوە دە لەمودیری گشتیوەتادەرکەوان گیرابوون[48]. کون بەکون لەمالان دالییان دەگەران، خانوویان ئاورتێبەردەدان. و.یان دەگیران

ژمارەی کوژراوەکان بەچاکی دیاری نەکرا ، لەوبەنیەش دا هێندێ لەشەر کە رەکانی کوردیش بەبیانووی ئەوەی کە کومونیستن گیرانو، لەزیندانکران.

## ١٣ ـ دژی کردوەی کوردەکان

لە ٨ی فیورییەی ١٩٦٣ دا ژێنێرال بارزانی لەلای ناوچەی کوردستاندا بەیەک لائی تەققەی راوەستاند. وەچاوە نوری و ئاگاداری حوکمی ئۆتۆنۆمی کوردستانی دەکرد.

بەلام حکومەت یەک بە دووای یەکیدا هەواڵ و بریارنامەکانی بەگوتنی "ووشەی گەورە" رادە گەیاندو، دەی خوێندەوە، وەشتێکی لەبابەتمافی رەوای نەتەوایەتی "ئوتونومی" تێدانە بوو.

هاورێیەکانی بارزانی زۆرقینیان لەوە هەستا بوو، وەخۆیان پێرانەدەگیرا دەیانگوت: "وادیارە ئەو کەرەتەش دەیانەوێ هەڵمان سوورێنن!"

## فەسلی ٧

### هەولین نەفەس کیشان (فیوریبە ــ ژوئن ١٩٦٣

ئەوا دەگونجێ کەبڵێین گەورەترین ڕازونە گوتراوێکی کەلەهەلوێستیک دا ئامادە کرابوو زۆربەو، کودتای ٨ فیوریبیەی ١٩٦٣ بوو کە نەخشی متقابلی شارستانێکان و نیزامێکان بوو، وەبەڕاستی سەنعەت گەرانێکی ماهروژیر بوون کە لەو کودەتایەدا بەتوندیو، تیژی دەبزوتنەوە، کە ئەویش بەعسێکان بوون! گەنجەکانی بێتەجروبە کە لە نێو گەل دا نەناسرابوون، لە لایەن میشێل ئەفلەقەوە تەربیەت دەکران، وەلەگەل هێزی نیزامی دەکەوتن.

بەچەشنی ژێنێرال نەجیب لەکاتی خۆیی دا کەلەولاتیمسرڕەچاوی هێنا ئەویش وای کرد."

ئینجا ئەوەلە لەنهێنیدا بۆشەڕ ئامادە کرابوون کە بە قودرەتەوە، وڵات بەدەستەوە بگرن، بەلام نەیان دەزانی کەئەگەر قودرەت بەچنگبگرن چۆنبزونەوە وەزۆرخراپحالی کرابوون.

هێندێ سەرۆکەکانیانکە هێستا لەبەنددابوون، بەوەیان بیرو، باوەڕ هەبوو کەعەبدوسەلام عارف دەبێقارەمانیئەوکارەبێ، وەئەوکەڕەتەشبەچەشنی ١٤ژوییەی ١٩٥٨ ڕاپەرێو، شۆڕشبکات وەلەقودرەتدابمێنێتەوە! ڕاز ونهێنی یەک حار زۆر بوو، وەختێکی ئیزگەی رادیو بەغدا ئاگاداری بەوەدا کە کودتا کراوە "کۆمەڵی نەتەوایەتی سەرۆکە شوڕشگێرەکان بەسەروێەکاتی سەرهەنگ عارف داندراوە" بەبێ ئەوەی کە نێوی ئەندامەکانی دیکەی تاقمەکەبەرێ، وە هەروەها بەبێ ئەوەی کەقسەیەک لەبارەی مەسەلەی کوردستاندا بەخەڵکی ڕابگەیندرێ، چ دیکەی

نەگوت .

ئینجا پێش مەرگەکانی بارزانی دەیانەویست کە هێرشی خۆیان بەزوویکی زوو لەو دەمو، دەستەدابەرنە سەرشارەکانی گەوری کوردستان وەک کەرکوک، سولەیمانێ، وەگەمارۆی بدەن‌و، دەستی خۆیان وەپێش‌خەن. بەلام بارزانی ئەوکاتە ناسکەی لەبەرچاوبوو، هیوا داربوو ئەو کەرەتەش بتوانێ ڕێگای گوفت‌و گوێ بێڵێتەوە، پێی لەوەچاکتربوو کە لەو هەلە تازەدا دەس بەشەڕبکات . ٣

بەشوێنی ئەوە دا پاش حەوتوێک، حکومەتی تازە پێ‌گەیشتووی عەراق دووەزیری کورد، بەناوانی "فواد عارف، وەباباعەلی" کە لەزەمانی قاسم‌ش داهەبوون، ڕاگەیاندڕان، تاکولەڕێگای هێمنی و ئەهوەنی وەپرسیاری گشتـــی مەسەلەی کورد تەواو بکەن .

**١ ــ هەوەڵین تیک پەڕین ــ بەرەنگاری**

جەلال تالەبانی لە ١٩ی فیوریبیەی ١٩٦٣ لەگەل سالح‌یوسفی بۆبەغدایە ناردرا.لەچاوپێ کە وتنی هەولێیان دا زۆر بەفرۆفێل لەگەلیان بزوتنە وە واتە: ژێنیرال تاهریحیا کە سەرۆکی ستادبوو لە پۆستی تازەدا لەگەل کوردەکان خەریکی گفت‌وگۆ بوو. ئەو تاهریحیایە لە بەهاری سالی ١٩٦٢ ش‌دا لەبارەی "ئەفسەرانی ئازادی خواز" وەشۆڕشی کوردەوە لەلایەن دەولەتی عەراق لەگەل کوردەکان ووت‌و،ویژی کر دبوو.

ئینجا تاهریحیا لە گفت‌و، گوێ دووائی دا ئاوای دەس‌پێ کردو گوتی‌کە لەو هەل‌و، مەرجەدا مەسەلەی نەتەوایەتی، پێش‌ترلەمەسەلەی کوردستانە،وە لەلای‌وابوو، کە "خودموختاری کوردەکان" زەرەرو،زیانی بۆنەتەوە عەرەبەکان هەیە. ٤

لەکاتیک‌دا کە لە دوولایانەوە کایەی دەکرد، هەروەها لەوبارەیەدا ڕابەری بەعسێکان لەبەغدایەدا ڕای‌گەیاند کە بەهیچ جۆرێک ناگونجێ کەلەوکاتە دا مەسەلەی کورد باسی‌لێ‌بکرێ، پێویستە کەمێک وەدووایە بکەوێ، تاکوحکومەت پەرەبگرێ وە لەگەل دەولەتەکانی دیکەی عەرەب یەکێتی بکات، جائەوکەرەت مەسەلەی شمال بێ‌نێتە پێشێ، وەپیشنیاری بەجەلال تالەبانی کرد کە لەگەل

تاقمەکەی ڕەسمی کورد بۆوت‌و، ویژبچیتە قاهرە بۆلای ناسر. هەروەها گوتی کە ئەوەی کە بەچاکی ئاشکرایە، ئەوەیە کەناسرش ڕای لەسەر ئەو هەلوێستەیە کە گەلی عەرەب یەکتربگرن، وە هەروەها دژی جۆیبونەوەی خەلکی کوردشە.

**٢ ــ سەرۆک کۆمار ناسرو، مەسەلەی کورد :**

لەنەکاو لەوەختێکی تایبەتی‌دا، ئەندامانی کۆمەڵی عەرەبەکـــان ــ عەلی‌سالح ئەسسەعدی، نایب سەروک وەزیر وەوەزیری ناوخۆی، تالب‌شەبیب وەزیری دەرەوەی عەراق، وەژی‌نیرال عەمماش وەزیری بەرگری٥ وەسەرۆک ناسر، تێگرا ڕایان‌گەیاندکە: کە! هیچ مرۆڤێک حاشای ئەوەناکات کەخەلکی کورد هەستی‌نیە، وە سەرئەنجام پێویستە بەمافی خۆیان کە ئوتونومی یەبگەن. ٦

بەلام نەتەوەی عەرەب "دووژمنێکی گەورەی هەیە کە ئەویـــــش ئی‌سرائیل ە " : سەرۆک ناسر هەروەها ڕای‌گەیاند کە ئیمە لەو وەختەدا نامانەوێ شەڕی ناوخۆ هەلایی سێندرێ. . . کوردەکان دەبێ لەچووار چیوەی عەراق د ا مافی ڕەوای خۆیان بدرێتێ. نازانم بۆچی‌ئیوە لەووشەی "ئۆتۆنۆمـــــی" دەترسێن؟" ٧

لەڕاستەقینەدا واڵاشکرا بوو، کە ئەوقسانەی کە ناسر لەبـــــارەی چارەسەرکردنی کوردەکانی عەراق کردبووی، دۆستانەبوو، ئەمما ڕەسمی نەبوو. ئەوەی کە کوردەکان بۆیان وەدەرکەوت بوو، ناسرحەزی‌دەکرد کە لەگەل کوردان دۆستا یەتی‌بکات، وەلەحەقیقەت‌دا کاربە دووژمنایەتی نەگا. ئینجا ناسر لە قسەکانی‌دا گوتی کە ئەگەر یەکێتی لەگەل حکومەتی عەراق،وە هەربەوجورە لەگەل حکومەتی سوریە پێک‌بێت، پێویسیە چارەی مەسەلەی کوردش بکرێ، بەلام ئەگەر بێتوو تەنیا عەراق دەس‌بەو کارەبدات،یانی (ئوتونومی) بەکوردان‌بدا، وازوئابرووی‌خویی لەنێونەتەوە عەرەبەکان لەمەترسیداوێ.

بەلام هەر چونێک بوبێ، ناسرنەیەویست کە کوڕێکی مسری بنێرێتەنێو کوردستانی عەراق مەبەست بەوەی کە بۆخوێی لەودەم‌و، دەستە دا زۆرپیس لە نێو قوڕو، زەلەق‌و،گێژاوی یەمەن‌دا مابۆوە، ئەوە بۆوی مەسەلەیکی گرنگ، بوو. ٨

له‌وڵاتی ئه‌ل جه‌زیره سه‌رۆک بن‌بلا ، له‌نه‌کاو ڕای‌گه‌یاند که"من به‌رله وه‌ی که عه‌ره‌بێک‌بم له‌کاتی‌حازردا ، ئی‌حساس ده‌که‌م ، ئینسانێکم ، من‌به‌باشی ئاگام له‌مه‌سه‌له‌که‌ی هه‌یه .!. ئێمه‌ش بۆخومان له‌نێو لاته‌که‌مان ئاڵۆزیمان زۆره" وه له به‌رانبه‌ر شوڕشی کورد دامه‌سه‌له‌ی به‌ره‌ی ئازادی به‌خشی‌نه‌ته‌وه‌ئی له‌گۆڕی دایه خه باتی ئه و دووانه وه‌ک یه‌ک به‌ره و پێش ده‌رون (اف . ال . ان)[10]

۳ ــ دوودڵی عه‌راقیێکان :

له‌به‌غدایه ش‌دا ، سه‌روکه‌کانی عه‌راق ، دوودڵ بوون ، وه‌ده‌یان گوت‌که ئایا پێویسته ئه‌ومه‌سه‌له‌یه زوو پیک‌بێت یان بمێ‌نیته‌وه ، وه‌نه‌یان ده‌توانی به‌باشی بی‌گونجێنن :

ژه‌نیرال عه‌مماش له سه‌رئه‌وقسه‌یه‌بوو ، که‌ده‌بێ پارتیێکانی ته‌واوی نه‌ته‌وه عه‌ره‌به‌کان‌ی عه‌راق له‌کۆبونه‌وه‌یه‌ک‌دا ، باس‌که‌ن ته‌سمیم بگرن ، بۆئه‌وه‌ی که‌ئایا مه‌سه‌له که له‌دووایه‌دا به‌پرسیاری گشتی ، « ڕی‌فراندووم » ، دابندرێ‌وه له‌پاشان‌ش به‌نهێنی باسی لێ‌بکرێ .

له ۲۸ فیۆرییه‌ی ۱۹٦۳ له کۆن فرانسیکی ڕۆژنامه نووسه‌کان‌دا که له شاری قه‌ڵا دزێ‌گیرا مه‌لامسته‌فا به‌قه‌ڵسی‌و ، تورّه‌ئی ڕای‌گه‌یاند که ئیترپێویست نیه له‌وه‌ی پاش جه‌لال‌تاله‌بانی بۆشاری قاهره وه‌ال‌جه‌زیره بچێت ، وه‌پێم گوته وه ده‌ستورم داوه‌تێ که پێش مه‌رگه‌کان بگه‌ڕێنه‌وه سه‌رجێگای خۆیـان‌وه‌بوشه‌ر ئاماده‌بن ، وه‌هه‌روه‌ها ڕای‌گه‌یاند که‌ئه‌گه‌ر بێتو حکومه‌تی عه‌راق مافـی "ئوتونومی"ی کورد نه‌دا من مافی‌گشتی نه‌ته‌وایه‌تی واته "ئیستقـلال"[11] ڕاده‌گه‌یێنم . به‌لام‌ئه‌و هه‌ڕه شه‌یه‌ش سه‌رئه‌نجامێکی‌نه‌بوو .

۴ ــ چاوپێکه وتنی دوولاله‌کانی ماران

به‌شوێنی ئه‌وه له‌وئاخریانه‌دا چاوپێکه‌وتنیک له‌به‌ینی ژه‌نیرال بارزانی ، وه‌کۆڕێکی عه‌راقی له‌ڕۆژی ۴مارسی ۱۹٦۳ داله‌کانی ماران " پیک‌هات .

*اف‌ال . ان به‌ره‌ئی‌ئازادی به‌خشی‌نه‌ته‌وه‌ئی م . ر*

کۆڕی عەراقیکان بەسەرۆکایەتی تاهریحیا ڕابەری دەکرا، کەبریتی‌بوون لەسەرهەنگیکی هەوائی وەئەندامی شۆڕشگێڕیک کەدەبی هەردان تکریتی‌بێ، وەهەروەها ژێنیرال فەتتاح شاعەلی وە سێ مرۆڤی دیکەش بەناوی کوردکە: وەزیرەکان باباعلی وەفوادعارف وەحەیدەر سولەیمان کەبالوێزی عــــەراق لەئەمریکادابوو، ئەوکۆڕەیان پێک‌هێنابوو.

هەوال بەری تایبەتی ڕۆژنامەی لوموند کەهەواڵو، وێنەیی دەنارد، بەهەلیکوپتریک لەگەل کۆڕی ڕامیاری و نیزامی عەراق‌هات‌بوو ئینجا پێش مەرگەکانی کورد کەهەتا ددان پڕچەک و ئەسلەحەبوون، لەکانی‌ماران ئەو کۆڕەیان دەپاراست. ۱۲

هەوەلین دیداریان زۆربەساردی‌وسڕی‌بوو.

پاش ئەوەی کەڕاگەیاندرا کە ئەوشەڕەو، براکوژێ لەلایەن رژیمی‌ڕووخاوی ڕابردوودا بەسەرئێمە داسەپاندراوە، تاهریحیا ڕای‌گەیاندکە، کوردو، عەرەب لەهەموکاتیک دا پیکەوە ژیاون

هاوفەرهەنگو، هاوئاهەنگن" وەپیکەوە لەزۆرنایەکی دادەتووڕێنن.

ئینجا بارزانی لەوەلام داگوتی، لەڕاوێژی زاران‌دا، ووشەی مرۆڤ بۆ هەردوونەتەوە، بەکاردەبردرێ، ئەممابەتۆ دەلێن تاهر، وەبەمن‌ش‌دەلێــــن مەمستەفا!... هەردوکمان هەین، وەنابێ خۆمان زیاتر لەیەکتربزانین، وەکاتی تایبەتی بۆخومان ڕەچاوکەین" مەلامستەفا زۆر بەتوندی ئەو ووتارانەی دەگوت، وەهەروەها بەقسەکانی‌درێژەداو، گوتی! "لەڕابردوودا، لەگەل خەلکی ئێمە بە پێچەوانە بزووتونەوە، قاسم‌مال ومندال و ژنانی ئێمەی دەکوشتو، دەبڕی!"

مەلامستەفا دیسان بەتووڕەئی بەقسەکان‌ی‌درێژە پێداوگوتی: ئەگەر دەتانەوێ پاڵ بە رژیمی ئێوەبەدەین، پێویسیە زەمانەتێکمان بدەنێ، وەهیچ پەلپو، بیانوویەکی‌شی تێدانەبێ، وەچارەسەری مەسەلەکە بکرێت. دەبێ حکومەتی عەراق نەخشەی ئوتونومی کوردان بکێشێو، مافی ڕەوای کورد بدرێ تا ئێمە لەباوەشی دەولەتی عەراق دابمێنینەوە.

ئەگەر بێتو ئەوکردەوەیە پێک نەیە، دووژمنایەتی هەروادەمێنێ، ئەگینە دووژمنایەتی لەنێومان دانامینی. ژێنیرال تاهریحیا، گوتی کە ئەوگوفت‌وگۆیە دەبێ لە کۆبوونەوەیەکی دیکەش هەر درێژەی پێ‌بدرێ. ئەو چاوپێ کەوتنە

سێسەعاتی خایاند، لەپاشان کۆڕەکان لەیەکتر جوێ بوونەوەوە هەردوک لالەو پێکگەیشتنە (گەشرو ،شاد) بوون.

بەلام مەلامستەفا لیستێکی لەپێش تاهریحیا داناو، دایە کەدەیگەیاند داواکانی زبرو، سەختە.

## ٥ ــ داوخووازەکانی بارزانی

داوخوازەکانی بارزانی بریتیبوو لەوانەیژێرەوە:بەڕەسیمی ناسینی مافی ڕەواێ کورد لەسەرڕێو:شوینی ئوتونومی

کۆڕێکەی کورد بۆ دانانی یاسای مەجلس لــە لایەن تەواوی خەڵکی کورد هەلبژێردرێ ،ئازادیو، سەربەخۆئیهەبی، ــ دانانینایب سەرۆکی کوردلەکوماردا ناوچەکوردستان بریتی بێلەلیواکانی سولەیمانی، کەرکوک، هەولێر، وەناوچەی لیوایموسلوە دیالەی، کوردستان،

ــ پێکهێنانیهێزێکی کوردی لەپێش مەرگەکانی تەواوی کوردستان، وەئەوهێزە لەژێر حوکمی فەرماندەری بەغدایەدابێ

ە پێکهێنانی ژاندارمی کوردستان

ــ بەشدار بوونی کورد لە قازانجی نەفتدا [١٣]

بارزانی ئەو لیستە داوخوازانەی لە پێش چاوی حکومەتی عەراق داناۋە هەروەها لە بارەی ڕاگەیاندنی خودموختاری، "ئولتیماتۆم "ی دانێ، وەگوتی ! ئەگەر ئەومەبەستانە بەجێ نەیەت، شەرپاشی سێرۆژان دەسپێدەکرێتەوە!

حکومەتی بەغدایە لەو داخوازنە کە.پێی زۆروگران بوو، مەترسیڕێنشت، وەئاگاداریدا کە ئەو هەلوێستانە بۆ ئێمە ناگونجێ! وەلە ٦ مارسی ١٩٦٣ تالب حسین شەبیب وەزیری دەرەوەی عەراق کەیەکێکلە گەورەکانی باڵیراستی، دەولەتی بەعس بوۆرایگەیاند کە: "مەسەلەی چارە سەرکردنی مافینەتەوایەتی کورد مەسەلەیەکی ئەوتۆنیە" وە ئەو داوخوازانە ڕێگا لە گفتوگۆ دەبڕێ وەجگە لەوەی، تەواوی کوردەکانیش لەسەر ئەوگومانەنین.

ئەگەر بارزانی لەڕاستەقینەدا دژی ئێمە نابزوێتەوە، کارێکی باشە، ئەگینە بوئێمەتێک شکاندنی ئەوشۆڕشە زۆر سووکوهاسانەو، زۆرناکێشێ. [١٤]

لەبەغدایە کوردە ناسیونالیستە میانەرەوەکان مانی فیێستێکیان وەدەرخست وەبەگورجی لەبەرانبەر پیاوەکانی میانەرەوی حکومەت کەبێ‌هەستو، دەنگ‌بوون، هاواری‌خۆیان دەربڕی.

## ٦ ــ هەڵەکان :

بەلام لە ٩ی مارسی ١٩٦٣ تەدبیرکەری هێزی فەرماندەی شۆرشی عەراق ڕای‌گەیاند کە "مافی کوردەکان بەنێوی"لامەرکەزی" دەناسێ! ئــــەوە، بۆ روژنامەکانی وولاتەکان بووبە بیانوو، وەڕایان گەیاندو، خەبەریان‌دا. بە تایبەت ڕۆژنامەی لوموند لە سەرەتادانووسی‌بووی کە: "بەغدا مافی ئوتونومی بە کوردەکان داوە!" (١٢ مارسی ١٩٦٣).

لەئاکام دا ئەومەسەلەیە زۆر بەباشی ڕوون نەبوۆە چونکە عەراق هەرلە خۆیەوە، بەبێ‌بیروڕای بارزانی "لامەرکەزی" ڕاگەیاندبوو، ئینجا بارزانی داوای شتێکی دیکەی کردبوو، واتەلەچاوپێ کەوتنەکەی‌دا لەگەل تاهریحیا (٤ی‌مارس) داوخووازەکانی لەوە پتر بوو.

عەلی سالح ئەسسەعدی‌نایب جێ‌گری سەرۆک وەزیری حکومەتی عەراق لەمافی کوردەکان "بەرگری" دەکرد، وەلەووتو،وێژێکی لە کۆبوونە وەیک‌دا لەگەل روژنامە نووسەکانی‌ڕای‌گەیاند بوو (١١مارسی ١٩٦٣) لەشاری دەمشق لەسەر ڕاوتەدبیری دەولەتی عەراق کە "کوردەکان ئیدارەی تایبەتی خۆیان هەبێ، لەناوچەکەدا جگە لەکاروباری دەرەوەی عەراق، هێزی بەرگری، دارائی، بەدەستی خۆیان‌بێ، هەروەها گوتی کە مەیلی بارزانی وەکوردەکان بەوەیە کە هێزی بەرگری ناوخۆی‌وە دارائی ناوچەکە لەدەستی خۆیان دابێ، وەڕای‌گەیاند کە ئەوە بەرهەلستێک‌وکەندوکوسپێکە کە لەنێو حکومەتو، بارزانی داماوەتەوە![15]

لە کۆبونەوەیەک لەشاری کۆی‌سەنجاق کە نـزیک بــــــە ٢٥٠٠ کەس‌هات‌بوون،وە (٢٠٠ مرۆڤیان کەهەل دەبژارد، بەبانگەوازی پارتــی دیموکراتی کـــــوردستان ئەندامەکانی نیزامی وە پیاوەبەرزەکانو، روشن بیرەکانی کوردتێدا بەشداریان کردبوو. ئەو دانشتنە کە پێک‌هات‌بوو بۆلێ کۆڵینەوە لەباری کاروباری و لات دابوو.

ئینجا لەسەر ڕێوشوێنی تازە وەلەسەر بڕیاری "٢٤ئاوریل" لە کۆبوونەوە
کە دا جەلال تالە بانیان هەل بژارد کە ووتو، ویژە کە لەگەل حکومەتی عەراق
دریژە پێ بدات

٧ ـ دووبەرە کایەکردنی بەغدا

ووتو، ویژی سێقولی (مسر، سوریە، عەراق) لەشاری قاهــــرە،
وای نشان دەدا کە نوینەرە بەعسیکانی بەغدا سیاسەتی دووبەرەکی دەگێرن،
وە لەراستەقینەدا نایانەوێ لەگەل کوردەکان پیکبێن.
بەشوێنی ئەوەدا پاش چەندرۆژ کەلەکودەتا، تێپەڕی بوو وە بەعسیکان
لەوڵاتــی سوریە دا، دەهاتن بەقەوەتو، هێزبن، لە ٨ ی مانگی مارسی ١٩٦٣
وە، وەختاووەخت لەشاری قاهرەدا بە دریژائی مانگیک گفتو،گۆ بۆیەکگرتنی
وڵاتەکانی مسر، سوریە، عەراقواتە "کۆماری یەک گرتووی عەرەب" هەوڵدرا.
سەرکۆمار ناسر پەیتا، پەیتا داوای ئەوەی دەکرد کەژەنیرال بارزانی
دەبێ لەووتو، ویژەکان داحازربێ، وەدەری بڕی بوو کە بەپێوستی دەزانم
کەلە فازی ئاخری گفتو،گویەکەدا بەشداریبکات، بەلام نوینەرەکانی عەراق
دەیانگوت کەچارە سەرکردنی مەسەلەی کورد، دەبێ لەنێو خۆمان باسی لێبکرێ!
سەرئەنجام لە ئاخرین کاتەکەی کۆبوونەوەکەدا، نوینەری عەراق ڕووی لە جەلال
تالەبانیکردو، گوتی کەمەسەلەی مافی کوردەکان ناگونجێ (، پیکنایە، چونکە
پتر مەبەست لەوکۆبوونەوەیە، "یەکێتی دەولەتە عەرەبەکان"ە، وە ئیمــە
دەمانەوێ لەویەکیتە سودو، کەلکوەرگرین، وە ناسرش ئەو هەلوێستەی
لەبەرچاوە. ١٦

٨ ـ بارزانی لەگەڵ بەعسیکان هاتو، چۆی دەبڕێ

لەنیوە راستی مانگی ئاوریلی ١٩٦٣وە، ڕۆژنامەیتروود ئورگانی سەندیکای
سویەتەکان، ڕای گەیاند کە واچاوەڕووان دەکرێ، کەشەڕ دژی کوردەکان دەستپێ
بکریتەوە. ١٧

ئینجا لەحەقیقەتدا ، دەبی بلین کە شکانی ووتو، ویژە کە عەلامەتی دیار بوو: پاش ١١ ڕۆژان جەلال تالەبانی لە بەغدایە (بیرەوەری نامیلکەی کوردەکان"ی ١٢ ئاوریلی ١٩٦٣ لە بە غدادا لە چاپدا ـ بەشـــیووتو، ویژەکەو، کۆبوونەوەکەی شاریکۆیسەنجاق، وە لە پیشدانانی (لیستی داوا کراوەکانی کورد) کەلەلایەن بارزانیەوە، بەتاهریحیا درابوو لە ٤ی مارسدا لە چاپدراو، ڕاگەیاندرا.

ئینجانە ووشەی "ئوتونومی" وە نەووشەی "لامەرکەزی" ئیدی قەت باسی لی نەکرا. بەلام داوای کوردەکان لەسەرمەبەستی دانانی دەولەتیکی بێناسیونال واتە لەچەشن و شکلی حکومەتە فیدرالەکانی ولاتی ئوروپا وەک (یوگسلاوی یان سویس" مەیلیانبوو. *"فۆرمی دراکونیەن" (کوردە کانی لایەنگری چەشنی قانونگزاران یونان) بەشوینی بەیان نامەکان کەلەچاپ دران و، بلاوکرانە. ئینجا مەتلەبیکی کە دەهات، ووتو، ویژەکە ببری، ئەوەبوو کە جەلال تالەبانی رایگەیاند کە: "ئیمە ئامادەین لەبەغدایە بۆ ووتو، ویژ بمێنینەوە، بەلام ئەگەر حکومەتی بەغدا نەیەوی دریژە بەگفتوگویەکەبدات، پاشحەوتویک بو شمال دەگەڕیتەوە." ١٨

سەرئەنجام لە ١٣ی مەی ١٩٦٣ جەلال تالەبانی بۆ ووتو،ویژیکی دۆستانە لەگەل ناسر سەرۆک کوماریمسربوقاهرە گەڕاوە.

بەلام ئەو چونەشنەیتووانی دەس کەوتیکی تیدابی وە هەروەها لە دەسپیکردنەوەی شەڕیکی تازە دژی کوردەکان بەرگریبکات.

* دراکونیەن ـ چەشنیقانوندانانییونان.

## فه سلی ٨

### هەوەڵین شەڕی بەعسیەکان لە (مانگی ژوئن، نووامبری ١٩٦٣)

لە ١٠ی ژوئنی ١٩٦٣ رادیو بەغدا لەووتاری خو.ی دابڵاوی کردەوە کە (شوڕای نەتەوایەتی شوڕشگێڕەکانی عەراق) بریاری هێناوەتە سەرئەوەی کە زۆرزوو، ئاکاری نیزامی خویی دژی سەروک مستەفابارزانی دەس پێ بکاتەوە".
بەوجورە واز ڕوون ببۆوە: پاش ٤ مانگ گفتو،گوی، مولەتدان، حکومەتی عەراق، تەنیا هەڵوێستی ئەوەبوو، کە بۆسەر کوردەکان هێرش بەرێوە بێ پەڵپوبیانوو ئەوکارەدەس پێ بکات.
دڵ بریندارەکانو، داخ دارەکان (جودائی خووازان، فئودالەکان، وە ئەوانەی کەدڵ پڕبوون وەلەگەل شوڕشی عەراق دووژمنایەتیان دەکرد، لە دەوروبەری بارزانی کۆ بوونەوە، شوڕای نەتەوایەتی کوماندری شوڕش ئاگاداری دا، هاوکات لەگەل ئەوە هێندێ لە ئەندامی تایبەتی بۆخارترجەم کردن کە "شورایەکی دائمی سولح و،ئاشتی بەینی کوردو، عەرەب پیک بێنی وەدیهات
١

### ١ ـ نەخشەی لامەرکەزی وئیداری عەراق

سەرئەنجام عەراق دانی بەسەر ئەو مەبەستە دانا کە ئیدارە کردنی ناوچە کەبەنێوی بەرگری لەخوێ "موحافازات" ی (ناوچەئی، لەژێر چاوەدێری حکومەتی ناوەندی وەبەئەستۆ گرتنی کارەکان بەنێوی "شوڕای ناوچەئی" کە هەل بژاردنێک کەمافی کاربەدەستە ئیدارەکانی تێدابێ. وەدیبێت : ٢

کوردستان ــ لەهیچ کاتێک دا لە پرۆژەی حکومەت ئەووشەیە بکارنابات ــ کوردستان بەدوومەلەبەندی کەرکوک، وەسولەیمانیٚ دابەشبیٚ. لیواکانی شاری سولەیمانی کەواتە سولەیمانیٚ، هەولێر، وەدەهوک،وە هەروەها ناوچەی زاخــۆ ئامادیا، ئاکراو ،زیباری دەگرێتەوە، لەگەلبوو.

ئینجا بە کوردەکان رێگا درابوو کە بەزمانی زگماکی خۆیان کەزمانێکی رەسمی کوردایەتیە لەناوچەی سولەیمانیٚ وەکەرکوکدا بخوێنن وەبنووسن!

بەلام ئەوەی کەپێویستبوو کە دانی لەسەر دابندریٚ "شەخسییەتی کوردەکان"ی شمالی عەراق وەئەوانەی کە لە دەولەتی کۆماری عەراقدا دەبن کە بگوتری، نیٚونەبردرابوو. لەئاکام دائەوەی کە بەباشی رۆون ببۆوە دەولەت مەبەستی لەوکارە ئەوە بوو، کە خەلکی ناوچەکەهەل فریوبێبی،دەناهیچ کەلک وقازانجیٚکی بۆکوردان تێدانەبوو.

## ٢ ــ سەرەتای دەس پێکردنی شەڕ

سەرئەنجام لە ٩ی ژوئن‌ی ١٩٦٣ لەکاتی ٥ی بەرلەبەیانی، لەپێش‌ئەوەی دا کە ئولتیماتوم بە بارزانی بدریٚ کە دەبی لەماوەی ٢٤ سەعات سەرشۆرەکاتەوە هێزی عەراق دەستی بەگوللە بارانی شاری کەرکوک، هەولێر، وەسولەیمانیٚ کرد، لەپاشان ئەوشارانەی بەتانگ گەمارۆدا، بەشوێنی ئەوەدا شارەکانی‌گرت، دووکان و بازاری کوردەکان تالان‌کرا، دەستی‌بەگرتن‌وقەلت‌وبڕی خەلکی شاری سولەیمانیٚ کردە پتر لە ٢٦٧ مروف کوژران، وەخەلکێکی زۆر لەوشارە لەجیگایەکی سەر ئەوالەدا کە گیرابوون، زیندانی‌کران. ٢

## ٣ ــ شەڕی بەعس

شەڕی بیٚ ئەمانی بەعسیەکان دژی کوردەکان، کەلەمانگی ژوئن‌ی ١٩٦٣ دا دەستی پیکرا "هەوەلین شەڕی بەعسیەکان بوو" وەعارف کەببوو ســـەرۆک حکومەت، دەرەجەی مارشالی لەمانگی فیورییەدا، بەخۆی‌دا.

بەلام ئەونێوە ووشەیەکی پوچ بوو ، وادیاربوو کە لەڕاستەقینەدا تووانائێکی ئەوتۆی‌نیە تەواوی پۆستەگرینگەکان لەدەستی بەعسێکان دابوو وە ئەوکەسانە کاروباری وڵاتیان لە ناوخوی‌دا بەش‌کردبوو : پۆستی وەزارەتی بەرگری (عەمماش) وەزارەتی ناوخو (حازم‌جەواد) ، سەرۆکو ، سەرفرۆکەوان (هەردان تکریتی) ، (حەسەن ئەل بەکر) سەرۆک کۆمار . . .

ئێدوارد سەعاب کەیەکێک لەباشترین تیرا بینەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەراست بوو ، لەوبارەیەدا نووسیوێتی‌ کە : "بەڕاستی پۆستێکی دیکە نەمابوو کەبەعسێکان لە ئیدارەکان‌و ، وەزارەت‌خانەکان‌دا نا گیری نەکەن" وەهەروەها دەڵێ کە : "مرۆڤێک نەمابوو کەبەعسیان نەی کەنە سەربازو ، قامکی لەسەر دانەنێن" ٤

دەگونجێ بڵێن کەعارف مرۆڤێکی راستەقینەی سیاسی نەبوو ، تەنیا پیاوێکی کەللەشەق بوو کە دەیەویست شەڕەکەی بە نێوی‌خوێی تەواوبکات . دەی گوت کە "نەتەوەی کورد ئیتر لەعەرە بەکانە" وەبەو زووانە"لایەن‌گرەکانی بارزانی بڵاوەدەبن . " ٥

## شەڕێکی‌کەزۆربە تین‌ترلەشەڕەکانی پێشووبوو

بەعس شەڕێکی واقوورسی دەست پێکردبوو ، کەهەتائێستا لە مێژووی شەڕی عەرەب‌و ، کورددا نەدەتیرابوو ، وەنرخ‌وبایخی‌ئەوشەڕە لە بەرچاوی سەرکوما ناسربە نومایش داندرا .

سەرۆکە نیزامێکانی عەراق بەو سەرئەنجامە گەیشت بوون کە قاسم بەڕاستی "نەی‌دەویست شانازی" بەوەبکات کەبەسەر کوردەکان‌دا پیروزبێ ، بەلکوپتر هەلۆیستی ئەوەبوو کە هێزی‌نیزامی لە بەغدایە دووربکاتەوە .

وە هەروەها لەکن‌خۆ ی گومانی‌شی ئەوە بوو ، کە لەماوەی حەوتویێک دا شۆرش‌گێرە کوردەکان لەنێو دەچن . لەئاکام‌دا ڕاوگومانی بەعسێکان هاتە سەرئەو مەبەستە کەبە : بۆمبی ناپاڵم‌و ، ئاورین ، وەتانک و توپ‌ی‌قورس‌وەچەکی هەرەتازە هێرش بەرنە سەر کوردەکان وە بێ‌ئەمان بیان کوتن . . .

هاوکات لەگەل ئەومەبەستە دەیەویست کوردان لەنێوبەرێ ، جا ، چ کوردی تاوان‌باربێت ،چ بێ‌تاوان قەلت وبڕیان‌بکات‌و ، بیان‌گرێ‌و ، بیان کوژێ ، وە

تەنانەت سەری بارزانی یەمزگینی دانا، وەڕایگەیاند کە کەسیکی سەری بڕاوی بارزانی بێنێ (١٠٠,٠٠٠ دینار) (١/٥) میلیون فرانگی ئەوڕو!) پوولی دە درێتێ. ئینجا لە ئەزیەتو، ئەشکەنجەی ئەندامانی پارتیدیموکراتیکوردستان ڕانەدەوەستان. سالح یوسف کەیەکێک لەسەروکە کوردەکان بوو، وەلەگفتو، گوی دەولەتدا بەنێوی نوێنەری کوردان قسەی دەکرد، چەندمانگ لەبەغدا گیراو، ئازاردرا. [٧]

## ٤ـ عەرەبی کردنی "وڵاتەکە (ئارابیزاسیون)

ئینجا عەرەبەکان پڕهێزو، تووانابوون بەقودرەتگەیشتن نەخشەیان ئەوە بوو کە ووڵاتە کوردەکان بکەنە عەرەبی، وە لە چاوەڕووانی ڕامیاریوەش ئەوکارە بەڕێوە بەرنوەتاسالی ١٩٦٨ خەریکی ئەوکارەبوون لەهەوەڵەوە هێزی عەراق تێ دەکوشی کە کوردەکان لەجێگا عاستەمەکان واتــەلەمەلەبەندە کانی، "ستراتێژیک"ی وەدەرنی، وەلە هەرێمی ناوچەی سنووریو، نەفتی ڕاپاندا. [٨] جابەوجورە دێیەکانی بۆمباران دەکرد، دەی سوتاندن، وەپاشان بەبولدزێر سافی دەکردو، لەگەل تەختی زەیو دەکردەیەک. لەناوچەی کەرکوک ٤٠٠٠٠ کوردی دەرکرد! وەهەروەهائەو چەشنە ئاکارەی لەهەولێریشدا کردوە بەچەشنی سیستێماتیک ئەوکارەی لەشاری هەولێرش بەڕێوەبــرد.

## ٥ـ کارو، کردەوەینیزامی

هێزی نیزامی عەراق سێ هێرشی بۆسەر ناوچەی شمال (بادینان) کە بەدەستی بارزانێ وەبوو، برد وە بۆ سەر ناوچەی (ناوەندی وەخووارو) کە بە دەستی، هێزی پ. د. ک بوو، هەروەها هێرشی برد. ئەوشەڕە زۆر زوو لــە دەرەوەی ولاتی عەراق دەنگی داوە.

بەلام بارزانی هەروەک جارەکانی پێشوو چاوە ڕووان دەکرا کە دەچێتە نێو کێوەکان: لەمانگی ئوتی ١٩٦٣ داهێزی عەراق گەیشتە زێبارووە ناوچەی بارزانی داگیر کرد (هەوەڵێئوت) وەبەچەشنی سالی ١٩٣٢ بارزانی پاشەکشەی

کرد ،وەبۆ کیۆەکانی لای‌تورکیە پەنای‌برد . . .

بەڵام هێزی حکومەت لە هێرشە کە دا سەری‌لێ سووڕما وەنەی دەزانی بۆ کوێ بچێ . . . وەدەگونجێ بڵێن کە هێزەکانی بارزانی هەروا ساغو، سلامەت مابوۆە،وەدەستی لیێ‌نە درابوو. لەچەند باڵی دیکەی شەڕدا هێزی عەراق، زۆر وازی باش نەبوو : لەناوچەی رەواندزدا هەنگێگ لەهێزی نیزامی عەراق لە زارکی "گەڵی عەلی‌بەگ"دا گەمارۆدراو، لەداوخرا، ئەوتەڵەو، داوە چەند حەوتوو بەردەوام بوو، واتە تانیۆەڕاستی مانگی ئوت هەرچەند، هێزی عەراق لە لایەن فرۆکەکان یارمەتی دەدرا، لەسرئەوەشڕا زۆریان لێ‌کوژرا وەهات‌وچۆیان لێ‌بڕابوو. لەجنوب‌دا، پێش مەرگەکان، هێرشیان بۆسەر جەمبوری‌چالاوە نەفتەکان لە خوواروی کەرکوک‌وەدا، لە١٧ی ژوئن‌ی ١٩٦٣، وەهەروەها ٢٢ ژوئن هێرش بۆسەر شاری کەرکوک‌بردرا.

هەروەها لەوئاسۆ یەش دا فەرماندەری عەراق، پێش‌مەرگە کوردەکانیان بۆپشتەوە کشاندەوە هێزی عەراق لەچەمی ڕازاب‌دا مەرکەزو، کانگای جەلال تالەبانی گەمارۆدا، ئەوگەمارۆیە دووکەرەت لە مانگی سێ‌پتامبرو، نوامبر بەرێوە بردرا. ٩

لە١٤ی ژوئیەی ١٩٦٣ پاش‌مانگێک کەلەسەرەتای شەڕ رابردبوو، مارشال عارف لە ووتاری‌بەناوبانگی‌خۆی‌دا بەبۆنەی پێنجمین ساڵی تێوە سووڕانی شوڕشی ژوئیەی ١٩٥٨ ڕاگەیاند وگوتی، کەناوچەکە لە شۆڕشگێڕەکانی کورد خاوێن بۆتەوە.[١٠] لە ئاکام دا شەڕی بەعسێکان کەبەسەرۆکایەتی حەردان تکریتی وەعەمماش دەستی پێکرابوو، بەوجورەی کە چاوەڕووانی‌دەکرا، نەی تووانی پیروز بی‌و، سەرکەوێ بەڵکو لەڕاستەقینەدا ئەوهێرشە "گەڕان‌و،سەیری هێزەکان ناوبردرا کە لە لایەن ژینرال عە مماش و ، هە ردان تکریتی پیک هابتو

**٦ ــ سوورییە خۆتیۆەردەدا**

هەوەڵین شەڕی بەعسێکان کە دژی کوردەکان دەستی پێکرا ( هیزی عەراق نەی تووانی پیرۆزی بەدەست بێنێ، پاش‌ئەوەی کە مارشال‌عارف لەگەل سەرۆکی هێزی سوورییە چاوپێکەوتنێکی لەنهێنی‌دا بەڕێوەبردبوو، هێزی‌نیزامی سوورییە

لە ٢٢ی ئۆکتوبری ١٩٦٣ داپەلاماری دەست پێکرد "ئە وجاو پیێ کە وتنە لەزاخو بو. ١٠"

لەئاکام دا هێزی (یەرموک)ی سووریە لەسنووری ئسرائیل دا کە سێ هزارکەس بوون، بەتانک و، توپەوە ئامادەی هەڵمەت بوون.

پەلاماریان لەناوچەی جوغرافیائی زاخۆ و، دەهۆکەوە بوو، وە ئەو تێ هەڵ قوتانەی سووریە لەبەرئەوەبوو کەبەڕاستی بەوجێگایە گەیشت بوو کەبەعسێکان ئابڕوویان دەهات بچێ، وەلەنێوبچن (نوامبری ١٩٦٣)

ئینجا ئاکاروکردەوەی نیزامی سوریە نەی تووانی سەرکەوێ وەبارو، دۆخی عەراق ڕاست کاتەوە. کوردەکان، زۆربەیەکی تەواویان لەهێزی سوریە دابوو. بەڵام پێش مەرگەکان ش نەختێک لە بابەت ڕووحییەوە، خۆیان وون کردبوو، وەدەیان گوت، "ئەوجار ئەوە دژی شۆڕشی کورد، دەوڵەتێکی دیکەش دەست بەکاربوو" ! ١١

دەگوترێ بڵێن ئەوە بۆ هەوەڵین جارو، ئاخرین جاربوو کە هێزی نیزامی بێگانە دژی کوردەکان لەعەراق دا دەست بەکاروئیشی نیزامی بوون.

**٧ ــ کاتی ناسر:**

کاتێک کە شەڕی کوردەکان لەگەڵ هێزی عەراقی بەعسی دەستی پێکردەوە ڕۆژنامەکانی مسر بەبێ ئامانج، یان "کەم ئاماج"[١٢] باسرو، خەبەریان بڵاودەکردەوە

سەرئەنجام سەرکۆمار ناسر کە لەڕووی دۆستی و، برایەتیەوە لەکاروباری کوردەکان داهەوڵی دەدا وەک کە گوتمان بەچەشنی ڕەسمی نەبوو، جەلال تالەبانی دەرۆژ پێش ئەوەی کەشەڕ دەستی پێ بکرێتەوە بەجۆرێک هات و، چوێ، ووت و، ویژی هەرهەبوو. بەڵام بەشوێنی دووژمنایەتی تازەوەکەلەسەرزاران قاوبوو، نەی دەتووانی بەچاکی ووت وێژ بکات وەکەڵکی لێ وەرگیرێ.

پاش پێش گرتن لە شۆڕشگێڕەکان و، لایەن گرەکانی ناسر ئالیێپ (٨ی مەی مەی ١٩٦٣)وە تێک شکانی ڕاپەڕین وپیلانی لایەن گرەکانی ناسر لەشاری بەغدادا (٢٥ی مەی ١٩٦٣) ناسرو، بەعس دەهات نێوانیان ببرێ، وەناسرکە لەبەعسیانی عەراق و، سوریە دڵ دۆنگ ببوو، وەدەیزانی کە "ئاکارو، ڕێبازو، خەت وشوێنیان" لەڕێگای خوێ لای داوە، ئینجانەی دەی تووانی لەسەر ئەوشەڕە بڕیاربدات، وە

دەیدیت کە تەواوی ئاکاری بەعسیەکان لەسەر حزبی خۆی لاچووە، وەلەوەی مەترسی بوو کە ئەگەر براوابردات "لەگەل دووژمنایەتی نەتەوە عەرەبەکان ڕوبەرودەبێ"[١٣]!

بەلام چەندمانگ پاش شکانی هەلستانی لایەن گرەکانی ناسرلە دیمەشقی سووریە لە ١٨ی ژوییەی ١٩٦٣ ناسرهاتوچۆی ڕامیاری خۆی لەگەل بەعسیەکان بڕی، وەرادیوی "دەنگی عەرەبەکان" لەقاهرەدا، دژی بەعسیەکان هەوالی بلاودە کردەوە، وە دروشمی دەداو، دەیگوت :

"ئەی خەلکی موسولمانی سورییەو، عەراق دژی میشیل عەفلەق هەلستنە سەرپێ، وەدژی ئاکارو، کردەوەی بەعسیەکان کە خودا نەناسو، کافرن، وە زەوی ئیسلامیان[١٥] داگیر کردوە، دەست بەکاربن"[١٤] سەرئەنجام ئەمما بۆ کاری کوردەکان کەس نەبوو دەنگ بەرزکاتەوەو، شتێکی بلێ.

## ٨ـ کات و وازی وولاتەڕۆژئاوایەکان :

لەکاتێکدا کە وردە ـ وردە ڕووخاندنو، لەبەین بردنی قاسم لەبیردە چۆوە واگومان دەبردرا کە رژیم بۆ لای "کومونیستەی" دەچێ، ئینجا ولاتە ڕۆژئاوایەکان، وەبەتایبەتی، دەولەتی یەکگرتووی ئەمریکا وەئینگلیس پتر لە بارەی مەسەلەکەدا خورد، دەبوونەوەوسەرنجیان دەدا حازم جەواد لە ٦ی فیوریەی ١٩٦٣ بەڕاگەیاندنی حکومەتی تازەی عەراق "بەپێک هاتنەکانی شرکەتە نەفتێکانو، کۆمپانیێکان حوڕمەتو، ڕێزدادەنێ". ئەوڕا گەیاندنە دروست پاش حەوتویێک مردنی قاسم بوو.[١٦]

کاتێک کە یەکێتی سۆویەت دژی عەراق دەنگی خۆی دەربڕی، ئەمریکاو، ئنگلیس ئاگاداریاندا کە ئامادەی ڕوون کردنەوەی ڕامیاری خۆیان لەگەل حکومەتی تازەی عەراقن.

لەبارەی نەخشەی ڕامیاریوە، ئنگلیس کاروباری گفتوگویی ڕامیاریێکەی ڕاگەیاند، وە گوتی دەگونجێ کەلەبەینی دەولەتەکانی عەراق، ئێران وەتورکیە، کە لە سالی ١٩٦٣ تورکیەو، ئیران کەلەبابەت هەل پەساردنی کوردەکان پێشنیاریان داوە کە پەیمان ببەستن، بەجێ بێت.

ئینجا ئەوکارە بەگرتنی قوتابی زانیارەکانی عەراق کە لە تورکیە بوون

دەستی پێکرا وە هەروەها سنووری ئێرانیش پتر ئاگاداری لێدەکرا.[١٧]

## ٩ ـ کاتی تەسمیم گرتنی یەکێتی سۆویەت

بەلام لەپاری نەخشەی ڕامیاریو، دیپلوماسیکی زۆر گرینگ کە لە لایەن یەکێتی شورەوی کە هیچ مەبەستێکیتیدانەهێشتبۆوەلەکاتی شەڕی بەعسێکان لەگەل کوردەکانگیرا، وە لەسەرئەوەشڕا لەئاخریدا لایەنگری لەژینیرال بارزانی کەکرابۆباری ئاخربوو.

مەبەستی ئەو ئاکارو کردەوەی سۆویەت پاش لە نێو چوونی قاسم سی هەلویست لەبەرچاوبوو.

هەوەل لـە کاتێکی زۆر عاستەمدا کە "ڕاوی کومونیستەکان" لەعەراق دەستـــی پێکرابوو، موسکو دەهات هات وچوی خوی لەگەل بەغدایە ببڕێ: لە ١٤ی فیوریبەی ١٩٦٣، ئاگادارێک بەچەشنی بەیانییە لەلایەن هەوالدەرەکانی ڕۆژ ئاوای رادیو ـ موسکو واتە ئاژانسی روژئاوایەکان بلاو کرایەوە وە (نیگەرانی خوی لەبارەی نارەحەت کردنی، "هیزی دیموکراتیک" لەعەراق دا دەربڕی وە لەبەرامبەر "ئاکاری تیڕۆر" دەنگی خوی بەرزەوەکرد.[١٨]

بۆ دووا ڕۆژێ ئەج جماهیر، ڕوژنامەی ڕەسمی بەعسی عەراق کەبەدەستی تارقعەزیز بلاودەبۆوە چاوەڕووانی بڕینی ڕامیاری و دیپلوماسی لەگەل موسکو دەکردو، بڕیاری دا کە: "ئێمە کە کومونیستەکان ڕاودەکەینو، دەیانگرین، تەنانەت ئەوە نابێتە مەبەستی ئەو هەلوێستە کەلەگەل موسکو،هات و چوێەکی باشماننەبێ. پیویستە بزانن کە شەڕی ئێمە دژی کومونیستی ناوچەی خومانە، نەکدژی ئیدئولوژی کومونیستی![١٩]" وەلامی موسکو زووبەم پرسیارە دراوە کە: لە فیوریبەی ١٩٦٣ کمیتەی ناوەندی پارتی کمونیستی سوویەت "کوشتنو، تیرۆریخوێناوی لەعەراقیدا مەحکومکرد" وەرایگەیاند کە ئەو ئاکارە ڕامیاریەوە کوشتنو، بڕینی کورەگەنجەکان لەعەراقدا ناکامیکی گەورەی بۆ حکومەتی عەراق لەبەرادایە".[٢٠]

مەبەستی دووهەم ئەوە بوو، کە بڕینی هاتو، چوی لەبەینی موسکو و عەراقدا بە قازانجی بارزانی تەواو دەبوو، وە یەکێتی سۆویەت گوتی، ڕایەرینی[٢١]

نەتەوەی کورد ، بزوتنەوەیەکی "دیموکراتیکی تەبیعی کوردە" قاسمی تاوان بار کرد کە"ماف نەدان" ڕێگای بۆ بزوتنەوەی ئاکاری ئمپریالیستەکان ئاوالـــە هێشتوتەوە. " ٢٢

لە ٦ی مەی ١٩٦٣ ڕۆژنامەی پڕاودا لە نوسراوەیەکی دوورو ، درێژدا بە قازانجی کوردەکان باسو ، هەواڵی چاپ کردبوو ، بەلام هێندێکی تێدا هێشت بۆوەو ، نووسی بووی کە : نووسراوەکانو ، چاپەمەنیکانی دەرەوە ، دەڵێن کە کوردەکان دەیانەوێ مافەڕەواکەیان واتە ئۆتۆنۆمی لە دانشتگەی قانون دا لە چوار چێوەی کوماری عەراق دا دیاری بکرێ . . . . وە هەروەها پراودا نووسی بووی کە لەکاتی حازردا ، کوردستانی عەراق ، یەکێکە لەهەرەوەدووا کە وتووی ئابوری ولاتەکان . ئاشکرایە کە کوردەکان بۆ گەیشتن بەئاواتی خۆیان کە ڕاستکردنەوەی بارو دۆخی سەنعەت ، فەرهەنگ ، زانیاریو ، کاروباری کشتوکاڵو ، هات وچۆی ڕێگاکانە زۆر بە تالوکەن ،وە تێدەکوشنکە . . .

بــەمــافەڕەواکەی خۆیان بگەن ، ئینجا هاوکات لەگەل ئەو داخووازانە بۆ وەدەست هێنانی حکومەتی خودموختاری تێدەکوشن ، وەدەیانەوێ لەمافی بەشەکەی خویان ، لەسوودو ، قازانجی نەفتدا بە شداربن ، وەکانەکانی مەعدەن لەکوردستان دا وە دەربخرێو ، تاژیانیکی باشیان هەبێ " . ٢٣

بەشوێنی ئەو دووژمنایەتی لەسەرڕا لە ١٠ی ژوئنی ١٩٦٣ حکومەتی شورەوی دەیگوت وە بۆ تاوان بارکردنی عەراق هە لوێستەکانیدووپاتەدەکردەوە ، وەهەروەها ڕایگەیاند کەحکومەتی عەراق نایەوێ لەگەل کوردەکـــان گفتوگۆ بکات ، بەراستی لەبارەی کوردەکاندا "ئاکارو کردەوەی نیزامیکەی بەچەشنی هیتلر ڕەچاودەکات " . ٢٤

لە ٣ی ژوییەدا دەولەتی مەغولستانی دەرەوە لەسێ کرێتێری گشتی نەتەوەکان واتە (دەبیری کل سازمان ملل متحد ، داوای کرد کە مەسەلــەی "ژینوسیدی کوردەکان لەعەراق" دا لەسەرڕاو ، تەدبیر ئیمە لە دەستوری ڕۆژدا ، دابندرێ وە لە کوبونەوەی نەتەوەکان داباسیلێبکرێ .

یادداشت‌ی سوویەت لە ٩ی ژوییەی ١٩٦٣ دا

لە ٩ی ژوییە، گرۆمیکۆ، وەزیری کاروباری دەرەوەی شورەوی نوسراوەیەکی لەپێش بالویزی عەراق‌دا، دانا کەبریتی لەوەی بوو کە پێویستە دەولەتی عەراق تیرابینی ئەوەی هەبێ کەئەوەبەراستی "هەڕەشەو، مال‌ویران کردنی کوردەکان لە ناوچەی شمال‌ی کوردستان‌ی عەراقێ دا، دەبێتــــە هۆی ئەوە کە دەولە تەکانی دیکەی‌دوونیایەش لەکاروباری عەراق خوتێوەردەن" وە ڕووناکی کردەوە کە: "ئاکاری خوێناوی" دژی کوردەکان ناتووانی لەعەراق‌دا هیچ ئشوکاریکی بەرێتەپێش، بەلکو، بەپێچەوانەی ئەوە "دەولەتی عەراق "لاواز دەکات"وە.[٢٥]
ئەوکاروبارە بە دەولەتە ئستعمارگەرەکان ڕێگادەدات کە بە ئستقلال‌ی عەراق زەرەروزیان بگەیەنن، وەکەلکو، قازانجی خۆشیان لەوەدا دەبینن"
هەرئەوێ ڕۆژێ‌ش گرومیکو، بەم‌چەشنە نووسراوەیەکی دیکەی بە بالوێزی ئیران‌و، تورکیەو، سوریە، داوە لەوبڕیار نامەیەدا "کوشت و کوشتاریکـــی خوێناوی" وە ئاکاری جنایەت کارانەیەکی کە لە بارەی کوردەکان دا بەڕێوە دەچێ وە دەری‌خستبوو، شوڕەوی هەروەها ڕای‌گەیاندبوو کە لە"هێندێ دەولەتان بەتاییەت ئیران، تورکیە، سوریەی دەوێ کەلە‌بابەت ڕوو داوەی هەلکەوتووی شمالی عەراق داخۆتێوە رنەدەن، چون سەرئەنجامی دەکێشێتە ئەوجێگایەی کەلایەن‌گـــرەکـــانی‌سێنتۆ[١] لەوە کەلک وەرگرن وە"ڕوودادەیەکی گەورە پێش‌بێت"

هەڕشەی خوتێوەردانی سۆویەت

لە ٩ی ژوییەی ١٩٦٣دا لە سازمانی دەولەتەیەک گرتۆکان‌دا، نوێنەری دائمی شورەوی نیکولای فیدرێنکو نامێلکەیەکی تەسلیمی سەرۆک شورای هێمنی، کردولە بابەت کاروباری ڕووداوەی عەراق‌وە "کوشت وکوشتاریکی خوێناوی کە لە

(١) پەیمانی‌سینتو لەلایەن عراق ـ ایران تورکیە لەسالی ١٣٣٧ بەستراوە.م.ر

کوردستان" دا دەقەومێ، دووا بوو، وە هەروەها قامکی لەسەروەی دانابوو کە دەوڵەتەبێگانەکان حەز خۆبەتێوە ردان دەکەن وە ڕای گەیاندبوو کە پێوستە "شورای هێمنی"بەوکارە دووائیبێنیێوە بەدەولەتەکان بڵێ کە لەومەبەستەوە بێلایەنبن، وەتانانەت تا ئەو ڕادەیە گەیشتو، هەڕشەی کرد کەئەگەر بێتو دەولەتە ڕۆژئاوەیەکان ئەوکارەبکەنو، خوتێوەردەن، دەولەتی سۆویەت بەپێوستی دەزانێ بۆ ئەوەی کە هێمنی خۆی بپارێزێ، لەوکارەدا دەخالەت بکات" ! [٢٧]

## گۆڕانی ڕاوتە دبیری سوویەت

بەلام لەبەرامبەر ئاکارو،کردەوەی توندی و لاتە عەرەبەکاندا، شورەوی ئیدی لەسازمانی شورای ئەمینەت لەبارەی مەسەلەی کورد بەگرنگی لەسەری نەڕۆیشت. بۆ دووای ڕۆژێ لە کۆبوونەوەی دانشتوی گشتی نەتەوەیەک گرتۆ کاندا، مۆنگۆلیای دەرەوە (مغولستان خارجی) دا خووازەکەی کە لەبابەت کوردەکاندا، دابووی، وەریگرتەوە!

گۆڕانی ئەو ڕاوتەدبیرە زۆر بەسووکی پێکهات، ئەوەش پتر لەبەر ئەو مەبەستە بوو کە دەولەتی عەراق ڕایگەیاند، کەئەگەر دەوڵەتی شورەوی، لە شۆرای [٢٨] نەتەوەیەک گرتوکاندا لایەنگری لەمەسەلەی کوردەکان بکا، زۆربەی دەولەتە عەرەبەکان، هاتو، چۆی خۆیان لەگەل دەوڵەتی شورەوی دەبڕن. مسکۆ هەروەها مەترسی لەوەبوو کە بەغدا هەڵوێستی ئەوەیە وەلەوەی بگەڕێ کە پشتیوانێکی دیکە پەیدا بکات وەئەویش بەتایبەت دەبێ دەولەتیچینبێ.

گومان وابووە کەهاوکات لەگەڵ گۆڕانی ڕاوتەدبیری شورەوی، بارزانی تیندراوە، وەئیتر بەهۆیئەوە تەواویئەو داخووازانەی کە شورەوی ڕایگەیاندبوو نەدەکرا بەڕێوە ببردرێ.

## ١٠ ــ نابەرانبەری فکری بەعسێکان لە بزوتنە وەکەدا

لە هەوەڵی نووامبری ١٩٦٣وە، شەڕ هێمنوئارام بوو! چوونکە بەفرووڵاتی کوردستانیداگرت بوو،وە لەکردەوەدا لەشەڕ پێشیگرتبوو. تالبحسین شەهیت

وەزیری کاروباری دەرەوەی حکومەتی عەراق لەشاری لەندەن لە باسو هەوالیکی تایبەتی دا ، ڕای گەیاندکە : "ئایا ئێمە بەڕاستی بەچ‌چەشنێک دەتوانین لەگەل کوردەکان پێک‌بێن‌ەوە ڕێک کەوین تا داخووازی ئەوان پێک‌هاتبێ ؟ ئایا ئێمە لەڕاستەقینەدا دەتووانین لەگەل دەولەتێکی سەربەست‌و و ، سەر بەخۆی کورد لەعەراق‌دا کـە بڕوای کوردەکانە پێک‌بێت ڕازی‌بین ؟ ئـەوەئاشکرایە کە ناتووانین چوونکە ئەوە نابێتە فێدرال ، بەلکوشتێکی دیکەدەبێ !" [٢٩] وە لەئاکاما هەروەهـا لەقسەکانی‌زیاد کردوگوتی ! هیچ بارۆ دوخێکی ڕامیاری‌و ، نیزامی ناتووانێ بە ڕێوەبچێ ، مەگەر کاتی دەولەت لەعەراق داکاروباری‌چاک‌بێ‌وەبتووانێ‌لەسەر پێی خۆی ڕاوەستێ !

لەسەرەتای مانگی ئوکتوبری ١٩٦٣ سەرئەنجام لەنێوان‌بەعسێکان دا دوو بەرەکی‌پێش‌هات بالی چەپی بەعس لەلایەن‌عەلی‌سالح ئەسسەعدی، نایبی سەرۆکی کۆماری عەراق ، کە دووژمنی ناسر ولایەن‌گرەکانی بوو ، وە مەبەستی ئەوە بوو سۆسیالیستێکی فەوری بینێتە سەرکار ، وەهەلوێستی ئەوەبوکە عەراق ڕێک‌وپێک بکات‌و ، حکومەت بەدەست بگرێت . ئینجا بالی راستی‌بەعس کەسەر بـــە ، تالب‌شەبیب وە حازم جەواد وەزیری ناوخوبوو ، وەسالح سەعدی‌یان بـــە "کومونیست "دەزانی ، لەنێوانیان‌دا دەنگ‌وچەلەمە پەیدابوو ، وەلە کونگرەیەکی بەعسێکان دا لەبەغدا کەلە١١ی نوامبری ١٩٦٣ لە لایەن دووژمنانی ئەسسەعدیێ‌وەپێک‌هات‌بوو ، سەعدی‌لەکەمایەتی‌دا داندرا . . . ئینجا لـــە فروکەیەک داناردیان بۆ وولاتی ئی‌سپانی !

٤٨ سەعات بەشوێنی ئەوەدا ، هەوادارانی سەعدی لەشەقامەکانی بە غداوا ، لەکاتێک کە فڕۆ کەکانی عەراقی هێرشیان بردە سەرکاخی کۆماری‌و ، وەزیری بەرگری عەراق ، خوییان نیشان‌دا ! بەووتەی رادیو بەغدا پیاوانی "ئـرشادی‌مللی" بەعس لە ١٤نوامبردا گەیشتەبەغدا ،وە بریتی‌لە میشیل عەفلەق ، پیشوای بەعسێکان ، وەژی‌نێرال ئەمین ئەل حافز ، سەرکۆماری‌سورییە ، وەژی‌نیرال سالح جەدید ، سەرۆکی ستادی هێزی سورییەبوون ئینجا هەولیان دا کە نێوان ناکۆکی دووبالی بەعسێکان‌ی عەراق لەنێوبەرن ، وەبارودوخـی حیزب لەیەک‌خەت‌و ،ڕێبازدا ، دابنێن ـ وەتاهەل‌بژاردنی "ناوچەئی" نوێ لەونێوان ناخوشی دەست هەل گرن . ئەوکەڕەتە تالب شەبیب بۆ وولاتی لیبی دوورخراوە ،

وەهێندێ لە لایەن گرەکانی هیودار بوون کە لە بەینی دووجناحەکەدا بەرامبەری پێکبێت ! ٣٠

سەرئەنجام عەفلەق و، ئەمین ئەل حافز ، بەشەڕوناخۆشی بەعسێکان دووائیان پێدا ،وەپێ بیانگوتن کە بۆگەیشتن بەقودرەت نابێ تالۆکەو ،پەلەبکرێ

لە ١٨ی نوامبری ١٩٦٣ رادیوی بەغدا بەرنامەیخۆی لەکاتی ٦/٤٠ دەدقیقەوە ، ڕاوەستاندو ، ڕایگەیاند کە"مارشال عارف قودرەتی بەدەستە وەگرت" وەئەوقودڕەتە بۆماوەی سالێک کەتەواوی قودڕەتی نیزامی وولات بەدەستەوە دەگرێت شامل دەبێ . ٣١

بەشوێنی ئەوەدا گەورەکانی بەعسی سورییەلەروژی١٨یدا ، گیران وەتاعارف بەسەر وولاتدا زالنەبوو ، ئازادانەکران . پاش دەمانگ قودڕەت ، پارتیبەعس نەختێک پووچاوە ، وە حیزب "ئەهەوەن و متعادلبوو" .

ئینجا ژێنیرال تاهریحیا بوو بەسەرۆک وەزیر وەژێنیرال هەردان تەکریتی بووبە وەزیری بەرگری ، ٨ ئەندامی کۆنی کابینە هەروا لە حکومەتی تازەدامانەوە ، دووژمنەکانی بەعس لەنهێنیدا دوور دەخرانەوە ـ کاری کوردەکانش بەبێ ئەوەی کەرێکوپێک بکرێ هەرواماوە

روژنامەکانی ئێران هاواریان لێبڵند بوو وەگویتانکە"کوردەکانی عەراق هێرشێکی گەورەیان" دەست پێکردوە ، وەلەناوچەی موسلو ، خانەقین داپاش ئەوەی کەبەعسێکان دووژمنایەتیان لەنێو خوی دالێ پەیدا بووە هەروەها درێژەی هەیە ، بەلاَمساردیو ، سەرماشەڕەکەیڕاوەستاندو ) وەحکومەتی تازەی عارف "کوردەکانی بانگە وازکردوە" ٢٨ نوامبری ١٩٦٣ ٣٢

## فەسلی ٩

## دووهەمین ئاهەنگ (فیوریيەی ١٩٦٤ ـ ئاوریلی ١٩٦٥)
## ئالۆزی (بوحرانی ١٩٦٤)

**١ ـ وەستاندنی تەقەلە ١٠ی فیوریيەی ١٩٦٤**

**بەنێوی خودای مەزن، بەڕوحم .**

**"برایانی ئێمە**

قسەی راستەقینەی خودای گەورەجیهان کەلە قورئانی مەجیددا فەرموویەتی ئەوەیە: "ئەی عەبدینە ئێوە براواتان بەوەی دەبێ هەبێ! کە مرۆڤیکی ڕوحم و حەوسەلەی‌هەبێ، وەبیینەوێ لە سولح وئاشتی‌و، هێمنی دابژین، پێویستە هیوا دار بەروحمی خودای بن جائە گەرهەلوێسیان بەوجورەبوو بولای هێمنی وخۆشی دەڕۆن وەوەک برایان پیکەوە دەژین. " خودا گەورەیە"

وەهەروەها لەلایەن بارزانی‌وە لە١٠ی‌فیوریيەی ١٩٦٤دا هەوال دەرکەوت کە"برا" کوردەکان" وەستاندنی تەقەزۆرزوو بەڕێوەبەرن، وەئێمە لەگەل مارشال عارف ئەوە، بەرەو، پیکگەیشتن دەچین. ١

ئەگەر ئەو بانگەوازە بۆگەڕانەوەی سولح‌و، ئاشتی بۆ کوردستان حەقیقەتی هەبێ، بەڕاستی کورد پێشوازی لێدەکات، بەلام مەسەلەکە هێستا ئالۆزە وەچارە نووسەکە زۆر ئاشکرائیە وە تەنیا بارزانی گوتویەتی کە حورمەتی تەققە وەستاندن ڕابگرن وە "براکوژی نەکەن" وەحکومەت هەروەهاڕاو، تەدبیری ئەوەیە کە"ژیانێکی عادی بگەڕێتەوە کوردستان، وەهێمنی لەوولات‌دا دامەزرێتەوە، ئینجا کورد لەمافەکەی خۆی لە چووارچێوەی عەراق دا بەشداردەبێت. "

دەبیندرێ کە ووشەی "خودموختاری" بەکار نەهێندرابوو! وەبە ووشەی "کوردستان"! بەلێنی نەدرابوو، وەهێستا مەسەلەی "مافی نەتەوایەتی کورد" زۆرباش ڕوون نەبۆوە وەبارزانی تەنیا قامکی لەسەر "هێمنی لەناوچەکەدا" دانابوو،وە سەرئەنجام دەی‌گوت: "خودا بۆ خۆی بەشوێنی ڕاوتەدبیری ئیمەدایە!" هەرلەو ڕۆژە داعارف لەسەرمەسەلەی تەققە وەستاندن ووتاریکی زۆری گوت‌بوو، ولەسەرهەلویستەکە ڕۆیشت‌بوو و (رای‌گەیاندبوو:

٥ ناسینی مافی‌ڕەوای‌برا کوردەکان... پێویستە لە یاسای مەجلسی‌کاتی‌دا بنوسرێ.

ــ ئازادی تەواوی ئەو کەسانەی کە لەبەنددان، لەسەر ڕاگەیاندنی فەرمانی لێ‌خۆش بوونی گشتی،

ــ گەڕانەوەی تەواوی کار بەدەستەکانی ئیداری بۆسەرکاروباری خۆیان.

ــ هەلّ گرتنی باری سەرئەستوی تاجرەکان لەبابەت مەسەلــــەی خوواردنەمەنی، وولات

ــ دروست کردنەوەو، ئاوەدان کردنی شمال زۆر بەتەرّدەستی

ــ دانی زەرەرو، زیان بەخاوەن شتمەکەکانیٚ کی کە لەبەندەردا ماونەوە،

ــ گەڕانەوەی هێمن بۆ ولّات

ئینجا هات‌و، چۆیەکی کە لە بەینی‌بارزانی‌و، عارف دابوو، کەس‌نەی دەزانی بەچچەشنێکە، لەڕاستەقینە دا ڕاوتەدبیری بارزانی لەوکاتە بۆحرانییو گیژە لوکەیەداوە هەروەها بە درێژائی ڕاپەرینی، نەتەوەکەدا بۆ کورد، وە ڕۆژەتالەکانێکی کەلەوماوەیەدا ڕای بووارد بوو نرخ‌وبایخ دابندرێ پێویست بوو واز کات لە بەرچاو بی تا نەبیتە هوی ئەوە. موانەبێ تانەبێتە هوی کەمافەکە لەنێوبچێ، وەپێکهاتنی ناوخۆ لەبەین‌دابێ.

ئەوەی کە لەو ڕووداوەیەدا دائاشکرابووە، لەپاش گەڕانەوەی بارزانی لەسالی ١٩٥٨ بۆعەراق، حیزبی دیموکراتی کوردستان وەمەلامستەفا نەیان تووانی کارەساتیکی ئەوتۆ بەڕێوەبەرن کەهەوالیکی ڕێک‌وپێک بدەنــــە دەرێ... پاش شکانی‌ووت‌و، وێژلەگەل قاسم، کەسەرئەنجام هات‌و، چۆیەکە بەناکۆکی‌گەیشت‌بوو، هەوالّ دەرەکان‌و، ڕۆژنامە نووسەکان کەهەوالیان لە کوردستانەوە بۆدەرێ دەنارد بێ‌گومان لەســــالی ١٩٦٣ ـ ١٩٦٢ دا[٣]

واوه دەردەکەوێ کە "بۆحران گەیشتبوو جیێەکی عاستەم و ناسک" واتە دەهات لەنێوان پارتی‌دیموکرات‌و، بارزانی هەڵو، مەرجێکی خراپ بەهەست‌بێت. بارزانی، پارتی تاوان باردەکرد کەنایەوێ لەگەل حکومەتی بەغدایە پێک‌بێت.

پاش فەرمانی تەققەوەستاندن لە ١٠ی فیورییەی ١٩٦٤ دا ئەو ووتەی بارزانی کە لە پێش‌دا گوت‌بووی، بەجوۆرێک ئالوزی‌و، ناکۆکی لەنێو کوردەکان[٤] دا هەستی هەبوو کە تائەوڕادەیەی‌گەیشت‌بوو کەنزیک بوو شەڕی ناوخۆی کوردەکان بقەومێ.

## ٢ ـ مەبە ستەکانی بارزانی (مەنتقی بارزانی)

لەبەرچاوی بارزانی مانای تەواو بوونی کاری کوردەکان ئەوە بوو کە سە بارەت بەتەققەوەستاندن، کاروکردەوەی کوردستان بەجێیەک دەگات.

بارزانی لەووتارێک دا ڕای‌گەیاند، وە ئەو مەتەلەی لەسەرەتاوەگوت: کا برایەکیان‌گرت‌بوو، لەدارێکیان بەست، لەوکاتە دالێیان‌پرسی،ئەری پیاوە کە چیت پێ‌خوشەو، دلت‌چی دەوێو، ئاوات‌و، مەبەست‌چیە؟ گرتوو کەوەلامی داوە کە: "تکام ئەوەیە لەو دارەم بکەنەوە، وەلەدارەکەی دیکە کە ٣٠ هەنگاوی بەینە بمبەستنەوە" جالەوقسەیەی کە ئەو گرتویە گوتی، کێشک چێگان سەریان لێ سووڕماو، نەختیک ڕامان، وەلە بەرخۆیانەوەگوتیان دەبێ، ئەوە چ‌هەلوێست‌و، مەبەستێکی تێدابێ وەقازانجی ئەو ئالو، گورە دەبێ چ‌بێ؟ لییان‌پرسی: کا برا مەبەستت لەوکارەچیە؟ ٥

وەلامی داوە کە ئەوکاتەش بۆخویی دەرفەتێکە کە ٣٠ هەنگاو ڕێ‌دەڕۆم‌و باوی لاقم دەکرێتەوە.

بارزانی بەووتارەکەی درێژە پێداوگوتی: بەراستی جائەو گرتۆیە گەلی کوردە ٣٠ هەنگاو،بۆخۆی دەرفەتێک‌و، هەل‌کەوتێکە، وەئێستا کە هێمنێک‌و، ئاشتێک بۆئێمەو، بە غدایە هاتۆتە پێشێ، پیویستەکەلکی لێ‌وەرگیرێ.

لەڕووانگەی مێژوو نووسو،و، مێژوو ناسیکی کورد بەنیوی عسمەت شەریف وانیلی ئاواچاوەڕووان‌ی کردوە، ژێنیرال بارزانی دەبێ بەچەشنی گەوهەرتراشێک ئەوەی ڕەچاوکات دەلێ "هێزی ئێمە لەسەرسەرەوەی نەتەوەی کورد بەحسیب‌دێ‌و،

هەستی‌هەیە، بەلام‌پاش دووسال شەڕ پێویستە ئـەوکـەڕەت نەتەوەکەمـــان لەسەرەوەی هێزە کە قەراربگرێ!"
٦

دوونەقل‌و، دووشکل کە بارزانی ڕاوتە دبیری لەسەربوو: پاش دووسال شەڕ بەتایبەتی پاش زەرەرو، زیانی هەوەلین شەری کوردەکان لەگەل بەعسیکان خەلکی کورد هیچ توانائی‌و، قودڕەتیکی وەدەست نەکەوت.... ڕوژنامە نووسێک کە بە دووای چەندمانگ تەققەوەستاندن چۆتەکوردستان ئەوادەگێڕێتەوە تەنانەت لەکاتی تەقەوەستان دا واتە لە فیورییەی ١٩٦٤وە: "تەواوی دێیەکان‌و، ڕێگا باشەکان کە بۆشاری سولەیمانی دەچێ بەبومبی ناپالم، سوتاندراوەو لەنێوچوون.

ئینجا خەلکێکی کە لەئاوایەکان مابوونە، لە کوخەکانێکی کە لەداروچرپی‌و گەلای‌دار دروست کرابوون دەژیان. لەنێوان ٥ مانگ‌دا ٣٠٠٠ ئاوەدانی‌لـە ناوچەی کوردستان دا لە بەین‌چوو، وەسەدان خەلکی دێیەکان هەلوەداو، ئاوارە ببون..." ٧

سەرئەنجام واڵاشکرابوو کە: ماندووببوون، بێ‌تەفاوەت، دەگونجێ بلین باوەڕیان نەمابوو:

دووهـــــــــــم تەققەوەستاندن لەگەل عارف، وادیارە بەو نەتیجەیەدەکات کە بارزانی ڕاوتەدبیری ئەوەیە کە پەلامارێکی بۆسەپارتی دیموکرات وە بۆسەر ئەوکەسانەی کەدەرووبەری‌ویان گرتووە بەرێ، لەراستەقینەدا دەگوتری کە هەلوێستی عارف لەگەل‌ڕاو، تەدبیری بارزانی یەکتریان گرتۆتەوە وەک کە عارف حیزبی تاوان‌بار کردبووکە: "ئەندامانی حیزب، کەدەورووبەری بارزانیان گرتووە، بریتین لە سیخورو، خەبەرچین‌و، پیاوە ئمپریالیستەکان... جابەراستی بارزانی‌ش وەک ئێمە دەیەوێ کـــە پارتی دیموکرات لەنێوبەرێ!" ٨

### ٣ــ جییاوازی لەبەینی‌پارتی‌دێموکرات وبارزانی

باش زەربەی کوودتای نوامبری ١٩٦٣ کە حکومەتی عەراق بەراستی لەڕو، لاوازو، بێ‌هێز ببوو، پارتی دیموکرات پێ‌لەسەر درێژە پیدانی شەڕ دەچەقاند،

تاکو دەولەتی ڕازی بکات کە لەسەر میزی ووتو، ویژدانیشنێ، وە هەروەها لەومەسەلەش دڕدونگ ببوو کە بەبێ ئەوەی مەسەلەی (ئوتونومی) یان "لامەرکەزی) حەل کرابێ، بۆچ دەبێ بارزانی بەتەققە وەستاندن رازی بووبێت.
حیزب پیێوابوو کە لەبەینی بارزانی – عارفدا لەووتو، ویژێکی نهێنی" دادەبێ پیکهاتنیک بەدی هاتبێت.

جەلال تالەبانی لە ٢٢ی فیورییەی ١٩٦٤ لە کونفراسی ڕۆژنامە نووسەکان کە لەشاری ڕانیەدا بەڕێوەی‌بردبوو وەهاوبەشی تێدا کردبوو، وایگێڕاوە کە بارزانی باسی ئەوەی نەکردوە کەچەشنە پیک هاتنێک لەگۆڕێ دابێ. بەلام هەواڵ بەری رویتر ڕایگەیاند کە لە ٣ی مارسی ١٩٦٤ دا بارزانی گوتویەتی کە پیک گەیشتنێک بەڕێوە بردراوە! ٩

وادیار بوو کە پ.د . ک لەسەرمەسەلەی هێزی کوردستان لەگەل بارزانی پیکنەگەیشتبوون.

لەتێلێ گرامیک کە لە ڕۆژی ٢یمارسی ١٩٦٤ داکرابوو، بارزانی لەسەر مەسەلەی هێزی نیزامی بەراشکاویوە کە زیاترمەبەستی بڕینی ووتو، ویژە کە ببوو، پیێ چەقاندبوو، وەگوت بووی کە:

"کاتێک هیزی حکومەت بییەوێ کە دووبارە بێتەوە ئەومەلبەندانەی کە لەژێرچاوەدیری حیزبە، ئتر ئێمە هیچ چەشنە یارمەتیک ناکەین، وەتەنانەت وای لێ دێ کە بکێشیتەشەڕێبەینی ئیوەو، ئیمە، بەکورتی ئامادەیئەوەبین لەگەل پ.د.ک بەشەری. ١٠

پاشگە یشتنی ئەوتیلی گرامە کە بەراستی هەڕشەو، گووڕشەی تیدا بوو، ٦ ئەندامی پۆلیت بورو (ئەندامانی دەفتەری رامیاری– وەرگیر) وەکمیتەی ناوەندی لەگەل بارزانی لەشاری قەلادزە، چاوپێ کەوتنێکیان بەهەست هیناوە ووتو، ویژیکیان کرد. لەمارسی ١٩٦٤

ژینیرال بارزانی هەمیشە(هەڕەشە)ی لەحیزبی دیموکراتی کوردستان دەکرد وەدەی گوت کە پێویستە لە"سەروک" فەرمان بەرن، چونکە بەراستی (کوردیناساندوە" وە مرۆڤی سەرۆکی هیزی کوردستانە، وەنابێ "سەرکردەکانی پارتو، ڕابەرەکانیان" قازانجی خەلک لەپیناوی قازانجی خۆیان بنێن!

لەئاخری مانگی مارس دا پاش کۆونەوەیەکی نیزامی (کنفرانس) ی

سەروکەنیزامیکانی کورد، بارزانی، عومەرمستەفا وەعەلیعەسکەری لەسەرکار لابرد ،بەجیێ ئەوان سەرهەنگ ئەکراوی، وەنووری مەعروفیدانا . ١١

## ٤ ـ کنفرانسی پارتی دیموکراتی کوردستان ( ٩ ـ ٤ ئاوریلی ١٩٦٤ )

پاش ناکامی و شکانیووتو ،ویژ لەگەل بارزانی، سەروکەکانی پارت ڕاو، تەدبیریان هێنا سەرئەوەی کەبارزانی دەیەوێ کە "حسیبی خوێ لەگەل ڕاپەرینی کورد، جودابکاتەوە" جابۆ پێ ڕاگەیشتن بەومەسەلەیە لە شاری ماوەت، لە ئەندامانی دەفتەری ڕامیاری، ئەندامانی کمیتەی ناوەندی،وە هێندێ لـــە ئورگانەکانی دیکەی کورد وەسەرانی نیزامی حیزب، کنگرەیەک پێکهات، تالە بارەی تەسمیمی بارزانی، وەتەققە ڕاوەستان ڕاوتەدبیربکەن، ئینجا پ.د.ک لە ١٦ لاپەران دا کە بەچەشنی بەیاننامەیەکی دوورو، درێژ ب.زمانی عەرەبیبوو وە بەنێوی بەیانییەی «پیک هاتنی عارف ـ بارزانی ڕێبازیکی راستەقینەی ئاشتی خووازانەیە؟یانپەیمانیکی کاپیتولاسیون ؟" لە١٩ی ئاوریلی ١٩٦٤ دابۆ خەلکی بلاو کردەوە. سەرئەنجام لەو بەیاننامەدا بارزانی بەوانە تاوان بارکرابوو:

ـ ئەوتەققەوەستانە هیچ کەلکو، قازانجیکی بۆ کوردەکان تێدانیە، چوونکە هیچباسی داخووازەکانی کوردەکانی نەکردوە.

ـ ئەوتەققەوە ستاندنە بەقازانجو، سوودی حکومەتە.

ـ بەگەڕانەوەی هیزی نیزامی بۆ کوردستان وە دانانی ئیدارەکان لە ناوچەکەدا بێشک و گومان دەست دەکەن بەگرتنو، لەبەندیخانەکردنی، پارتێکانو، ئەفسەرەکانی

ـ بێگومانئەو تەققە ڕاوەستانە مانای تەواو بوونی شوڕش لە کوردستان دایە واوەدەردە کەوێ کە بەو کارەی بارزانی کە زۆرکاریکی پڕلەمەترسیـــە، راپەرینیکورد بۆلای نابوودی دەکیشێ " جامە بەستبە مەیەکە حیزبی دیموکراتی کوردستان خەباتی خوێ لەسەر ڕێبازی راستەقینەی خوێ دژی کردەوەکەی ڕامیاری بارزانی، کەمەترسیکی گەورەیە دریژەپێدەدا، وە هـــیوادارە کەلە

ئاکاما سەرکەوێ وە بارزانی‌ش بۆسەر ڕێبازی خوێی بگەڕێتەوە. ١٢

پاش کنفرانسی ماوەت، پارت بەپێویستی‌زانی کوڕێک بنێرێتەلای بارزانی وەنەتیجەی کاری خۆی پێ‌ڕابگەیێنی. بارزانی وەلامی نارد کە کاری کنفرانسی ماوەت بێ قانوونیە، چوونکە سەرکردەی پارتی لەوێ داحازرنەبووە! وەپێشنیاری کرد کە کنفرانسێکی دیکە لەشاری قەلا دزێ بەماوەی مانگێک بگیرێ...

بەلام دەفتەری‌سیاسی پارتی‌دیموکرات ئەو کۆ بوونەوەی ڕەد کردەوە وەڕای گەیاند کە کوبوونەوەیەکی کە لـەژێر سایەی چەکدارەکانی بارزانی پێک‌بێت ناتووانی کەلکی لێ‌وەرگیرێ. ١٣

لەهەوەلی مانگی ژوئن دا کۆبوونەوەیەکی پ.د.ک لەئەندامانی ڕامیاری وەک برایم ئەحمەد، وەعلی‌عەبدوولڵا، وەئەندامانی دەفتەری رامیاری، وە عەزیز شەمزینی (نەوەی سناتور عەبدوول‌قادر) نایبی ئەندامی دەفتەری سیاسی بەنیوی ئەندامانی ڕێکخەر بۆ چاوپی کەوتنی بارزانی چوونەشاری قەلا دزی.

## ٥ ـ گوفت‌و، گۆی بارزانی لەگەل تاهریحیا (لەسەرەتای ژوئن‌ی ١٩٦٤دا)

سەرئەنجام بارزانی چاوەڕووانی وەی دەکرد کە چاوپێ کەوتنێکی لەگەل تاهریحیا سەرۆک وەزیری عەراق بکا. ئینجا لەو چاوپێکەوتنەدا ئەومەترسیە هەبوو کە بارزانی تائەو ڕادەیە بڕوا کە بلێ: "من خاکی عەراق بەجێ‌دێلم، وەلەوەپترناتووانم" ١٤

بەراستی پاشەڕۆژی‌تالی بارزانی هەر لەلایەکیوە نەبوو، وەلەوئاخریانە دادەهات هەڵ پەسێردرێو، تەنیا بمێ‌نێتەوە، هەل‌پەساردن‌و، دووژمنایەتی لەگەل کوردی ئیران و تورکش لەلایەک [illegible]

---

١- "ژی‌نیرال دوگول گویی خوی لەبانگە وازەکان کەر کردبوو، ئینگلیس وئەمریکاش مەبەست بەقازانجی نەفتی‌خۆیان ئاگاداریان لەعەراق دەکرد، تەنانەت دەولەتی شورەوی‌ش لەو بابەتەوە وازی لی‌هێنابوو!

لەنیۆخۆیی‌دا، بارزانی لەگەل سەروکەکانی پ. د. د نیوان ناخوشی لێ‌وەدەرکەوتبوو: سەرئەنجام عەلی‌عەبدوولڵا، ئبرایم ئەحمەد، وەجەلال

سەروک کوماری وەختی‌فەرانسەم. ر

تالەبانی خۆیان بۆ چاوپی کەوتن لەگەل تاهریحیا ئامادە دەکرد، بەلام مەلامستەفا، نەی‌دەویست جگە لە جەلال‌تالەبانی کەسی‌بوووچاوپیکە وتنە لەگەل‌بێ، تەنانەت بۆیش رازی نەبووو، زۆر بەلاساریەوە ئەوی دەسەلماند![١٥].

جالە وەختە ناسکەدا ٢٠ دەزگا جیپ حازر کرابوو، وەبارزانی لەگەل شێخ لەتیف، سالح یوسفی، عەزیر عەقراوی، وەهێندێ لە گەورەدەرە بەگە عەشیرەتەکان سازبوون‌و، چوون بۆ لای ناوچەی خالەکان کەنزیک بەرانیەبوو، کە هردوک لا بەیەکەوەبگەن.

چاوپێ‌کەوتن بەجێ‌هات، پاش‌ئەوەی کەبارزانی کاتێک لەسەرقەست‌و، مەبەستی حکومەت رۆیشت‌و، گوتی: "ئێستا کە مرۆڤەکان لەکاتی‌حازر دا لەگەل سەروکەکانی کورد لەووت‌و،ویژدان‌کە نوێنەرانی نەتەوەکەن بەراستی لێرە دابەتەواوی دیاری کراکە حیزب هەل پەسێردراوە.

بەلام زور زووکات کەوتەمەترسی وکاتی‌ناسکەوە، دەنگ بلندبوو، وەنیوان ناخۆشی پەییدا بوو: جگە لە دوکتور فیلوجی کەمدیری کاروباری وەزارەتی دەرەوەی عەراق وەچاپەمەنی بوو، ئەوانی‌دی هەموویان کەنیزامی‌بوون پێیان خوش‌بوو کەکارە کە سەرنەگرێ وەشەر لە کوردستان دا هەلائی‌سێتەوە، وە بەپێچە- وانەی ئەوان دوکتور هەلویستی ئەوە بوو کەمەسەلە کە لەرێگای رامیاریەوە جی بەجی‌بیت!

لەئاکام‌دا پارتی دیموکرات‌ی کوردستان بەو نەتیجەیەگەیشت کە لەسەر ئەسلی‌مەسەلە باس بکرێ وەدەری‌برێ کە پێویستە چەشنی ئوتونومی ئیداری لە کوردستان‌دا وەدی‌بێ.

بەلام تاهریحیا لەو پێشنیارە توورە بووگوتی: "ئەو داوایە بەمانای جۆی کردنەوەی ناوچەی شمالی عەراقە، لەوولاتی عەراق!"[١٦]

ئینجا سەروک وەزیر داوای ئەوەشی کرد کە پێویستە حیزب دیموکرات،وە حیزبەکانی‌دیکە هەمووبرووخێن، وەهەروەها ژێنیرال‌هانی خەمماس سەروکی دووەمی دەفتەری ناوەندی حیزبی بەعس رای‌گەیاند کەپێویستە تـــەواوی ئەفسەرە کومونیستەکان،وە رووناک بیرانیکی کەکاتی تیک‌شکانی شورشی قاسم هەلاتووون‌و، پالیان وەکوردەکان داوە، بمان‌دەنەوە!

حیزبی دیموکرات وەلامی داوە، ئەوکارە وەختیک دەکرێ کە فەرمانی

لێ بووردنێکی گشتی لەلایەن دەولەتەوە لەسەرتاسەری وولات بڵاوبێتەوە، وەبەڕێوە ببردرێ، دەنا ئەوکارەوا بەتالووکەو، لاپلەسەنی نابێ!

بەشوێنی ئەوقسەدا سەروک وەزیر دژی ئەومەسەلەیەش دەنگی خۆیی دەربڕی و، ڕای گەیاند کە ئێمە لەماوەی سی سالدا لە هەلبژاردنێک دا کە دانشتگەی پاسای نەتەوایەتی بەڕێوە دەبردرێ، قسەی لێ دەکەین!

سەرئەنجام پاش ئەو هەموو گفتوگۆیە کە لە ڕانیە کرا، بەبێ ئەوەی کەنەتیجەیەکی الێ وەر گیرێ وە ڕای یەکتر بسەلمێنن، کۆبوونەوەیە کە پاش شەودرەنگێک، بلاوەی کرد دوو کۆڕە کە هەر کامیان ڕێی خویان داگرت و، لەیەکتر جودا بوونەوە.

"دوکتور فیلوجی مودیری وەزارەتی دەرەوەی عەراق لەسەر دەمی ئاخری ووت و، ویژەکادا گوتی کەبەراستی کوردەکان داوای مافی گشتی نەتەوایەتی دەکەن، وەئەو مەسەلەیەش لەبەر چاووی حکومەت زۆرگرنگە، وە ئێمەی لەمەترسی هاوپشتووە.

## ٦ـ برانی هات و، چولەگەل پارتی دیموکراتی کوردستان

جەنگەی ئەوەبوو کە دەهات هات و، چۆی کوردەکان لەگەل حکومەت ببڕدرێ، بارزانی ش هەر بەو بۆ نەیەوە وەک کە لەپێش دا هەرشەی کردبوو لەگەل پارتی دیموکرات نێوان ناخوشی لێ پەیدا بوو، وەهات و چۆی بڕی.

حیزب بەوەی رازی ببوو کە کوبوونەوەیەک لەبارەی پێک هاتنەوە کەی دا بەڕێوە ببردرێت، لە ٢٥ی مانگی ژوئینیدا ڕاوتەدبیرهاتە سەرەوەی کـــە "کوبوونەوەیەک بەبێ ئەوەی کە لایەنگری لەهیچکامیان بکات، بەڕێوە ببردرێ،[١٨] بەلام ئێستا کەش نەزاندرا کەلەو کاتەدا کەدەهات ئەوکوبونەوەیە پێکبێت، بۆچی بارزانی عەلیعەبدوولاوەعــەزیزشەمزینی گرت و، تەنیا برایم ئەحمەد توانی لەو کونگرەیەدا بەشداربێت.

لەهەوەلی مانگی ژوئیەی ١٩٦٤ دا بارزانی لەگەل ٩٥٠ مرۆڤ نوینەر لەشاری ڕانیەدا لە (شەشمین کـــونـــگرە )هاوبەشی کرد، بەلام ئەندامانی سەرۆکی ڕامیاری ناوە رووکەی حیزب لەکۆنگرەکە دا هاوبەشی یان نەبوو. وەدەنگ

وباس وابوو کە بارزانی چەشنە "کودتا" یەکی لەنێو کوردەکاندا بەڕێوە بردووە.
ئینجا بەو جورە ١٤ ئەندامی کمیتەی ناوەندی پارتی دیموکرات لەلایەن ئەندامانی کۆنگرەی ڕانیە بەبیانووی "چێوتی لەکار هاوشتن‌و، خووار ڕۆیشتن" لەپارت دوورخرانەوە، وەبۆ بەڕێوە بردنی ڕامیاریکی تازە ٥ ئەندامی دیکە کە یەکیان بەنیوی حەبیب کەریم سی کریتری گشتی، وە ئەوی دیکە بەنیوی دوکتور عوسمان بوو هەل بژاردران.
دەفتەری سیاسی حیزب کە لەلایەن ئیبرایم ئەحمەدەوەئیدارە دەکرا، دەری‌بڕی کە بارزانی "هەروەها لایەن‌گری لە دەرەبەگەکان دەکا، وەخۆی بە سەروک عەشیرەت دەناسێ) وە ڕادیو کەشی‌نیوی "کوردەکانی پیش مەرگەیە" بەو هەلستانە نیوان ناوخۆشی‌و، هات‌و،چۆ لەنێو حیزب و بارزانی زیاتر بوو.
هەوالێکی هێزی نیزامی ڕای‌گەیاندبوو، کە هیزی ئیبرایم ئەحمەد، وەجەلال تالە بانی‌گومان،وایە کەلە١٠٠٠ پیاو پیش‌مەرگە پترنەبستن[٢٠]، لەکاتێکدا، ١٥٠٠٠ تا ٢٠٠٠٠ پیش‌مەرگە لایەن‌گری خۆیان لەبارزانی دەربریوە
لەنێوە راستی مانگی ژوییەی ١٩٦٤ دا هێزی گەورەی ژی‌نیرال بارزانی بەسەروکایەتی کورەکەی خۆی عوبەی‌دیل‌لا،هێرشی بردە "ناوەندی ماوەتی"، حیزب‌وە لە ڕۆژی ١٧ی ژوییەدا کە کونگرەی پارت کۆبوونەوەیەکی هەبوو، بەرەنگاری‌یەکتربوون، وەسەرئەنجام لەو بەرنگاریەدا پیاویک کوژراو،چەند کە سێکش بریندار‌بوون.[٢١]

## ٧ــ برایم ئەحمەد لەئێران:

سەروکەکان‌و، ئەندامانی دەفتەری ڕامیاری پارتی دیموکراتی‌کوردستان عەراق،وەک برایم ئەحمەد، جەلال تاڵەبانی، عومەر مستەفا، عەلی عەسکەری‌و، حلمی‌شەریف، بو ئەوەی کە لە شەڕی‌بەینی کوردەکان دا خۆبپاریزن وەیان پێیان وابوو، کە لەئاکام دا لەخەبات خۆ بکێشنەوە،پەنایان بۆ ئیران‌هێنا.
دووئەندامی دیکە یانی‌عەلی‌عەبدوللاوە ع"زیز شەمزینی، لەلایەن مەلامستەفاوە لەبەندکرا بوون، وەنوری شاوەیس لە ئنگلیس دیترا.
جەلال‌تالەبانی لەوەی خاترجەمم ببوو کەلەلایەن‌ئێرانەوە، تووشی گێچە-

لێکنابێ.

ساواک هەروەها بەنیگەرانیەوە چاوەدێری لەوکوردانە دەکرد کە لـــە سنوورەوە، ڕەخنەنەکەن وە هەروەها ئاگادارێکی تەواوی لەپەنابەرەکان دەکرد، وەهەولیدەدا کە "کۆمونستەکان" تێیاندا ڕەخنەنەکەن. "ئەوهاتنە بوئیران ئەوەندەی نرخو،ئەرج هەبوو کە ئێران لەو بابەتەوە دژی عەراق و، مسرئەوکوردانە بلاوێنێتەوەو، دەستیان بەسەر سەری دابکێشێ." ۲۲

ئینجا هەرچێک بیجەلال تالەبانی هاتەتارانێ ولەبارەی هاوڕێیەکان و،بەسەرهاتی ،وان لەگەل سەرۆکەکان گفتوگوێ کرد.

کوردەکانێکی کەلەگەل جەلال تالەبانی بوون لەهەمەدان دامەزرا بوون، بارزانی دژیهاتنی ئەوکوردانە دەنگی خۆیی دەربڕی، وەهێزیئێران لەگیانی کوردەکان ئاگاداریدەکرد.

سەرروکەکانو،ئەندامانی دەفتەری ڕامیاری کوردەکان تاکاتی دووبارەی شەڕ لـــەناوچەی کوردستانی عەراقدا هەر لەئیران مابوونەوە،واتە تا سالی ۱۹۶۵ وەپاشان هاتنەوە ئەوناوچەیەی کە لەژێرچاوەدێری بارزانی دابوو.

ئینجا جەلال تالەبانی، عومەرمستەفا، عەلیعەسکەری وحلمیشەریف بۆجیگای خۆیانچوونەوە،جێگیر بوونەوە. ۲۳

## ۸ ــ سەرئەنجامی بۆحرانی سالی ۱۹۶۴

بڕینی هاتو،چـۆ ی سیاسی لەنێوان حیزبی دیموکرات، وەبارزانی، وەهاتنی پارتیکان بۆئیران زەرەرو،زیانێکی گەورەی بۆ ڕاپەرینە کەبوو.

بەراستی گەنجو، ڕووناکبیرەکانی، دەستەی برایم ئەحمەد، جەلال تالە بانی، زورباشی یەکتریانگرتبووە،و، لەیەیەکتر کۆبووونەوە، پاشئەو بۆحرانەو، نێوان ناخۆشیە وەپاش "ڕەچاوو کردنی سیاسەتی ناوغار"[24] یانی لە نهێنیدا خەبات کردن، لەحەقیقەتدا بارزانی تەنیا مابۆوە، وەتەنیا لایەن گرەکانی وەفادار بەوی، دەورووبەریانگرت بوو، کەئەوانیش، کاردانیو، ئەرجی ئەوتۆیان نەبوو: پاش سالی ۱۹۶۴ لـــە پ.د.ک دا مروفیکیوا کەئدئیولوگ بێ، وەکارو، باری حیزب بەریوە بەری وەیان بیروڕای ئوتونومی،یان فکری

سەربەخوئی لە کوردستان داهەبێ، نەبوو.

کاتی سالی ١٩٧٠ بەتایبەتی سالی ١٩٧٤ ڕووناک بیرەکانی کورد کەلە کەنار شۆڕشی بارزانی کۆ ببوونەوەو، جەمبورەیان بەست بوو، بارزانی یان نەیدەویست کە لەفکری ئەوان کەلک وقازانج وەرگرێ، وەیان لەبەر تەنگ نەزەریو، بەدگومانی خۆیەوە بەئانقەست ئەوکارەی نەدەکردوە سەری بەسەر قاپێلکی خۆی داگرت بوو.

ئینجا برایم ئەحمەد وەجەلال تالەبانی دەیانەویست کە شۆڕشی کورد، لە "کانگایەکی هاوکاری ڕاستەقینە." بەشداربێ، بەلام وەک کەگوترا لەپاش سالی ١٩٦٤، بارزانی تەنیامابۆوە، بارزانی هیچکاتێک سەروکێکی دیکتاتوربە ژمارنەدەهات، بەلام دەسالپاش، واتە لەسالەکانی تالیوناخوشیدا سالی تالی ١٩٧٣ – ١٩٧٥ وە،کەس ڕاو،تەدبیری لەخۆوە نەبوو، تەنیا سێ کەس هەموو شتێکیان لەنهێنیدا بەرێوەدەبرد کەبریتی بوون لە: ژینرال بارزانی، ئیدریس وەمەسعود.

کەسێک نەی دەوێرا لەبەرانبەر بارزانی دا ووستەی لێ بێ، تەنانەت لەکاتی تێکچوونی ڕاپەرینەکەشیدا مرۆڤێک نەی توانی دەنگی لە بەرەوەبێ وەیا سەربلند بکات.

دەگونجێ کە بگوترێ کە بارو، دۆخێکی کە لەسەر ئەستۆی کۆڕی برایم ئەحمەد، جەلال تالەبانی داندرابوو مەسئولیەتی کەم بوو: بەڕاستی کولانەیەک نەبوو کەلەویرا تیشک و رووناکایەک بێتە ژوورێ،یانی لەوشکانەو، ناهومێدانەی کە بارزانی هێنابوویە گۆڕێ، کوردەکان رزگاربکات. ئەوەش بەچاکی ڕوون نەبوێ. تەوە کەچ کەسێک بۆتەباعسی شکانیو،بڕینی ڕامیاری لەنێو پارتی دیموکراتو، بارزانی، چوون هەریەکیەکێی تاوان باردەکات. بەلام ئەوەی کەبەچاکی دیاربوو، بارزانی بۆخۆئی تەواوی باری مەسەلەی کوردستانی لەڕاپەرینەکەدا لەهەوەلەوە بەکولەوە گرت بوو، کەرەتی هەوەل کە لە هێزی عەراق شکاو، ڕووی لە خاکی ئێران کرد، جا پیویست بورزانی هەتا ئاخر ئەوبارە گرانەی هەلگرێو، بیگەینیتە مەقسەد.

سەرئەنجام سەروکەکانی حیزی دیموکراتی کوردستان لەسال ١٩٦٤ هەربەوەتاوانبار کران کە حیزبی کومونیستی عەراق ئەوئی شبتاهاتەی کە لە

سالی ١٩٥٩ – ١٩٦٠ کردی و تەنانەت بەووتەی بارزانی گوناحیان لە بەرچاوی بارزانی پترش‌بوو.

## ٩ – سەرسەختی بارزانی لەگەڵ بەغدا

شەشمین کۆنگرەی پارتی دیموکرات کەپێکهات ،لەبارەی بڕانی‌هاتو، چوی‌پارت لەگەل بارزانی سەرۆکی قەدیمی‌بوو، وەهەروەها ڕووبەرووبوونی پارت لەگەل بەغدا، ولە ئەنجام ڕا گەیاندنی یادداشتی مەسەلەی مافی نەتەوایەتی کورد بەچەشنی‌ئوتونومی‌و، گەڕانەوەی کاربەدەستەکانی ئیداری ناوەندی بو خەتتی ئازادی،وەڕاو،تەدبیرلەکاتی سەلماندنی بیرەوەری ئوتونومی حکومەت‌بوو.

هاوکات لەگەل ئەو ئاکارانەلە کۆنگرە دا تەسمیم‌گیرا کەلەمەسەلەی مارکسیسم –لنینیسم بکۆڵنەوە،بەلام لەبەرنامە دائیدی‌باسی لێ نەکرێ.

لەئاخروئوخری سالی ١٩٦٤ دا کە بارزانی‌و، داروده‌ستەکەی‌وە هەروەها ڕابەرەکانی دەفتەری پۆلیت بورو (دەفتەری سیاسی) تەنیا لە بیروڕای ئوتونومی دا بوون‌وە داواکەیان‌لەو مافانەی‌ژێرەوە بریتی‌بوو:

تاقمی شۆڕشگێڕی "مەجلس"ی کوردستان لە ٥٠ ئەندام بریتی‌بن،
– هاوبەشی‌و، ئیدارەکردنی ڕاستەقینەلە "کابینەی وەزیرەکان‌دا"

ئینجا جەلال تالەبانی‌و، هاورێیەکانی لەوەتاغێکی سادەی دەفتەری دابوون، وە چاوەڕووانی کاروبارەکەیان دەکرد. ٢٥

## ١٠ – حەوزەی کورد:

لەئاخری ١٩٦٤ داژەنیرال بارزانی هێزی لەتەواوی ناوچەی‌کوردستان‌دا هەبوو،وەئەوهێزەش تا سال ١٩٧٥ هەربەردەوام مابووە.

بارزانی لەسنووری ئێران وتورکیە، لەناوچەی‌خانەقین ڕا بە درێژائی‌و، پانائی مەلەبەندهێزی هەبوو، وەهەروەها لە ڕۆژهەلاتەوە تازاخۆ، وە لە ڕوژئاواوە،لەسنووری تورکیە – سوریە لەلایەن هێزی بارزانی بەرگری لیدەکرا،

ئەو سەرزەمینە نزیک بە سیوپێنجهەزار کیلومتری چووار گوشدا بریتیبوو.

مەلبەندە کە دووبەشبوو، یەکیان مەلبەندی بادنیان کە لەژێر چاوەدێری وهێزی ئەسعد خۆشەویبوو، وەئەویدی بریتیبوو لە کانگای هێزی بارزانی کەلەبەشی ڕۆژهەڵاتدا، یانی لەقەراغ ڕێگەی بەناوبانگی هامیلتونبوو.

لەشارەکانی کوردنشین، وەک سولەیمانیّ، کەرکوک، هەولێر، ئاکرا، دەهۆک، زاخۆ، هیچکامیان لە مەلبەند ی بەرگریدا نەبوون، ئینجا نیوەی ژمارەی دانشتووانی کوردی عەراق کەنزیک بەیەکمیلیونکەس بوون، لەژێر چاوەدێری کوردە ناسیونالیستەکاندا بوون. ٢٦

بەڕاستی لەسنووری بەینی عەراقو تورکیاوە هەروەها لە سنووری ئیران وعەراق دا لەسێبەشان بەشێک لەبەرحوکمی بەغدایە دابوو، وە ئەوی دیکە کوردەکان بەسەری داڕادەگەیشتن.

دەگونجیّ بلێن کە بارزانی تا ئەو ڕادەیەی دەستی دەڕۆیشتو، حکومەتی دەکردکەلەسەروکوەزیریکزیاتربوو. کەبەراستی وەک پادشایەکی بیّ تاجوتەختی کوردستانبوو.

بەحەقیقە تەوە کوردەکان لەسەردەمی حکومەتی ئەفسانەی بەدرخانەوە، وە لەتەواوی ڕاپەرینەکانی کورد بەدرێژائیمێژووە، تائەو کاتو، زەمانی بارزانی کەدەستی دەڕۆیشت نەی توانیبوو، دەورەیەکی ئەوتوّ دیتبێ واتە بەو جورەی لەبارو، دۆخی سیاسیو، جوغرافیائیو، ... ستراتیژیکیوە کەلکوەرگریّ.

## فەسلی ١٠

### شەری عارف (ئاوریلی ١٩٦٥ — ژوئنی ١٩٦٦)

داگیرسانەوەی شەڕ وەدەستوری مارشال عارف دژیژینیرال بارزانی، دەبێتەهۆی ئەوە کەهاتو،چۆ لەبەینی هەردوک لایان دا ببڕدرێ. ئینجا تەققەوە ستاندنێک لەفیورییەی سالی ١٩٦٤ دا بەڕێوەبردرا، بەلام نەزاندراوە چۆن بووە.

دەبێ بگوترێ کە لەپێش ئەوەیدا کەشەڕەکە دەستی پی بکرێتەوە،لە لایەنهەردووک لاوە، بەیاننامە، نووشتاریخەبەری،یادداشت وەجارجار تەققە لە یەککردن ئـالو، گۆڕدەکرا. لە١١ی ئوکتوبری ١٩٦٤ دا بارزانـــی نووسراوەیەکی بەحکومەتی عەراقدا.

واتە لە ٢٤ ئاوریلی ١٩٦٤دا داخووازەکانی دووپاتە کردبووە بە کورتی لەبارەی دانانی یاسای مەجلسی عەراقوەتێدا گونجاندنـــــــی مافینەتەوایەتی کوردەکان وە مەسەلەی ئوتونومی،دووابوو،وەمادەیەکی نیزامی کە لەبەینی هەردوک لادا گوترا بوو،وەبیریهێنا بوونەوە. هـەروەهـــا ڕایگەیاندبوو کە هیزی کوردەکان لەوکاتو،وەختەدا پتر لە ٢٠٠٠٠ کەسن! پێویستە ئەوهێزە کەئێستا کـە کوردستانی دەپاریزن،ببێنە هیزینیزامی بەنزمو،تەرتیبی و لاتی کوردستان".

لە دێسامبری ١٩٦٤دا لەبەینی پێشمەرگەکان،وەهێزی نیزامی عەراق لەناوچەی چەمچەمال،بەرنگاریێک ڕوویدا. هێزی عەراق دەیەویست کەبەزور ناوچەی بەندیخانوەخانەقین،لەژێردەستی کوردەکان بێنێتەوەدەرێ،بەلام

هیستا ، شەڕبەچاکی دەستی پێنەکرابوو .

لەژانوییەی ساڵی ١٩٦٥ ، عەبدوول حەمید سوبحی وەزیری داخلە (ناوخۆ)ی عەراق رای‌گەیاند کەحکومەتی عەراق ، دان بەسەر مەسەلەی هیزی کـــورد ،دانانێ، بەڵکو دەیەوێ کەچەک‌وئەسلەحەکانیشیان دابنێن ،وەهەرگز و هەرگز لەگەل کوردەکان ووت و ،وێژ دووپاتە ناکاتەوە ،ئینجا ئێمە ئاگاداری دەدێن کە عەراق نە "هەر ئێستا ، بەلکو لەداهاتوش‌دا[٢] پێ‌لەمەسەلەی ئوتونومی کوردان نانێ‌وەنای‌سەلمێنێ ، جابەوچەشنە وادیاربوو ، کەئاسوێ کوردستان تاریک‌دەبێ وەهات‌و ،چۆ دەبڕدرێ .

### ١ ــ سەرەتای دووژمنایەتی

لەمانگی ئاوریل‌ی ١٩٦٥دا هێزی‌زرێپوش و تانکەکانی عەراق لەشاری سولەیمانێ هەل‌پرژانەسەرخەلکی ،وە ٦٠ کەس‌یان کووشت ،سەدان کە سیان بریندار کرد . [٣]

بەوجورە شەڕی‌عارف دژی خەلکی کورد ،دەستی پێ‌کراوە هێزی نیزامی عەراق لەوشەڕەدا دەیەویست کوردەکان بشکێنێ وەتاسنووری ئیران‌و ،تورکیە بەرەوپیش بـــڕووا، لەچەند حەوتووان دا پێش مەرگانی کورد لەنێوهەل‌گری وکاری‌کوردستان یەک‌سرەبکات . عەراق هەولی‌دەدا کەهەربەسووک وهاسانی ، بەبێ‌دەنگ زووتر ئەوشەڕە دووائی پێ‌بێنێ وەتەواوی ناوچەی کوردستـــــان بگرێتەوە .

ڕۆژنامە نووسیک کەبەنهێنی چولۆوولات لـــەتێلی‌گرامیک‌دا بەوجورە گوت بووی : "کوردەکان" لەکوردستان‌دا لەشەڕێکی نهێنی‌دا نیزامیکان‌و ، ئەفسەرەکان دەکووژن ،جەنازەکانیان دەنێرنەوە بۆلای جنوب ، تەنیـــــــا کەس‌وکاریان دەزانن ، دوعایان بۆدە کەن‌و ، دەیان نێژن ،ئیترهیچی‌دی دەگۆڕێ‌دانیەو ،دەنگ‌لەبەرکەس دەرنایە . [٤]

دەگوترێ کەزۆربەی هێزی نیزامی عەراق ، یانی ٤٠٠٠٠ تا ٥٠٠٠٠ هەزار لەکوردستان‌دا بوو کەئەوهیزە بەفرۆکەی میگ‌وەفرو کەشکاریکای هونتێر زۆر بەتووندێوە پشتوانی لێ‌دەکرا .

کوردەکان دەسیتان بەشەڕی پارتیزانیو، گرێلائی واتەچریکی کرد، چەکی هەرەقورس لەلایەن هێزی عەراقەوە بە کاربردرا ، جا ووردەووردە، دەهات‌کەیارمەتی دەولەتی ئیران بۆ کوردەکان دەستیپێبکرێ وەکارەسات جۆرێکی دیکەی لێبێ!

لەهەوڵین هێرش‌دا هێزیعەراق بەشەڕێکی کلاسیکی تەواوعەیار،یانی بەنەزم‌وتەرتیبەوە،وە لەرووی نەخشەیەکی رێکو،پیکەوە، هەلمەت دەباتە سەر ناوچەکانی چوورتا،پێنجوون،قەلادزێ وەدەیان گرێتەوە. شەڕ هەروەها لەناوچەی هەولێر،وە لەدەورووبەری زەنجیرەی شاری سەفین‌دا توونددەبێ [٥].

لەپائیزی سالی ١٩٦٥دا کوردەکان هێرشی تەواویان بردەوەسەرناوچەکانی سەفینو،چووارتا،وەرێگای هاتو،چۆپان لەهێزی عەراق‌بڕی وەمەلبەندەکەیان گرتەوە. لەزستانی ئەوێ‌سال‌دا هێزی عەراق نەیتووانی کارەساتێک بەڕێوە بەرێ.

بەلام بۆ هەوەلین کەڕەت‌دەبێ کە هێرشێک دەباتە سەرپیش‌مەرگەکان، وەسەرئەنجام لەشەوی جیژنی نوویلی ١٩٦٥ دا ئەو هێرشە توندتردەبێ وەتامانگی فیورییە درێژەی پێدەدرێ. بەعسیکانی عەراق سێجار بەقودرەت گەیشتن، وەلەمانگی سی‌پتامبری ١٩٦٥ داحکومەت بەدەستی دوکتور بەززاز قازی کەنیزامی نەبوو گەیشت. ئەمما هەرئەڕتێش بوو کە دەستی دەڕۆیشتو، حکومەتی دەکرد، لەسەرەتای هێزی نیزامی عەراق‌دا، ئەفسەرێک بەنێوی ژێنیرال ئووخەیلی کەوەزیری بەرگریعەراق بوو، وەزۆردژی کوردبوو، کاروباری بەدەستەوە گرت.

## ٢ ــ هاتو،چوێ بارزانی لەگەڵ ئێرانیێکان :

لەوکاتە دابوو کەژینرال بارزانی تەسمیمیکی گرنک،بەلام تال‌ونالەبار، کە سەرئەنجام بۆ کوردەکان چارەڕەشیو، بەدبەختی تیدابوو،دەگرێ. بارزانی بەرلەوە لەگەل عەشیرەتەکانی ئێران هات‌وچوێ هەبوو، یانی لەپێش‌دا هێندی لەشەڕ کەرەکانی پێش‌مەرگەی کوردی ئیران لەگەل بارزانیکان،شان‌بەشان دژی هێزی عەراق بەشەڕدەهاتن،وەئەوەش دەنگی لەجیهان‌دا دابووە.

لەهەوەلی سالی ١٩٦٢ دا یارمەتی‌دانی کوردەکانی ئیران زۆربەگرنگی دەستی پێکرابوو، بەلام لەوسەردەمەدا لاپەڕی ڕۆژگار گۆڕا: بەراستی‌ئیران لەوکاتە ناسکوعاستەمەدا نەی‌دەتووانی سنووری‌خۆی بپارێزێ،جائەوچینەی‌بو هەل‌کەوت‌و،دەستی یارمەتی بۆبارزانی درێژکرد، کەبەتیرێکی دوونیشانان بنگێوێ، یانی هەم‌سنووری ئیران‌بپارێزێ وەهەم‌هێزی عەراقیش پتر لەڕو، لاوازبکات. هێزی عەراق بەتەواوی گەمارۆی ئابوری کوردەکانی‌دابوو، کوردەکان دەستیان بەهیچ‌کوی ڕانەدەگەیشت،لەئاکاما کوردەکان ئەویارمەتیان سەلماند.

ئینجا لە خواردنەمەنی،تفاق، لەجلک‌وبەرگ،لەپوول، چەک‌و،ئەسلەحە یەک‌بەدووای‌یەکێ‌دا بۆ کوردەکانی بارزانی دەچوو،وەحیزبی دیموکراتی ئیرانیش لەوکومەگەدا بەشداری‌دەکردو،سیورساتی‌دەگەیاندە پێش مەرگەکانی بارزانی.

لەهاوینی ١٩٦٢ دا ئەو شتمەکانە دەدرابە شەڕکەرەکانی عەبدوول لای ئسحاقی (ئەحمەدتوفیق). لەسالی ١٩٦٢ تا ١٩٦٤ ڕا ئەوهات‌و،چوێەپتر بوو،وەئەو یارمەتیە لەسالی ١٩٦٢ وە لەلایەن ڕۆژنامە نووسەکان لەهەوەلین ڕیپۆرتاژدا ئاشکرابوو وەبلاوکراوە.[٧] ئەو سازوبەرگە لەلایەن ئێرانەوە بە لێشاو دەهات وە ڕۆژ بەڕۆژ پتردەبوو وەتائەو ڕادەیەگەیشت کە تەنانەت‌چەن سەروکی کوردی ئێرانێ لەکوردستانی عەراق‌دا لەتەنشت کوردەعەراقیکان بەتایبەت لەستادی بارزانی‌دا جێگیردەبن. ئەمما ئەوهات‌و، چوێەلەبەینی مرۆڤەکان کاتی‌نهێنی‌و تایبەتی هەبوو، کومەگێکی کە بارزانی وەری‌دەگرت بەنێوی لایەن‌گری کوردەکانی ئێران بوو کە پشتیوانیان لە شۆڕشەکەدەکرد.

### ٣ــ ..... وە،شا!

ئەونەخشەو، هەلوێستە لەسەر ڕێوو شوێنی برایم ئەحمەد جەلال تالەبانی بوو کە بارزانی بوهەوەلین جار لەگەل سەرۆکە ئێرانیکان هات‌وچۆی سازکرد.[٨] یانی لەو کاتەدا بوو کە بارزانی سەبارەت بە پەنادانی کوردەکانی عەراق کە لە شاری هەمەدان جێگایان درابوویە،هەرەشەی لەئێران کرد، کە بوچ‌ئەوکارەی کردوە.

ئەو مەبەستو،ڕازەش هەتائیستا هەر لەنهێنی دا ماوەتەوە کە چـــۆن بارزانیوا بەتووندی هەڕەشەو،گوڕەشەی لەئیران دەکات،وە پاشانیش ئەو نیوان ناخۆشیە دەبێتەهۆیئەوەکەئاشتیو،هاتوچۆی کوردەکان وئیران بەوڕادەیەبگات!

شایئیران بەچاکیلیێ،رون ببوو، کەبرایم ئەحمەد ــ جەلالتالەبانــی ناتووانن ببنە بەر هەلستیکی گەورەی شۆڕشی بارزانی. ئینجا بەجێیە کە بگوترێ کە سەروکەکانی حکومەتی عەراق تاسالی ١٩٧٠، نەیان توانی قەتبەچاکی لەکوردستاندا حکومەت بکەن،وەشۆڕشگێڕەکان دژی ئەوان ڕاوەستابوون. هەلوێستیکی دیکە کە بوو بە هۆی ئەوە کە شایئیران پتر یارمەتیخۆی بەبارزانی بکات، ئەوە بو کە دەیدیتکە کوردەکانی ئێران بەئاشکراو تیڕاشکاوی کومەگی شۆڕشە کەدەکەن، جا ڕاو،تەدبیری هێنا سەرئەوەیکە بۆ بەدەستگرتنو، چاوەدێری ئەو ناوچەیە واباشە کەئەو کومەگە بەدەقو، دوغریبکرێ، تاکوردەکانی هەردووک مەلبەند بـکـەونــە ژێر چاوەدێری ئێران. لەئاکاما لەمانگی مەی ١٩٦٥ ڕۆژنامە نووسەکانی جیهان ڕایان گەیاند کەچەکو،ئەسلەحەی تازە،وە هەروەها چەکی قوورس بۆ شۆڕشگێڕەکان دەچــێ .[9]

لەپائیزی ١٩٦٥دا یارمەتی شایئیران بەکوردەکان بەوڕادەیەگەیشت،وە بوو بەهۆی ئەوە کەشاحسین پادشای ئۆردون لە ٢٥ تا ٢٨ سێپتامبری ١٩٦٥ بۆ چاوپێکەوتنیک هاتە تاران لایشایئیران.[10] سەرئەنجام زۆر زوووڵاتەیەک گرتوکانی عەرەب دژی یەکەتی کوردەکان وئێرانیکان دەست بەکاربـــــوون، کاربەدەستەکانی مسر لەمانگی ئوکتوبری ١٩٦٥دانوێنەری بارزانیان کەشەوکەت عەقراوی بوو بانگ هێشتە شاری قاهرە،وەبەدووای ئەودا،دوکتور بەززاز سەروک وەزیری عەراق بۆ قاهرە داوەتکرا.

## ٤ ــ هەوەڵین پیشهاتوبەسەرهاتی عەراقو،ئیران

لەنیوەڕاستی مانگی نوامبری ١٩٦٥دا بەینی هێزی ئیران و عەراق بەرەنگاریک وەدیدێت، سەبارەت بەوکارە ،**بالویزی** ئیران لە بەغدا، لەحکومەتی عەراق داخووازدەکات کەپتر لە سنوورەکانی خۆی پارێزگاری بکات.[11] لەڕۆژی هەوەڵی ژانوییەی ١٩٦٦ ئەو هەواڵە وەکتۆپ دەنگی داوە: پاشسێرۆژ

شەڕ لە ناوچەی پێنجوون دا لەژێر چاوەدێری فەرماندەعەزیز عەقراوی، هەڵمەتێک بۆسەر هێزی عەراق دەبردرێ وەسەربازێکی زۆر دەکوژرێ،پاش کوشتنی ۳ئەفسەر،وە ٤١ سەربازی عەراقی شۆڕشگێڕەکانی کورد بە زۆریەی خویان پێنجون‌دەگرن.

ژینیرال ئوخەیلی وەزیری بەرگری عەراق ڕای‌گەیاند کە پێویستە ئیران سنووری خۆی بەچاکی لەشۆڕشگێڕەکانی کورد ببەستێ،تاکوو دەوڵەتێکی دەرەوەیانی قوودرەتێکی خارجی‌بیانووی بەدەستەوە نەبێ کە یارمەتی بە کوردەکان بکات، واتە لە ناوچەی شمالی عەراق، ئیسرائیلێکی دیکە بەهەست‌بێ. ١٢

لەڕۆژی ٤ی مانگی ژوییەی ١٩٦٦ دەولەتی عەراق رەسمەن دەنگی‌خۆی دژی دەولەتی ئیران دەربڕی،وەگوتی ئیران بە هەموو جۆرێک بە شۆڕشگێڕەکانی کورد کۆمەک دەکات.

عەدنان پاچەچی وەزیری دەرەوەی عەراق، بەکارداری بالوێزی ئیران‌ی ڕاگەیاندکە ئێران بەبزووتنەوەی‌کورد یارمەتی دەکاو،ڕێگایان دەدا کە لە خاکی‌ئیرانەوە بۆ لەنیێوبردنی حکومەتی عەراق‌تێ بکوشن وەئینجا وڵاتی‌ئیمەش بەچەکەکان خۆیان لە٢ی‌ژانوییەدا بومباران دەکەن. وەهەروەها عەراق، ئیرانیکان تاوان باردەکا کە کوردە شۆڕشگێڕەکان، بەهەموو جۆرە چەکو، ئەسلەحەوە وەک خومپارە، مین، ئەسلەحەی دژی تانک، وەتوپو، نارنجەک ئامادەی شەڕکراون![13] ئینجا وەزیری کاروباری دەرەوەی عەراق بەوەش رازی نەبوو، بەباڵوێزی ئەمریکا، ئنگلیسو، فرانسە ڕادەگەینی کە پێویستە لەوکارە ساتەی ئیران باش ئاگاداربن

بەشوێنی ئەوەدا، دووای‌چەن ڕۆژ ژینرال عەبدوورەحمان عارف برای‌سەروک وەزیری عەراق وەسەروکی ستادی‌عەراق، ئەمیرعەبباسی هووەیدا سەروک وەزیری ئێران تاوان‌باردەکات کەلەهەوەڵی مانگی نووامبری ١٩٦٥،ڕا،لەگەل بارزانی هاتو،چوی سازکردوە، وەچاوو پێ کەوتنیان بووە. ١٤

جابۆ ماوەیەک ئەو قسەوباسە نەختێک لەبیرچۆوە،بەڵام لەزستانی ١٩٦٦ – ١٩٦٥ دا مەسەلەی کوردو، ڕاپەرینەکەی کە دەسال بەر دەوام بوو لەدونیایەدا دەنگی دابۆوە، وەئاگاداری درا کە ئەگەر زوو چارە سەری ئەو کارە

نەکرێ،واچاوە ڕووانی دەکری کە ئەوە نەتەوەیەک لەنێو چوون دایە وەدێ تەرت وتونابێت.

**٥ ـ مەسەلەی ناردنی ئەسلەحە**

هەوال دەرەکان ڕایانگەیاند کە کوردەشۆڕشگێڕەکان لەدوولایەوە کومەگیان پێدەکرێ،واتە هەم لەلای ئیرانڕاوە هەملە لای دەولەتەکانی دیکەشەوئەسلەحەو، سازوبەرگ بۆ بارزانی دەچێت.

لەسەردەمی مانگی ژانوییەی ١٩٦٦ پۆلیسی ئەلمان، چووار مرۆڤی ئەلمانی غەربی دەگرێ،ئەو چووار کەسەلە ولاتی چکسلەواکیۆە کامیونێک پڕلە ئەسلەحەبۆ کوردەکان دێبەرێت کە لەشاری برووک دەگیرێ. ئەو چەکانە دەبوو لەریگای ئەستنبوولە وەڕاگویز رابایەو، بەدەستی کوردەکان بگەیشت بایە، بەلام هینابوویانە ئەلمانی غەرەبی وە نەزاندرا کە ئەوچەکانە لەکوێوەڕا هاتووە، وەناردراوە،ئایا بە خۆمالیو تایبەتی ناردراوە،یان لە جێگایەکی ڕەسمیوە،وە پولیسی ئەلمانیش لەوبارەدا لـ(سەرینەڕۆیشتو، دەنگی دەرنەبڕی. ١٥

**٦ ـ یەکگرتنی هەوا دارەکانی تالەبانی:**

لەمانگی ژانوییەی ١٩٦٦ دا جەلال تالەبانی، عومەرمستەفا، عەلی عەسکەری وە حیلمیشەریف لە دێیەکیڕاکەجێدانشتیان بوو، هەلاتن،بارزانیکان ئەوهەلاتنەیان بەوردی چاوەدێری دەکرد،ئەو چووار مرۆڤە لە(هایوینی سالی ١٩٦٥) دا لە ئیرانی ڕا کەدەگەڕینەوەولاتی عەراق، بەو مەبەستە بوو کە لەگەل سەرۆکەکانی عەراق چاوو پێکەوتنێکیان هەبێ. بەلام لەوکاتەدا تووشی مەیدانی شەڕێ دەبنو، دەگەل تاقمیکی تازە ڕووبەروو دەبن، ئەودەستەیە پیاوە بەکریگیراوەکانی کوردبوون کە شانبەشانی هیزی عەراقی لەگەل کوردە شۆڕشگێڕەکان بەشەردەهاتن، واتەبە جاشی ٦٦ نیودەبردران.

ئینجا ئەو کەڕەت،نەکتەنیا عەشیرەتەکان بوون کە بەخوینی سەری بارزانی تینوو بوون، بەلکو ڕووناک بیرەکانی حیزبی دیموکراتی کوردستانی

عەراق‌یش بوون کەدەیانەویست لە دەست بەسەریەو ، ئاغایەتی و عەشیرەتی ، یانی دەرەبەگەکان خۆیان ڕزگار بکەن .

ئەو ڕۆشن‌بیرانە زۆرزوو لە ڕۆژنامەیەک‌دا ،کەنێوی "ئەننور" بوو ،شتیان دەنووسی وە هەستی خۆیان بەسەرکردایەتی برایم ئەحمەد ، جەلال تالەبانی ، عەلی‌عەسکەری ، حیلمی‌شەریف ، عومەدەببابە دەربڕی ،وە دژی ئاکارو کردەوەی دەرەبەگەکان ،وە رزگار کردنیڕاپەرینەکە لەچنگی ئەوان دەسیتان دابۆ قەلەم .

ئەوانە نزیک بە ٢٠٠٠ کەس بوون کە تا سالی ١٩٧٠دژی مەلامستەفا خەباتیان دەکرد وەدەولەتی عەراق چەک وئەسلەحەی دەدانی .

شتێک کە بۆ ڕۆژئاوایەکان بەچاکی ڕوون نەبۆتەوە ، ئەوەیە کە دووژمنایەتی لەنێو سەرانی حیزبی دیموکرات ،یانی‌پاش بزووتنەوەی مهاباد ، کە بارزانی هەمزە عەبدوول‌لای ، بۆدانان‌و ، پێک هینانی پ.د.ک ی عەراق ، لەئیرانەوە ناردەوە عەراق پاش ٢٠ سالان چۆن بووە .

### ٧ ــ شەری هەندرین (مەی ــ ژوئن ١٩٦٦)

شەڕی هــەندرین فەسلێکی نوێی لەمەسەلەی کوردستان‌دا بەڕێوەبرد : بەراستی ئەوە ،بۆ هەوەلین کەڕەت‌بوو کە کوردەکان لەگەل شەڕێکی گەورەی کلاسیک‌دا کە عەراق دەستی پێکردبوو ، ڕووبەروو دەبوون . شەڕ چەن حەوتووان بەردەوام بوو ، لەو شەڕەدا ، دوو لەشکری تەواوی عەراق وە بە کریگیراوەکانی برایم ئەحمەد ،کەلە لایەن فڕۆکەو ، توپ ، پشتیوانیان لێ‌دەکرا ، هەلمەتێکی گەورەیان بۆسەر شۆڕشگێڕەکان‌برد .[١٦]

هێزی شۆڕش کە بریتی لە ١٧٠٠ پیش‌مەرگە بوون ،وە لەلایەن عەبدوول‌لا پشدەری وە ئیدریس بارزانی کەیەکیک لەکوردەکانی مەلامستەفابوو ، ڕابەری دەکران ، بۆهەوەلین جارپوستی فەرماندەهیان دانا .

جێگای ئەوشەرە ،کیوی هەندرین بوو کە ٢٨٧٦ متر بەرزائی هەبوو ، وە ئەو کیوە کاتێکی حەسساسی‌بوو ، وەبەسەرکیوی زووزەک دادەیڕووانی،کەئەویش سەر چەققەریی هامیلتون بوو ،کەستادی ناوەندی بارزانی لێ‌بوو .

ئەوشەڕە پاش چەن ڕۆژمردنی عارف کە لەهێلی‌کوپتردابوو ، وەکەوتە

خوواری (١٣ی ئاوریلی ١٩٦٦) لە لایەن هێزەکانی عەراقەوە دەستی پێکراو، توانیان کە تروپکی هەندرین بگرن. ئینجا لەماوەی دەڕۆژان دا لەشەڕێکی نابەرانبەردا کە هەربەردەوام بوو، هێرشو، دژیهێرش لـەهەردوک لاوە بووە لە ١٢ی مە ١٩٦٦ شۆڕشگێڕەکانی کورد دژی هێرشێک دەست پێ دەکەن، وەهێزی عەراق جێگای عاستەمو، گرنگیستراتێژیکی خوی بەجێ دەلێت، ئەو هێرشە هەوال دەریکی فرانسەوی بەنێوی ڕێنێ مۆریە[9] کەلموێ بووەو، دیتویەتیوئاوای نووسیوە:[17] ئەوشەڕە بۆعەراق زۆر سەرشۆڕی تێدا بوو، هێزی عـــــەراق زۆر[18] خراپ شکا، سەربازی زۆر لێ کوژرا، زۆریان هەڵاتن، زۆریان بە دیلگیران، ٤توپی کیوستانی ٤خومپارەیگەورە، ٦ ڕەشاشیگەورە، وە تفەنگیکی زۆریان وەدەستکەوت، کوردەکانیش ٦٠ پیشمەرگەیان کوژرا.[19]

## ٨ـ بڕیارنامەی پێکهاتنی ٩ ژوئنی ژوئنی ١٩٦٦

هەوال دەری عەراق هاوکات لەگەل هەڵبژاردن لەبەغدا ڕایگەیاند کە شۆڕشی کوردەکان تیکشکا، وەئیدریس بارزانی کوژرا!

بەلام هەرلەو هەلو، مەرجەش دابوو کە حکومەتی عەراق لەنهێنی دا بو ووتو، وێژ چەن مرۆڤێکی ناردە لای مەلامستەفا: ١٣ی ژوینی ١٩٦٦ کۆڕێکی کورد بەسەروکایەتی حەبیب کەریم نووسەریگشتی پ.د.ک سالحیوسفـــــی وەموحسندزەئی ئەندامانی کمیتەی پارت، بۆ ووتو، وێژ لەگەل عەبدورەحمان عارف کە جێنشینی براکەیعارف بوو، وەببوو سەروک کۆمارهاتنە بەغدایە. سەرەتای ووتو، وێژ کە دەستی پێ دەکرێت، گوتراوە کە چەشنە سەرلێشێوانو، سەر سوورمانێک بوو. عارف لەووتو، وێژە کە دا زۆر سەرشۆڕ بوو، ونەی دەزانی چیلێ، ئینجا بەگشتی باسیمەسەلەی کوردی دەکرد، حەبیب کەریم لە وەلامدا[20] گوتی، لەپێش هەمووشتێکدا پێویستە کە هەردوکلا لێیبکۆڵینەوە کە "ئایا ئیمە بۆ پیکەوە بەشەڕدێن؟ مەگـــەر هەمووومان مووسولماننین... مەگەر موسولمان هەموو پێکەوە براییەکترنین[21]، جائە و موسولمانە چکوردبێ یان عەرەب فەرقو جۆییازی لە گۆڕێ دانیە! گفتوگۆیەکی دیکە کە لەگەل سەرۆک وەزیـــــــر عەبدووررەحمان بەززاز، کەماموستای حەبیب کەریم ش بوو لە زانستگەی حقوقدا،

لە بەغدایە بەڕێوە بردرا بوو: بەڕاستی ووت‌و،وێژ زۆر بەچاکی وجووانی ودوستانە درێژەی پێ‌دەدرا.

تاقمی بارزانی لە دوکتور بەززاز داوا دەکەن کە مافی‌خەلکی کورد بدرێ‌و، بسەلمێندرێ، بەلام سەرۆک وەزیر وەلام دەداتەوە کە ئەرتێش ئەومەبەستەی ناسەلمێنێ....

وەلە ٢٩ی ژوئینی ١٩٦٦دا پاش ووت‌و،ویژە کە سەروک وەزیری عەراق لەسەر تلویزیون مافی کوردان بەچەشنی لامەرکەزی بە خەلکی عـــەراق ڕادەگەیێنێ. سەرئەنجام لەبارەی ئەو پێک‌هاتنە،

برنامەیەکی کە لە ١٢ مادده دا ڕێکو، پێک کرابوو، بلاو کراوە کەبریتی بوون‌لە: هەل بژاردنی نوێنەر، دانانی‌یاسا، لێ‌خوش بوونی‌گشتی، لەدوورگەو، ناوچەی کوردستان‌دا، زمانی کوردی جێی زمانی عەرەبی بگرێتـــــەوە، وەلەئیدارەکان‌دا، داب‌و، ڕۆسم‌بێ، پیش‌مەرگەکان بەچەشنی (هیزی دەولەتی، لەمەلبەندی کوردستان‌دا ببێ، تەواوی خەلکی کورد کەهەڵ‌وەدا بوون پچنەوە سەر کاروباری‌خۆیان، وە بەژیانی ڕاستە قینەی خۆیان درێژە پێ‌بدەن. هێندێ لە مادەکانی بڕیار نامە کە بەنهێنی نووسرابوو، کە حیزبی دیموکراتی کوردستان، بەچەشنی ڕەسمی بناسرێ،وە گرتوکانی ڕامیاری لەبەندیخانەکان ئازاد بکرێن،وە کانگای ناوەندی کورد،یانی لیوای کورد لەدەوروبەری دەهوک لەمەلبەنـــدی بادینان‌دا، دیاری بکرێ. ٢٢

لەئاکام‌دا،بەوجۆرەپاش ١٤مانگ شەڕوکێشە، بەشوێنی سەرکەوتنی کوردەکان، گەلی‌کورد توانی بەئاوات‌و، هەلوێستەکانی‌خۆی بگات‌و، وەدەستی بێنێت.

ئەوەی کە شای باسە، حەبیب کەریم بە دووای پێک هاتنە کەدا وای‌گێڕا بۆ وە کە "کاتی ئێمە کوردەکان، زۆرباش نەبوو" ئێمە ١٤ مانگی ڕەبەق کە لە شەڕ دایووین سەردەمی‌ئەوە هات بوو کەچەک‌و ئەسلەحەو، شتومەک‌مان تەواوبێ‌وە بەڕاستی زۆر سەخلەت‌و، نارەحەت بووین." ٢٣

ئەندامێکی دیکەی دەفتەری ڕامیاری بەنیوی دوکتور مەحمود عسمان کە بە "وەزیری کاروباری دەرەوەی" بارزانی دەناسرا، لەبارەی بارزانی‌دا پاش ٩ سال بەو جۆرە دووا بوو وەدەڵێ.

ئێمە بەچاکی دەمان توانی لەو داخووازانەی کەکردمان، پێ،پتر لە بەرەئی خۆمان ڕاکێشین، بەلام بەداخەوە، کەلکمان لێوەرنەگرت: تەنیا بەوپێ گەیشتنە ڕازیبووین [٢٤] لەحەقیقەتدا شەڕە کە بە سوودو،قازانجی کوردەکان تەواوببوو، بەلام وردەوردەکاتی هێمنایەتی وئاشتی دەهات لە نێوبچێوە ئاسۆی کوردستان تاریکبێتەوە.

# فەسلی ١١

## سووەمین خوشحالی (ژوئن ١٩٦٦ ــ ژانوییەی ١٩٦٩)

### ژینیرال عارف و، مەسەلەی کورد :

ژی‌نیرال عەبدورڕەحمان عارف پیاویک بوو، کەلەپاش لەنیو چوونی قاسم لە عەراق دا دەنگی دەرکرد: بەشوێنی ئەوەدالە ١٧ی نووامبری ١٩٦٣ لەکاتی کودتا یانی لەوەختی ڕووخاندنی حکومەتی بەعسێکان، عارف سەردەستەی لەشکری تانک و، زرەهی بوو... پاشان بوو بەسەرۆک ستاد لە (١٩٦٤)، پاش ئەوەی کە براکەی لەنێو چوو، جیگای وی‌گرتەوە. ئینجا بەهیوا بوو کەدووای مارشال عارف، بتوانی وولات بەچاکی ئیدارە بکات. لەماوەی ۴ مانگ تەققە وەستاندن لە ٢٩ی ژوئن‌ی ١٩٦٦، ژینیرال عارف لەگەل بارزانی چاوپێ کەوتنیکی کرد، لە٢٨ی ئوکتوبری ١٩٦٦ لە سەربازخانەی مەفرەق‌لەتەنشت ڕەواندزێ[1] ئەو دوو مروڤە خەلاتیان بەیەکتردا: عارف قورئانی هدیە کرد، بارززانی لەت و، پەتی‌توپەکانی هەندەرینێ[2] لەپیش دانا! بەلام پاش بەردانی هیندێ لەگرتوکان‌ی سیاسی کورد، وەدانەوەی شتمەک و، مولکەکانیکی کە لە کوردەکانیان هەراج کردبوون، روژنامەیەکی کوردی عەرەبی بەنیوی (التاخی)، کە سالح یوسفی بەسەری دارادە گەیشت، وەدەرکەوت.

دەگوترێ کە پیک‌هاتن و، ریک‌کەوتنی زەمانی بەززاز ئتر کاغەزەدڕاویک زیاترنە بوو یانی هات و، چو لەسەرڕادەهات تازەبێتەوە، وەووت و، ویژە دەستی‌پێ بکرێتەوە.

لەهەوەلی مانگی نوامبری ١٩٦٦ ژێنرال عارف لەپاش چاوپێ کەوتنێک لەشمالی عەراق، کەحەوتویەکی خایاند ڕای‌گەیاند: "مەسەلەی کورد ئیدی تەواوبووە.... وەبارزانی بەمین‌ی گوتووە، وەئاگاداری داوە کەکورد مەسەلەی ئوتونومی ڕاناگەینی ،وە دووژمنی جیاوازی لەولاتی عەراق‌دابە ٣

بەلام چەندڕۆژ بەشوینی ئەومەبەستە دا لە کونگرەی ٧ی پ.د.ک لەگەلاڵە( ٢١ ـ ١٥)نوامبری ١٩٦٦) کەلەلایەن بارزانی‌وە بەڕێوە بردرابوو، وە لەگەل ٥ ئەندامی هەل بژێردراوی ـ وەک حەبیب کەریم، سێ‌کرێتری‌گشتی ،وە دوکتور مەحمود عوسمان ،نوری‌شاوەیس، عەبدوولڵاوسالح‌یوسفی وەتەواوی مەقامی‌لی‌نەپرسراو)- ژینیرال بارزانی بەسەر کومار عارف وەبەسەروک‌وەزیر ناجی تالب لەبەیان نامەیەک‌دا کە پڕلە هەڕەشەو ،گوڕەشەبوو، بەوجورەی ڕاگەیاندبوو کە: شەر لە کردەوەدا ڕانەوەستاندراوە ،هێندێ لەهێزەکان پەلامار دێنن ،وە لەولایەشەوە بارزانی حکومەتی تاوان‌بار کردبوو کە دەیەوێ خەلکی تین‌وهان بدەن وەدژی کوردەکان شەڕی تەواوعەیار دەست پێ‌بکەن ،وەسەرئەنجام بۆپێش‌گرتن لەوە، داوای پیک‌هاتنی (کمیتەیەکی‌عالی) کردبوو کە زۆر زووبەوکارە ڕابگات..." ٢

ئەوکردارو ،ئاکارە وای دەنوواند کە نێزیکە هات‌و ،چو لەنێو هەردووک لاهەل‌گیرێ، وەمەسەلەی "سولح‌وئاشتی" بەگاڵتە وگەپ‌بگیرێ، بەلام لەسەر ئەوەش‌ڕا ووت‌و ،وێژ کەم‌و زۆر تابەهاری ١٩٦٩ درێژەی هەربوو!

جارجار کەبەرەنگاری لە ناوچەکەدا وەدی دەهات، دیسان‌مەسەلەی کورد دەهاتەسەرزاران بەلام شەڕی ئسرائیل ـ عەرەب لەسالی ١٩٦٧ دا کە ٦ ڕۆژبەر دەوام‌بوو، بەوخاترە نەختێک مەسەلەکە لەبیرچۆوە ،وەبێ‌دەنگـــەی لێکرابوو، وەکاتیک کەبەعس لەعەراق‌دا بەقودڕەت گەیشت ،بەرهەلستـــی (مەسەلەی عەرەب ـ ئسرائیل، تاسالی ١٩٧٨ هەرلەگوزێ‌بوو.

٢ ـ بارزانی‌و، شەڕی٦ ڕۆژە

بەچاکی ئەوە مەسەلەیەروون نـەبووە کەئایابارزانی دەیەوی کەلە داهاتوو دا ئەگەر پیۆیست بی بەرەنگاری ئیسرائیل بێ‌یان‌نە. وادیار بوو کە بارزانی کاتی

شەڕی۶ ڕۆژە (ژوئنی ۱۹۶۷) دەیەوێ چاوەڕووان بێ کە سەرئەنجامی کار بە کوێ‌دەگات .

کاتێک کە ژینرال عارف لەبارزانی داوا دەکا کەلەوشەڕە دا کۆمەکمان‌بکا ، بارزانی بەوجورە وەڵامی داوە: ئیستا ماوەی ۶ سالە کە ئێوە هەول دەدەن کە کوردی تەرت وتونابکەن‌و ، لەسەرعەرزیی نەهێڵن ،کەوابوو ئێمە چۆن یارمەتی‌تان دەدێن؟" ئینجا عارف‌گوتی هەرچونێک‌بێ هێندێ پێش مەرگەی سەمبۆلیک واتەپیش مەرگەی کەچەشنی نمایشی‌ هەبێ ، بنێرنە بەغدایە. بارزانی وەڵامی داوە: من بە پیش مەرگەی نمایشی‌م بڕوانیە ، بەلام ئەوەش وەک‌خەون‌و ،خیال دەچی ." ۵

ئەو بێ‌تەفاوەیتە لەمەجموع دا ، دەگوترێ کە مەسەلەی عەرەبی لەجیهان دابەقوولی‌لەبارەی‌دەدوێن ، وە وائاشکرا ببوو کە عەراق سەوداکەی تێک داوە ، وە دەولە تەعەرەبەکانیش وەسەرخویان ناهێنن ، ئینجا بەوجورە نێوان‌ناخوشی لەبەینی بارزانی‌و ، بەغدا بەچاکی روون ببوو: لەناوچەی کوردستان ژینێرال بارزانی پشتی بەکێوەکانی شمالی عەراقەوە بوو ، کە پەناو ، سەنگەری گرت بوو ، وەبەر هەلستو ، کەندوکۆسپی بۆ کۆماری عەراق پێک‌هینا بوو! لەماودای چەن سال کە لەعەراق‌دا شەڕ لەبەینی دەولەت و بارزانی بەردەوام‌بوو ، لەنهێنی‌دا ، هەلویستو ، مەبەستی ، بارزانی ئەوی‌وردە ــ وردە دەکێشا بۆ لای داواکردنی مافی سەر بەخۆیی‌گشتی کەهەنگاو هەلێنی‌و ، بچێتەپێشێ .

ئینجا سالح‌یوسفی لەبارزانی بەتەقیەتربوو ، وەلەووت‌و ،وێژیک دا دەری‌بڕی‌و گوتی : ئێمە زۆرچاک بەسەر ناوچەکە دازاڵین ، دژی زۆردارین ،بەلام داوای گەیشتن بەمافەکەمان دەکەین ، ئێمە لە داواکەمان‌دا لەگەل ئسرائیل دژی عەرەب‌هاوبەشین .

لەکردەوە دا بارزانی قــەت نەچووبوەوولاتی ئسرائیل ،وە تەنانەت هیچ کومەک ویارمەتێکش لە لایەن ئیسرائیلەوە بەکوردەکان نەکرا .

### ۳ ــ نرخو ،بایخی یارمەتی شای ئیران :

لەماودای چەندمانگان‌دا کە چێوتی و نالەباری و بەرهەلستیان لە

ئاشتی‌و، تەققەوەستاندن‌دا، دینا پێشێ بارو، دۆخی کارە کە وەڕاســـــت نەدەگەرا" بارزانی بەتیژاشکاوی هات‌و،چوی‌لەگەل‌شاساز کرد،وەئەویش‌یارمەتیکی گرنگی پیدا .

بەلام چاوەڕووانی نرخو، بایخی شەڕی سالی ١٩٦٧ دەکرا کە بزانرێ ڕێک کەوتنەکە بەکوێ‌دەگات : لەمانگی مەی ١٩٦٧ پاش ئەوەی کەدەستەیەک هێزی کۆماندۆی‌شورش‌لەئەندامانی‌پ.د.ک‌ی‌ئیران دەیەویست کانگای ناوەرووکەی حیزب کە بریتی بی لەشەرکەری‌گریل‌لای لە کوردستانی ئیران، بەهەست‌بێت. تاقمیک لەکیمتەی بەڕێوە بەری پ.د.ک ی‌عەراق "سامی" کەجێ‌گیری هەوادارانی شەر دژی شای‌بوو، پێویست بوو کەئەوتەسمیمەبگرێ: یان‌لەبەغدایە بمێنیەوە،یان بێتەوە کوردستانی عەراق،یان بگەڕێتەوە بۆئیران، بەلام بەهەر چونیک‌بێ، دەبێ لەگەل بارزانی‌هات‌و،چوێ‌خوی‌ببڕێ. ٦

پاش‌چەند مانگ کە لەشەری رابردبوو، لە ئوکتوبری ١٩٦٨دا دوکتور مەحمود عوسمان گوتی : ئیمە خۆمان لەکاروباری ئیران‌و، تورکیە تیوەرنادێن. تاران‌و ئانکارا دەزانن هەر وەختێک کە ئەوان پێش‌دەستی بکەن‌و،هێرش بۆ ئیمە بێنن، جائەوکات ئێمەش چارە سەری‌خۆمان دەکەین" ٧ ئینجا وائاشکرا دەبوو کە ووتارەکەی "وەزیری دەرەوەی" بارزانی نیوەی راست‌و، نیوەی درۆیـــــــە. لەراستەقینەدا یارمەتی ئیرانیان بۆ بارزانی زۆربەنرخ‌وبایخ‌بوو، چونکە بارزانی لەلای خۆیەوە، وای حیساب کردبوو کە ئەگەر ڕۆژێک‌بێ، بزوتنەوەی ئیران دژی ئەو کارێک‌بکا ، بارزانی دەستی خوێ وەپیش خست‌بێ‌و، کارێکی‌کردبێ. بەوجورە بارزانی،لەسیمی ئاخری‌دا: لەمانگی ئاوریل ـ مەی ١٩٦٨ سولەیمانی معینی گرت‌و، کوت‌و، پرلەنێوی‌برد، "ئەندامی کمیتەی بزوتنەوەی کوردەکانی ئیران" بوو" خەلیل شەوباشی هەر وەها کوشت، جەندەکی ئەوانی داوە بەسەروکەکانی ئێران! ٨

## ٤ ـ لەنێوچوونی ژێنێرال عەبدووڕەحمان عارف :

پاش ژوئن‌ی ١٩٦٧ کەمەسەلەی کورد حەل‌نەکرا، وەرژیمی‌ژێنیرال عارف لەپێک‌هینان‌و ، ڕاپەراندنی مەسەلەکە بەتەواوی ناتەوان‌و، عێجز مابووە،وە

هەروەها لەمانگی مەی١٩٦٨ داژی‌نیرال عارف دەستی بە دەورەیەکی درێژی "دەورەی ناتەواوی" یاسای عـەراق، بـەڕاو، تەدبیری بەززاز کرد کەپێویستە ئەو هەل بژاردنە لەسالی ١٩٦٦ تا ١٩٧٠وە بەڕێوببردری.

ئینجا لە ١٧ی ژوییەی ١٩٦٨،کودتای "سپی"کرا، واتەیەکێک لە دوو مرۆڤەکانی نێزیکی خۆی کەنیوی ژینیرال داوود بوو،وە سەروک گاردی سەرکومار بوو، لەگەل سەرهەنگ نایف سەروکی ژمارە٢ی ئیدارەی کۆمار، کەلە شەبەکەی ئەفسەرانی ناسیونالیست دابوون، عارفیان گرتو، لەفروکەیەکدا ناردینانە شاری لەندەن...

ئینجا ژێنیرال حەسەن ئەل‌بەکر، کەسەرۆک وەزیری پێشووی بەعسی مارشال عارف لەسالی ١٩٦٣ دابوو، کرا بەسەرکۆماری عەراق،وە سەرهەنگ نایف بووبە سەرۆک وەزیر.

لە ٣٠ی ژوئیەی ١٩٦٨ بەشوێنی کودتای دووهەم، سەرهەنگ نایف‌ش لەو لات دوورخراوە،وە ژینرال حەسەن ئەل بەکر تەواوی قودرەتی بە دەستە وەگرت، ژینیرال حەردان تەکریتی بەوەزیری بەرگری،وەعەمماش‌بەوەزیری‌ناوخو داندرا. پاش ٥سال ناهومێدی یانی لەسالی ١٩٦٣وە، سەرئەنجام بەعسیکان بو کەڕەتی دووهەم کاروباریان بەدەستەوە گرتەوە، وە لە قودرەت دامانەوە.

**٥ ــ کوردەکانو، بەعسیکان:**

بۆ کوردەکان زۆر ناخۆش و تاڵبوو، کەبەعسیکان دووبارەبەقودرەت گە یشتوونەوە: چونکە لە ڕاستەقینەدا لەسالی ١٩٥٨ پاشڕووخانی حکومەتـــی پادشایەتی ئەو کەسانەی کە لەکوماری عەراقدا بە قودرەت گەیشت بوون، لەونیوەدا بەعسیکان بۆکوردەکان دووژمنیکی خوێناویو، چەپەل بوون.

بارزانی کەڕەتیکی دەریبڕیو گوتی: ئیمە بەعسیکان چاک دەناسین وە لەو مەودایەش دا هەڵمان سەنگاندوون". ئینجا چەن حەوتووڕانە بووارد کەبەدەستووری ژینرال تەکریتی ٣٠٠٠ دیی‌کوردەکان بۆمباران کرا. وەژینیرال عەمماش بۆ گەڕانو، سیاحەت هاتبوشمال" وەلەونیوە دا ڕایگەیاند کە هێزی عەراق ئامادەی کارە. بەعسیکان لەوەی دەگەڕان کەجێی پیی‌خۆیان لەناوچەکەدا

پێته‌وبکه‌نه‌وه، په‌ره‌ی پێ‌بده‌نه‌وه. هات‌وچۆڵه‌ناوسه‌رۆکه‌کان، وه‌کورده‌کان به‌چاکی مه‌علوم نه‌بوو، هومێدی پیک‌هاتن له‌گۆرێ دانه‌مابوو، واته ته‌نیاپاش‌نێوان خوش بوونی سالی ١٩٧٠ پیتر عه‌لامه‌ت‌ونیشان‌ی پیک‌هاتن و نێوان خوش‌بوون نه ده‌دیترا" بۆو که‌سانه‌ی که له‌ده‌ره‌وه بۆ چاوپی که‌وتن‌و، وازی کوردستان ده‌هاتنه ناوچه‌که ده‌یان‌گووت که جێگایه‌کی زور عاسته‌م‌و، پڕله‌مه‌ترسیه[١١]. ته‌واوی ئه‌و مه‌لبه‌نده تاده‌گه‌یشته‌وه ڕه‌واندزێ، شه‌وانه له‌لایه‌ن پیش مه‌رگه‌کانه‌وه ده‌پارێزرا. له‌ئاکاروعه‌مه‌ل‌دا ١٢ ماده‌که‌ی که ته‌نیاله‌سه‌رزاران‌بوو، هینده به‌ڕێوه نه‌ده‌بردرا، حکومه‌ت قه‌ت سه‌ری ئاشتی خووازی له‌گه‌ل کورده‌کان نه‌بوو، کورده‌کانیش زۆر له‌وکاته رازی نه‌بوون، ته‌نانه‌ت روژنامه نووسه‌کانیکی که له‌لایه‌ن حکومه‌ته‌وه، ده‌ناردرا بۆ کن بارزانی، ده‌یان نووسی که بارزانی هه‌میشه ڕخنه‌له حکومه‌تی عه‌راق ده‌گرێ‌وه له قسه‌کانی‌دا په‌لامار بۆسه‌روکه‌کان ده‌بات!

روژنامه‌ی ئه‌تتاخی که‌سالح یوسفی وه‌ده‌ری ده‌خست،وه ئۆرگانی بارزانی بوو، ته‌نیا رۆژنامه‌یه‌ک بوو، که زۆر به‌ئازایو، غیره‌ته‌وه شتی ده‌نووسی وه له باره‌ی گه‌لی‌عه‌راق،وه‌کورده‌کان‌دا نووسراوه‌ی بڵاوده کرده‌وه، ژینیرال حه‌سه‌ن ئه‌ل‌به‌کر،دوو، وه‌زیری کوردی به‌ناوانی ئیحسان شیزاد وه‌محسن دزه‌ئی که له هه‌واداره‌کانی بارزانی‌بوون، له‌کابینه‌دا جیێ کردنه‌وه.

به‌لام هاوکات له‌گه‌ل ئه‌وه،لایه‌ن‌گره‌کانی برایم ئه‌حمه‌د، جه‌لال تاله بانی خۆیان کێشا قه‌راغێ وه‌له روژنامه‌ی ئه‌ننور ناره‌زایه‌تی خۆیان ده‌ربڕی[١٢]. هێرشی ڕۆژانه دژی‌بارزانی درێژه‌ی هه‌بوو، ووشه‌کانی فئودال، ده‌ره‌به‌گ، وه‌پیاوی ئمپریالیسمیان پێ‌ده‌گوت.

لایه‌ن گره‌کانی ئه‌ننور نزیک به ٢٠٠٠ که‌س بوون وه‌مانگی به ١٤ دینار به‌کرێ‌گیرابوون وه‌به‌نیوی جاش ده‌ناسران، که‌له‌وانه ١٥٠مرۆقی ئیرانیشی تێدا بوو،که‌له پێشاپێشی‌شه‌ڕه که دا به‌شداریان ده‌کرد. حکومه‌تی عه‌راق له‌و ئاخری‌و ئوخریانه‌دا، ده‌یه‌ویست به‌هه‌ر چونێک‌بێت جوولانه‌وه‌که‌ی کورده‌کان تێک بشکێنێ، جاله‌وباره‌دا هه‌مووفرۆفێلیکی ده‌کرد،وه ته‌نانه‌ت که کورده‌کانی پیکه‌وه رووبه‌روو کردبوون،ده‌شی‌گوت که با‌ئه‌و"سه‌گ‌وگورگانه" هه‌رله‌یه‌کتر ڕۆبێن‌و، خۆبه‌خۆ یه‌کتربکوژن[١٣]. وه‌هه‌روه‌ها بۆ ئه‌وه‌ی که‌کورده‌کان له‌وبزوتنه‌وه‌یه‌ده‌ست بکێشنه‌وه، قه‌ول‌و، قه‌رای دانانی زانستگه له‌شاری سوله‌یمانی‌وه ئاکادێمی کوردی

(فەرهەنگستانی کورد) لەبەغدایەی پێدان. ووشەیەکی دیکەیان کە لەوئاخرێیدا بەبارزانی دەگوت، ئەوەبوو کە سەر بەلای سیونیسمو، بمپریالیسمە تاکوردەکان بەوجورە بەهەرحیلەو، تەڵەکەیەکبێ، لێبنەو، ڕاپەرینە کە تەرتوتونیابێت.

## ٦ـ یارمەتی ئیرانیکان:

ئەوەی کە ئاشکرا بوو، وەبەچاکی ڕوون ببۆوە، بەعسێکان نەیاندەویست کەلەگەل "کوردەکان پیکبین، وەمافینەتەوایەتیان[١٤] وەدەست کەوێ" جا،بارزانی بەپێچەوانەی ئەوان، ڕۆژدەگەل ڕۆژێ لەئێرانیکان نزیکتر دەبۆوە،کاتیک کە شەڕ لە ژانوییەی سالی ١٩٦٩ دەستی پێکراوە، هیچ وەختێک کوردەکان تا ئەوڕادەیە بەچەکوئەسلەحەی "قوورس" وەک رەشاش، توپ، دژیتانک... ئامادە نەببوون، وە هەروەها قەت ئەوبیروباوەڕەوگومانەیان نەدەکردکە دەولەتیکی سووەم یارمەتیان بدات.

سەرئەنجام دەهات کە هێزی ئیران لەسنووری لایخۆیەوە بەئاشکرائی کومەگی کوردەکان بکات.

## فەسلی ١٢

### دووهەمین شەڕی بەعسیێکان لە (بەهاری ١٩٦٩ ــ تامارسی ١٩٧٠)

لە کاتیﮢتەققەﮢڕاوەستان لە ژوئن‌ی ١٩٦٦ دا کەبەراستی ئاشتیێکی بەقەستی ونالەبار هەستی هەبوو، وە حکومەتی "نیوەئاشتی‌و، نیوەشەڕ" کەلەسەرکاربوو، وە هێندێ لەکوردەکان‌ی (جاشی ٦٦)ی تاقمی ئەننور دژی پیش مەرگەکانی بارزانی بەشەڕدەهاتن، بەچاکی روون نەبۆتەوە کەشەڕی دووهەمی بەعس و بارزانی بەدروستی لەچوەختێک دادەستی .پێکراوەتەوە.

### ١ ــ پی‌چەقاندن لەسەر مەسەلەی کەرکوک (هەوەڵی مارسی ١٩٦٩)

سەرئەنجام لە هەوەڵی مانگی دی‌سامبری ١٩٦٨دا سەروکەکانی کورد راوتەدبیر دێننە سەر ئەوەی کە زۆر بەو، هەڵمەتێک لەکانگای نەفتی کەرکوک ... ن. ئەوەش مەبەست لەوە نەبوو کە تەسیساتی ئەوکانگایە لەنێوبچێ، بەڵکو دەیانەویست کە لە دەفتەری تەسیساتی نەفتی کەرکوک ای.پی.سی نەختێک زەرەرووزیان بدەن،وەتەنانەت بەچەشنی هەڕەشەوە لەئاکارو کردەوەدا، پیی‌یان بڵێن کە ئێوە لەمانگی دا ١٠میلیون[٢] دولار کە لە پوولی ئەو نەفتەی دەکەنە، خەرجی ئەسلەحەبو سەرکوت کردنی کوردەکان کارێکی شێتانەو، بێ‌عەقلانەیە، وە "کون سێر سیومی نەفت"[٣]، دەبێ ئەوەی بەچاکی لێ‌حاڵی‌بێ، وەچارەسەری ئەوکارەی بکات. بەلام بارزانی بەو ڕاوتەدبیرە رازی‌نەبوو، ئەمماله کەمایەتی (ئەقەلیت) داماوەو، ئەوکارە بەڕێوە بردرا.

پاش شارەزائیو، شناسائی، له ٢٦ دیسامبری ١٩٦٨ ئەندامی دەفتەری بەریوه بەری ناوەندی واته "سامی" ـ مەحمەد مەحمود عەبدووررەحمان لەئوتی ١٩٦٨ هاتبونەوەسەرکار. له ٢٣ فیۆرییەی ١٩٦٩ سەرکردەیی ٢٠٠ پیش مەرگەیان بەدەستەوەگرت. ئەوپێش مەرگانه ٦ خمپاره، ٢٠٠ نارنجەکیان لەئێستریکی زۆر بارکرد.

لەهەوەلی مارس له کاتی ٨/٤٥ پاش، برینی ریگای هاتو، چوی هێزی عەراقیکان هەوەلین گوللەی خومپارەیان له ئەسیساتی نەفتیای.پی.سیلەنیۆبابا (باباگورگور) لەشمالی رۆژئاوای کەرکوکدا، بەدووای گوللەی هەوەلی ١٠٠ گوللەی خومپارەیان هاویشت، پاش ئەو عــەمەلیاته کوماندوکان بەبێ زەرەروزیان بۆسەرریگای شمال گەرانەوه.

ئەو هەلمەتو، زۆر بەیه، نزیک به ٢میلیون دولاری واته ٧٠% هەفتا لەسەدا زیانی لەشرکەتی ای.پی.سی دەدا. قازانجیئەوشرکەﻩ تەکەلەمانگیدا ١٠ میلیون دولاربوو لەنیوچووت .

لەبەغدایه حکومەتی عەراق هیچ لەوبارەیەدا لەسەری نەرۆیشت وتەنانەت گویشینەدایه وەبەهیچ جوریکباسی لەهیرشه که بۆ سەرنەفتی کەرکوک نەکرد، تەنیا بەنهێنی لەگەل کون سیرسیوم لەو وبارەدا ووتو،ویژی کرد، ئیدی لەسەری نەرۆیشت.

ئینجا جارجار پەلاماریان دەبرده سەر خەتتی لولەیای.پی.سی"سامی" مەبەستی ئەوه بووکه "بریتانیای گەوره ببینی وەلەقودرەتەکانی دیکەشی بوی تامەسەلەی کورد حەلبیت.[٤]

## ٢ ـ هێرشی بەهاری ١٩٦٩

لەحەوتوکانیکی که چەن هروژمیان برده سەرکەرکوک، حکومەتی عەراق ٤لەشکری نارده سەر کوردەکان. لەماوەی چەنمانگ دا که شەرێکی زۆر قورس کرا، بەداخەوه گەلانی جیهان لەوکاته ناسکەدا گوێشیان نــەدەدایه، وەبێ تەفاوەت مابوونەوه، بەهیچ جۆرێک لەوبارەدا هــەوالیک لەکوردستانی شمالی عەراق دەر نەچوو، وەئەوهێرشەشهەربەردەوام بوو.

### ٣ ــ دووژمنایەتی‌و، قینەبەری‌ئیران‌و، عەراق :

٦سال شەری کوردەکان دژی حکومەتی عەراق کە بەردەوام بـــــوو، وەپیروزی‌و، سەرکەوتن هەرلەلایەن کوردەکانەوەبوو، وردەوردە بەوجیگایەگەیشت کە دووژمنایەتی ئیران‌و عەراقیێ لی‌پەیدابیێ. لەنیوەی مانگی ژانویەی ١٩٦٩ شای‌ئیران مەسەلەی مافی میژووئی (حقوق تاریخی) ئیرانیی لەبارەی جەزیرەی بەحرین دا هێنا پیشێ.

بەعسیکانیش بەتولەی ئەوە، داوای مافی‌خۆیان لە دووچومی خلیج‌دا کەنیوی خلیجی‌فارسی لەسەربوو دەکردو، دەیان‌گوت کە لە بنەرەت‌را، تەواوی چومی خلیچی فارس ئی‌عەربەبەکانە. زور زووهات‌و، چولەبەینی دوو ولات دابرا، ناخوشی‌و نالەباری لە نیوان هەردوک دا وەدی‌هات، لە ١٩ ئاوریل‌ی ١٩٦٩ حکومەتی ئیران داوای مافی بەریوە بردنی سالی ١٩٣٧ لەسنووورەکانی ئیران‌و عەراق‌دا کرد ،وە لەسەر مەسەلەی شەت‌تول عەرەبێ رۆژهەلات دووابوو! جاحکومەتی عەراق، زوڕ بەتووندی‌و، چالاکی هیزی خوی لەسنووری ئیران و عەراق لەناوچەی خانەقین‌و، ئابادان دا کو کردەوە وەمەسەلەکەشی بردە لای یەکەتی نەتەوایەتی گشتی (سازمان‌ملل متحد)

### ٤ ــ سێ‌گـوشی ئیران ــ عەراق ــ کوردستان :

هەروەها کە دەهات سێ‌گوشی ئیران ــ عەراق ــ کوردستان بەهەست‌بێ، شەری‌بەینی کوردەکان و عەراق ڕۆژ بەروژ بەتین ترو بەقەوەت تردەبوو، ئینجا ئەو شەڕە لەگەل مەسەلەی خلیج‌فارس تیکەل‌دەبوو، وەرژیمی تاران جار لەگەل جاریێ دووژمنایەتی خوی لەگەل‌عەراق بەتین تروتیژتردە کرد، جگە لەشەری بە شکرائی، ئیران بو رووخاندنی ڕژیمی عەراق لەهیچ‌چەشنە ئاکاریـــــک ڕانەدەوەستا.

بەشوینی نیوان ناخوشی لەسەر مەسەلەی خلیجی فارس، دوومەبەست‌و،

هەلویستی گرنگی دیکەش لەگوری دابوو: کورد وە زوففار کەسەبارەت بەومەسەلانە دووژمنایەتی ئەو دوو دەولەتە پترو، گەورەتردەبوو.

مەسەلەی زوففار بەجیگای خوی، تەنیا مەسەلەی شەری‌کوردەکان بوشای ئیران دانی ئمتیازی راستەقینە وە دانی ئی‌متیازی بورژیمی بەغدا لە: سالی ١٩٦١ – تا ١٩٦٦ وە ١میلیارد دولاری خەرج لەبەر دابوو...

وەنزیک دە بووە کە بەشکانی یەکیک لەو دوودەولەتە تەواوبیت.

ئینجا ریگای سووک وهاسان‌و، کەم‌خەرجتر بوئیران، ئەوە بوو کەلەگەل بارزانی ریک‌کەوی واتە کوردەکان یارمەتی‌بدا، تابەوجورە بتوانی رژیمی بەعسی عەراقی برووخینی. ٦

گەورەترین هەلویست بوتیک شکاندنی بەعسیکان – کەبومروف ئەرجو، ئەرکیک‌ی دانەدەنا وەهەروەها بو پول‌وپارە بایخیک‌ی نەبوو، ئەوەبوو کەبەراستی بەقازانجی ژینیرال بارزانی کاربکات.

ئینجا بارزانی بەچاکی‌دەی توانی که لەیارمەتی دانی شای‌ئیزان بە تایبەتی لەیارمەتی دانی سالی ١٩٧٢ کەلکیکی باش وەرگری،وە سەرئەنجام بە قازانجی کوردەکان تەواوبی، وەهەروەها لەدووژمنایەتی ئەو دوو ولاتەش سوود بەری.

بارزانی تووشی ئەو کارەساتەو، هەلەیە بوو کە بەهوی ئەونرخو بایخەی کە شای ئیران بەریوەی برد: واتە شای ئیران‌پیی‌گوت بوو کە دەبی: خو لەوەی بپاریزی کە کوردەکانی ئیران لەوکارە داتیوەر درین، لەکاتیک‌دا ئەوە بوخویی مەسەلەیەکی گەورەو، نالەباربوو کە بو بارزانی هات‌بوپیشی. بی‌گومان کوردەکانی ئیران لەو خوتیوە ردانە دا هیچ وەختیک رانەدەوەستان وە ئەوقسەی شای‌یان نەدەسەلماند.

ئینجا بابیرە وەریک لەراپەرینی سالی ١٩٤٦ بکەین کە بارزانی‌ئەووەخت رابەرایەتی هەبوو وەلەوکاتەش‌دا بوو کە حیزبی دیموکرات‌ی ئیران بەرابەرایەتی قازی مەحەممەد پیک‌هات بوو، ئینجا وادیاربوو کەپاش ٢٠سال بارزانی، دەیەوی هەلەکانی دووپاتە کاتەوە.

بەراستی بارزانی بو ریگایەکی دەکیشرا کە دەهات دووتاقم‌ی کورد لە بەرانبەر یەکتردا رابگری‌وە تووشی بەلایەکی گەورەیان بکات،زور جووان ئاشکرا

بوو کە دەستیدە ولەتە قودرەت مەندەکانی تێدایە، وەکوردەکان لەونیوەدا سەرئەنجام تووشی چارەرەشیو، کوێرەوەری بکات.

## ٥ ـ کانگای میهرەبانی :

لەبەهاری سالی ١٩٦٩دا، بارزانی کانگایەکی بەنیوکانگای میهرەبانی دانا، وەلەئاکام دا تا سالی ١٩٧٥ وەسەروکایەتی کرد. ٥ ئەندامی دەفتەری سیاسی (پولیت بورو) کە لەسالی١٩٦٦ وە داندرا بوون، وەبریتی بوون لە: (حەبیب کەریم، دوکتور مەحمودعوسمان، سالحیوسفی، نوری شاوەیس، وەعەلی عەبدوولا) دوو مروڤی دیکەشی بەو نیوانە، سامی وەعەزیر عەقراوی لێزیاد کردن.

لەئاکارو، کردەوەدا، بیروگومانی ئەوئەندا مانە پیکە جوور نەدەهاتەوە (قەدیمیکان ـ وەک سالحیوسفی، نوری شاوەیس، عەبدوولا" نەخشیکی وا گەورەیان نەبوو.

وە، جگە لە دوکتور عسمان، کە لەسالی ١٩٥٥ دا چو نیو پ.د.ک وە لەدووائی دا بولای چەپی حیزب کیشرا، مروڤەکانی دی لەژێر دەستوری بارزانی کاریان دەکردو جیگای هەرە بەرزیان لەحیزب دا وەدەست هینا بوو. "سامی" کەنیوی ئەسلی خویی موحەممەد مەحمود عەبدوررەحمان بوو، لەسالی ١٩٣٩دا لە ناوچەی سەنجار لەدایک بووە. پاش ئەوەی کە لەشاری منچستر بووبە مهەندس بەدووای ئەوەدا مەدرسەی سکول آف ایکونومیک (مەدرسەی عالی اقتصاد)ی تەواوکرد بوبە ئەندامیپ.د.ک ، وەلەگەل بارزانی لەسالی ١٩٦٣دا، هاتو، چویی بەرقەرار کرد، لەپیشدا لەسەرڕادیوی کوردستان کاریدەکرد، بەشوینی ئەو کردەوەدا لەگەل هێندێ لەقوتابیکانی کورد بووبە وەرگێری روژنامەکان، وە چاو ساغی پیاوەکانی دەرەوە کە دەهاتنە مەلبەندی کوردستان، وەهەروەها، لردکیل براکین کە لەسالی ١٩٦٦ هاتە کوردستان، شارەزائیدەکردو، لەگەلی بوو.

سیسال کەرابرد بووبە ئەندامی بەرێوەبەری دەفتەری سیاسی

سامییەکیک بوو لەهەرە کە سە نزیکەکانی بارزانی، وە وەک کورەکانی بارزانی

حسێب دەکرا.

سەرئەنجام بووبە دژی کومونیست، تووانی نەخشێکی زۆر گرنگ بەرێوە بەری، وەلە جووڵانەوەی کورد دابەچاکی خۆ تێوەردا. پاش ساڵی ١٩٧٠ لە حکومەتی عەراق دابووبە وەزیری دەرەوەی شمال، واتەهاوکات لەگەل تەققیە راوەستان لەساله کانی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ دا ئینجا لە عەمەلدا بووبە (سەروک وەزیر)ی کوردستان لەکاتی ئاخرین ساڵی ڕاپەرینی بارزانی.

حەبیب کەریم، کوردیکی فیلی بەغدایەبوو (ئاباو، ئەجــــدادی لەکوردەکانی لرستانی ئیران بوون، کە هاتونە عراق)، لەساڵی ١٩٢٨ لەدایک بووە. حەبیب بەپیچەوانەی براکەی کەنیوی دوکتور جەعفەر عەبدوول کەریم بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر یەکیک لە لیدیرەکانی هەواداری چەن ساڵەی بالی کمونیستی پ.د.ک ی عەراق بوو، ئدیئولوگ نەبوو. لەکونگرەی شەشمی حیزب لەساڵی ١٩٦٤دا بەنووسەری گشتی پ.د.ک هەل بژیردرا ئینجاکونگره لەژیر چاوه دیری بارزانی هەل دەسووڕا ــ حەبیب قازیبوو،وە "زانستگەی حقوقی بەغدای تەواو کردبوو، پیاویک بوو کە بەراستی دڵسوزی حیزب بوو واتە پاش گیژەلووکەی بوحران ساڵی ١٩٦٤، بووبە ڕاوتە دبیرکەری حیزب.

بەلام دووپیاو، کەلە هومووان بەدەسەلاترو، دەس ڕۆیشتر بوونەوە نەخشی ئەسلیان دەگیڕا وە لەڕاپەرینە کەدا هەمووکارو، باریکیان، بەدەستەبوو، دووکوره جەحیلەکانی بارزانی: ئیدریسو، مەسعود بوون.

ئیدریس، لەساڵی ١٩٤٤ دا لەبارزان لە دایکیکی خەلکی شینان بووە، لەساڵی ١٩٦٢دا بوتە، نووسەری (سیکریتر) بابی، ئینجا نەخشی ئەسلی لە ساڵی ١٩٦٦دا بەدەست هینا کەلەگەل عەبدوولا پشدەری شانبەشانی کوردە پیشمەرگەکان، لەشەڕی هەندەریندا بەشداری کردبوو، (مەی ١٩٦٦). لەوکاتە دائیلەی سەرکەوتنی خوی پیوا، واتە لە ساڵی ١٩٦٨ دا لەگەل مەسعودی برای، لەدەفتەری بەریوەبەریڕاو، تەدبیرکەرەکانی شوڕشی کورد دابوو. ئەو پلانەی زورزوو ڕابوارد، پاشان بووبە ئەندامی دەفتەری سیــــاسی پ.د.ک وە، لە ساڵی ١٩٧٣ دا لەگەل بابو، برای خوی خاوەن قودرەتیکی تایبەتی بوون. لەبابەت ئیشوکارەوە، گوتراوە کە بەچەشنی بابی لەپاری ڕامیاریو، ئەندامی لەش ساغی نەگەیشتوتەئەو، هەرچەند بوخویی پیاویکی ئازاو دلیرە، بەلام لە

پلەی بابی لەخووارتربووە مرۆڤیکی شەرمێوون بەحەیایە بەلام لەسەرئەوەشرا ، پەیوەندیو ، هاتو ،چوئی تایبەتی لەگەل روژنامە نووسەکانی روژئاوا هەبوو وەووتو ،وێژی لەگەل دەکردن . ١

ماوەیەک ، کە تیپەری بەلانی زوٚرەوە زمانی ئنگلیسی فیربوو ، تاسالی ١٩٧٤ بەتەواوی ئەو زمانەی دەزانی ، تەنانەت وای دەزانی کەباسی سیاسیو ، گەپو ، گفتوگوی ڕامیاری پیدەکرد . لەکاتی قودرەتدا ، دەیەویست بەچەشنی بابی دەست بەسەرهەموو کاریک دابگرێ ، لەزوٚر هەلوێستان دا لەلای روژنامە نووسەکانو ، هەوال دەرەکان دەیەویست بیسەلمینێ کەلەسازمانی حیزبوە کاروباری کوردستاندا بەهیژو ، قودڕەتەو ، بەجووانی دەتووانی کاری کوردەکان هەل سوورینی .

مەسعود ، لەسالی ١٩٤٦ ، لەشاری مهاباد لەخیزانی دووهەمی ژینیرال بارزانی لەدایکبووە ، مەسعود لەهەوەلەوە لەژێر چاوەدیریو ، دەست پەروەردەی دایکیکی عەشیرەتی گەورەبووە ، پاش ئەوەی کە بابی لەو لات دوورکەوتەوە ، وەبۆ و لاتی شورەویچوو وەگەڕاوە ، هەروەها مەسعود لەبەردەستی دایکی دا پی گەیشتووەو ، تەربیەت کراوە (دایکی کچی مەحمود ئاغای زێباری بوو) .

لەتەمەنی ٨ ـ ٧ سالانەدا لەگەل هیندی لەکوردەکان بوٚژیاندەگەڕێتەوە وولاتی بارزان ! مەسعود ،وەک ئیدریس لەسالی ١٩٦٨وە ، بوٚتە ئەندامی بەریوە بەری ناوەندی دەفتەری سیاسی ، بەلام تا سالی ١٩٧٠ لەو دەفتەرە دانەخشێکی زور گرنگی نەبووە .

تاسالی ١٩٧٤ ـ ١٩٧٥ هەردوک برا لەبارەی فیڕکردنی کردەوەی نیزامیو ، فەننیشەڕ بەئەندامانی پارتیزانی خەلک ، زوٚرتێ کوٚشان ، وەلە بەریوە بردنی ئاکارو فنونی شەڕی داهاوبەشیکیباشیان هەبوو . مەسعود مروٚڤیکبوو کەتەواوی ئاکاری کوردیکی ئازاو ، نەبەز لەویدا دیتراوە ،بەتایبەت لەش ساغشبوو

ئیدریس ومەسعود بەیەکەوەلەنیو ئوٚرگانی ڕاپەرینە کە داقودڕەتێکی زوٚریان پەیدا کردبوو ئەویش سەبارەت بەوەبوو کەکورانی بارزانیبوون ،مەسعود متالای لەباری رامیاریوە کەم بوو ، واتە لەسە ناسینی جیهان ئگاداریکی ئەوتوی

ئیدریس بارزانی لەخاکە لیوەی ١٩٨٦ داکوچی دووائی کرد

نەبوو. چەند تاقمێکی کۆڕی ڕامیاری کە لە ئوروپایان لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستڕا، وەیان لەو لِاتی ئەمریکایەوە دەهاتنەکنی، زۆر لە لایەنەدەمانەوە چاوپیکەوتنە کە بەسووکو، هاسانیوتالووکە بەڕێوەدەبردرا، لەراستەقینەدا لەبەرامبەر ٣ پیاوی جیهاندا وەک سەددام حسینو، شای ئیران وە... دوکتورهێنری کیسینگر کەلەساڵە تاڵەکانی کارەساتەکەدا کەبەبەسەرهاتی کوردانیان گاڵتە دەکرد، چی پێ نەدەکرا!

## ٦ـ هێرشی هاوینی ١٩٦٩

لەنیوەی مانگی ئوتی ١٩٦٩، هیزی عەراق هیرشیکی تازەی بردە سەر کوردەکان. بەشوینی ئەوەدا کە کوردەکان گەڕانەوە لای شمال، هێندیکیشیان چوونە سنووری ئیران، وە لەوی کوبوونەوە.

لەزاخویەرا تا خوواورووی روژئاوا، تاپێخونو، سنووری ئیران، واتە تەواوی ئاسۆیی بەرەکانی کورد لەژێر گوللە بارانی توپو، فڕۆکەکانی عەراق دابوون.

لەمەلبەندی بادیناندا، شەر بەتوندی بەردەوام بوو، وە تازاخۆو ئاکراشەڕ درێژەی هەبوو. سەعدوون قەیدان، ئەندامی بەریوە بەری شورش وەژینیرال عەمماش نایبی سەرۆک وەزیر، وەوەزیری ناخو شەرەکەیان لەهەردوک لاوە رابەری دەکرد. هەرچەند لەناوچەکان داهێزی عەراق سەرکەوتووبوو، بەڵام پێش چوونیکی ئەوتویان نەبوو.

شەریکی خوێناوی دەستی پیکرابوو: لەمەلبەندی دووکان دا لەگوندیک کەناوچەی شیخانبوو، لەشمالی ـ ڕۆژئاوای ئەکرا، سەربازەکانی عەراق لە نیوەراستیمانگی ئوتی ١٩٦٩، ٦٧ کەس ژنو، مندال کە لەغارێکدا خویان شاردبووە، خەفەکردو، لەنێویان بردن.

سەرئەنجام لە دیی سوورەییا کە بەپییان تازاخو ٣سەعات ریبوو، ئەفسەرێکی عراقی لە١٦سیپتامبر داتەواوی خەلکی دێیەکەی کە لە باغچەیەک دا کۆ کردبووە: کە بەبیانووی ئەوەی کە قسەیان بۆدەکات، لەنەکاو بەڕەشاش دایان دەگرێ وە ٥٣ کەساندەکوژێوە ژمارەیەکی زۆرش بریندارەدەکـــات.

لەئاکام‌دا بەوهەموو پەلامارە کەکرا، تەنیا توانیان کە کویسەنجاق بگرنەوە، بەلام نەیان توانی خۆیان بگەیننە سنوریئێران. (٤ی هارک ١٩٦٩)

## ٧ـ خۆتێوەردانی ئێران (سی‌پتامبری ١٩٦٩)

لەوکاتەدا، کەئەو هێرشە براسەرکوردستان، وەخەڵکیان زۆر لەنارەحەتیو پەشێویدا، دانا، پێش‌مەرگە هەروا دلێرتر وشێرگیرتردەبوو، وەژینیرال بارزانی، دەیەویست لەلای‌شای‌ئێران یارمەتی زیاترپێ‌بکرێ: بۆهەوەڵین کەرەت، خەبات گەرەکانی ئێران لەکوردستان‌دا شان‌بەشان حازر بەیارمەتی ببوون.

لەمانگی سی‌پتامبری ١٩٦٩ تلویزیونی عەراق دەستەیەکی "سەربازی ئێرانی" کەلەزەوی‌عەراق‌دا بـەدیل‌گـیرابوون‌نیشان‌دا. ٧

بەو نمایشی تلویزیونی، عەراق دەیەویست کە بەئێران بسەلمێنی کە بۆچ دەبێ‌بە کوردەکان یارمەتی بکات. ئینجا لەکاتێکی زۆر ناسک‌دا، تاقمێک لەلایەن حکومەتی عەراقەوەبەنهێنی هاتەتاران، وەلەگەل ئەمیرعەبباسی‌هوەیدا سەرۆک وەزیری ئێران دەسیتان بەووت‌و،وێژ کرد.

تاقمی عەراق ڕایگەیاند کە ئەگەر ئێران سنووری خۆی ببستێ‌وە نەیەڵێ کوردەکان ئاوای ئێران‌بن، ئێمە بۆ هەموو،گفت‌وگویەک ئامادەین... هوەیدا وەڵامی بەتاقمەکە داوە کە ئێمەناتووانین سنووری خۆمان داخەین، ئێوەپیویستە سنووری خۆتان ببەستن، ئەگەر لە دەستودێ ئەوکارەی بکەن‌و، رامەوەستن" ٨

## ٨ـ ووت‌و، وێژەکان:

لەمانگی ژوییەی ١٩٦٩ را،گەورەکانی بەعسی لەگەل سەروکەکانـــی پ.د.ک بەنێونجیگەری قوتابیکانی رووناک‌بری کورد لەبەغدایە، چاوپێ کەوتنێک پێک‌هات، بەلام چاوپێ کەوتنیکی دی لە سی‌پتامبری ١٩٦٩ وە کـە بەجی‌هات بەتین‌تر بوو: بریگادی تارق کە فەرماندەی بریگادی رەواندزی‌بوو، ڕایگەیاند کە حکومەتی عەراق ئامادەگی خۆی بو ووت‌و، وێژی تازە ڕادەگەێنی. بەوچەشنە لە ناوپردان لەگەل بارزانی ئەو چاوپێ کەوتنە بەجی‌هات.

ئەمما هێرشی پائیزی تێک شکابوو ، هەڕەشەو خوتیێوە ردانی ئیران لە شەڕەکەدا پتربووو ، جامەبەست بەوەبوو کە سەروکەکانی عەراق حازر بەووتو ، ویژیکی‌راستو ،دوغری ، ببوون بەدووای ئەوحازربوونە دا کوڕێ ڕەسمـــــی بەسەروکایەتی عەزیز شەریف ، سەروک شورش لەهەوەڵی دی‌سامبری ١٩٦٩ دا خوّی بوّئاشتی ئامادە کرد ، بەلام ئەو چاوپێ کەوتنە لە ١٩ی دیسامبـــــردا وەدی‌هات : لەبەعسیکان سامیر عەزیز نەجیم کەیەکێ لەئەندامی ناسیونالیستی بەعس وەویژەوەری نیزامی بوو ، لەگەل فواد عارف بۆ گفت‌وگوهاتنە ناوپردان بولای بارزانی ئەو دیتنە بە "دانشتنێکی دوّستانە" نیوّبردرا ، وە درێژەی زوّر بوو . تاقمی کوردەکان بریتی بوون لە : ئیدریس ، مەسعود ، دارا تەوفیق ، دوکتور مەحمود عوسمان وە"سامی" تاقمی‌عەراق لەهەوەڵ دا گوتی کە"حیزبی ئیوە ، لەڕادەی سەرەوەدەژمێردرێ ! " وە ئێمە دەمانەوێ بەوشەڕە کوتایی بێنین ، وەئەوەش دەزانین کەکورد پوّچی شەڕ دەکات . . . بو دریژە پێدان بەو ووتو ، ویژە ، بارزانی ، دارا تەوفیقی لەگەل سامیر عەزیز نەجیم کەئەندامی‌پارت‌بوو ناردە بەغدایە کە بە کارەکەیان درێژەپێ‌بدەن . ئەوئەندامە لەپاشان بووبە ئەندامی کمیتەی ناوەندی پ.د.ک ــ هێندێ لە فاکتەکانی بەعسی وە هەروەها لەسەروکەکانی‌نیزامی کە لەگەل ئەوگفت‌وگویە ، دووژمنایەتیان دەکرد ، دەیان‌گوت پێویستە کە تاقمی برایم ئەحمەدوەجەلال تاڵەبانی لەو دانشتنەو ،ووتو ، ویژە داهاوبەشي بکەن دارا تەوفیق ٥ ڕوّژ لەبەغدایە ماوە ، لە ٢١ی تا ٢٥ی دیسامبری ١٩٦٩ لەکوّشکی سەروک وەزیر دەست بەسەر ڕاگیرابوو .

## ٩ ــ نەخشی سەددام‌حسین :

ووتو ،ویژ لەبەینی بەعسیکان‌و کوردەکان‌دا ، بوو بەهوّی ئەوە کە سەددام حسین پلەیەک[١] لەسەرئێشروکاری خوّی وەسەرکەوێ ، وەلەگفت‌وگویەکـــــەش‌دا بەشداربێ . ئەو دانشتنە لەگەل دارا تەوفیق بەڕێوەبردرا : لەسەردەمی هەوەلە وە سەددام زوّر خوّی چاک‌نیشان‌دەدا ، وەوای دەنوواند کە دەیەوێ لەگەل کوردەکان‌بەیەکتربگەن .

وە هەروەها بەکوری کوردەکانی بارزانی راگەیاند وەگوتی ئیوە نابێ بەهیچ جۆریک بە قودرەتیکی‌سیاسی دەرەوە پشت ببەستن وە لەسەروی حیساب‌بکەن : وە بۆ کوردەکانی ئاشکرا کرد کە بیگانەکان بۆتیک رووخاندنی حکومەت ،وە لە نیوبردنی تێ کوشەر بوون. لەحەقیقەت‌دا پیلانێک‌بو سەددام چن درابوو، وە لە ژانوییەی ١٩٧٠دا سەددام پتر لە٧٠ ئەندامی نیزامی لەپیلان گیرەکان گرت‌وکوشت.

لە ٢١ی دیسامبری ١٩٦٩ دا پاش گفت‌وگۆی سەددام لەگەل حەسەن ئەل‌بەکر، تاقمی بەعسێکان کە لەوکەسانە بریتی بوون : ژینیرال عەمماش، مورتە داهادیتی ئەندامی بەرێوەبەری فەرماندەی شۆرش، عززەت مستەفا، سەعدوون قەیدان ،وە عەبدوول‌لاسەلووم سامورائی ،وە ١٠ ئەندامی‌ترش کاروباری وولایتان بەدەستە وەگرت سێ‌مەبەستی‌گرینگ لەو کۆبونەوەیەدا لەگۆرێ دابوو : مافی نەتەوایەتی کورد، مەسەلەی "سنورەکان،ی کوردستان، وەمەسەلەی هات‌و، چۆ لەگەل ئیران لەحدودە کەدا. لەسەرمەسەلەی ئاخر، سەددام حسین، لەو وەلامەی کە دارا توفیق دایەوە رازی‌بوو، وەگوترا کە نێوان‌و، هات‌و، چوی لەبەینی دەولەتی ئیران وعەراق‌دا هەرچونێک‌بێ، کوردەکانیش بەو چەشنە ببزونەوە، وەئەومەسەلەیان لەبەرچاوبێت.

لەپاش ئەوەی کە دارا توفیق لەبیروت لەگەل می‌شیل عەفلەق تیوریسین وە دامەزرینەری مەرامی بەعس چاوپیکە وتنیکی کرد، گەراوە بوناوپردان، بە ژی‌نیرال بارزانی راگەیاند کە بەعسیکان لەبابەت مەسەلەی داواکراوی ئوتونومی بەو جورەی‌کە بارزانی دەیەوی، رازی‌بوون ١٠

لەکاتیک‌دا کە پیک‌هاتنە کەدەهات بەدی‌بێت، سەددام حسین ٦٠٠ ئەفسەری هیزی عراقیێ لەئاخری مانگی دی‌سامبری ١٩٦٩ دا لەبەغدایە کو کردەوە ئینجا هەلویستی لەو کۆبوونەوەیە ئەوە بوو کە لەو تاریک داپییان رابگەینێ کە گوێ بیس‌بن‌و، بزانن "کەسانیکی ئیستا لەگەل ئیمە شەردەکەن، شۆرش‌گیری سادەنین" وەبەئاشکرائی دەری‌بری و گوتی کەهیزی نیزامی پیوستە لەژیر چاوە دیری حکومەت دابێ‌و، دەستور وەرگرێ : وەبێ‌گومان سەروکەکانی نیزامی‌نایانەوێ کەبزانن‌و، لیی‌بکولنەوە کە "لابردن)ی حەردان تکریتی‌وە دوورخستنەوەی‌ئەو بۆوولاتی کویت‌و، کوژرانی وی‌پاش چەندمانگیک چون بووە.

ئینجا هاتو، چوّیو، چاوپیّ کەوتنیّکی گرینک لە لایەن هەردوک لاوە، بەرێوبردرا، واتا لە٣١ی دیسامبری ١٩٦٩ کوّرێکی کومەلی گەورەی بەعسی عراق کەبریتیبوون لەهادران تکریتی، عەبدوول خالق سامورائیوە تارقعەزیز، وەهەروەها دولایەنگری "سەربەخوی، عەزیز شەریف کەزوّر لە کومونیستەکان نیزیکبوو، وەفواد عارف، لەناوپردان دا دیتنیّکیان لەکوردەکان کرد.

پاش چەند ڕوّژیّکیتر، کوّرێکی کومەلی کورد کە بریتی بوون لە دوکتور مەحمود عوسمان، سامی، نوریشاویس دارا توفیق، نافیرجەلال، موحسن دزەئی،سالح یوسفی، وەئیدریسو، مەسعود بارزانی سەفەرێکی کورتیانبو بەغدایە کرد.

هەر لەوسەردەمەدا، لە ١٠ی ژانوییەی ١٩٧٠ کە تەواوی کوّری کورد لەبەغدایە بوون، سەددامحسین هاتەناوپردان کە بەتایبەت لەگەل ژینیرال بارزانی ووتو،ویّژیک بکات. لەودانشتنەشداوەک هەمووجاران، ووتو،ویژ بەوردی لیّیدەکولدراوە، دەبوو، مەتنی قسەکانو، نووسراوەکان، رستەبەرستە، بەلّکو ووشە بەووشە لەسەری بڕوّن لەکورەکوردەکان گیڕاً بوویانەوە کە جاری وابوو، دەبووکە: ئیّمە لەبارەی هیّندیّ مەسەلەی دووڕوّژ لەسەری باس بکەین، رستەیەک ویان نووسراوەیەک کە دەنووسرا، پیّویستبوو کوّرێکی دیکەی کوردش کە قامکی لەسەر دابنیو، دانیپی دابیّنن.١١

بەرهەلّستی گەورە لەبەینی هەردوک لادا، مەسەلەی جوغرافیائی خود-موختاری مەلبەندە کەبوو، کە پیّویست بوو دیاری بکریّ. کوردەکان دەیانگوت کەئەگەر سنووری جوغرافیائی ناوچەی کوردستان بەچاکی مەعلوم نەکریّ، ئیتر دانی مافینەتەوایەتی واتە ئوتونومی هیچ کەلکو، قازانجیکی بوئیمەنیە!

بەپیچەوانەی کوردەکان، بەعسیکان دەیانگوت،وە لە ڕوّژنامەی ئەسسوّرە دا نووسیان، کە "گەلی کورد ناتووانی بەتیّگرائی" زوّن"ی واتە جغـــزی جوغرافیائی خوّی دیاریبکات، وەلە ومەحدودە و چووارچیّوە دا مافی نەتەوایەتی بەڕیّوە بەریّ" ... بەلّکو مەسەلەی گەورە وەبەشداربوون لە "ماف" نەتەنیا ئەوەیەکە کوردەکان فەقەت لەقازانج وسوودی هەولیّر وەسولەیمانیّ وەشـــارە کوردنشینەکانی دیکە کەلک وەرگرن، تەنانەت دەبیّ لەمافوقازانجی هەموو وولات، وەک بەسرەوە بەغداشدا بە شداربن وەلەچاوەدیّری مافی "کومەلایەتی

وئیداری کۆماری" داشەریک‌بن ، واتە لە"بیروڕای دیموکراسی" تەواوی‌وولات‌دا کەلک‌وەرگرن .[12]

سەرئەنجام بەهەرچونێک بوو ، بەعسیکان دانیان بەسەر دیاری کردنی جوغرافیائی ناوچەی کوردستان‌دا هێنا . بەڵام وەک ئینگلیسیکان کەلەسالی ١٩١٩ وە ١٩٢٤ دا لەگەل شیخ مەحمود قەراریان دانابوو وە تەنیا ناوچـــەی جوغرافیائی مەلبەندی هەولێر ، سولەیمانیێ ،وە دەهوکیان لەبەر چاوو بوو ، بەعسیکانیش هەر ئەوەیان لەبەرچاووگرت‌بوو .

بەڵام مەسەلەی گرینگ لەبەرچاوان کەرکوک‌بوو ! لەهەوەڵی مانگی مارسی ١٩٧٠ کە لەو ووت‌و ، ویژە دابوون لەوکارە ساتەهیچ کەڵکی لیوە رنەگیـــرا ، کۆڕەکانی بەعسی بەغدایە دەیانەویست بەدوکتور مەحمود عوسمان[13] بسەلمێنن کە ئیدی مەسەلەی مەلبەندی کەرکوک ، وەناوچەکانی دیکەی نەفت لەبیرخوی بەریتەوەو ، لیی‌ببریتەوە .

بەلام پاش سێ مانگ گفت‌وگو لە ١٠ی مارسی ١٩٧٠ لەنەکاو ، بارزانی‌و ، سەددام‌حسین لەمەدرەسەیەکی چوکی‌ناوپردان ، پیکهاتنیکیان بەئیمزا گەیاند .

## ١٠ ـ پیک‌هاتنی ١١ی مارسی ١٩٧٠

لەوپیک هاتنە دا ١٥ ماددەکەرەزامەندی‌هەردوک‌لای تێدا بوو ، وەمادە ١٤ کەی‌ئوتونومی‌بوو بەجێ‌هات بەلام ئەوشتەی کەلەسەری باس‌دەکراوە هێستا ، بەڵێنی لەسەرنەکوترا بوو ، هێندێ لەناوچەکان‌بوو کە کوردەکانی تێدا دەژیا ، وەدەبوحکومەت‌بەچەشنیکی "خوئیدارەکردنی ناوچەئی‌و ، رەسمی" رازی‌بیت‌و ، چارەسەری ئەوکارەش بکات .

مەسەلەی گرنیکی دیکە ، کەلەسەری دەروێشتن ، خویندنی زبانی کوردی وە بەرەسمی ناسین لەناوچەکانی کوردستان دابوو کە کوردەکان دەیان‌گوت لەو مەلەبەندانەی‌کەزیاتر کوردی‌تێ دادەژین خوێندن‌و نوسین‌ی زبانی کوردی (لەگەل زبانی‌عەرەبی) لەئاکاری نیزامی و ئیداری دا بەرانبەربێ . بودجە و پوول بۆ ناوچەکە دیاری‌بکرێ ، نابێ سەروکیکی کوردی دابندری ، نوینەری کوردان بەگوێرەی دانشتوانی کوردی ئەو ناوچە لەڕووی یاسائی هەڵ بژێر درێو ،

دیاری بکردرێ.

ئەوەبو هەوەلین‌کەرەت، یانی‌پاش دیاری کردنی مافی‌گەکی‌کـــــورد، لەپەیمانی سیور Sevre. دائتر ئەوە دەهات پاش ١٠ سال شەڕونیوە شەڕو، تەققە وەستاندن، نیوە پێک‌هاتن، فراکسیونیکی گەلی کوردٚواتە بالێک لەقەومی کورد مافی ڕەوای ئوتونومی خوێی وەرگرێ ــ بەراستی ئەو کەڕەتە هەلوێستی ئەوپەیمانە تەنیا ئەوە نەبوو کەقەومێک لەژێر چەپوکە، چەوسانەوەی قودڕەتێک دابمێ‌نیتەوە، بەلکوپیکهاتنیکی بەرانبەرو راستەقینە بوو کەلەبەینی حکومەت‌و ڕاپەرینی نەتەوەی کورد دەبەسترا.

دارا توفیق گوتی" ١١ی مارس ١٩٧٠ ڕۆژیکی پڕ لە شانازی مێژوو ی عراق بوو" دارا تەوفیق یەکێک لەسەروکەپایە بەرزەکانی کوردبوو،

ئینجا کاتێک کە قودڕەتی بارزانی وە بزوتنەوەی کوردەکان لەسالی ١٩٧٥دا تیک‌شکا، رستەی ١١ی مارسی١٩٧٠ واتە "جیژنی مەیل‌نان‌و، داواکراو" هیٚستا کە هەر لەسەر زاران بوو، وە باسی دەکرا.

بەلام بەداخەوە هیواو، ئارەزووی گەورەی کوردان کە لە ١١ی مارسی ١٩٧٠ دا دەهات بەهەست‌بێ، بەجێ‌نەهات، وە روژی خۆشی‌و، بەختەوەری کوردەکان زور کورت بوو، وەئاوابوو. ئەوجارە ئەستیرەی گەشی گەلی کورد زوولە ئاسوٚی شانازی‌و، بەختەوەری دائاوا بوو.

## فەسلی ۱۳

### ئاشتیو، تەقەوەستاندنێکی کورت و دریژ

پێکهاتنی ۱۱ی مارسی ۱۹۷۰ لەبنەڕەت هەڵەی زۆربوو یەکێک لەوانە ئەوە بوو کە درەنگو، زووی لە سەرکرا ، وە زوو بەڕێوە نەبردرا! مەلبەندی خودموختاری کوردستان زۆر بە باشی دیاری نەکرا بوو. ماددەیەکلەو پەیمانە ئەوە بوو کە پێویستە لە ماوەی ۶ مانگان‌دا سەر ژمێری بەجێ‌بێت. بەلام نەگوترابوو، هەروەها لەپیکە یشتنی ۱۱ی مارسی ۱۹۷۰ لە بارەی سازمانی رامیاری ناوچەی ئوتونومی کوردەکان لەگەڵ‌حکومەتی ناوەندی بەچاکی مەعلوم نەببوو، وەبی دەنگەی لیکرابوو.

لەمادەیەکی دیکە دا کە بڵاونەبۆوە، باس‌کرابوو کەلەناوچەی کوردستان دا پێویستە تاماوەی ۴سال پرسیار (ڕێفراندووم ) بەڕیوە ببردرێ.

"کمیتەی عالی" لەهەوەلی کارەوە بەنوێنە رایەتی مورتەدا هادیتی بو بەڕێوە بردنی ماددەکانی قەرار دادە کەپێک‌هات.

خۆزگە کوردەکان بیان زانی بایە کەبەڕاستی حکومەتی عەراق لەودەمو، دەستەدا وازی ئابوریو، ڕامیاری زۆرخراپە، جائەوکات بەهیچ‌جۆریک حازر بە ئیمزا کردنو، مۆرکردنو، سەلماندنی ئەو قەراردادە نەدەبون! وە ئەوەبەوجیگایە گەیشت کە بە غدا لەبەر ئەو سەخڵەتی حازر بوو کەلەبەهاری ۱۹۷۰دا هەمووکاریک بکات.

بەغدا، وای زانی کە کوردەکانی‌زۆر بەچاکی وازی‌حکومەتی عـەراق لەوکاتەدا نازانن، جابۆیە ئەو پیشنیادەی کرد، ئەگینە زۆرکاریکی گرنگو، پڕلە

مەترسی بۆ ئەوان بەدی‌دەهات ئینجا برایم ئەحمەد[۱] ئاوای گوت‌بوو. " لەسالی ۱۹۷۰ دا بەعسیکان زۆر ماندو، شەکەت ببوون، ژێنیرال بارزانی، لەداهاتودا ئەوەی دەسەلمێنی: "کە ئەوە حکومەتە کە ۴ سال ماوە دادەنێ! وەلەسەر ئەو مەبەستەش پێ‌دەچەقێنێ.

ئەگەر ئێمە ئەوەمان نەکردبایە، قەراردا دەکەیان نەدەسەلماند،وە دەیان گوت ئەو مەودایە بۆ ئاوەدان، کردنەوەی ناوچەکەیە...

بەلام لەراستەقینەدا ئەوە بۆسەنگ‌وسوک کردنی‌کاری کوردەکان بوو. بارزانی ئەوەی بەباشی دەزانی... وەئێمەش دەمان زانی.

ئێمە لەوکاتە بو وەلام ئامادەبوین، ئاشتی و سولح بۆ ئێمەزور گرنگ‌بوو.
۲

**۱ ــ سەرفەسلی بەڕێوە بردنی قەرار دادەکە:**

بەشوێنی ئەو ڕێک‌کەوتنە، مرۆف لێی مەعلوم نەبوو کە تاچ ڕادەیەک‌ئەو قەرارداده لەلایەن حکومەتی بەعسی عەراقەوە بەڕێوە دەبردرێ وقسەی‌خۆیان دەبەنە سەرێ. لەمەتنی قەرار دادە کە ئەو مەبەستانە وەدی‌هات، ئازادکردنی زیندانی کان، لێی‌خۆش بوون لە کوردەکان،چ نیزامی‌وچ‌شەخسی، گەڕانەوەی کاربەدەستەکانی ئیداری، وەوەزارەت خانەکان، بۆسەرئیش و کاری‌خۆیان.

ئینجا سێ‌پیاوی کورد بەنێوی حاکمی هەولێر، زاخۆ، سولەیمانـــێ داندران،وە ۵ مرۆڤی کورد لەدەموو، دەزگای دەولەتی‌دا هاتنە سەرکار. ۳

پارتی دیموکراتی کوردستان لەسەرڕابەگرنگی دەستی بەکاروباری خۆی لەروژیکی گەورە دا کردەوە،وە روژنامەی ئەت‌تەئاخی دووبارە لەژێرچاوەدیری دارا توفیق بلاو بووە.

حکومەت ۲۰میلیون دیناردنزیک بە ۶۰ میلیون دولار ی بو ئاوەدان کردنەوەی‌وولات‌ی شمال‌تەرخان کرد، وەئیشوکار لەسەر ڕێوو شوێنی خۆیی لەکوردستان‌دا دەستی پێ‌کراوە، وەلەئاکاما بەعسیکان وازیان لەجاشەکانی برایم ئەحمەدو، جەلال‌تالەبانی هێناو، تیکیان‌دا. ۴

٢ ــ هەورو هەڵا (کەندوکوسپی) پێک‌هاتنەکە:

لەمانگی ژوییەی ١٩٧٠ لەکاتێک دا گە هەشتەمین کومەڵی کۆبوونەوەی کورد، پانی کنگرەی پ.د.ک لەگەڵالەپێک هات بوو، (١ ــ ١٠ ژوییەی ١٩٧٠) وەبەعسیکان دانیان بەسەر ناوچەکە دا، دانابوو، لەکنەخۆیان پێیان وابوو کە ئێستا کە کەکونگرەتەشکیل بووە، بێگومان لەژی‌نیرال بارزانی وەیان ئیدریس یەکی‌کیان هەڵ دەبژێر درێ وەبەنێوی نایب سەروک بەحکومەت دەناسێندرێ...

بەلام لەکوبوونەوەکەدا بەپێچەوانەی گومانی ئەوان، حیزب دەنگی‌دا بە حەبیب کەریم، واتە پارت ئەوی هەل‌بژاردو، بەدەولەتیی ناساند.

سەروکەکانی بەغدا پێیان وابوو کە دەستی ئێرانیکان لەوکارە دا، وەدی هاتووە، وەهە لبەت بە ووتەی. ئەوانە کەحەبیب کەریم هەل بژیردراوە. ئینجا بەو بیانوویەوە، لەمانگی سی‌پتامبردا، ئەو هەلبژاردنەیان ڕەدکردەوە.

هەروەها لە بارەی پرسینی گشتی (ڕێفراندوم) بۆ دیاری کردنی ناوچەی مافی ڕەوای‌نەتەوایەتی وەبەجێ هێنانی قەراردادی ١١مارس، چیوتی لەکار داهاتەپێشێ.

لەمانگی ئوکتوبری ١٩٧٠ دا حکومەتی بەغدا دەست بەکاردەبێ کە لە بەهاری ١٩٧١بۆ دیاری کردنی، سنووری‌وولاتی خودموختاری هەنگاو هەلێنێ‌وە سەرژماری‌بکات، وە هەروەها لەبارەی پاشەڕۆژی شاری کەرکوک تەسمیم بگرێ.

لەئاخری سالی (٧ی دیسامبری ١٩٧٠) لەبەغدایە قەتڵێک قەوما کە بەسەر ئیدریس‌یان داهینا لە ئاکاما نەزاندرا کەئەو کوشتنە کاری کێ‌بووە.

لە هەوڵین سالی تێوە رسووڕانی پێک‌هاتنی ١١ی مارس دا وا ئاشکرا بوو کە هیواو هومێدێک بەوقەراردادە نەماوە. لەبەغدایە پاش سانو، ڕێژەی تایبەتی کە هەتا مەیدانی ئازادی درێژەی هەبوو، شبلی ئەل ئیسامی، سێ کرێتیرێ گشتی ئاجوودانی بەعس، مورتەدا ئەل هادیتی ڕابەری‌کمیتەی ئاشتی، وەژی‌نیرال عەمماش نایب سەرۆکی کۆمار، لەبارەی پێک هاتنە کەو، جیژنە کە-دا ووتاریان بلاو کردەوە.

عەمماش لەقسەکانی دا ڕایگەیاند کە ئێمە لەگەل کوردەکان پێکهاتوین، بەڵام ئەگەر کە سێک چیوتی‌ونالەباری لەکارەکە دا پێش‌بێنێ ئیتر "سەرقامکەکانی خویی‌سووتاندوە". ٥

لەبەڕێوە بردنی ئەو سان‌وجێژنە دا هیچ مروقیکێ سەرشناسی کوردی نەدەبیندرا، وەبەشداری نەکردبوو. سالح یوسفی وەزیری دادگستری لەبارەی (یەکەتی نەتەوایەتی‌دەبی‌لەسەر بناغەو، بیرورای باوەری) بێت، ووتارێکی بلاو کردەوە، بەلام لەڕاستەقینەدا لەقووڵایی دڵەوەنەبوو.

سەرئەنجام بەعسێکان چێوتی لەکاری سەرژماردندا دەکەن‌و، بۆدووایەی دێڵنەوە، لەئاکاما دەیانەویست پێکهاتنەکەی ١١ی مارس لەسەر نفوسی سالی ١٩٥٧، حسێب‌کەن!

ئینجا لەچاوو پێکەوتنەکانی کوردەکان لەگەل کاربەدەستەکانی‌حکومەت، ژینرال بارزانی هەولی دەدا کە "هەردوک لاپێکەوە لەڕێبازی دوستایەتی‌وە" مەسەلە گرنگەکەی کوردستان حەل بکەن ئنجا لە گفت و گوی رەسمی‌دا ژینیرال بارزانی زوڕ سەختی‌نەدەگرت‌ودەی‌گوت "ئێمە دەسالی ڕەبەق بوّوە دەست هینانی خودموختاری، شەڕوخەبات‌مان‌کردوە، ئەگەر پێویست بێ‌بوّ وەدەست هینانی‌شاری کەرکوکی‌ش ٥سالی دیکەخەبات‌وشەڕدەکەین." ٦

## ٣ــ بوحرانی ١٩٧١:

لەمانگی مارس تا نووامبری ١٩٧١، هات‌و،چو لەبەینی بەغدا،وە بارزانی لەبەرهیندی پێش‌هاتیک لەو لات‌دا، بەدژواری پیک‌دەهات، لەماوەی چەندمانگان دا ئەوکارەساتە درێژەی هەبوو، بێ‌باوەڕی لەهەردوک‌لاوە دەدیترا، وەتا قەراردادە کەشکا، ئەو بڕووایێ‌نەکردنە هەر درێژەی هەبوو.

### مەسەلەی کوردەکانی ئیران لەعەراق‌دا:

چەن مانگیک بوو کە سەروکەکانی بەغدا سیاسەتی "عەرەبی) کردنی و لاتیان لەبەرچاوو گرت‌بوو، عەرەبەکانیان دەنارده ناوچەی کوردستان کە

نشتە جێبن واتە لەهەرێمی ستراتیژیکی‌دا بە تابیەت لەدەوروبەری شاری کەرکوک یا ئاوچەی سەنجار داجێبگرن. لەولایە شەوە کوردەکانی عەراق داوا لەدەولەتی عەراق دەکەن کە لە کوردەکانی دەرەوەی عەراق کەبەشی زۆریان ئیرانین داوە بکرێ کەبێنە وەعەراق.

لەمانگی مەی ١٩٧١، لەبارەی ئەوکارەساتە، شەڕێکی قەڵەمی لەبەینی دووروژنامەی ئەج جمهوریە ئۆرگانی حکومەتی عەراق وەئەتئاخی ئۆرگانی کوردەکان بەهەست‌دێت.

ئەج جمهوریە دەنووسێو، دەڵێ کەهیچ‌کاتێک حکومەتی عراق دانی بەسەرئەوە دانە هێناوەونە گوتراوە کەئەوکوردانە بێنەوە عەراقێ، وەئێوە دەڵێن کە ئەو کوردانە پتر لە ١٠٠٠٠٠ کەسن لەحاڵێک دا پتر لە ١٥٠٠٠ کەس[٧] نین.

لەئاکاما حکومەتی عەراق بەو، قال مەقالو،ووت‌و،وێژە کۆتایی دێنێ وەنزیک بە ٤٠٠٠٠ کەس لەکوردە فێلیکان لەمانگی سێپتامبری ١٩٧١ دا لەسەرجیی خۆیان هەڵ‌دەقەنێ وە دەریان دەکات.

## ڕووداوەکانی وڵاتی بارزان (نیوەراستی ژوئیەی ١٩٧١)

لەحەوتووی دووهەمی ژوییەدا فەرماندای نیزامی، مانۆرێکی گەورەی نیزامی لەمەلبەندی بارزان‌دا بەڕێوە دەبات، وەبریگادێک کەبریتی لەتوپ‌وتانک بوون، هیرش دێنن.

لە١١ی ژوئیە بارزانی سەروکەکانی کورد داوەت دەکا، بەلام حسەن ئەل بەکر چارەسەری ئەوکارە دەکاوە شەڕ بو ماوەیەک ڕادەوەستێندری.

## پیلانی کووشتنی بارزانی لە (٢٩ سی‌پتامبری ١٩٧١دا)

حکومەت زۆر بەگرنگی بەدووای لەنیو بردنی بارزانی بوو، ئینجا لە ٢٩ی سی‌پتامبری ١٩٧١ دا پیلانێکی بۆچندرا، بەلام بارزانی لەوپیلا نەگیانی

ساغی ڕزگارکردو، لەنێو نەچوو، ئینجا ئەوکارەساتە بووبە هۆی ئەوەکە لەبەینی بارزانی وەسەروکەکانی بەغدا نێوان ناخۆشی پەیدا بێت. بۆ ئەوەی کەدووبارە پیلانیکی دیکەبگێڕن،وە لەولایە شەوە بیانوویان بەدەستەوە بێ کە مەلامستەفای ئاشتکەنەوە، ئەو کەڕەتەی ٩ مەلا لەبەغدایەڕا بە سواری دووماشین دەنێڕنە لای بارزانی. ئەوانە پیاوەکانی بیرو، باوەرپێکراوی حکومەتی بەغدایە دەبن، لەبەر پشتێندیان دا "دەزگای قسەزەبت کردنیان شاردبۆوە" کەقسەکانی بارزانی زەبت بکەن، بەلام ئەوانە دینام دەبن وەکاریتەقاندنیان لەلای شۆفێری ماشینکەوە. بەڕێوە دەبردرێ. لەوکاتەدا کەنیزیک بارزانی دەبن، دینامەکان دەتەقێنن، بارزانی لەلایەن یەکێک لە چاپەزەکانەوە کەخۆیوەبەردەگرێ ڕزگار دەبێت، دوکتور عوسمانبەلەشی خونیاوێوە هەل دێتەدەرێ وە هەرنومەلاکان دەکووژرێن.

چەن مانگ دووای ئەو کارەساتە، مەلامستەفا بۆلای مەلەبەندی حاجی عومەران دەچێت، لەیەکێک لەهۆدەکانی حاجی عومەراندا چاوی بەجیگایی تەقینەوەیەکی گەورە دەکەوێ کە.ولاتی خراپ کردوە، وەخوین و گوشتو،مێشکی سەر بەمیچێ وە نووساوە، وە بەبارزانیان نیشاندا گوتیان کە دوو بۆمب کە هێستانەتۆ قیوەو، لەهودە کەدەریانهێناوە،

ئینجا حەسەنئەلبەکر سەرکۆمار بێووچان، بەبۆنەی رزگار بوونی مەلامستەفای بارزانی لە پیلانەکان بروسکەیەکی لێدەدا پیروزبایی لێدەکات،وە ئەوەشی لەبروسکەکەدا وەدروخست بووکە ئەوپیلانە کاری دەولەتەو، سەروە دەولەت دەدرێ. بەلام بارزانی بەبێشکوگومان، باوەری هەبوو کەئەو کارەساتە لەلایەن بەعسیکانەوە پیکهاتبوو، ئەوانیش هەرپاکانەیان دەکرد. لەژوئیەی سالی ١٩٧٣ پاش ئەوەی کەلەپیلانەکاندا دەولەتوەسەر نەکەوت، نازم کەزار، سەروکی هێمنایەتی وساواکی عەراق لەهەوالێکی ڕەسمیدا ڕایگەیاند کەئەوپیلانە بەدەستی منوەبەدەستوریمن بەڕێوە بردرا وە،... وە مرۆڤیک لەوکارەدا دەستوری بەمن نەداوە.

بەشوێنی ئەو پیلانانەدا مەلامستەفا بۆپاراستنی گیانی خۆی کوڕی، بەرگریو، خاترجەمی بە هەستهێنا، وە"گفتوگوی" خویبڕی. ئینجا پاش ئەو جەریانە ئیتر مەسەلەی کورد بەحکومەتی بەغداو، کوردەکان لەبەردەست

ڕانەدەپەری وەحەل نەدەبوو، بەڵکو مەسەلەکە، دەبوو لە تاران و... واشنگتن جێبەجێ بێت، وەبەتایبەت بارزانی بەقسەکانی ئەوان گوێلەمســــتبوو، وەراوتەدبیرِی لەگەڵ ئەوان دەکرد. کاتێک کەحەسەن ئەل بەکرلە نیوەی مانگی نوامبری ١٩٧٣ پێشنیاد دەکا کە "حیزبی دیموکراتی کوردستان و، کوڕێنەتەوە پیش کەوتوکان پێویسیە لە"بەرەیەکی واحد"دا یەکبێن،ژینیراڵ بارزانی ڕەدی دەکاتەوە وەدڵێ کە ئەوکارە بۆگەڵێکی کە لەخویەوە دەنگینیە وباوەڕیان پێناکرێ فەرهەنگیان لاوازە وەتووانائی ئەوەینیە کەفکروگومانی خوی بنوینی ئیتر ئەو یەکگرتنە بەدەردیچدەخووات!" ٨

## ٤ـ شایئێران وەپیکهاتنە کەی ١١مارسی ١٩٧٠

زۆر بەباشی ڕوون نەبۆ تەوە کەچوەختێک بارزانی لەگەڵ شایئیران چاوو پێ کەوتنیبووە، بەلام وادیارە کەئەوچاوپێ کەوتنە، پاش ناکام مانەو، ئیمزانە کردنی قەراددادەکەی ١١ی مارسی ١٩٧٠ بووە.

شایئێران لەوە زۆر مەترسی هەبوو کە ئەگەر کوردەکانی عەراق لەگەڵ حکوومەت ڕێککەون،ئیدی عەراق بەتەواوی بەسەر مەلبەندی خلیجیفارسدا، زاڵدەبێ،وە دەبێتە یەکێک لەهەرە دەولە تەکانی تووانای ئەو ناوچەیە،وەلە لایەکی دیکەشەوە ئەوپیکهاتنە دەبێتە هۆی ئەوە کە کوردەکانی ئێرانیش هەڵستنە سەرپێ،وە لەئیران دا ئاژاوەیەک بەڕێوەبەرن وەبارزانیش دەستو، باڵیان بە سەرکێشێ.

کاتێک کە پیاوە گەورەکانی ئیران بەنهێنی هاتنەلای مەلامستەفـــا، لەووتو،ویژەکانیاندا بەبارزانیانگوت، ئایائیوە دەتانەوێ ببنەعەرەب؟ بارزانی لەوەلامدا گوتی،ئێمە هەتائیستا لەگەڵ بەعسیەکان پیک نەهاتووین،کورەکانیشم دەڵین ئتر بۆچ بەشەرین، تەنانەت ئەوە دەبینە خاوەن مافەکەمانو،ڕێک کەوتووین؟" ٩

### ٥ – بەچەشنی نیۆنجی شورەوی بۆپیک‌هاتنی هەردوک‌لا ئۆلتیماتوم‌دەدا "اتمام حجت )

لە٨ی ئاوریل‌ی ١٩٧٢ دا شورەوی لەگەل عەراق پەیمانێک بەئیمزا دەگەیێنێ ، کەئەو پەیمانە دەبێتە ئەو هەلوێستە کە شورەوی لەمەلبەندە کەدا ، بۆپەرەپێ‌دانی کاروباری ڕامیاری خوێ هەول‌بدا ،ئەوقەراردادە بەڕاستی بۆئێران زەنگێکی خەتەر بوو ، مەبەست بەوە کەبارزانی‌و ، شوڕەوی دەیانەویست نێوانی خۆیان دووبارە تازەبکەنەوە لەئاکاما لەمانگی فیۆرییەدا ، بارزانی حازردەبێ کە کۆڕێکی شورەوی بەسەروکایەتی رومان‌سیەف بێنەلای وە لەناوپردان چاوپێ کە. وتنکیان هەبی ، ئەوپیاوە یەکیک لەئەندامی ناوەندی کمیتەی کومونیستی شورەوی– بوو . لەوچاوپێ کەوتنەدا رومان‌سیەف لە بارزانی دەوێ کەنێوانی لەگەل بەغدا نوێ‌کاتەوە وەنێوان ناخوشیان لەنیۆ هەل‌گیرێ ، هەروەها لاپەڕێکی تازە لەسەرەتای مێژووی عەراق‌دا بنوسرێ .

ئەو ووت‌و ،وێژە وادیدارە زور بەخۆشی‌و ،باشی لەبەینی کۆ ڕ ەکـــــەو ، بارزانی‌دا پیک‌هات . ١٠

بارزانی لەگەل کۆڕێ شورەوی بەزمانی ئەوانی قسەدەکرد ، لەکاتیک داکەرووسیکی باشی‌دەزانی ،لەووتارەکانی خوێ‌دا گوتی ، : "بەراستی سەددام حسین پیاویکی پیسە ! " ئینجا بۆئەوەی کەئابروی نەچێ ،ئیۆەی بەیارمەتی‌و ، هاواری خوێ هێناوە وە ناردوویەتە لای‌مە . . . ئەگەر ئیۆە یارمەتی بدەن‌و ،بالی بەسەردا بکێشن‌و ، پشتووانی لێ‌بکەن ، ئیتر لەسەر کۆلی کوردان سوواردەبێ ، وەکاری کوردان وەک مەسەلەی تایوان‌ی لێ‌دێ . (لەوکاتە دانیکسون بۆووت‌و ، ویژ لە پیکەن پی تەختی‌چین ) بوو .

بارزانی هەروەها لەکۆڕێ شورەوی داوادەکات کە لەپێش پێک‌هاتن لەگەل بەعسیکان ،پیویستە لەگەل سازمانی سیاسی عەراق وەبەتایبەتی کوردەکان چاوپێ کەوتنیک بەڕیۆەبچێ وەڕاو ، تەدبیر لەو دوولایەشەوە وەرگیرێ .

**نیکسون سەرکوماری کاتی ئەمریکا**

پاش چەن حەوتوان کاسگین سەروک وەزیری سوویەت چاووپێ کەوتنیکی رەسمی لەعەراق بەجێ هیناوە لەڕادیودا سەروکەکانی کورد، پیکهاتنی عەراق و، شورەویان گوی لی‌دەبی.
محەممەد مەحمود عەبدوورەحمان ئەندامی‌رامیاری‌پ.د.کوەوەزیری کاروباری

شمال بەتووندی داوالە کاسگین دەکات کە بەس کاری کوردەکان بەکوی دەکات. کاسگین لەوەلامدا دەلێ، بوّتە واوبوونی مەسەلەی کوردەکان، من پیشنیاد دەکەم کە هەردوک لادو کۆڕ بنێرنە شورەوی تالەوێ گفت و گوێی لیێبکرێ و مەسە لەکە حەل بێ، وەهەروەها کاسگین گوتی کە سەروکایەتی کوڕی کورد بدرێتە دەستی حبیب کەریم‌دەبیری گشتی حیزی‌دیموکراتی‌کوردستان‌پ.د.ک‌بەلام‌سەبارەت‌بە ئـــال‌و گوریک کە لەعەراق دا وەدی‌هات ئەوبانگ هێشتنە وەپشت گوێ خرا وەئیتر لە بابەت کاروباری کوردەکان هیچ باسێک نەهاتە پێشێ.
هەروەها کاسگین لەقسەکانی گشتی خوی دا، ئشارەی بەوسەفەرە دەکرد. سەرئەنجام پاش ئەوەی کە شورەوی لەوبارەیەدا، نێونجی نەکردو، ،ەنگی لەبەردەرنەهات، وردە وردە کوردکان بۆلای شای ئیران وەئەمریکا یشران.

### ٦ ــ پیکهاتن لەگەڵ سیاوشا

کوردەکان دەیان دیت کە ئیترکەلک و قازانجیک لەونیوەدا بو وان نەماوە، وە دەیانەویست کە هەل و مەرجیک هەڵ کەوێ کەڕێگایەک بێتە پێشێ و، سوودی لیێوەرگرن! ئیران نیگەرانی ئەوەبوو کە شوڕەوی لە ناوچە کەدا ئەوە دێ هەست پەیدا بکات، وە لەگەل عەراق پهتر نیزیک دەبێتەوە، وەبە تایبەت پەیمانی

بەست تووە. وە هەروەها ئیران دەی‌دیت، کە لەلای شمالەوە لەسنووریکی پان و بەرین‌دا لەگەل شورەوی هاو سنوورە، وەلە سەر ئەوەشڕا دە یەوێ لە سنووری ڕۆژ ئاواش دا یانی ڕوژ ئاوی ئیران داسینگی خۆی بچەقێنێ وەپێ‌خووسپیک‌لە خلیجی فارس دا کەڕەگی ژیانی ئیرانە بە دەست بێنێ.[11]
ئیخا ئەمریکا دەیەویست لە وولاتی عەراق‌دا جێ‌نشینی ئینگلیس بێت، وە لەخلیجی[12] فارس‌دا جێ‌پێیەکی بۆخوی پەیدا بکات، ئینگلیسکانیش بە هەر

چونیک‌بی دەیانەویست، سوودوقازانجی ئەو مە لبەندە لە دەست نەدەن جامە بەست بەوە بزوتنەوەی دژی حکومەتی عەراقیان هان وتین دە دا وە لەشمالی عەراق دا نەیان دەویست شەڕ بکووژێتە وە وەکۆتایی پێ‌بێت، وە بەراستی ئەوەی لەحالی ببوو، کە ئەگەر عەراق دەستی وەبەرخۆی بکەوێتەوە، وەگرێو، گۆلی ناوخۆ لەبەین بەری، ئیتر دەپڕژێتە سەرئیسرایل وەدژی ئەودەست بە کار دەبێت و، زەرەرو، ژیانێکی گەورەی لێ‌دەدا. عەراقی هان دەدا کە بەشی — زیاتری هێزی خوی بۆ سەرکوتی کوردەکان لەشمال دا ڕابگرێ، وە بەو جۆرە لە دەنگ و چەڵەمەو، شەڕو شوڕی عەرەبەکان و ئیسرایل دا دوور بێت. ئیخا بەو چەشنە وردە وردە دەهات سازمانی سیا[۱۳] لە ناوچەی کوردستان دا هەڵوێستی خوی پتەوکات، بەلام هێستا زوڕ بە چاکی و ئاشکرائی سیا ڕەنگ و ڕووی خو ی‌وە — دەرنە دەخست.

لە واقع دا نوێنەری انتلجنت سرویس بەرلەپێک‌هاتنی پەیمانی"مارسی ۱۹۷۰ لــــە بەر چاوی بوە کە بە ژنیرال (مستە فا ـــ) بارزانی کومەک بکات، بەلام لەو بڕیارە چاوی‌قووچاند، وەبالوێزی‌ئەوان‌لەتاران‌ڕای‌گەیاند کە ئەگەر ئێمە یارمەتی کوردەکان بدەین دەبێتە هۆی درێژەی شوڕش کە ئەویش دەبێتە مەبەستی جۆی بوونەوەی کوردەکان وەهەروەها بالوێزی دانشتوی تاران پیێ وابوو کە شورەوی خۆی تیوەردەدا وە لە ناوچە کەدا بۆئەمریکا[۱۴]، کە ندو کۆسپ بە هەست دێنێ. سازمانی‌سیالەئوتی ۱۹۷۱ ولەمارسی ۱۹۷۲کاتیک‌کەکسینگێر یارمەتی دەری سەرکومار نیکسون‌بوو، پێشنیاری‌خۆیی‌بەشورای‌هێمنی‌دەدا

بــــەلام. پاش بەستنی پەیمانی عراق — شورەوی، هنری کسینگر، راوتەدبیری دەگوری، وە پاش ووت و، وێژێکی "تایبەتی" لەگەل شای ئیران لە ۳۰ یا ۳۱ مەی ۱۹۷۲ دا سەروک کۆمارنیکسون قامک لەسەر بەرێوەبردنی نەخشەی سیا دادەنێ وە دەستور دەدا ۱۶ میلیون دلار (۸ میلیارد فرانکی ئەو وەخت) لەمانگی ئوتی ۱۹۷۲ تا مارس ی ۱۹۷۵ بە ژنیرال بارزانی بدرێ.

بە شوێنی ئەوەدا پاش چەندحەو توو، گفت و گوێی تایبەتی‌وە ڕووبە ڕوو بوون‌ی بارزانی[۱۵]، لەگەل شای ئیران، شا، ڕاوتە دبیری هێنا سەر ئەوەی کە پتر یارمەتی بە کوردەکان بدرێ، چوونکە ئەوەندەی پێ کەم بوو![۱۶] بەڵام بارزانی لە بارەی قسەی شای ئیران هەربێ باوەڕبوو، وە خوتیۆەردانی سیای پێ باشتر

بوو. ئیخا خوتێوەردانی سیا لەکاروباری مەسەلەی کوردان دا مەیدان، زیاتر دەدابە ژنیرال بارزانی، واتە خۆ تێهەڵ قووتاندنی ئەمریکا لەکاری کوردان، شای ئێرانیێ خاتر جەم دەکرد کە یارمەتی چاکتر بکات وەبۆ دووا ڕۆژی پشتی لی نەکاتەوە.

لەڕاستە قینەدا لێرە دابوو کە ڕۆژی ڕەشی بارزانی وەبە شوێنی ویدا بەدبەختی کوردەکان وەدیهات. ژنێرال بارزانی لەلای خۆی پێی وابوو کە یارمەتی ئەمریکا سەبارەت بە ڕاپەرینی کوردە.

ئیخا بۆبەڕێوەبردنی ئەوکارە ٣ یا ٤ مرۆڤ (ئیدریس – مەسعود – "سامی" مەحەممەد مەحمود عەبدوردەحمان لە لایەن بارزانیێوە داندرا کە لەگەل سیا لەهات و چۆو، چاووپیکە وتن دابن، ئەوەی کە ئاشکرا بوو ئیدریس و مە سعود، تەجروبەی ڕامیاری ئەوتویان نەبوو، سامی دەریبڕی کە خۆتێوە – ردان و، یارمەتی سیا، ناتووانێ وەیان نایەوێ داوای مافی نەتەوایەتی کورد بەجێی بگەێنێ.

لە ئاکام دا بارزانی بەچاوو گوی بەستراوی باوەری بەمریکا کرد – "بارزانی بە هیچ کامێک لە قودرەتەکانی دیکە باوەری نەبوو" زۆرجار لەووت، وێژەکانی خویی دا، ڕای گەیاندبوو کە بۆسەرکەوتنی ڕاپەرینەکە تەنانەت ئامادەیەکە ببێتە ئەیالەتی ٥١ ئەمریکا. ١٧

دەگونجێ مرۆڤ لەخۆیی بپرسی کە ئەگەر ژنیرال بارزانی زۆر لەوتیکەلێ خاترجەم نە بوو، بۆچ لە وبارەیە دالەگەل کسینگر گفت و گوی کردوە.

لەسەر ئەوەش ڕا بارزانی ڕەزامەندی خۆی لەوبارە دا سەبارەت بە کی – سینگیر دەربڕی، واتەکەڕەتێک ٣ قالی وە کەڕەتیک گەردن بەندێکی زێر و مرواری لەمانگی مارس ١٩٧٤ دابۆکی سینگیر کەژنی هینابوو، دەنێری. ١٨

بەلام دیاری نەکرا، کە ئایائەو دیاریانەی بۆچ بۆ نیکسون سەرکومار وە – ویلیام راجرز سێکریتیری دەولەت نەدەنارد. هەروەها کەسەرهەوالی "دەنگی کوردستان" کە بلاوی کردەوە، بارزانی دووجار لەگەل کیسینگیر لە تاران لە – مانگی ئوکتوبری سالی ١٩٧٤ داچاوەپێ کەوتنی بووە، بەداخەوە لەو چاوپێ کەوتنانەدا بارزانی تووشی فڕوفێل تەلەیی، کیسنگیری ماکیاویلست [١] تەدبیر

(١) ماکیاولیست: مەکتەبێکە کە پیاوی خوش گوزەران لەومەکتەبەدا ئەندامن. م

کەری نیکسون بووە وە کلاوی چۆتەسەری

## ٧ ــ نیــوان ناخۆشیو، ناتەباهی بارزانیو بەغدا

لەمەسەلەی خۆتی وەردانی ئەمریکا لەکاری کوردەکاندا، سەرکۆمار نیکسون وەکیسنگیر هەولیان دەدا کە زۆر خوئاشکرانە کەن، چوونکە شای ئیران گوت بووی کە ئەو کارەدەبێ زۆر لەنهێنی دابەڕیو ببردرێ:

سەروک کوماری ئەمریکا، جان کانالی سیکریتری گشتی خەزانە داری قەدیمیخۆیبۆ ئاگادارکردنی شای ئێران، لەنیۆە راستی مانگی ژوئیەی ١٩٧٢ نارده تاران کە پێی را بگەیێنی کە سیا تەسمیمی گرتوە کە نەخشەی کارە کـــەی بەڕێوە بەرێ. جالیرە داهێندی کار بە دەستانی ئامریکایە دەستیان بەچاوی خویان دا گرتو، خۆیان لەنەزانین دا، وەدژی دەس تێ وەردانی سیالە کارو ــ باری کوردان دا دووژمنایەتیان نەکرد. ٢١

شایئیران ئینجا زور بەپاریزە وە لەگەل بارزانی چاوپی کەوتنێکی بەجێ دێنێت بەلام بەهیچ جۆریک مەسەلەی دیدار لەگەل بارزانی لە مەجلسی نیۆئیەران دا باسی لێنەکرا... هەرچەند ئەوکارە زۆربەنهێنی بەڕێوەبردرا، لەسەر ئەوەشڕا بەغدا لەوکارە ئاگادار بوو، بێگومانکار بەدەستەکانی بەغدا دەیانزانی کەشتێک لەگۆڕێدایە .لەئاخری ژوییەی ١٩٧٢دا روژنامەی ئەسسۆرە، کەئورگانی بەعسیکانی عەراقبوو، بارزانی تاوان بارکرد بەوەی کەچەکو، ئەسلەحەی قوورس وەردەگرێ وە هەروەها لیزگەی تازەی کوردستانی لەئیران دامەزراندوە، وەکەمپی تازەی هێزەکانی "فیرکردن و تەعلیمدانی نەتەوایەتی" بۆکوردەکان داناوە. ٢٢

لەوکاتو، وسەروەمەدا ٥ وەزیری کورد لەکابینەدا بوون، بەلامپاش پیلان گێڕا نەکەی بارزانی لە١٥ی ژوئیەی[٢٣] ١٩٧٢دا لە حەقیقەت داهات وچۆ بڕابوو، تەنیا هێندێ نوشتارو، یادداشت لەبەین دائالوگۆڕ دەکرا.

لە ٣١ ژوییەی سالی ١٩٧٢ دا دەفتەری سیاسی پ.د.ک نووسراوەیەکی لە ١١ ماددەدا، بۆ بەعسیکان نارد، وەلەوێدا حکومەتی عەراقی تاوانبارکرد کە وەزیریناوخو ،وە سێرویسی ئاگاداری هێمنایەتی عەراقیێ" لەکـــارە

له سه ره تای سێ پتامبری ١٩٧٤ وه، هێزی عه راق هه وڵی ده داکه تا سه ره‌ رما وسۆڵی زستانێ نه گه یشتووه، ئه وبڵندایانه به فرۆ که خراپ بکا، ستادی ناوەندی عه راق پێی وابووکه پێویستێتی ئەوجێ عاسته مانه بگرێ وه کاره کەی ته واوبکات . جاله سه رئه ورِاوته دبیره ٣٠٠ تانک١٢ ئاتەش باری هوپتزیێوه گوردانیک ی زرێهی ئاماده کردبو و که له گه ڵ ٣٠٠٠٠ که س وەفرِۆکه یه کی‌زۆرکه شان به شانی هێزی زەمینی بێ ، هیزش به رێته سه رناوچه.که شه رِله گه روی دۆڵی عومه رئاغا رِاده ستی بێ کراهێزی عه راق رِو وبه رِووی کیۆی زۆررزه ک له به‌رپردێکی زۆرعاستەم رِاوه ستابو وده یه ویست که هێزی نیزامی به وپرده دابپه‌ رِێنیێته وه وه به وجوره زۆربەی خۆی نیشان بدات . ١٢

له ١٠ی مانگی سی‌پتامبری ١٩٧٤ وه له سه ره تای ده س پێ کردنی شه‌ رِه وه، هێزی عه راق ١٣٠ تانکی ناردە پێشێ وه تا ١٢ ی سێ‌پتامبر ئەوشەرِەی درێژه پێدا ، به لام له١٤ ی سێ پتامبر داشه رِ ێکی گرنگی "مێژووئی "دەستی پی‌کـرد، وه له شه وی ٢٧ و ٢٩ ی سێ پتامبری ١٩٧٤ دامه سعودی بارزانی که خۆی را به رایەتی ئه وشه رِەی ذه کردتەوای گێرِا وەته وه: لەته واوی ماوەی شه رِداهێزی عه راق به تۆپ ورِاکیێتی فرِۆکه ئێمەی کوتاوه تاکاتی ٣ی به یانی هه ردرێژەی هه بووجابه شوێنی ئه وگولله ها ویشتنه داهێرش ده ستی پی‌کرا .
به راستی سه رۆکی به رزی عه راق له ده ستوردانی تۆپ‌ها وشتن وه گوللەته‌ قاندن وبۆمباران کردن بۆسه رئێمه زۆر سه خیبایەتی ده کردوبه لێژاوده ی‌ها‌ و پشت له شکر یێک له هێزی عه راق که بریتی بوون له گوردانی ٥ و ٢٩ وەهێزی تایبه تی وه له لایەن تانکێکی زۆر پشتیوانیان لێ ده کراله کیۆەکان رِابۆسه‌ رهیزی ئێمه هیێرشیان هێنا . له به رامبه رئه وهه مو و هه ڵمەت وهێرشه داکه بۆهێزی مه کرائێمه ناچار بلاوه مان کرد !

به لام زۆری پێ‌نه چووپێش سه عاتی ٥ ی به یانی بەرله وەی کەهیزش عه راق بتوانی سه نگه رهەڵ قەنێ وه جێگای خوێی دامه زرێنێ دژی هیێرشمان دەس پێ کرد . به رِاستی ئه وه زۆرجێێ مه ترسی بوو . مه سعود گێرِایه وه، وه گوتی

ئێمە گوللە وفیشە کمان نێزیک بە تە واوبوون بوو.دە ستمان بە شە ڕی نارنجە- ک کرد وە بە ئە سلە حە ی سارد هە ڵمە تمان بردنە سە ریان عراقیێکان سە نگە- ریان چۆل کرد وهە لاتن .سە رئە نجام ٥٠٠کە سیان لێ کوژرا ٥ تانکی خراپیان بە جێ هێشت . . . وە لە پێش مە رگە کان تە نیا ٨ شە هیدو٢٢ مرۆڤمان برینداربوون. مە سعود هە روەهالە قسە کانی داگوتی ئە وشکانە بۆعراق زۆرگران تەواو بووە گێڕایە وە کە من خۆم بە تە نیا ئە وشە ڕە م بە ڕێوە بردوە ئیدریسی برام بۆئێران وە بە ڵکوبووولاتی دوورترسە فەری کردبوو . ١٤

ئە وشە ڕە لە حە قیقەت داشەڕی ( مێژووئی ) دو وپاتە کردە وە چەن ڕۆژ بە دووای ئە وشە ڕەداستادی هێزی عە راق بە رگری ولە مپە رراگرتنە کانی کوردە-کانی پێچە وانە کردە وە وە لە ٣ ی ئوکتوبری ١٩٧٤ وە دە ستیان بە هێرش بۆسە-رزۆرزە کبرد . ئینجائە وەی کە زۆر ئاشکرایە دۆڵی ناوچۆمان وە ناوپردان تەنیا ناتووانین بڵێین کە بە تە واوی ناوچەی کوردستانە بە ڵام دە گوترێ کە بە ڕاستی لە هە وە ڵ تائاخرە وە بۆ کوردان جێگایە کی عاستەم وناسک بووە ڕە گێکی ژیان بووان بە ژماردە هات .

## ٧- دانانی شتێکی دی واتە ڕێک وپێک کردنی ئیداری بە جێی (ئۆتۆنۆمی)

لە کاتی هێرشی پاییزی داحکومەتی بە غدالە ناوچەی ئوتونومی دابە چەشنی خۆیان تە شکیلاتێکیان دامە زراند : لە ٢٤ سی پتامبری ١٩٧٤ وە ، هاشم ئەکراوی بووبە ڕابە ری بە ڕێوە بردنی ئە وکارە بە ڵام هێستائە ندامانی دیکە دیاری نە کرابوون . لە ٥ ی ئوکتوپری ١٩٧٤ وە حکومەت بە چە شنی ڕە سمی لە شاری هەولێرهە ولێین کۆبوونە وەی کۆمەڵی ناوچەی کوردیان پێک هێنا . حکومەت زۆر بە لێشاوی ودە ست بلاوی وتێگرائی شتومەکی دەنارد وەلە ١٠٠ کە س ڕۆژنامە نووسە کانی دە رە وە داوە تی کرد . عوبە یدل لای بارزانی شیان لە گە ڵ کە وت بووئە ویش ڕای گە یاند کە ئیترلە کێوە کانی کوردستان داتە نیا کە سانێک ماوون ودزی

حکومەت بە شە ردێن کە لایەن گرە کانی ئیمپریالیسم وفئودالە کانن !
بە لام روژنامە نووسە کانی دە رە وە نە یان دە توانی ئە ومە تڵە بە بسە- لمێنن چونکە هە موویان لە نێوخۆیان داتاریفی سە رۆک کۆماری عراق حە سەن ئە ل بە کریان دە کرد وە ئیترگوێیان بوهیچ شتێک شل نە دە کردئە وەش سە- بارەت بە وەی نە بووکە کاری کوردە کانیان جێ بە جێ کردبووبە ڵکولە بە رئەوە بووکە دە زگادژی ئێران وسە یۆنیسم وئیمپریالیسم دە نگ وهە واڵی دە ردە بڕی ئینجاخە ڵک لە وبابە تە وە" بێ‌تە فاوەت مابوونە وە" وە دە ولە تش لە وبارە یە دادە یە ویست زۆرکە ڵک لە وهە را و هوریایە وەرگرێ . ١٥
کوردەکان لە وبابە تە وە لێرە دابە هە ڵە نە چووبوون وە ڕاگە یاندنی کارساتە کەی هە ولێریان پێ‌گاڵتە بووەوە شە ڕبە چە شنی پێشو لە لایە ن پێش مە رگە کانی کوردە وە لە کێوەکانی کوردستان داهە ربە ردە وام بووخە ڵک هە موئێواران لەهە- ڕکومەل و کۆبوونە وە یە ک دا کە دانشت بوون رادیو-ی " ئینرگەی دە نگی کوردستان " یان گوێ دە دایە .

## ٨ـ ئاخرین ڕۆژەخۆشەکانی بارزانی وبزوتنەوەی کورد

لە پائیزی سالی ١٩٧۴ دالە ناوچە یە کی ٣٥٠٠٠ کیلومتری[١۶] واتە لە چووار خشتی کوردستان داکە میلیونێک دانشتووی تێدا بووجگە لە پە نابە رە کان پترلە وەندە کە سە ش لە کوردستان دامابوونە وە وە لە سە رئە وە ش ڕا کە لەهێندێ‌لەو مە لە بە ندانە داهێزی کوردەکانی تێدانە مابووبە لام وادیار بووکە بارزانی‌لەو زە و یوزارە دادە ستی دە ڕووا . عە لی‌عە بدوول لا ( وەزیری دارائی لە نێویە کێک لە ۴ یا ۵ کۆخ داکە بە کۆلە کە ی‌ئە ستور دروست کرابووولە تە نشت خڕێکی کە چە ندسە دمتری لە گە ڵ دێی دە ربە ندە وە مە ودای هە بوودە دیترا . ئە و مرۆڤە لە کاتێک داکە پێکە نینێکی تاڵی لە سە رلێوی بو وهە ڵیدایەو گوتی : بەڵێ لە ڕاستە قینە دائە وە ئۆتۆنۆمی نیە کە ئێمە پیویستمانە بە ڵکوئە وە مافی گشتی

نە تە وایە تیە کە داواکراوە. هە رلە وکاتیش دادە نگی تۆپی قورس لە لای ژەو-
اندزە وەبە گوێ دە گە پشت وەوای دە نوواند کە بە رەی شە ڕزۆر دو ورنیە بەلام
لە سە رئە وەش ڕاکوردەکان ؛ ئەتەدارە کی بە ریوە بردنی کاروباری مافی
گشتی نە تە وایە تی دابوون

**کابینەی کوردەکان**

بێدە نگ وهە راکوردەکان وە زیرپان دانابووکە کاروباری کوردستان بێ ڕێوە
بە رن ئینجائە وچە شنە ئیدارە کردنە لە ڕووانگەی هە واڵ دە رەکان ورۆژنامە
نووسە کان بە نیۆی ئیدارە کردنی سازمانی ناوخۆ دە ناسرا واتە پێیان " مودیریتە
تی "وولات بووبە ڵام کوردە کان لە نێو خۆیان داهەر ووشەی وە زیریان بە کاردە
برد. ئینجاوە زیرەکانی حکومەتی کوردەکان بریتی بوون لە" سامی" مە حمودعە-
بدوورە حمان کە وە زیری کاروباری دە رە وەی حکومە تی کوردستان بوو.

وە زیرەکانی دیکە یە کیان دوکتۆرمە حمودعوسمان بووکە لە وە زاڕەتی دە
رە وەش کاری دە کردعە لی عە بدووڵلاوە زیری دارائی، داراتوفیق ئاگاداری وتە
علیم وتە ربیەت، سالح یوسفی دادگوستەری، نوری شاوێس کارەکانی گشتی،
موحسن دزەئی ناوخۆ، سە دیق ئە مین ش وەزیری پەنابە رە کان بوو. پۆستی وە
زاڕەتی بە رگری بە کس نەدرابووبە لام "دە فتە ری نیزامی" لە لایەن عە بدول
وەهاب ئوتڕوشی وە بە ڕێوە دە بردراوئیدریس بارزانیش سە ری لێ دە داوێ-
ڕادە گە پشت پولێکی کە بۆکورد ستانیان دانابووکە لە٦ مانگان داخە رج بکرێ
١٨ میلیون دیناری عەراقی یانی ٥٥ میلیون دۆلار بوو، (ئاوریل — سیپتامبر
١٩٧٤) وەقە را ربوولە دووایە داپوولی سالێکی خە رجی کوردستان لە لایە نوە
زارەتی کاروباری عە راق وە، بۆشمال تە رخان بدری. ١٧

ڕا بە رە کان وسە رۆکەکانی کوردلە چاک ترین ڕۆژە خۆشە کانی کوردستانی
ئازاد دازۆربە دلێکی پرلە شادی وئاواتە ودە س بە کاربوون تە واوی ڕێگاکانی ها-
میلتون لە حاجی عومە ڕانەوە تاناوپردان لە لایەن وەزارەتخانە کانی کورد،

ئیدارە دە کران کە مە رکە زیان حاجی عومە ران بوو. حاجی عومەران گوندێکی چووکی کوردستان لە ئاخرین زە ویوزاری عە راق لە سنووری ئیران دابووئە ودێیە چووکە واچاوە ڕووان کرابووکە ببێتە" پێ تە ختی" کوردستان: ئە ودێیە خانو ومالی زۆرخوش و باشی‌نە بووچە نددووکانێکی چووکی هە بوو کەتاجرە ئێرانیێکان خرێد وفرۆش یان لێ دە کردجارجار پیاوە گە ورە کانی ڕژیمی‌عە-راقیش دەها تن ولە وێ دە مانەوە . ئە وەی کە ئاشکرایە هەڵ بژاردنی ئە وجێگایە بۆپێ‌تە خت مە بە ست بە نێز یک بوون لە سنووری ئێران و عە راق‌وە بووە مە بە ستی دیکە ئە وە بووکە چوون جێگاکە ی زۆرعاستەم بووفڕۆکە کانی عە راق‌نە-یان‌دەتووانی لێ‌نێز یک بنە وە وە ئەوە سە بارە ت‌بە کێوە بە رزە کانێک‌بووکەدە وروبە ری ئە وگوندەیان گرتووە. هە لۆیستێکی دیکەش لە هە ڵ بژادرنی حاجی عمەران ئە وە بووکە خزم وکە س ووکارە کانی بارزانیش ی تێدابوون لە بەینی تە ققەوە ستاندنی سالی ١٩٧٤ ــ ١٩٧٥، وە چە ندهە نگاوکە لە گوندە کە دو وردە بوویە وە کۆشکێکی تازەی زۆرخۆش واتە مۆدێرن دروست کرابووکە دە فتە ری ئیدریس ومە سعودی بارزانی بووله وێداکاروبارهە ڵ دە سووڕا (جێگای توریستی عە راقیێکان) ش بووئە وکۆشکە لە قە راغی‌خانووناخۆشە کانی پێش‌مە-رگە وەسازکرابوو پە نابە رە کان بە ژن وگە نج وکچ وکوڕە وە کە دەهاتن بۆئێران پە نا بەرن ڕێگایان بە سە رئە و گوندە دابوو، وە شۆڕ دە بوونە وە خاکی‌ئێران وهەروە هالە دە ورو بە ری ئە ودێیە داچە ندپە ناگایان پێک هێنابووە بە رگری دژی ئاسمانیش دە دیترا. وە لە تۆپە کانێکی کە بێ‌گومان ئە سلە حە یەکی‌تازە بووکە بە کوردستان در ابوودە بین درا. لێژاوسێلاوی پە نابە رە کان لە ئێواریی ٦ مانگی مارس ی ١٩٧٥، دە ستی پێ کراوە پە نایان بۆئیران هێنا.

لە نێودۆڵە کە داچادری‌وەزارەتی ئاگــاداری، و خە بە رۆە تە علیم و تە-ربیەت ی حکومەتی کوردستان لێدرابو وئینجا خوێندە وارەکان و قوتابیێکانی کوردی ڕووناک بیرکە لە بزوتنە وە کە ی کوردستان دالە گە ڵ بارزانی بوون وە پە نایان هێنابوو، لەودێیە داچە میورەیان کردبوو، وادیار بووکە هاتوون لە

دێیه که دابحه سێنه وه وزۆر بمێن ننه وه، له ودێیه هه روەها مامۆستا کانی زانستگه وه مودیری وەزارەت خانه کان که له نێوچادری پارچەئی ، یان له نێودو کانێکی ئاسن داکوێبوونه وه ده دیتران وه زیری ئاگاداری وخه بەردا را تۆفیق رۆژنامه نو وسێکی کۆن بۆواته سه رنووسه ری رۆژنامەی ئه تتاخی له سالی ١٩٧٥ وه ١٩٧٤ وه بوو بارزانی بۆهه وه ڵین که رەت کردی به وه رگێری گۆڤاره کان وه کاربه ده سستی گوێ ڕاده ری ڕادیوکانی ده ره وەئه وپیاوه وه رگێرێکی گه ورەی کوردبووبه زمانی عه ره بی‌له ڕادیوکور دستان" ده نگی کوردستان" داه هه وەها به سه رچاپه مەنیێکانی دیکەی وه زارەتخانه کانیش ارادەگـه پشت. به شی" ته علیم وته ربیەت" بریتی بوون‌له چه ندسه دکه س خوێنده وار ، کەها تبوونه سه رزه مینی ئازاد کراوی کوردستان وه ده یان خوێند .

بۆگه یشتن به ده فته ری" سه رۆک وه زیر" پێویست بووچەند کیلومترێک بێیه خوواری. چه ندماڵێک بو و که له سه ره وه بۆخوواری ده ڕووانی وەماڵی وه زیری دارائی ، وه وه زیری دادگوستەری له وده ربه نده دابووله لای خوواره وه له قه راغی حاجی عومەران له نزیک چووارڕه یانێک له گه ڵاڵه" ده فتەری نیزامی" وه" ده فتەری ڕامیاری" قه راری گرت بووبه لام له بەرچاوی فڕۆکه کان دیارنه بوون.

فه رمانده کانی حکومەتی عه راق ته واوی ئه وجێگایانەیان به باشی دەزانی کاربه ده ستانی نهێینی له وناوچەیه دازۆربوون وه له پێش برینی‌هات و چۆدا کاربه ده سته کانی عه راق له به ینی حاجی عومەران و ناوپردان داهات وچۆیان کردبووله سه رئه وەش ڕاهیچ کاتێک هێزی ئاسمانی عراق له بۆمباران کردنی‌هێزی به رگری ناوەنـــدی ژیانی کوردان دا پیرۆزنه دەبوو .

فڕۆکه وانه کان بۆمباکانیان له بلندایه کی زۆره وه داویشـه خوو اری تۆپۆلۆف" ٢٢ که جاروبار ده که وتنه خوواری ته نیاله بۆمبارانی پردەکان وڕێگاکانی ڕێی‌هاـ میلیتون ده یان توواني پیرۆزبن له مانگی سی‌پتامبری ١٩٧٤ وه سازمانی کوردستان به روژنامه نووسه کانێکی که له ڕێگای شاری ورمیوه که له تارانه وەدەهاتن ئیزنی

دان که بێنه کانگای ناوه ندی کوردستان واته حاجی عومەران وه به شی زوری لەو روژنامه نووسانه له لایه ن ساواکی ئێرانه وه ده ناردرانه ئه وجێگایه. ئینجائەـ و روژنامەنو وسانه له پێش داله گه لّ شه فیق که زازه وه چاوپێ که وتنێکیان ده کردوله پاشان ده ناردرانه کوردستانی عەراق. رۆژنامه نو وسه کان له لایەن سێرویس ی ئاگاداری کوردانه وه ڕابه ری ده کران که له سنوورئاوابن وبچنه (قه سری سه لام ) روژنامه نو وسه کان وهه وال ده ره کان که دەها تنەناوچەی ناوەندی کورده کان پێویست بووچه ندسه عاتێک به ڕیوه بن تابگه نێ ، هه والّ به رەکان و روژنامه نو و سه کان پاش ووت و وێژله گه لّ ئه ندامانی ده فته ری سیاسی (سامی ، دوکتورمه حمودعوسمان ، حه بیب که ریم وچه ندئه ندامی به رزی‌دیکەی کورد . . . ) وەهه روەهاله گه ل ژینرال بارزانی وەمه سعودوئید ریس دەچوون چاوپێ که وتنێکیان له به ندی خانه کان ونه خۆشخانه کان ده کردوسه رێکیشیان له سنووری‌ڕه واند زده دا ، له ســه فه ری خۆیان داپاش ئه وەی زۆربه و ورودی له هه مو و شتێکیان ده کۆڵێوه وه چاویان بەئه ســله حــەی قورس وه ک د .بس.آ وه دژی تانک ده که وت له ئاکامابه ونه تیجه یه ده گه یشتن که وائاشکراده بێ کەئه وشه ره ۱۰۰ سال به رده وامه .

## ۹ــ ئەودیوی‌میدالّ

دۆلّی چۆمات‌ڕێگای حاجی‌عومەران به ناو پردان ده گونجێ بلّێن وه ک شه ققامی‌شان زه لیزەی پاریس بوو ، واته ئه وڕێگایه هیچ مه ترسێکی تێدانەبوووەهات وچۆئازاد بوو .

## بیافرایمکی تازه

کات‌لەپاییزی سالی ۱۹۷۴ له بادینان دازۆر باش نه بوووا ئــه وناوچەیه له زاخۆیه ڕاتاسنووری سوریه ــ ترکیه وه تامه لّبه ندی بارزان له مانگی ئوت ڕا

تێگرابە وچە شنە بوولە جنوب ڕاهێزی عەراق تە واوی ڕێگا وجێگای هات و چۆیتادە گاتە وە شمال داگیر کرد بوو ، لە شمال داهێزی تورکیە سنووری بەچرای پرۆژێکتۆر ، شە وی وە ک ڕۆژلێ کردبوو وەلە هێندێ جێیان دابە شە وپێگەی دژی قاچاقچیانی دانابوو .

تە نیاڕێگایە ک کە چۆمانی بە بادینان پێک دە گە یاندوە دە گە پشتەوەمێرگە سووریێ بە گوللەی توپە کانی عەراق کە بێکە لُک وەە دەف داوێژ ڕاچاوە دێری دە کرا . لە مانگی ئوتی ١٩٧٤ وە کە کاتی چاوە دێری زۆرتوند ببووسە رۆکە کوردە کان ڕێگایە کی تازە یان دروست کردئە وڕێگایە بە بولُدزێرچاک کرا ، وە لە هێندێ جێگابە سە رکێوی‌دا کێشرا بووئێنجالە ماوەی چەن حە وتووان داگە یاندیانە بادینان ئە وڕێگایەی کەکێشرا بووهێزی عەراق دە ی تووانی بەدانانی ڕووانگە لە سە رکێوێک ڕابە باشی چاوە ڕووانی بکات بە لام لە وڕێگایە بە باشی کە لُکیان لێ وە ردە گرت ولە بە رچاوی فرۆکەکان بە دوور بوو .

ئە وڕێگایە لە جیاتی ئە وەی کە کاروانی ماشینی پڕلە ئاذوقە وخواردنە مە نی‌نە فت وە بنزینی پێدابچێ وە بۆبادینان بنێردرێ ئەمماسە رۆکە کوردەکان ماشێنە کانیان بۆمە قسە دی کاروباری نیزامی بە ڕێوە دە برد . لە ئاخری سێ پتامبری ١٩٧٤ کات زۆر ناسک وپڕلە مە ترسی بوولە شارێکی چووکی وە ک سەر سە نگ قیمە تی خووارد نە مە نی زۆر چووبۆسەرێ : شە کر٣٠٠٪ چا٢٠٠٪ برنج ٤٠٠٪ ئارد ٥٠٠٪ ( لە ڕاپۆرتی مانگی مارس) دانووسرابووئارد و برنج بە هیچ جورێک وە دەست نە دە کە وت ! ونرخی زۆرلە سە رتر بوو .

نرخی نە فتی چرای لە دێیە کان بوفە لەکان وجوتیارە کان ٨ دینارەوە . بنزین ٦ دینازبوو . مالک شیککو" ڕابە ری پایە بە رزی مە سحێکان" ڕای گە یاندکە لە وناوچە یە دانرخ وبایخی خووارد نە مەنی وسووتە مە نی تائە وڕادە چووبۆسە رێ کە هیچ شتێک بە پول دە کڕین نە دە هات ، وە تە نانەت‌پولیش لە کڕینی شتوومەک دانە خشی نە بوو . مرۆڤ بە ڕاستی بە سە مەرگی دەژیا و ئیتر هیچ . . ." نە[18]بوونی بنزین کاتی ئە ومە لُبە ندەی زۆرلە مە ترسی ونالە-

باری دا، دانابوو. هێندێ لە خە لکی بۆخویان بۆناوچەی دیکە دەچوون وبە هە رچونێک دە بوو خوواردنە مە نی وسوتە مە نیان وەدەست دە خست ودە یان هێناوبە نرخێکی زۆردە یان‌فرۆشتە وە. وە بە وجورە ڕەشە بازاریان پێک هێنابوو. سە رکردە کوردە کان پێشی ئە وە یان پیێ نە دەگیراونەیان دەتوانی شت وە گیرخەن ، وە خە ڵکی لە وقاتی وقڕێ ڕزگاربکەن. حاکمی بادینان کە ئە حمە دشالی بووبە ڕاستی قودڕەتی خۆی لە بە ڕێوە بردنی کاروباری بادینان دانیشان دابوو، بە ڵام لە سەر ئە وەش ڕاکە دە گە لّ ئە وکاتە نالە بارە تووش ببوسە ری لیێ سوڕمابوو. بنزین هە روەگیرنە دە کە وت بۆچارە سە رگردنی مەسە لەی قاتی وقڕی دە ستوری دابە هە رمرۆڤێکی پـە نابە ر۲ دیناری لە مانگی دابدرێتێ:

٢٠٠٠٠ کە س یانی ٤٠٠٠ مال کە پێش مە رگە وکرێ کاربوون لە وبا بە تەوە پوڵیان وە ردەگرت لە هە واڵێک دائە حمە دشالی ڕای‌گە یاند کە زۆربە چاکی ژمارەی پە نابە رە کان نازانم دە گوترا کە بەینی ١٠٠٠٠٠ و ١٥٠٠٠٠ کە س دە بوون. شارێکی چووکی وە ک سە رسە نگ کە مە رکە زێکی توریستی بـە ناو بانگی ئە ومە لبە ندە بووە ژمارەی دانشتوکانی خویی لە ٢٠٠٠ تا ٣٠٠٠ کە سی‌تێ‌نە دە پە ڕی بەهاتنی پە نابە رلە شارە کانی وە ک دە هۆک زاخۆوە ئە کراکە ٢٠٠٠ مالی هات بۆنیێوی بە چەن بە رامبە رگە پشت بوو. پاشماوەی پەنابەرە- کان لە دێیەکانی هە رمە نی یامۆسولمانە کان جێ گیر ببوون ویالە بەینی دۆڵی سە رسە نگ وئامادیادا دامە زرا بوون. ئینجابێ جگە لە وپە نابە رانەی کە لە بادینان دابوون هێندێکی دیکەش لە ژێر داران وە خڕی ویشکی سێلاوێ، دابە بێ‌جلکوبە رگ وپیێ‌پە تی لە کاتێکی زۆر چێوتی و نالە بار دابە سە مر گی ژیانیان ڕادە بووارد. هێندێ لە وپە نابە رانە کە سانێک بوون کە کوڕیان لە بە غدایان کە رکوک کە قوتابی بوونومابوونە وە بێ‌پوول وپارە بوون نە یان‌دە زانی بۆکێ دەست درێژکە ن وچۆنیان پوول بۆبنێرن. لە وهە ل ومە رجە داهێندێکیش لە کۆڕی میلیشای کومونیست بۆلای جنوب هە ڵات بوون وەلە

ماڵو منداڵیان هە ل وە دا و ببوون جانە یان دەزانی کە سە رنوشت و بە سە ر هاتی خۆیان، وکە س وکاریان بە کوێی دەگات لە مانگی ئوت ی ١٩٧٤ دائە حمە دشالی حاکمی کوردی بادینان ٣٣هە زار دیناری عە راقی بە پە نابە رە کان دا. بە لام ئە وپووڵە عیلاجی دە ردی کە سی نە کرد وبە هیچ کوێی ڕانە گە پشت وتە نانەت بۆسە رۆکە کانی کوردلە وکاتە عاستە مە دازۆرباریکی قورس و نالە باربووکە باری گرانی بودجەی کوردەکانی چەن بە را بە رپتر کردبوو.

لە بارەی کاروباری نیزامیٰ ونەی خشەی ستراتیژیکیٚ وە کوردەکان زۆرباش نە بوون: فە رماندەی هێزی نیزامی ئە سە دخۆشە وی بوو. بە راستی گوتویانە مرۆڤیکی بە دین وە بە بڕشت بووها وکاری نێزیکی بارزانی بوو، گە لەشورە- وی لە گە ڵیابوولە سالی ١٩٦٢ وە، لە تە نشت بارزانی لە شاری بادینان‌دابە قودڕە تە وە خە ریکی کاروباری کوردەکان بوو. بە ڵام لە حقیقەت داساز وبە- رگی نیزامی لێ بڕابوو تۆپی لە بە ردە ست دانە بووئە سلە حەی دکا D.K نە بووچە کی دژی تانکی بە دەستە نەبووتە نیا٤ یا ٥ بازوکای هە بووبیٚ گو مان ئە ویش زۆر چاوە ڕووانی ئە وی‌نەدەکردکەپێش مە رگە بە وچە شنە کاریکی لەدە ست بیٚواتە بە داری دە ستی شە ڕی بۆبکات.

لە هە وەڵی پائیزی ١٩٧٤ وە ئە و و ازوکاتە لە کوردستان دادە دیترابە ڕاستی کاتیکی زۆرناڵە باربۆکوردەکاتٌ هات بۆپێشیٚ. فەرماندە کان وحاکمە کوردەکان تە نیانێویان هە بووئیترچیان لە دەس نە دەهات.

ئەسە دخۆشەوی لە تە نشت بامە ڕنی لە ئە شکە وتیک داجیٚ گیربببووئەحمد شالی لە چادریک دابووکە لە ژێردار یک هە ڵ درابوو. . .لە مەجموع دائە وانە لە پیاوە بە رزونە بە زە کانی کورد بوون بە ڵام قو دڕە تێکیان لە کردە وە دالە دە ست دانە بوو.

بیٚ بنزینی لە ڕیگاکان دا،وە مە ترسی لە بۆمبارانی فڕۆکە کانی عە راق قاتی و قڕی وبرسیایەتی بە ڕاستی واز یکی ئە وتۆی هێنابۆپێشیٚ کە مێژو و نیشانی نە داوە، وەئەوانە هە مووی لیگراوە ک دیٚوە زمە وە شە بە حیکی گەورە

بە سە رکوردستان دابالێ خۆی ڕاکێشا بو و کە هە رگزوهە رگزلە و بە ر هە ڵست و نالە باریانە تائە وڕوبۆکوردان نە هاتبۆپێشێ . بێ‌گومان دە توانین بڵێن کە تە نیادە ست وقودرەتی بارزانی بووکە لە وکاتە نالە بارەدابسەرو وولادت دار، ولاتی بە هە رچە شنیێک بووڕاگرت بوو. پاس چە ن حە وتیێک ڕێگاکراوە وئیتربە فرنە باری وە لە ١٥ مانگی نووامبر داڕێگای بادینان بۆچۆمان بە دۆڵی داکراوە،وە بە سە رهاتی دە هاهە زار کە س ی پە نابە ری کورد لە کاتی زستانی سە رماو سۆڵی سە ختی ١٩٧٤ داکە ڕێگایان بۆئاواڵە ببۆوە وە بە دووای

سەرنوشت داخۆیان لە زاری هە ژدها دا ویشت دەڕۆیشتن کە چارە سە ری خۆیان بکە ن؟ بە ڕاستی ئە وچە شنە بە سە رهاتە کە زۆرتاڵ ونالە باربو وگومان‌ناکردرێ کە لە هیچ چیرۆک و هە ماسە کانی مێژووداگوترا بێ‌وگێڕابیانە تە وە :

یە کێک لە وکە سانەی کە شایە دی بە وکارە دا وە دوکتورئەالکساندرتەبی‌بێکی خە ڵکی ولاتی هولندە کە کونە کاروبە تە جرویە بووە ولە پاشان لە لایەن عە راقێکانە وە گیراوە بە دووای چارە ڕە شیوبە دبە ختی خۆی داسە بارەت بەوەی کە ڕە گە زی لە جوولە کانە لە دارد راوە .

لە حقیقەت داهە رنەزاند را کە لە ئاکاما بە چ چە شنێک ژی نیرال بارزانی ئە وهە مووخە ڵکەی شاری بادینانی دایە دە ستی چارە نووسی و بە سە رهاتە کە ی خۆیان کە ژمارە یان لە ٥٠٠٠٠٠ کە س تا ٧٠٠٠٠٠ کە س زانیوە جاچۆن دە بووئە وانە بە دستی چارە نووس وبە سە رەهاتی خۆیان بدرێن مەگەر ئە وانە بادینانی نە بوون وە بادینان بۆخۆی لە سە رە تا کەی شە ڕی ١٩٦٢ دابە شداری نە کرد، مە گە ر بارزانی بۆخۆی خە ڵکی وولاتی بادینان نەبوو شایانی با سە کە لە سێپتامبری ١٩٧٤ داکوردە کان لە سنووری ڕە و اندزداشە ڕێکی قورسیان کرد کە چە ن حە وتووبە ردەام بووە ودە نگی داوە بە لام ئەوبە رگری و خۆڕاگرتنە سودی لێ وە رنە گیرا .

## ٥کوردلەبەرگری‌توواناێی‌نەبوو

ئەگەرلە ڕاستە قینە دامە علوم نە بێ‌کە سە رئە نجام و بە سە رهاتی‌ئەوژا‌ـ
پەڕینە نەزاندرێ کە چۆن بووە وە بۆخە ڵکی کوردڕوون نە بوبێ تە وەبە ڵام هەر
چێک بێ‌لە بە رئە ومە بە ستانە بووە: تەواوی ڕاوتە دبیر وهە ڵوێست لە سە
رە وەواتە لە لای ژینرال بارزانی کۆنە کاروپیرە وە بووکە تائەو زۆ ٧٠ سالی لەتە
مە نی ڕابوواردوە ـ بارزانی کە زۆر لە گە ڵ خە ڵکی‌هات وچۆی نە بووەنەی
دە زانی واز چۆنە جالە وەی مە ترسی هە بووکە دو وبارە پیلانێکی بۆبگێڕن وە
قە ستی گیانی وی بکە ن، وە تە نیاخۆی لە حاجی عومەران لە قوژبنێک داکزی
کردبووپالێ دابۆوە بە ڵام جارجاربۆئێرانێ هە ردە چوو. بارزانی جاروباردەی
گوت کە: " من ئیترپیاوێکی پیرم تە نیالە سنوورسە ردە دەم: . . .من ئاخری و
ئۆخری عومرمە وە لێرەلە سە رئە و کورسیە خە ریکی متاڵای کتب وکاغە زانم وە
تیلی گرامان بۆوولات دە نێرم. "ئینجاوە ک کە گوترابارزانی‌هات وچۆی لەگە
ڵ کە م کە سان لە کوردەکان هە بووتە نیائە و مرۆڤانە بووکە دەی دیتن: ئیدریس
مە سعود کە مە سە لە ی شە ڕوهێمنایەتی وولاتیان هە مووڕۆژێ لە گە ڵ باس دە
کرد وبڕیاروفە رمانیان وردەگرت " سامی " زۆرجار بۆدە رە وەی وولات دە چوودوکتور
عوسمان وە ختی خۆی دوبەش کردبوونیوەی لە نە خۆشخانە ڕادە بووار دونیوەی
لە دە فتەری سیاسی دائحە بیب کە ریم کە بۆهەواڵ لە دە فتەری حیزبی دیموکرات
لێێ کودە بوونە وەئە ویش جاروباربۆ دانی هە واڵ دەهاتەلای بارزانی. لە ئە
ندامە کانی دیکەی دە فتە ری سیاسی " پۆلیت بوڕۆ " جارجارسە ریان لە بارزانی
دە داوە وە ختێک‌دەهاتە پێش کە کمیتەی ناوە ندی بچێتە کنی. تەواوی ئە وانە
مە بە ستێک وئامانجێک وئاواتێکیان بووئە ویش ئە وەبووکە دیانە ویست لە ڕێگای
سیاسێ وە سە رکە ون وە داخووازی شە ڕنە بوون' بارزانی‌ش ئە وە ی دە ویست و

هیچی دی. تاسالی ١٩٧٤ بارزانی هە ربە نهێنی لە گە ڵ ئێران هات وچۆیی‌هە بوو. ئە وەی کە قاوبوولە مانگی ئوکتوبری ١٩٧٤ وە هێزی ئێران لە ناوچەی کوردستان دا ،وای‌خۆتێوەر دابووکە ئیترلە ژێرچاوە دێری بارزانی دە زچووبوو.

ئە وخە بە رە لە لایە ن زۆرکە سە وە باسی لێدە کراوە ڕخنەوعەیب وعاریان لە وبارە یە دالە بارزانی دەگرت. لەئاکامائە وخۆتێ هە ڵ قوتانەی هێزی ئێران یان بە چارە ڕەشی وبە دبە ختی دە زانی نەک سە رکە وتن وبە ختە وە ری. وە دەیان گوت کە ئە وپشت بە ستنە وە ک نە خۆشی " سە رە تان " وایە کەڕیشەی دادە کوتێ وە بزوتنە وە کە ی کورد ، وە ک خورەدەی‌خوواولە بە ینی دە بات:

بارزانی ئە وکارەی هە ربە نهێنی دەکردوتە نیاچە ن مرۆڤێک بوون کە لە ووت و وێژ و هات و چۆیە دابوون ئە وانی دیکەی ئاگادارنە دە کرد کە چ کراوە وکاربە کوێ دە گات خراپترلە و نێوان وهات وچویە لە گە ل ئێران کە مە سە لەیە کی زۆرمە ڕموزونالە باری بۆتە واوی خە لکی کوردستان هێنابۆگۆڕێوکە وتبۆسەر زاران ئە وە بووکە دە یان گوت ئە گەربە ڕاستی ئە رکی وە ی هە یە کە ئە وپێک‌هاتنە باسی لێ بکرێ پە س بۆبە سە رئا واللە ئی باسی ناکەن‌بە لام مە بە ست وهەلۆێستێکی دیکە لە کاردایە ئە ویش لە بە رچاونە گرتنی فکر وڕای خوێندنە وارەکان لە ڕا پە ڕینە کە ی کوردستان دایە.زاناکان دە یان گوت بۆچ نابێ لە " هۆش وگۆش و ئستعدادی گە نجە کان کەڵک وە رگیرێ" واتە ئە وتاقمە بە هێزوتینە بە کایە و بازی نە گیری. لە ١١٠ مرۆڤی دوکتور کە میان لە کاروبار دابوون وە ٢٥٠موهەندس لە وەی گلێ یان هە بووکە لە بە رچی نابی دووکاریان پێ‌بسپێردرێ.هێندێ لە سە رۆکاکانی کورد وە ک دارا توفیق لە بارەی گە نجەکان دادە یان گوت کەگەنجە قوتابێکان کە تە مە نیان لە زانستگە دارابووارد ووەنایانە وێ ژیانی خۆیان‌لە مە ترسی باوێن ولە مە یدانی شە ڕێ دابگوژرێن بە لام گە نجە کان دە یان گوت ئێمە دە بێ‌فێری توپ وئە سلە حەی دیکە بین ولە کاردابین ئینجا لە وئە فسەرانە وکاربە دە ستە نیزامیکانیکی کە لە نێوهێزی عە راق ڕاهە ڵات بوون وە هە روەهالە خاوە ن کارە کانی تری کورد کە هاتبوونە ناوبزوتنە وە کە ی کوردستان پێیان

دە چە قاند ودەیان گوت کە ئێمە دە مانە وێ بە باشی و چاکی و ئیمانە وە لە شە ڕە کە دابە شداربین، وە رابە ری وفە رماندەهیمان بدریتێ بە لام نە یان‌دە دانێ کە ئە وان ڕازی بکات. بە ڕاستی سە رۆکە قە دیمێ کان پێ یان خۆش نە بووکە تاقمی خوێندە واران لە کاروئیش دابن. یە کێک لە" ڕووناک بیرەکان "گوت بووی کە ئە وانە لە وە ی دە ترسێن کە ئە گە رئێمە بێتووکارە کان بە دە ستە وە بگرین ئیترهە مووشتێک دە گۆڕدرێ بە راستی هە رواش دە بوو. ئە مماشکرابو کـە پیاوە کانێکی کە تا سالی ١٩٧٤ ڕا بە ری وسە رۆکایە تی بزوتنە وە کە یان دە کردوە دژی ئازاترین هێزی عە راق بە شە ڕدەهاتن وە بە گوتەی موشاورە کانی سۆویە ت وەهند ،ئاگادارترین کە سانێک بوون کە لە شە ڕی پارتیزانی وگرێل لابی دادە ستیان هەبوووە ١٣ سالی ڕە بە ق شە ڕیان کردبوووە بارزانی ئە وانی هە‌ڵ بژاردبووکە لە ئاکامابودا مە زراندنی حکومە تی خۆی بە کاربێن. جائە سەد خۆشە وی خە لکی بادینان، عە لی خە لیل لە دە هۆک عە بدول لاپشدە- ری (بە ڵەک) وە تا نانە ت هێندێ لە سە رۆکە کانی دیش کە زۆربە زەحمەت دەیان، تووانی بخوێننە وە و بنویسن کە لە سە رئیش وکاری گرنگ بوون بە تانە وتە حقیرە وە دەیان گوت کە ڕووناک بیرە کان تە نیابودە فتە رداری باشن. مرۆقە کانێکی تە نانە ت نە یان دە تووانی کارتێکی ناسینی ستادی ناوە ندی بخوێننە وە تامانگی ئوت ی ١٩٧٤ وە لە کردە وە دالە سە رئیش وکاربوون بە راستی ئاەووەختی نە ناسرا و بوون.

بە کورتی ئە وانەی کە لە بەینی شە ڕی کوردستان داجوتیاران ورە نجبە رە- کان و ڕووناک بیرە کان بە شی زۆری لە شارستانیێکانی دۆڵی چۆمان لە مە جموع دابە ونتیجە بە گە پشت بووکە لە کردە وە دالە شە ڕدابە شداریان نە بووسە رو- کە کانی کورد وڕابە رە کان حە زیان لە وە دە کرد کە مە سە لە ی نە تە وایە تی مێژووئی لە نێوکوردەکان داپە رەی پێ بدرێ وە تا نێوقوولائی شە ڕێ کاری گە- ربێ بە راستی تە واوی هێزی بروتنە وەی بە رگری یان ئازادی نە تە وایە تی بێ باوە ڕی خۆیان مە بە ست بە کارنە کردن وبە چاوی چکۆڵە تە ماشاکردن لە

ڕاپەڕینە کە دادە ردە بڕی وە ئە وەش بۆخوی زو بە یە کی گە ورە بـووە کـە هێزوتوانائی کوردە کان لە هە ست بخات وڕای وە ستێنێ سالی ١٩٤٣ — ١٩٤٥ ئە وانەی کە شان بە شانی بارزانی بۆچوونی شورە وی لگە لی کەوتن لە تەنشت بارزانی بوون وە هە رئە وانە بوون کە گە ڕانەوە، کوردستان وڕاپە ڕینە کە یان پیک هێنا وە تا سالی ١٩٧٤ لە خە بات دابوون بە لام بە دگومانی ودڕدۆنگی لە وان دارخنەی کردبوووە مە سە لەی ساز شکاری ش بە ڕاستی گرێیەکی گە ورە بوولە کاردا.

بە لام کاتی ژی نیرال بارزانی وەها وڕێیە کانی کە لە دە وروبە ری بوون نێزیک بە ئاخری وئۆخری بوو: سە رئە نجام کاتێک کە ژنیرال بارزانی لە سالی ١٩٤٣ وە لە میلیشیای هیوائیانی لە لایە ن گرە کانی چریکی هیوا جودا بۆوە وە نە ی زانی چۆن لە گە ل ئە وان ببزوێتە وە — بە داخە وە ڕێک کەوتن‌لەگەڵ زوونـلـک بیرە کان ئیترهیچ کە ڵک وقازانچی تێدانە بووە نرخ وبایخێکی لێ‌وەر رنە گیراوە، کۆبوونە وە یە کی ئە وتۆکە پێویستی پارتی بێ‌وە دی نە هات.

١٠ــ خۆتێوەردانی‌ئێران

پاش گرتنی کێوی زۆرزە ک لە لایە ن هێزی عە راقە وە ٣ ی ئوکتوبری ١٩٧٤ کاتی ناوچەی کـوردەکان زۆرجێ مـە ترسی و عاستەم بوو. ڕابە رەکانی کورد: ژینیرال بارزانی ئیدریس ومە سعود وە عە بدول‌وەهاب ئوترۆشی سە رۆکی ستادی دە فتە ری نیزامی بە پێوستیان زانی کە لە ئیران یارمە تی وە رگرن تا بە باشی لە سنووری ڕە واندز بە رگری بکـەن ئـە وجاربـە تایبەتی هیزی‌تۆپخانەی قورسی ئێرانیش بە شوێنی ئە وان داپشتیوانی لی‌کرد:تا ئاخری حە و تووی مانگی فیوریەی ١٩٧٥ گوردانێک لە تۆپخانەی ئیران کە بریتی لە ١٢ توپی ١٥٥ میل‌متری‌بووبە٤٠٠سەربازە وە لە نیزیک ستادی بارزانی دامە زران وە لە قە جە رە وە ٦ توپ لە دە ربە نددابە نێوی پشتیوان لە بە رگری داماوە... ئیران ئە وکە ڕەت بە ئاشکرائی یارمەتی کورددەکانی دە کرد — دوکتور، پەرستار، ڕوژنامە نووس

لە وە کردە وە یە چاوە دێریان دە کردوچاوە ڕووان مابوونە وە نیشانەی ئالای سێ ڕە نگ کە بە کامیــون وجیپە کانی ئێرانە وە بوون بۆئی حتیات قوڕیان تێ‌هەڵ دە سوون‌وەو یان شاردە وە. هێزی تۆپخانەی ئێران، هە مووئێواران دەهاتە کوردستانی عە راق وە تاسنووری شە ڕنێزیک دە بووە ئینجالە بە رە بە ری‌ڕۆژئا-وابوون داڵای کاتی ۸ ئیواری بۆ نێزیکی ڕێگای هامیلتۆن کە بە دژواری دە دیترادە ڕۆیشتن: کامیونی نیزامی چە ک وخووارد نە مە نی ومرۆقیان دە بردودە هێنائسە رۆکە کانی . شە ڕلە هات وچۆدابوون... لە سە رهە یوانی میوانخانەی دە ربە ندراکە ڕۆژنامە نووسە کان چاویان لە وکارە ساتە دە کردتووانی بویان لە ماوەی نیوسە عات دا ۱۲ کامیون و ۱۲ تۆپ کە بە رە وجە بە دە ڕۆیشتن بژمێرن.[21]

لە کاتی دە ست پێ کردنی شەڕداتۆپچی کانی ئێرانێ زۆر بە باشی شەریان نە دە کردوە نیشانە یان نە دە هە نگاوت چونکە لە فرۆکە کانی عە راق زۆردە-ترسان وە زۆریشیان لێ کوژرابە لام[22]وردە وردە تــرسیان شـکاوە باشتیریان شە کر دهە روە هاهێزی ئیران بە ئە سلە حەی دژی" ئاسمانی و موشەکی زە مین‌بە هە واکوردە کانیان یارمە تی دە دا.وە لە ئاخری نووامبری ۱۹۷۴ وە موشە کی دژی تانک لە ئاکاری نیزامی دابە ڕێوە بردرا. هێزی عە راق خویی بۆشە ڕی زستانیش ئامادە کردبو، واتە ستادی هێزی عە راق ۱۵۰۰۰۰ دە ست لیباسی زیستانی بە دە ولە تی هندوستان سفارش دابوو. کوردەکان ئە وکە ڕە ت دەیان تووانی بە چاکی پە لاماری هێزی عە راق تێک بشکێنن وەئێرانیش ئە سلە حە و سازی وبە رگی دە دایە وپشتیوانی لێ دە کرد بە لام کات د هـ هات بگۆڕێ: تە-نانە ت یێ کیک لە ئە نداماني دە فتەری سیاسی زوربە دڕدۆنگی وشک وگومانە-وە وە لامێکی لە وبارە یە دادابوو و گوت بووی: بە لێ ئە وان بە باشی دە زانن کە ئە وە تە نیاقودڕە ت و هێزی ئێمە نیسە کە بە شە ڕدی وە ئیترلەپاشان...؟[23]

## ١١- بارودۆخی کۆمەگی ئێران

بە چاکی ئاشکرا بووکە یارمە تی ئێران بۆکوردە کان قازانجی تێداهە یە.لە

مانگ فیوریيەی ١٩٧٥ لە پاش ئەوە ی کە شە ڕنە ختێک وازی گۆڕابووە دەهاتبە سوودی کوردەکان بێکوردە کان توانی بوویان جێگای خۆیانقایم بکەن ودامە زرێن : لە جە بەی ڕە واندزداهە ر وە کوئید ریس بارزانی گوت بووی نیوەیکێوی زورزە ک بە دستی هێزی عە راقە وە بوو نیوکەی دیکە بە دی ستی هێزیکوردەکان ئیدریس هە روە هادە ری بڕی بووکە ئە وکاتە ناتووانێ بۆئێمە باش بێ :هێزی عە راق بە شێک لە ڕێبازی هات وچۆی ئێمە ی لە ژێر چاودایە. . .ئە وە بە ڕاستی بوئێمە گران تە واودە بێجایە کێک لە ئێمە وە یان لە وان پێوستە ئێرە بە جێ بێلێت.[٢٤] "لە بارەیکاری ڕا میارێوە بارودۆخی خە باتی کوردەکان زۆرڕیشەی نە بووهێندێ لە وکوردانەی کە لە بارزانی نێزیک بوون پێیان لە وەنابووەوسە-لماند بوویان کە ئیترکاتی شە ڕەوازی کوردستان وردە ـ وردە دەهات شەڕکە-ڕە کان وە خە ڵک ماندوکات بە راستی خۆتێوە، ردان وتێ هە ڵ قوتان لە" کوردستان ی ئازاد کراو" لە گە ل دڵداری دانە وەو"لاواندنە وە پێکە وەتێکەڵ ببووخە ڵکی وولات تازە دەهات تام وبۆنی ئازادی بچێی ژن ئینجا کە دەیان دیت ئە وە ئاژاوە دێ بە هە ست بێوە وولات ناخۆشبێتە و ە پێیان خۆش نە بوو. روژنامە نو سە کان بۆنووسي هە واڵ دە بوووەرگێڕیان لە گە ڵ بێکە بتوانن قسەی پێش مە رگە کان بنووسن وە جێگای یەکتریان ئال و گۆڕدە کرد.

لە وئاخریانە دا ئاکـاری شە ڕلە لە دە ستی کوردەکان دە رچووبوو، ئیتر سە رکردە کوردەکان تاکتیکی لە ژێرچا وگرتنی کردەوە ی سە ریان لە دەست دابوو وە حوکم و، دە ستووریانزۆرباش کاری بە ڕێوە نە دەبرد. قاوبووکە ئیترسە رۆکە کانی کورد ناتوانن بە باشی هە ڵ وێست بدەن وە تە سمیم بگرن: ئینجا بەوجورە ١١مانگ ئە و کارە بە ردە وام بوو، ئە وکە ڕە ت سە رۆکە کان ڕێگای ڕا میاریان لە بە رچاوو گرت وە ڕاوتە دبیریان هێناسە رئە وەی کە بە ڕاگەیاندنی ئوتونومی یان وە رگرتنی حکومەتی، موو ققمت، یان مافی نە تە وایە تیگشتی چارە سە ری کارە کە بکەن. جابە ڕاستی بۆوە دی هێنانی یە کێک لە وسێ مەبە ستانە پێویست ئە وە بووکە لە جە نگەی شە ڕداسە رکە وتنێک واتە پیرۆزێک بە

دەس‌بی‌نن ــ وە ئەوتە سمیمە دە بووتاپاییزی سالی ۱۹۷۴ بگیرێ، بە لام ئەو کاتە هە لێ کە وتە لە ووە ختە عاستە مە دانە دە ها تە پێشێ !

ئیدریس بارزانی، تێ دە کوشی کە ئەوحاڵە تە و، لێ کۆڵینە وە لە مێشکی خەڵک و بە تایبەت لە بە رچاوی‌سە رۆکە شە ڕکە ڕە کان دەربێنێ و دوورخاتە وە، وە دەی گوت کە قودرەت و، تووانائی ئێمە لە وەزیرەکان زۆرپترە. ۲۵

لە حە قیقەت داگە ورەکان و ڕابەرە کانی کورد، بباشی هە مووشتێکیان بۆروون ببۆوە بە لام پرس وجۆیان هە ردە کرد، دوکتور مە حمود عوسمان لە ئاخری فیوربیەی ۱۹۷۵ داڕای گە یاندکە: ئیمڕۆشای ئێران دژی ئۆتۆنۆمی نیە...وە ئەوەش...لە بە رئە ومە بە ستە نیە لە وبارەش دازۆریش تێ‌ناکوشی ۲۶

سەرئە نجام سە رۆکە کوردەکان بەونە تیجە یە گە پشت بوون‌کەئیدی‌شەڕ هیچ مانای نیەوە کە لکوقازانجیشی لێ هە ل ناوە رێ وە شەڕکوردەکان لە ئاکامابە هیچ جێگایە ک ناگە یێنێ، جائە وگوتە و پرسیارو، لێ کۆڵینە وە ووشە یە ک بوون کە لە یە کتریان دە کرد، وە دەنگی دابۆوو دوکتوروعوسمان پە یوە ندی خۆیی لە گە ل باڵی ڕاستی حیزبی دیموکرات لە سالی ۱۹۶۲ دا ڕاگە یاندبوو، وە پێویست بووئاگاداری بدات کە: بە ڕاستی ئێمە ناتو وانین سە بارەت بە ڕەزا مە ندی شای ئێران، خوێنی کوردەکان بڕێژین !"

چە ندڕۆژپاش پێک‌ها تنی پە یمانی ئە ل جە زیرە ئیترنێوانی سە رۆکە کانی‌کوردلە گە ل شائاڵۆزببوو !

یە کێک لە سە رۆکە کوردەکان ی خووا روبۆئە وە ی کە باری سە ردڵی‌خۆی سووک کردبێ، زۆربە تاڵی، و،ناخۆشێوە گوت بووی: "ئێمە بە ڕاستی وادیارە بۆیە کێکی دیکە شە ڕدە کە ین...وە تاملان تێوە چووین. کوردچارە ڕەش و ماڵ وێران و، بە دبە خت‌کرا، پەنابە رە کان لە کاتێکی زۆر نالە باروناحەز دان،وە گفت وگۆیی ئیستاش‌ناتو وانیٚ لە ووت و، وێژی‌سالی ۱۹۷۰باشتربێ...

درێژە دان بە شە ڕزەرەرو زیانی بۆهە ردوک لاهە یە هە ر وە کوکە عە راق بە وشە ڕە لاوازدە بێ، ئێمە کوردە کانیش هە روەهابێ هێزولە ردەبین...

وە ئاشکرایە شای ئێران کە لە وکات و، شە ڕە داسە رکە وێ، لە کە ـ
لک و، قازانجێکی گە ورە بە شدار بیت . !"

هێستاهیچ شتێک بە باشی ڕوون نە بۆوە، کە پاش چەن ڕۆژووت و ، وێژو،
پێکهاتن لە کۆبونە وە کە ی شای ئێران وە سە ددام حسین لە ئە ل چە زیرە
دا ، دە هات زۆر بە توندی ڕاپە رینە کە و، بزوتنە وە کە ی کوردستان و بارزانی
بکووژێتە وە، وە داوای مە سە لەی مافی گشتی نە تە وایە تی ،واتە ئستقلال ی
کوردستان وە ک خە ون و ، خە یالێک بڕ واولە بیربچێتە وە !

## فەسلی ١٥

### پێکهاتنی ئەلجەزیرە (٦مارس١٩٧٥)

لە مانگی ئوکتوبری ١٩٧٣ سەرۆکەکانی کورد، کە لە کێوە بەرزەکانی کوردستان دابوون، لە بابەت شەڕی عەرەب ـ ئیسرائیل دابەوردیەوە لێیان دەکۆڵیەوە، جا لە نەکاو کە گوێ بیس بوون کە کسینگێر دەچێتە شاری مسکوێ، سەریان لێ سوورماو، دەیان گوت:

"ئێمە نەمان دەویست کە وا زبەوجۆرەی لێ بێ، بەڵکوئاواتێکی دیکەمان هەبو !"

کاتێک کە نێوانی عراق وئێران ناخۆشتردە بوو، وەهات و، چۆ دەبڕا کوردەکان شائیان لە دڵی دادەگەڕا. کاتێک کە کوردەکان توونود و تیژی و قین ـ ئەستووری شای ئێرانیان لە بابەت پێکهاتنی پەیمانی ١٩٧٠ وەکە لەبەین کوردەکان،و عراقیێ بیست، قەت باوەڕیان لەسەر ئەوەمنە بووکە ڕۆژێک پێش بێت کە عراق لەگەڵ ئێران ئاشت بێتەوە. ١

لە مانگی ئوکتوبری ١٩٧٢ ڕا کە شا، ڕای گەیاند بووکە وەزیری دەرەوەی دەولەتێکی سوهەم، بێتە پێشی، وە لە کاری نێونجی کردنی نێوان ناخۆشی عراق وئیران دابێتە حەکەم ـ بێگومان ئەودەولەتە دەبوو، تورکیە بێ ـ کە ڕای گەیاندبووئامادەیە ئەوکارە بە قازانجی هەردوک لاکۆتاهی پێ بێنێت.

بە پیویستیان دەزانی کە عراقیش لە سە رمافی پە یمانی ١٩٣٧ داکە لە بارەی‌شە تتول عە رەب داکە ئیران سی سال لە وە بە ر، هێنابوویە گوڕێ دییانی لەسەر دانێ. ئە شکرابووکە سازمانی سیالە و کارە ساتە ئاگاداربوو، بە ڵام کوردەکان و ادیار بووبێ خە بە ربوون. ٢

ئە وە دە هات نزیک بێتە وە کـە نامێلکە یـە ک ئیمزابکرێ وە لە و بە یشـە داکوردەکان ببنە قوربانی سیاسە تی ڕۆژ، واتە بە چە شنی پێکها تنە کە ی بە عسێکان و، سۆویە ت‌کەکوردبوونەفیدانی‌ئەوکارە،وهە روە ها دروست وە ک، مەسە لە ی تایوانی" لیێ‌بێ‌کوردەکان پێکها تنی‌شاو، سە ددامیان زۆرسەسخت نە دەزانی، لە مە و دای هات وچۆ ی ڕامیاری، لە بە ینی‌ئێران وعراق ڕا،بۆدووا ڕۆژێ ڕاهێرشی مسیرێکان لە مانگی ڕە مە زان (٧ ئوکتوبری ١٩٧٣) دەستی پێکرا وە زیرە کانی دە رە وەی تاران ــ بە غدا، جارجارلە شاری ئە ستە نبول ڕاچاوپێکە وتنێکیان دە بو . هاوکات لە گەل ئە وە، لە سازمانی‌نە تە وە یە ک گرتوکان دالەو بارە یە وە گفت وگۆیان دە کرد بە ڵام درِ دۆنگی ونیگە رانی لە وبابە تە وە لە هە موولا یە کە وە دەدیترا. لە ئوکتوبری ١٩٧٤ پاش ووت و، وێژیکی زۆردوورودرێژ لە بارەی مە سە لە ی کوردە کانە وە سە رۆک‌وە زیری ئیران ئە میرعە بباسی‌هووە-یدا ڕای گە یاندکە: لە ڕووناکەی یاسائی ناونە تەوە کان‌وە هە روەها مرۆڤایە تیوە، ئیران ناتووانێ دە رکی سنووری خۆی لە سە رنە تە وە یە کی کە پەنای بۆئێمە دێنێ وە ئە وە نێزیکە لە برسان‌بمرێ لە ترسی بومباران هە ڵوە داو، داماوبوون ببە ستێ" ئیمە لە ڕێگای ڕامیاریوە یارمەتی کوردەکان دە دێن بە لام ئەوەش بباشی دە زانین و ە بە خومان ریگانادەێن، کە لە مە سە لە ی‌کاروباری ناوخۆی عە-راق دا، خۆتی وە ردەین. . . ئینجائە وە بە سە رهاتێک‌نیە، کە تازە بە سەر عەراق داهات‌بێ،بەڵکوبە درێژائی مێژوو، ئە وئە و لاتە لە گە ڵ مە سە لەی کوردەدەست بە یە خەیە وە لە گە ل ئە وان بە شە ڕدێت. من ئە وە تەسدیق دەکە م کە ئە و مە سە لە یە دە بێ‌عە راق بۆخو ی لە فکری چارە سە ر کردنی‌دابێ. . . ئەوەش ئاشکرایە کە بێ‌گومـان‌کوردەکان‌ش مافێکیان هە یە وە بە وە ندە ڕازی نابن کەوەک

ئە وانی دی لە گە ڵیان ببزونەوە. " کاتێک کە لە هوە یدایان پرسیار کرد، ئە دی کێ کوردەکان یارمەتی دە کات، وە ڵامی داوە کێ دە بێ‌ببێ؟ ئە وە ی شایانی با سە هە ڵبەت دە بووسیابێ... یان سازمانی پێسین ( سرویسی تایبە تی‌فە رانسە)لە ئاخری ئوکتوبری ۱۹۷۴ وە‌سە رئە نجام شای ئیران دانی بە سەر رئە وە داهێناکە لە گە ڵ‌رۆژنامەی کوئیتی ئە س سیاسە بە شک وگومانەوە گفت و گۆبکات، ئە و وت و ، وێژە کە لە شاری ئە ستە نبول بوو، شای ئیران لە بارەی کوردەکان داڵاوای گوت: هیچ کاتێک، مە سە لەی مافی نە تە وایە تی گشتی استقلال باسی‌لێ نە کراوە، بە ڵکوتە نیاقسە لە سە رمافی ئۆتۆنۆمی کوردبووە ئە ویش لە ناوخۆ ی عە راق دا، نە لە دە رە وەی عەراق، وە ئێمە عراق ۴

بە وەتاوان باردە کە ین کە لە مە سە لەکەی پێچە وانە حاڵی بووە. لە وکاتە دا، لە شە ڕێکی کە لە بە ین ئیران و عراق دالە سنوور، ڕووی دا دووفڕۆکەی توپولوف ی ۱۷ وە سوخوی عەراق بە ساروخی ئیران خرایە خوارێ. ۵

پاش چەن ڕۆژشای ئیران لە شاری ویە ن اوتریش رای گە یاندکە دانی (ئەسلە حەی هێرشی" بە کوردەکان، هیچ کاتێک لە گۆڕێ دانیە، چونکە ئێمە" دان‌بەسەر مە سە لە ی مافی نە تەوایە تی گشتی کوردستان لە عە راق دا، دانانێین" هەر چە ندئە و هە ڵوێستە نە زاندرا وەو، وەنەگوتراوە کە بە ڕاستی ئێران دە یە‌ویست کە مە سە لە کە ی تە واوبکات وە بە کوردەکان بسە لمێنێ کە مە ترسی‌لەو کارە دازۆرە.

لە مانگی ژوییەی سالی ۱۹۷۴ دا حکومەتی ئیران داوەتی‌لە"کمیتەی‌نە‌تە وە کانی سە لیبی سوور، وە هە روە هالە، کمیسە ری عالی سازمانی نە تەوە‌یە ک گرتوکان بۆپە نابە رە کان" کرد، کۆڕێکی خۆیی بۆچاوپێ کەوتنی پەنابە

رە کانیکوردی عراق لە ئیران دابنێرێ وە لە کە مپە کانی پە نابە رە کاندیتنێک بکات . ئە وکۆڕەهات و ، چاوپێ کە وتنە کە ی بــە جێ هێنا ، لە حکومەتی ئێرانی ویست کە ئە گە رپێویستێتی ،دە تووانێ لە سە لیبی سوورکومەک وەرگرێ بەلام ئیران وە لامی مە نفی داوە .

هە روە هائە وکورە لە حکومەتی ئیرانیێی داواکرد کە لە ئێران ڕا رێگابدات کە سە لیبی سووریا رمە تی خۆی بە کوردستانی عە راق بگە یێنێ ، بە لام ئە وەشی ردە کردە وە .

هاوکات لە گە ل ئە وکارە ساتە ، سە رۆک وە زیری ئێران ڕای گە یاند کە حکومەتی ئێمە تاکوئێستا ۸۰ میلیون دولاری بۆ ۱۱۲/۰۰۰ مرۆڤی کوردی پەنابە‌ری عە راقی خە رج کردە وە. (لە ئوکتوبری ۱۹۷۴) وە گوتی کە : "زۆربە داخە وە دە لێم ،وە تاسوف دەخۆم وسە رم لێ سوورماوە ، کە بۆچ دە بێسە لیبی ــ سووروە کمیسە ری عالی نە تە وە یە کگرتووکان بۆپە نابە رە کان ، لە وبارەیە وزۆر باش خۆیان نیشان نەدەن . " سە رۆک وە زیرهە روە هالە قسە کان ی داگوتی کە : "ئەو سازمانە جیهانیە" پێوستە زۆرترلە ومە سە لە یە دالێی بکۆلێتە وە کە ئە وانە ڕۆژێک دێتە پێش کە بگە ڕێنە وە وڵاتی خۆیان[۷]" سە رئە نجام مە بە ستی ئیرانتە‌نیالە وەبووکە سە لیبی ــ سوربێتە نێوکە مپە پە نابە رە کان وەچاوی بە وازی ئەوان بکە وێ ،وە ئە وەش بۆ خویی دە بۆهۆی " پروپاگاندێک کە مە بە ستیان ئە وە بوو بڵاوببێتە وە" جامە بە ست بە وە بووکە سە لیبی ــ سوری وولاتی سوء یدلە۲۴ ئوکتوبری ۱۹۷۴) دائیجازە ی درایە کە لە لایە ن سی ،آی ، سی ار(کمیتەنە تە وە کانی سە لیبی ــ سوور) بۆئیرانبێت . ۸

بێگومان ناتو واتین ئە وە ی بڵێین کە ژینرال بارزانی و هاوڕێیە کانی لە و بارە وە ناڕە حە تی وجدانیان بۆنەها تبێتە پێشێ ــ وە شایئیرانبەمە سە لەی ئوتونومی یان دروست بوونی دە ولە تێکی فیدرالی کوردستان لە( چووار چیوەی کۆماری عە راق دا ) ڕازی بووبێ وە تە نانەت بارزانی ش لە سالی۱۹۷۴ وە لە گە ل شای ئێران ئە وە ی باس کردبوو ،وە درسی لێ وە رگرت بوو ، وە بە

گوی داخوێندرابوو.... ئه وەی که ئاشکرا بووه، ژینرال بـارزانی لـه سەر
ئه مریکایەی حیساب ده کرد که کارێکی بۆبکرێ وه هیچ کاتێک له فکری ئەوەی
دانه بووکەسیا،ته نیامه به ستێکی که له پێش چاوگرتووه، ئه وه یه که قه درو،
حورمەتی عه راقی له دنیایه دابه وجوره بێنیته خووارێ" ! ٩

له ٢٠ ی مانگی فیورییەی ، ١٩٧٥ دا، باڵوێزی مسرله بێروت ڕای گه
یاندکه به بارزانی ڕابگه بێ‌ن که سه رکومارسادات ده یەوێ چاوپێ کەوتنێکی
پێویست" مه به ست به کار ێکی گرنگ" له گه ل ئه وبه ڕیوه برێ ٤٨ سه عات
به شوێنی ئه وبانگه وازەدا، "سامی" له نه کاوله کوردستان ڕاهاته تارانێ‌واته
له وجێگایەی که بارزانی له ٢٦ فوریه داچاوپێ کەوتنێکی کردبوو، دیتنی به عه
مه ل هێناله ٢٨ فیۆریه داشا چۆقاهره،وه له گه ڵ سه رکۆمارسادات، وه له
پاشان له گه ڵ هەیکەل چاوپێ که وتنێک به ڕێوه بردرا. .

سه رکومارسادات به" سامی" ڕاگه یاند، که پێ‌ک ها تنێک له به ینی ئیران
وعه راق له ئه ل جه زیره داله گۆڕێ دایه وه بێ‌گومان مه سه لەی کوردەکانی‌ش
باسی لێ ده کرێ. هه روەهاسادات له قسه کانی داگوتی که شای ئیران له"
کوردەکانی لایەن گری" کردوه".

له نێوان گفت وگۆیه ک کەلەبه ین‌ی" سامی" وه هه یکه ل ڕه دوبه ده ڵ
کرا، سامی به تێرادیویو، ئاشکرائی‌وئازائیێوه ڕای گویاند که : هه ر ووت و،
وێژێک و پێک‌ها تنێک له به ینی شای ئیران وه سه ددام حسین‌ڕابـردبووبێ
ئیتربه جێگای خۆی، به ڵام کوردەکان ئه سلەحەی خۆیان دانانێن، وه ئه گەر
پێویست بێ‌ساڵه کانی داهاتووش هه رخه بات ده کات و، سه ردانانوێنێ[١٠]

**١ــ نەخشی‌سەرکۆماران سادات ــ بومیدیەن**

له کاتێک داکه یه کتردیتن و، چاوپێ که وتنی ئه وسه رۆکانه له نهێنی
داپێک‌هات، نه زاندرا وه که چ که سێک بۆته مه به ستی ئه و نزیک بوونه وەیه

ئایاسە رکۆمارسادات، یان سە رکۆمار بوومید یە ن وە یان شاحسین پادشای ئۆردون بووە کە ئە وکارەی پێک هێناوە؟ ئە گە رسادات مە بە ستی لە وکارە دائە وە بووبێ کە بە نێوی سە رۆکایە تی عە رە بە، سە رسە ختە کان وە پێش کە وێ وە نە خشی سە رکردایە تی کایە بکات، جابە وە شای ئێران هە رگز دلیناتابێ ئە ممانە خشی بوومی‌دیە ن ئە وە بووکە نێوان ناخۆشیێکە لەناوهەڵ گرێ.

هە ڵوێستی‌سادات زۆرباش ڕوون بوو: دە وڵە تە عە رە بە کان لە بە رامبە ئیسرایل دابە خۆیان ئیجازە نە دە داکە جە بهەیە کی دووەم کە ئە ویش یان لە کوردستان وە یان لە زوفاردابکە نە وە.

ئینجادە گونجێ بلێن کەشاحسین لە وە دانە خشی هە بوو. نە خشی‌بوو میدیە ن لە وکۆبوونە وە یە دازۆر ڕووانگە یە گی پان و بە رینی بوو. لە بارەی نە خشەی جوعزافیایێیوە بومیدیە ن بە شوێنی ئە وە دابووکە نفوزی دوئە بەر قودڕە ت، واتە ئە مریکا ــ شۆڕەوی لە خلیج ی فارس ومدیترانە داکە م کاتە-وە، وە هە ربە ومە بە ستە دە یە ویست زۆربە گورجی ــ شە ڕی کوردەکان‌بکو ژێتە وە، وە دەی گوت ئە وشە ڕە مە ترسێکی گە ورەی پێیەوە.

لە سە رمە سە لەی نە فت، وە نێزیک بوونە وەی ئیران ــ عراق لە یە کتر، لە ئە ل جە زیرە هە وڵ وتە قە لای دە داکە قازانجی‌هە ر دوکی تێدابێ و: شای ئیران لە سە رئە ومە تڵە بە زۆربە" توندی وگرنگی" دە ڕۆپشت، وەدەی گوت کە شای عە رە بستان، مە لک فە یسەل، بە چاکی دیانی بە سە ردانە هێناوە، وە بە تە وس وتانە وە گوتی: " ئە گە رفەیسە ل ویە مانی بییانە وێ بە ئە مریکا، دیاری بدەن، واچاکە کە چە کی بدەنی. بە لام ئێمە بە وە ڕێگانادەین ئێمە ئە وەی ناکە ین!! هە روە هالە وکوبوونە وە یە دا، سە رۆک کۆمار، بومیدیەن هیوادار بووکە لە و دانشتنە دا ( او ــ پ ــ ای ــ پ ) قە را دادێکی سێ گوشی ئە ل جە زیرە بە غدا ــ تاران بە جێ بێت.

ئینجا بومیدیە ن خیاڵێکی‌دیکە شی لە سەردا بوو، وە دە یەویست کە" گوشە

یە کی چاوو" بە غە مزەبۆئە مریکا هە لێنێ ، تابەیارمەتی وی دە ستی شورە وی لە ناوچەیخلیج ی فارس داکورت کە نەوە . لە(٢٦ ئو کتوبری ١٩٧٤ ) دالە کۆبوونە وە یەک داکە لە شاری ڕە بات گیرا بە ڕاستیهەوەڵین پێگە یشتن بوو ئە ل جەزیرە نە خشەی ئەوە بوو کە لە سە ددام حسین داوابکات کە ئە گەربێتو،بی سەلمێنێ کە لە گە ل شای ئیران لە دە وری میزێک داکۆببنەوە بێکە ڵک نابێ ئینجا پاش ڕاگە یاندی ئەو پێشنیارە بە نایب سە رۆکی کۆماری عراق ی گوت کە ئە وەمەبە ستە دە بێ زۆر لە نهێنی دابێ .

لە٦ ژانوییەی ١٩٧٥ داشای ئیران بۆماوەیسێڕۆژ چاوپێ کە و تنێکیلە عوممان کرد . لە ٨ ی ژانوینە داسە رێکی لە قاهرەدا ، وە سە بارە ت بە وەی کە یە گ میلیارد دولار، ئی عتبار بە مسر بدات ، لە قاهرە بە روپیری دە چنوەپێشوازێکی گە ورەی لێ دەکە ن ١٢٠

" نەقورچ لێدان" واتە تین دانیسازمان ( او ــ پ ــ ای ــ پ ) وە کار و کردە وەیسادات بە وڕێگایە گە پشت کە ئیترچە ندڕۆژپێش لە پێکها تنی پە یمانیئە ل جە زیرە دا سادات بە گرنگی بە کوردەکان ڕادە گە یێنی کە بە یە ک گە یشتنێکی گەورەلەگۆڕێدایە .

## ٢ــ ئاسۆی او پ اوپوەپێک گەیشتنیپەیمانی١٩٧٥

کۆبوونە وەی گە ورە کانی اوپ اپ لە ٤مارسی ١٩٧٥ لە ئە جە زیرە دە رفەتی بەبومیدیە نداکە بتوانێ کات بە دە ست بێ نێ کە سە ددام حسین و شای ئیران لە یە کترزۆر نێزیک کاتە وە : هە مووئێوارێ پاشکو بوونە وەی اوپ ،اپ شاوە" پیاوی دە س ڕۆیشتووی" عراق لە دانشتنێکیزۆر نهێنی داپێکەوە ڕووبە ڕوودە بوون وتابەری بە یانی لە بارەی مە سە لە ی بە ینی دوو ولات بە ووت و، وێژەدادە نشتن ، لە سێ شەوی خۆشی هە وە لێ داکە ئە ودووپیاوە پێکەوەقسەیان دەکرد ، نە شایە دێکیان لە گە ڵ بوو نە نازرێک و نەنێونجێک . لە شەوی دووهەم

دابومیدن‌ها و بە شی‌کرد : ووت و ویژ بە زمانی فە رانسە بود وە یە کێک لە
هە رە نزیکە کانی سە رکۆمار بوومیدیەن قسە کانی بە زمانی عە رە بی بۆسە ددام
حسین وەروە گێڕاوە .

بوومیدیە ن هەوڵی دە داکەبە سە ددام حسین ڕابگەیێنێ کە ئێمە دە زانین
وە تۆش بە چاکی لێت حاڵیـە کە ئە رکی شە ڕی گرانی کوردستان زۆرلە بەرچاوە-
عە راق ۱۰/۰۰۰ کە سی لە ساڵێک داکوژ راو، بریندار داوە وە ۴میلیارد دولاری
خەرج کرد وە، وە ئە گە ربتە وێ بە کار وباری‌ئاوە دان کردنی عە راق ڕابگەی،
پێو یستە خۆت لە وشە ڕوکێشە یە ڕزگاربکەی‌وە" برینە کە " سارێژبکەی. ۱۳

لە بارەی پەیوەندی عە راق لە گە ڵ مسکو، نایب سە رکۆمارهەوڵی داکە بە
بیسە رە کە ی حاڵی بکات کە نێوان سازکردن لەگە ل شۆڕە وی مە بە ست بە وە-
یە کە عەراق دە یە وێ( بە قە وەت بێ ) چونکە عە راق لە و نێوە داتەنیاماوە-
تە وە،شای ئێران لە مێژ بوودە یە ویست کە ڕابگە ینی کە لە ئاوریل ی ۱۹۷۲ کە
بە یمانی دوستایە تی عە راق شورە وی بە ستراوەپێویستە شورەوی لە ناوچە کە
دالەو بابە تە وە لەحقوقێکی مە حدود کە ڵک وە رگرێ .

سە ددام دە یە ویست بە ئاشکرائی حاڵی بکات کە شە ڕی کوردەکان وەهان
وتین‌دان بە وشە ڕەگالتە لە گەڵ‌ئاورە" بە چاکی دیارە کە لە ئێران ذا ۵ میلیون
کورددە ژین کە لە مافی نە تە وایە تی کە ڵک وە رناگرن، وە تە نیامافی فارسە-
کان لە بە رچاوە. کوردە کان‌ناتووانن بەزمانی خۆیان لە مە درە سە کان دا،
بخوێنن و، بنوسن مامۆستاکانی‌کورد بۆنا وچە کانی دیکەی‌ئیران دوورخراونەوە)
کتێب بە زمانی کوردی نایە ڵن چاپ بێ، وە نەتە وەی کوردبێ سوچ و تاوان
بێ ڕوحمانە سە رکوت دە کرێ. بە کردنەوەی جە بهەیە ک لە بە ینی کوردستانی
ئیران وعە راق دا، شا ی ئێران بە جێگایە کی دە گات کە سە روبنی دیارنیە :
لە مانگێ دا د و ویاسێ ڕۆژ هە زاران پێش مە رگەی کورد، بۆچاوپێی کە وتنی‌کەس‌و
کاریان لە کە مپە کانی‌ورمێ وە کرماشان سە ردە دە ن .

ئایامرۆڤ،چۆن لە سە رئە و پێش مرگانە حیساب دە کات وە لە حە قیقەت‌دا

بە سە رهاتیان بە کوێ دە گات؟
شازۆر لە مێژبووئە وڕیسک ومە ترسییەی لێ حاڵی ببوو، کاتێک کەلەژوئینی
١٩٧٤ دادە چێتە وولاتیفەرانسە لە وێ ڕای گە یاند : ١٤
" باش دە زانن کە ئە گە رمن ئە وشێرە ئاوەی ببە ستم کارتە واوە" بە لێ
هە ل ومە رجی شانێزیک ببۆوە کە ئە وشێرە ئاوەی ببەستێ" پاش ئاخرین شە
وی خۆش کە ڕایان بووارد، سەرلە بە یانی لە سە ر نان و چای سبحەینێداسەر
کۆمار بومیدیە ن ڕای گە یاندکەکاتی تە واوبوونی کاری سە رۆکەکانی او ـ پ
ا ـ پ تە واو بووە ئێستاکە وە ختی وەی گە یشتووە کە دووبرای وە ک ئێران وعراق[٩]
یەکتربگە نە وە چونکە ئیدی هەمووشتێک حە ل بووە، سە رئەنجام سە ددام
حسین وشای ئیران لەوکاتە دالە بە رچاوی سە رۆکە کان، کە بە ڕاستی سە ریان
سوورِ مابوو، یە کتریان لە باوە ش گرت.
ناسرسە رکوماری پێشوی ولاتی مسر لەبارەی شای ئیران ئە وڕستە یەی
گوتووە:
" موسلمانی خۆشەویستی ئیسرائیل. ١٥

### ٣ـ مادەڕەسمێکانی ٦مارس١٩٧٥ وەپێکهاتنەکە

لە سە رپێکهاتنی پە یمانە کە، ٤ مادە نووسرا بو،وەچاوەدێری کرابوو.
چلۆنایە تی سنووری بە ینیئیران و عراق لە سە ربڕواری پڕوتۆکول ی قوس
تە ن تە ڤیە لە سالی ١٩١٣ وە هە روەها لە سە رئیش وکاری کمسیونی سالی
١٩١٤ وە.
ـ دیاری کردنودامە زراندنی سنووریچۆم لە سە رڕیبا زوخەتتی سە رڕێباز
تالویگ!
ـ چاوە دێری لە سە رپێ ڕاگە یشتنێ کی ( زۆرباش وگرنگ ) لە سنووردابوئە-
وەی کە خراب کارە کان نەتووانن بێنوبچن.

– ئه ومه به ستانه به ته واوی گوترابوو، به ڵام دوورله مه ترسی و، خەتەر نه بوو هێندێشتی تی داما بۆوه ١٦

## ٤– مادەنهێنی پێکهاتنی ٦مارس١٩٧٥

وادیاربووکه پێکهاتنی ئه ل جه زیره، پێکها تنێکی واسوکوها سان نەبوو، به ڵکوبه ڕاستی پێگه پشتێنکیستڕ اتیژێکی بوو، که ئه گه ربه ته وا و که ماڵ به جێ هێندرا بایه، له هه مووناوچەی خلیجی فارس داده بووه هۆی دەنگێکی گه وره وده نگی ده داوه.

له کاتێک داکه په یمان نامەی سالی ١٩١٣ و ١٩١٤ که دووباره له بابه ت ڕێبازی سنوری ڕاوه ستاووه بیرهاتبۆوه سه روکەکانی به عسی عەراقێ ته نیامه به ستیان مه سه له ی شه ت تول عه ره ب نه بوو، به ڵکوداوای مێژووئی لەسەر، خوزستان ( عه ره بستان ) ویان له سه رڕێبازیشمالی خلیجی فارس ش ده کـرا به دووای ئه وه دا ـروژنامەی بەعسی دیمه شق به توندی له سه رئەوپێکها تنه ڕۆپشت. له پێکها تنی ئه ل جەزیره دابه تایبه ت مادده یه کیتێدا بوو، که بریتی لەوه بووکه ئه به رقودرەته کان نابێ له وەیپاش ئەگەر هات وشه ڕێک له ناوچه که داقه وماخۆتێ وه رده ن، یانی له خلیجی فارس دانابێ ده خالەت بکەن، هه ربه وبیروباوه ڕه بووکه ئێرانیێکان ده ستیان له کوردەکان هه ڵگرت.

ئینجاعه راق تەواوی ئه وکه سانەی که له به غدایه ڕادژی ئیران به نێوی پارتی دیموکرات ی کوردستـــان وه شۆڕش گێڕه کانی زوفاربنکـه یان دانا بـــوو، تێک دا.

١ – تالویگ لەدووشەی تال + ویگ پێک هاتوه واتەقولائی ڕێبازی دەریائی

## ٥ ـ کوردەکان لەبەرانبەر پێک هاتنی ئەل جەزیرە ٦ مارسی ١٩٧٥

کوردەکان لە پە یمانی ئە ل جە زیرە بە رادیوئاگادار بوون. ئە وهە واڵە" دەنگی کوردستان" نە بووکە بڵاوی کردە وە، بە ڵکورادیو کانی بی‌بی سی. "دە نگی ئەمریکا" رادیوقاهرە رادیوئیسرائیل یارادیوبە غدابووکە ئاگاداری‌دا.
تە نیاچەندکە سێک لە سە رۆکە کوردەکان دە یان زانی، لە بە یانی ٥ ی مارس دا: بۆتە واوی کوردە کانی دیکە، وە بە تایبەت بۆپێش مە رگە کانێکی کە لە جەبهەی‌زاخۆ، ڕە واندز وە قە ڵادزێ بوون وەهە روە هابۆپە نابە رە کان وە بۆتە واوی کاربە دە ستە کانی " وە زارەت خانە" ی دۆڵی چۆمان ئە وڕاگە یاندنە وە ک گرمەی هە ورەکانی پاش بروسک دەنگی داوە. لە جە بهەکانی‌شەڕ دائە وهە والە بە سە رسووڕ مانە وە باسی لێدە کراۆە بڕوایان نە دە کرد وە هیوایان وابووکە ئە وپێک‌هاتنە قە راردادێکە کە لە بە ینی بارزانی وە بەغدایە بە کۆمە ک و. لایە ن گری شای ئێران بە ڕێوە چووە. کوردەکان لــە وکاتــە دادە پان گوت کە ئە گە ربە ڕاستی پێوستە سنووربە سترێ، ئێمە شە ڕە کە هە ر درێژە پێ دە دین ، وە بەوچە شنە دە مانە وێ بە ئێرانێکان بسە لمێنین‌کە ئێمە دە توانین بێ‌یارمە تی ئە وان لە سە رپێی خۆمان ڕاوە ستین. "
لە پشتی دۆڵی چۆمان بە گشتی دە یان گوت کە ئە گە رشە ڕبە ردە وام بێ، تە نیاچە ن مانگێک بە رگری دە بێ، خوێندە وارەکان پێ‌یان وابووکەئە‌وە بە ڕاستی خۆلە ناوبردنە، وە هێندێ دە یان گوت دە بێ‌چەک دانێن سەر ئــە نجام پە شێویو، سە رلێ شێوان لە بە ینی کوردەکان دازۆر بە هێزبوو:
لە ئێوارەی ٦ مارس داهێزی ئیران توپخانەی خۆی کێشاوە پشتەوە، وە توپی‌دژی هە وائی کە لەکانگای ناوە ندی مە لامستە فای بارزانی لە جاجی‌عومە ران دابە رگری وپاریزتنی دە کرد، هاتە وە خاکی ئیزان. کامیونی‌گەورەی‌توپە‌کان کە یە ک بە دووای یە کێ دالە ڕێگای هامیلتۆن بە قە تاردە گە ڕانەوە ئیران

ده دیتران ، بێگومان سه رنشینانی ئه وماشێن‌وکامیونانه له فکری ئه وه دابوون که ئایابه سه رهات و پاشه ڕۆژی‌تاڵ و، ناخۆشی کورده‌کان به وچاره ڕه شێی که توشی بوون به کوێ ده گات ، وه په یمانی ٦ مارس چ به سه ربزوتنه وی کورده کان دێنێ .

سه رله به یانی ٧ مارس ی ١٩٧٥ ته یاره کانی عـراق ، کـه ترسیان له دژی هه واێ‌وه موشه که کانی ئیران نه مابوو ، به چه شنی‌سیستماتیکته واوی دۆڵه کانی گه لاڵه ناوپردان ، تاچۆمان و ده ربه ندو ، نێزیکی سنوری ئیران به ئاشکرائی ده گه ڕان وهات وچۆیان ده کرد . ئینجاله وکاته یه کێک لـه روژنامه نووسه کان که له مه لبه‌ندی ده ربه نده گه ڕاوه ، له ٨ ی مارس دابه هه ڵ که‌وت سه ری له کانگای ڕۆژنامه نو وسه کان ده دا ، وده بینێ که روژنامه‌نوو سێکی تێدا نه ماوه وه هه ربه وجوره ( وه زارت خانه کان ) چۆڵ بوون ئه ندامانی ئیداره ی پشتی جه‌بهه هه مووی په نایان بۆئێران بردبوو .

هاو کات له گه ل ئه وه ، هیزی سوپای عه راق هێرشێکی‌گه وره‌ی ده ست پێ کرد . ته نیاله جه بهه‌ی ڕه واندزله شـکرونیوێک کـه له لایه‌ن ٢٠٠ تانـک پشتیوانیان لێ ده کرا هه لمه تیان بۆسەر پێش مه رگه کان‌هێنا·بۆعراق ، و بوئیران ئتربه چاکی ده زاندراکه به رگری له لایه ن کورده کانه وه زۆرکه مه وه ناتووانن خۆڕاگرن ئینجا هێزی عه راق له ماوه‌ی ٤٨ سه عات داخۆێ‌گه یانده سنووری ئێران .

به لام له سه‌رئه وەش ڕا پێش مه رگه به ئازائی و پیاوه‌تی هه رشه‌ڕی ده کرده وه زیانێکی زۆری له هێزی عراق ده دا . حه وتێک که له په یمانی ئه‌ل‌جه زیره ڕابووارد ، رادیو به‌غداهه مووڕۆژێ بڵاوی ده کرده وه که شه ڕله کوردستان داته واوبووه ، ئینجامانگێک مۆڵه ت به کورده‌کان دراکه یان خۆیان به ده سته وه بده‌ن وه یان بۆکوردستان‌ی ، ولاتی ئێران بچن [18]

## ٦ـ ژنرال بارزانی و، پەیمانی ٦مارس ئەل جەزیرە

دە گوتراکە لە هە وە ڵە وە سە روکە کوردەکان، بە ئاشکرائی قە راردادی ئە ل جە زیرە یان ڕە د دە کردە وە،وە بە هیوای ئە وە بوون کە ئە مریکا بە شای ئیران بلّێ تالایە ن گری خوّی دەربڕێ.

بارزانی کە لە٢٦ فیوریە دا، هات بوّتارانی، مەبە ستِ بە وە بووکە ئتمامی حوجە ت بدات، بە ڵام ناهومێد، گە ڕاوە، وە بە دووای گە ڕاند وە کەیدا، پێیان گوت، کە پێکهاتنێک بەجێ گەیشتووە کە بوٚکوردایش کە ڵک وسودی تێدایە.

لە ٥ مارس ی ١٩٧٥ واتە پێش پێکهاتن و، بە ستنی پە یمانە کە ئە ـ فسە رێکی سێرویسی تە علیمی ئێران هاتە کنبارزانی وە پێ ڕاگە یاند کەسە ـ رئە نجام تالّی و، نالەبارێکی کە لە گوماندانا گونجێ" ئەوە یە کە سنوور" دە بە ستریّ" وە تە واویبزوتنە وە کەڕادەوستێ ........وەنابی چاوە دێرییارمە ـ تی لە لایە ن" ئێرانە" وە ببێ.....وە پێویستــە داوخوازە کانی عراق بە جێ بێت.....وە پێش مە ر گە کان ئە گە ر، بیانە وێ بوٚ ئێران پە نابێنن،نابێ هە مووپێکە وە بێن، بە ڵکودە بێ بە چە شنی تاقمی چووک بێن و، ئە سلە حە کانی خوّیان بدە نە دەستی هێزیئیران، وە بێ چە ک خوّیان بە دە ستە وە بدەن و، ئێمە پە نایان بدە ینێ ١٩٠

بارزانی و هاوڕێیە کانی هێستاهومێدیان هە بووکە لە پە یمانی ئە ل جە زیرە داکارێک بوّچارە سە رکردنی کوردەکان کراوە، وە مافێک بە کوردان دراوەتە نــانە ت پاش هێرشیعراق لە ٧ ی مارس ی ١٩٧٥داسە رۆکە کانی کوردهێستاکە ش هیواداربوون ئێجالە ١٠ ی مارس دا، وە ڵامبەرێکیان ناردە لای سازمانی سیا بوّتاران، وە بە و چە شنە ڕایان گە یاندبوو:

لە وکاتە عاستە مە دا مە ترسیو، نیگە رانیێکی تە واوکوردە کانی داگرتووە،

